کۆکردنەوەی ئۆسکارمان

# تو حفەی موزەفەرییە



پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانەسەر ڕێنووسی کوردی

هێمن موکریانی



# ناوەرۆك





# پێشەکی

پاش بڕانەوەی شەڕی یەکەمی جیهانی، پاش ئەو هەموو کوشتار و تالآن و بڕۆیە، پاش ئــەو هەمــوو قاتوقڕە و پاش ئەو هەموو کوێــرەوەری و دەرد و داخە کە لە هەموو لایەک تووشی نەتەوەکەمان هات، هێشتا فۆلکۆری ئەدەبی کوردی لە کوردستان برەوی هەر مابوو و نرخی بۆ دادەنرا.

وەبیرم دێ ئەو ســەردەمە کە من منداڵێکی ســەر بە کۆچکە و دیوەخاننشین بووم و هێشتا شوێنەواری شەڕ و گرانی و هەژاری و نەداری لە وڵاتەکەمان هەر مابوو، لە ناوچەی موکریــان هەر ئاغایەک دانگە ملکێک، کۆنــە دیوەخانێک، قوڵە بارگینێک، کەچە زینێک، پیرە تاژییکی هەبایە، خۆشــخوانێکی ڕادەگرت کە شــەوانە لە دیوەخان بەیت و باوی بۆ بڵێ؛ لە وەختی نووســتندا حیکایەتی بۆ بکا؛ لە شــاییدا داوەت و ڕەشبەڵەکی بۆ بگێڕێ؛ لە ســەنگەردا تانووتی لێبدا. لە ڕاودا لەسەر تەماڵ پایزە و ئازیزەی بۆ بڵێ؛ فڕان باوێتە دژمنی و بەندان بەدۆستی هەڵبڵێ و تەنانەت لە پاش مردنی شینی بۆ بگێڕێ.

تا ئاغا دەســترۆیوتر، تا دێ ئاوەدانتر و گەورەتر، تا دیوەخان بەبێنە بێنەتر، تا ئەسپ ڕەســەنتر، تا زین و لغاو و ڕەخت و ڕێشــمە پەرداختر، تا تــاژی چێتر و دەم گەرمتر بان خۆشخوانیش وەستاتر و شارەزاتر، نێر و پڕتر و کۆک و پۆشتەتر دەبوو.

دیارە خۆشــخوان وەک هونەرمەندێک چاوی لێ نەدەکرا و ڕێزی لێ نەدەگیرا؛ بەڵام لە کوێخا و گزیر و سەرکار و پاکار و بابنۆکەر و غوڵام و چاپەز و بەردەست، ماقوڵتر بوو.





هەقی بوو لە دیوەخان لەســـەر چۆک دابنیشێ. خەنجەر بچەقێنێ و ئانیشکی وێبدا و جا گوتن بڵێ. خۆشـــخوان لە حوزووری ئاغا نانی دەخوارد و دەگەڵ مام میرزا لەســـەر یەک سینی دادەنیشت و بەرماوخۆر نەبوو.

خۆشـــخوان بەکوڕی ماڵێ حیساب بوو. دەیتوانی بچێتە ئەندەروون؛ لە ژووری نوستندا حیکایەت بۆ ئاغا بڵێ تا خەو دەیباتەوە. خۆشـــخوان تەنانەت گۆرانی و بەیت و باوی بۆ ئاغاژن و خێزانی ئاغا دەگوت. چونکە خۆشخوانەکان زۆربەیان دڵتەر و قسەخۆش و دڵپاک بوون، خەڵک خۆشیان دەویستن.

خۆشخوان لە دێدا هەر ناحەزێکی هەبوو؛ ئەویش مەلای گوند بوو. کەم وابوو دانوویان پێکەو بکوڵێ. مەلا وشـــکەکان خۆشخوانە دڵتەڕەکانیان خۆش نەدەویست. ناویان نابوون چـــاوەش. بە چاوی ســـووک چاویان لێ دەکردن، تا مەلا تەشـــریفی لە دیوەخان بووبایە خۆشخوان دەبوو قرووقاپ دانیشێ و متەقێ نەکا. خۆشخوانەکان لەبەر ماموستایان دانەدەنواند و ئەوانیش بەچەکی خۆیان، بەچەکی زمان، بەچەکی شیعر ـ بە گژیاندا دەچوونەوە و فڕیان پێ دادەدان و بەیت و باڵۆرەیان بۆ ڕێک دەخستن و لاسایان دەکردنەوە.

دیـــارە مـــەلای وەک خانی و حاجی قادرمان بـــوون کە نرخی ســـامانی نەتەوایەتیی کوردیان زانیوە و ڕێزیان لە شایەر و خۆشخوانەکان گرتووە؛ بەڵام، بەکوڵێکی بەهار نایە؛ ئەگـــەر مەلا و فەقێیەکانی زوومان نرخی هونەریان زانیبا و لەباتی ســـوڵتان جومجومە و ئیسماعیلنامە، هەر یەکی بەیتێک، لاوکێک، حەیرانێک و گەلۆیەکیان نوسیباوە، ئێستا کار لە جێیەکی دیکە دەبوو و ســـامانی نەتەوایەتیمان دەگەیشـــتە پلەیەکیتر و فەرهەنگێکی دەوڵەمەندتر و گەورەترمان پێکەوە دەنا.

لە مزگەوتی گوندیش شـــەوانی زســـتان پاش نوێژی خەوتنان، ئەو شایەرانەی کە هەر بۆ دڵی خۆیان دەیانگوت و خۆشـــخوانیی ئاغایان لە کن کەمایەســـی بوو، یا ئەو شاگردە لاوانەی هێشـــتا ڕووی مەجلیســـیان نەبوو، بۆ کوڕ و کاڵان و بۆ پیرانی دڵتەڕ دیانگوت تا شـــەو ڕادەشـــکا و خەو لابەلای دەکردن. ئەوانە پاداشیان تەنیا ڕەحمەت لە دایک و بابت یا دەمخۆش بوو. بلوێرژەنگێو و نایەژەنی واش هەبوون کە ئاهەنگی ڕەســـەنی ئەو بەیت و بەندوباوانەیان دەزانی و بۆیان دەگێڕانەوە.

لەشـــارەکانیش شـــەوانە خەڵک لە قاوەخانە کۆدەبوونەوە و تا شـــەو درەنگ دەبوو، بەیتبێژ و حیکایەتخوان دەیخافڵاندن. قاوەچی ئەو هونەرمەندانەی بەکرێ دەگرت بۆ ئەوەی قاوەخانەکەی ڕمێن پەیدا بکا.




شایەری گەڕۆکیش هەبوون کە بەهار و هاوین و بەشێکی پاییز، خەریکی کار و کاسبی و جووت و گا بوون. کە شەو درێژ دەبوون و کاری مەزرایە کەم دەبوو، وێ دەکەوتن و بە ماڵە ئاغایاندا دەگەڕان و لەهەر ماڵێک چەند ڕۆژێک دەمانەوە و کۆڕی بەزمیان دەڕازاندەوە و شاباش خەڵاتی باشیان دەستاند. باشترین شایەر ئەوانە بوون. تەنانەت سنووریشیان دەپەڕاند و گەرمێن و کوێستانیان دەکرد. من بۆ خۆم چەند کەس لەو مامۆستا گەورانەم دیبوون و هونەر نواندنی وانم وەبیر دێ. ئەوی بیانناسم و گوێم لەدەنگیان بووبێ و بە هۆنەرمەندم زانیبن، ئەوانە بوون: مەجیدە گرۆێ، دەرویش سەرڕاو، هاجیلەی ئیندرقاشی، سەید عەوڵای سەید مینەی، عەزیزە خڕە، حەمەدی ئاغای، وسێن کەنیلە، هەباسە خڕە، شەریفی مام سەعیدی و وسێن زارخوار؛ ڕەنگ بێ ئێستاش لەوانە هێندێکیان مابن.

سەرەژنی واش هەبوون کە لە وختی ئاساییدا بەیت و حەیرابیان بۆ مەجلیسی ژنان دەگوت و لە شینگایان بەئاهنگێکی زۆر پڕسۆز بەمردوویان هەڵدەگوت. قەتم دەنگی خۆش و ئاهەنگی پڕسۆز و جۆشی فاتەڕەشی لاچینی و ژنی ئاغای لەبیر ناچێتەوە. زۆر منداڵ بووم کچێک لە دێیەکەی ئێمە جوانەمەرگ ببوو و ئەو فاتەڕەشە بەدەنگێکی زوڵاڵ و ئاسمانی پێی هەڵدەگوت؛ ئێستاش ئەو بەندەم هەر لە گوێدا دەزرینگێتەوە کە دەیگوت:

هەی مەکە، ڕۆڵە مەکە بابان وێرانم مەکە،

خەڵکی بەتاڵانی دەچۆوە، مەڕە، بەرانە، بەختەیە، شەکە،

ئەمنی مل بەکوێن بەتاڵانم دەچۆوە، گەردنی زەرد و بەژنی باریک و ڕووی بەخاڵ و دوو چاوی دە بەڵەکە.»

مەینێج حەیران و زڵەخا چوختیش، دوو ژنی بێباک بوون کە دەفەیان لێ دەدا و گۆرانیی داوەتیان دەگوت و شایەری شایی بوون و هیچ لە پیاوەکانی ئاواڵیان نەدەمانەوە؛ بەتایبەتی مەنیج کە خەڵکی سابڵاخ و لە خێزانێکی دەوڵەمەند و بەناوبانگ بوو و بۆ خاتری هونەرەکەی دەستی لە خزمەکانی هەڵگرتبوو.

ئەوانەی تەمەنیان زیاتر بوو و پێش شەڕیان وەبیر دەهات، دەیانگوت: «جا ئێوە چتان دیوە؟ ئەو شەڕ و کوشتارە، ئەو قاتوقڕە، ئەو هەڵات هەڵاتە، شایەر و خۆشخوانی لە موکریان بڕێ». ڕاستیشیان دەکرد؛ چونکە چوار ساڵی تەواو لەو مەڵبەندەدا ئاگری شەڕ لە نێوان ڕووسیای تەزاری و عوسمانیدا ئایساوە و گەلی کوردی لێقەوماویش ئاوردووی ئەو ئاگرە ماڵوێرانکەرە بووە.

خوالێخۆشبوو میرزا ئەحمەدی ڕەئیس، جارێک بۆی گێڕامەوە و گوتی: «ڕۆژێکی ساردی

زســـتانێ بوو. نوا به‌فرێکی ئه‌ستوور باریبوو. سوارێکی زۆری ڕووسان له میاندواوه‌وه هات به‌ره‌و سابڵاخ. تورکه‌کان ڕایان کرد. میرزا فه‌تاحی قازی تا شه‌هید کرا له به‌ریان دامه‌زرا و نه‌یهێشت بێن ده شاره‌وه و زۆری لێ کوشتن. که ئه‌و شه‌هید کرا، که‌س خۆی ڕانه‌گرت. ســـاڵدات ڕژانه نێو شـــار. چه‌ند ڕۆژ فه‌رمانی قه‌تڵوعامنیـــان دا؛ هه‌رچی وه‌به‌ریان هاتبا به‌شیر سه‌ریان ده‌په‌ڕاند. پاشان ئه‌مانیان دا. من چونکه ڕووسیم ده‌زانی و ناسیاوم هه‌بوو و هاتوچۆی ڕووســـیام کردبوو، له کوشـــتن ڕزگاریم هات و حوکمیان لێ کردم که‌لاکه‌کان بنێژم. به‌ئه‌ژمار که‌لاکی شه‌ش هه‌زار ژن و پیاو و منداڵم شارده‌وه؛ جگه له‌وه‌ی وه‌بن به‌فر که‌وتبوون و له که‌لێن و قوژبناندا نه‌دۆزرانه‌وه و ســـه‌گ و گورگ خواردنی» . ئه‌وه ژماره‌ی کوژراوه‌کانی جارێکی؛ زۆر جاری دیکه و زۆر شار و دێی تر قه‌تڵوعام کراون.

گرانیی پاش شـــه‌ڕیش یه‌کجار سه‌خت و به‌سام بووه؛ به‌ڕاستی پیاو پیاوی خواردووه. له‌برسان مردووی ئه‌و گرانییه له حیساب نایه. تا ئه‌م دوایییانه‌ش پیره پیاوه‌کانی سابڵاخ ده‌یانگوت ژماره‌ی دانیشـــتوانی شـــاری مه‌هاباد ناگه‌یه‌نێته‌وه ژماره‌ی دانیشـــتوانی پێش شـــه‌ڕی یه‌که‌می شـــاری ســـابڵاخ. جا که وابوو؛ هه‌قیان بوو ئه‌وانه‌ی به‌ئێمه‌یان ده‌گوت: «ئێوه چتان دیوه؟»

په‌یدا بوونی گه‌رامافۆن له قاوه‌خانه‌ی شـــار و دیوه‌خانی ئاغا، جێی به‌خۆشخوانه‌کان لێژ کرد. گۆشه‌ی مزگه‌وتی دێ و زه‌ماوه‌ند و شاییی دێهات نه‌بێ، چیان به‌ده‌سته‌وه نه‌ما. هونه‌رمه‌نده گه‌وره‌کان لانه‌واز و بێ ئه‌نوا مانه‌وه؛ چونکه زۆربه‌یان پشتڕه‌ق و ده‌سته‌وستان بوون، تووشـــی نه‌داری و هه‌ژاری و ســـه‌رگه‌ردانی و په‌رێشانی هاتن. هه‌ر یه‌که ده‌ریایه‌ک هونه‌ریان ده‌گه‌ڵ خۆیان برده بن گڵ. شـــاگرده لاوه‌کان ده‌ســـتیان له فێربوون هه‌ڵگرت. وه‌دووی کار و کاسبی و ژیان که‌وتن.

پـــاش په‌یدابوونی ڕادیۆی باتری لـــه لادێ، فۆلکلۆری ئه‌ده‌بی کوردی به‌جارێک که‌وته مه‌ترسییه‌وه. ڕووناکبیرانی کورد هه‌ستیان به‌و مه‌ترسییه کرد. لاوانی زانا و وریا، ده‌ستیان بـــه‌کار کرد و که‌وتنه کۆکردنـــه‌وه‌ی به‌یت و باوی کوردی. هه‌رچه‌نـــد ئیمکانی ئه‌و کاره لـــه کوردســـتانی ئێران زۆر که‌مـــه و جارجاریش ده‌بێته هۆی ده‌ردی ســـه‌ر. به‌ڵام چه‌ند که‌سی خوێنده‌وار و ڕووناکبیر تا ڕاده‌یه‌کی باش له‌و کاره‌دا سه‌رکه‌وتن. کاک (عوبه‌یدوڵڵا ئه‌یووبیان) کاک قادری فه‌تاحی قازی و دکتۆر که‌یوان پووری موکری هه‌ر یه‌که به‌شبه‌حاڵی خۆیان، به‌رهه‌می باشیان له فه‌وتان و نه‌مان ڕزگار کردووه. به‌تایبه‌تی کاک قادری فه‌تاحی قازی کارێکی زۆر به‌جێی کردووه و به‌ســـه‌رهاتی کورتی گه‌لێک له‌شایه‌ر و خۆشخوانه‌کانی کۆکردۆته‌وه و له سه‌ره‌تای به‌یتی مێر و وه‌فادا به فارسی نووسیویه‌تی. به‌ڕاستی خزمه‌تی

ئەو زانایانە زۆر جێگای شانازییە.

لەمێژساڵ بوو بیستبووم زانایەکی ئاڵمانی بەناوی ئۆسکارمان، لە سەرەتای ئەم چەرخەدا هاتۆتە سابلاخ و هێندێک بەیت و بەندی کوردی بەیارمەتی دوکتۆر جەوادی قازی - کە ئەودەمی مەلایەکی لاو بووە- کۆکردۆتەوە و بەختێکی لاتینی تایبەتی چاپی کردوون.

بەداخەوە هەرچی تێکۆشام ئەو کتێبەم وەگیر نەکەوت؛ دەترسام ئەو ئاواتەی بەرمە بن گڵ. تا لە ساڵی ١٩٧٤ دا لە کتێبخانەی دەوڵەمەندی کۆڕی زانیاری کورددا ئەو کتێبەم دۆزییەوە. لەپێشدا بەزەحمەت خەتەکەم بۆ دەخوێندراوە. پاش ئەوەی لێی ڕاهاتم، تەماشام کرد کتێبێکی یەکجار بەنرخ و بێ وێنەیە. لەبەر ئەوەی پێشنیارم بەکۆڕی زانیاری کوردی کرد ئەم کتێبە بخاتەوە سەر ڕێنوسی ئێستای کوردی؛ تا هەموو کەس بتوانێ کەڵکی لێ وەربگرێ. کۆڕ پێشنیارەکەی قبووڵ کردم و بڕیارم داوە هەموو هێز و توانای خۆم بۆ خزمەتی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی تەرخان بکەم - وازم نەهێنا و ئەو ئەرکە دژوارەم وەئەستۆی خۆم گرت. هەرچەند کاری ئەدەبیی دیکەشم هەبوون، وازم لێهێنان و چەند کاری نیوە تەواوم لەولای دانان و خەریکی جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە بووم. پاش ئەوەی ئەم تێکستانە سێ چوار جار سەرلەبەر خوێندنەوە، تێ گەیشتم کە شێوەی ئەم تێکستانە هەر ئەو شێوەیە کە من بە منداڵی و ساوایی زمانم پێ پشکوتووە و زۆربەیانم زۆر جار گوێ لێ بوون و لە سەرانسەری ئەم کتێبە بەنرخەدا تووشی کەم وشەی وا هاتم کە مانای نەزانم. لە کاتی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی تێکستەکاندا ئەگەر تێگیراوییەکەم دەبوو، دەچوومە کن دۆستێکی زانام و پێکەوە گیروگرفتەکەمان ڕەها دەکرد. تەنیا کۆسپێک کەمێکی خەریک کردم، ئەویش هەڵەنووسی ئۆسکارمان بوو. لەو تێکستانەدا زۆر جار پیتی (ش) و (ژ) و (س) و (ز) و (د) و (ت) و (ح) و (ع) تێکەڵ بوون. بیرم کردەوە دەبێ ئەو هەڵانە وەک چۆن نووسراون شکڵنووسی بکەم یا ڕاستیان بکەمەوە؛ پاش ماوەیەکی درێژ هاتمە سەر ئەوە ڕاستیان بکەمەوە و بەچەند دەلیل ئەو کارەم کرد:

١- ئەگەر ڕاستم نەکردبانەوە کەس سوودی لێ وەرنەدەگرتن. مەگەر کەسێک کە زۆرباش کوردیی زانیبا و شارەزای شێوەی موکریانی بووبا.

٢- ئۆسکارمان بۆخۆی چەند تێکستی بەخەتی فارسی چاپ کردوون و لەواندا ئەم هەڵانە وەبەرچاو ناکەون.

٣- پرسم بە دوو مامۆستای شارەزای شێوەی موکریانی کرد- کە هەم لە من بەتەمەنتر

بوون و هەم زانا و کارامەتر ـ ئەوانیش قۆڵیان کێشا بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکان.

٤ـ تێکستی دمدم ـ کە کاک عەزیزی ئێبراهیمی بەناتەواوی هێناویەتییە سەر ڕێنووسی کوردی بەتەواوی هانی دام کە هەڵەکان ڕاســـت بکەمەوە؛ چونکە بەداخەوە هینەکەی ئەو سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ و مەعلووم بوو ئەم ئەمانەتەی ئەو لاوە زۆر بەجێ نەبووە.

٥ـ کاک (عوبەیدڵڵا ئەیووبیان) کە چەند ساڵ لەمەوبەر بەیتی مەم و زینی لەو کتێبە هێناوەتەدەر و بە فارسیی تەرجەمەی کردووە. تووشی ئەم هەڵە نەبووە و هەموو وشەکانی ڕاست نووسیون.

٦ـ من خۆم موکریانیم و تەمەنیشم لە پەنجا ساڵ تێ پەڕیوە. ئوسکارمانیش حەفتا و چەند ساڵ لەوەی پێش لە سابلاخ بووە و میرزا جەواد و ڕەحمان بەکر ئەم چیرۆکە و بەیت و وردە مەقامانەیان بۆ گوتووە؛ ئەوپەڕی ٢٠ ســـاڵ پێش زمان پشکووتن و فامکردنەوەی من. هیچ جێی بڕوا نییە بە (٢٠) ساڵ زمانێک ئەوەندە بگۆڕێ. من لە موکریان زۆر پیری کۆنساڵم دیون کە بێگومان تەمەنیان ئەگەر لە ڕەحمان بەکر زیاتر نەبووبێ کەمتر نەبووە. من زمانم لە کۆشی نەنکمدا پشکوتووە. نەنکم کچە کرمانجێکی خەڵکی دێی (قەباغکەندی) بوو کە زۆر لە دێی (حاجی حەســـەن) نیزیکە؛ ڕەحمان بەکریش خەڵکی حاجی حەســـەن بووە. نەنکم ٣٥ ســـاڵ لەوێ پێش لە تەمەنی ٨٠ ســـاڵیدا مرد. ڕەنگ بێ تەمەنی زۆر لە ڕەحمان بەکر کەمتر نەبووبێ. من قەت لە نەنکم نەبیست لەباتی (ڕۆژ) بڵێ (ڕۆش)، یان لەباتی (خۆش) بڵێ (خۆژ). کە وابوو ڕەحمان بەکر وشەکانی ڕاست گوتوون و ئوسکارمان بە هەڵەی وەرگرتوون. بەڵام با ئەوە بڵێم خەڵکی لادێی موکریان بەتایبەتی خەڵکی شامات و شارویران و چۆمی مەجیدخان هەمیشە (ح) و (ع) دەگۆڕن. تەنانەت خوێندەوارەکانیشیان لە قســـەکردندا ئەو هەڵەیە دەکەن. لەبەر ئـــەوە کە دڵنیام ڕەحمان بەکریش هەروا بووە، وشـــەکان چۆن نووسرابوون شکلنووسم کردن. تەنانەت پێم ســـەیرە کە جارجار دروست نووسراون.

ئـــەم کتێبە بەنرخە بریتییە لە شـــەش چیرۆک کە هەر یەکیـــان عینوانی هەیە ( خۆڵا لە ســـوڵتان مەحمـــوودی گەورەترە)، ئەوانیتر عینوانیان نییـــە و هەروەها ئەم بەیتانەی خوارەوە:

١ـ دمدم

٢ـ مەم و خەزاڵ

٣ـ لاس و خەزاڵ





٤- ناسر وماڵماڵ

٥- برایمۆک

٦- شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێ

٧- مەحمەڵ و برایمی دەشتیان

٨- قۆچ عوسمان

٩- جوڵندی

١٠- خەزێم

١١- کاکەمیر و کاکەشێخ

١٢- لەشکری

١٣- قەر و گوڵەزەر

١٤- بەیتی زەمبیل فرۆش

١٥- بەیتی باپیر ئاغای بابی هەمزاغای مەنگوڕ

١٦- بەیتی عەبدوڕەحمان پاشای بەبە

١٧- بەیتی عەلی عاشق

١٨- مەم و زین

١٩- وردە مەقام

نوســـکارمان ســـەرەتایەکی درێژی بەزمانی ئاڵمانی بۆ ئەم کتێبە بەنرخە نووسیوە کە بەداخەوە تا ئێستا نەکراوە بە کوردی. سەرەتایەکی کورتیشی هەر بە ئاڵمانی بۆ نووسیوە کە لە لایەن مامۆستا دوکتۆر ناجی عەباس ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کوردەوە کراوەتە کوردی و پاش ئەم ســـەرەتایە چاپ کراوە. هەروەها سەرەتایەکی کورتیشی بەفارسییەکی زۆر زەق و گران بە ئینشای ناهەمواری دەرباری قاجاری بۆ نووسیوە کە ئەوا لە خوارەوە دیکەم بە کوردی.

***

## دیباجە

لە خاوەنانی فام و زانست و یارانی تێگەیشتن و وردبینی ون نییە کە بەشی زۆری پێشکەوتن لە جیهانی زانست و ئەدەبیاتدا لە سایەی چاودێری و یارمەتیی پادشا پایەبەرزەکانە. بێ یارمەتیی ئەوان پێشکەوتنی تەواو، لە جیهانی زانست و شارستانەتیدا زۆر بە سانایی نییە. هەروەک ئەو بەندەی دەرگای ئاسمانپایە (ئۆسکارمان) کە لە ساڵی ١٩٠١ ەوە تا ساڵی ١٩٠٣ لەسەر فەرمانی خاوەنشکۆ ئیمپراتۆری دەوڵەتی ئاڵمان بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم زمانانەی کە ئێستاش خەڵکی مەڵبەندی ئێران قسەی پێ دەکەن و پەیوەندێکی تەواوی بەزمانەکانی کۆنی وەک فورسی قەدیم و پەهلەویەوە هەیە. کە لە زەمانی پێشدادییان و ساسانیاندا قسەی پێکراوە بۆ ئەو وڵاتانە سەفەر بکەم و لەپاش جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانم، بەرهەمی زانیاریی خۆم بەعەرز بگەیەنم. لە تەواوی ئەو دوو ساڵ و نیو سەفەرەدا لە ژێر سێبەری یارمەتی خاوەن شکۆ (موزەفەرەدین شای قاجار)، شاهەنشای وڵاتەکانی ئێران - خوا ملک و پادشایەتی ڕاوەستاوبکا - و یاریدەرانی حاکمە بەدەسەڵاتەکانی ئەم وڵاتانە، زۆر بە ئەمینی و بە ئاسوودەیی لەنێو تیرەکان و عەشایری کورد و لوڕدا مامەوە، بۆ بەجێگەیاندنی فەرمان ئیمپراتۆر و خزمەت و مێژوو و ئیشتقاقی زمانەکان (linguistique).

بەختەوەرانە ئەم خزمەتە پیرۆزەم بەجێ گەیاند. چونکە ئەم خزمەتە ئەنجام

نەدەدرا ئەگەر چاودێریی خاوەن شـــکۆ شاهەنشای وڵاتەکانی ئێران نەبا، ئەوەتا بەرهەمی لێکۆڵینـــەوەی خۆم کردە کتێبێک و بەناوی بەرزی پادشـــا جەمجـــا ڕازاندمەوە و ناوم نا (تحفـــە مظفریە). لە خوێنەوارانـــی بەڕێز تکا دەکەم ئەگەر کەموکورتێکی تێدا دەبینن لێم ببوورن.

ئۆسکارمان
لە شاری بەرلین، لە مانگی نوامبری ١٩٠٥

***

وا دیارە ئۆسکارمان حەزی زۆر لەوە بوو تا ڕادەیەک شارەزای مێژووی نەتەوەیی کورد بێ؛ لەبەر ئەوە زیاتر بەدوای بەیتە مێژووییەکاندا گەڕاوە. یەکەم چیرۆکی باســـی قەڵای دمدم دەکا. هەرچەند ئەم چیرۆکە ئەفسانەیە؛ بەڵام دیسان نیشانەی تەئسیری کارەساتی دمدمە لەسەر بیروڕای خەڵک. هەروەها یەکەم بەیتی ئەم کتێبەش بەیتی دمدمە. ڕەنگ بێ کورد نەبێ کەم تا کورتێک ئاگای لە کارەســـاتی دمدم نەبێ. کارەساتی دمدم ڕووداوێکی گەورەیە لە مێژووی نەتەوەی کورددا. بەیتبێژەکان ئەم ڕووداوەیان هەم بە شێوەی کرمانجی و هەم بە شێوەی موکری کردۆتە شیعر. ئەم بەیتەی ئۆسکارمان تۆماری کردووە، ڕەنگ بێ زۆر پاش ڕووداوەکە نەگوترابێ؛ چونکە ناوی هێندێک لە قارەمانانی شەڕ و کارەساتەکەی پاراستووە. بەیتێکی حەماسییە. شیعرەکانی سوار و جوانن و پڕ حەماسەن:

دمدمم بەردی لە نەزاری
لێیان دا تۆپی هەوشاری
حەوت شەو و ڕۆژان ئاور باری
خەبەر چوو لە بۆ هەوشاری

***

دمدمم بەردی لە بەردێ
لێی دەن بەتۆپی نەبەردی
تا ڕۆژی مەردی و نامەردی




شـــیعری زۆر پڕسۆزیشی تێدا هەن. شایەر لێرەدا لە زمانی ژنەکانی خانەوە باسی بێ ئاوی قەڵا دەکا و بزانن چەند پڕسۆزە:

خاتوونێک دێتە مەیدانێ
لە دڵی خانی دەدا تانێ
لێت حەرام بێ جێی کابانێ
ئاو نییە پێ بکەین شێلانێ

***

خاتوونێک دێ و دەبەزێ
ڕەببی خانە، مارت گەزێ
لێت ڕەش بوون سەر و کەزێ

لەم بەیتەدا خەیاڵی شـــاعیرانە بەســـەر واقعییەتی مێژووییدا زاڵە و شاعیر، یا باشتر بڵێم شـــایەر شـــتی وای لە بەیتەکەدا گونجاندووە، کە دەگەڵ ڕاستی یەک ناگرنەوە، ئەوە هەر شـــایەرێکی کوردی نەخێندەراو نییە ئەو هەڵەی کردووە، شـــانامەی فیردۆســـی ئەم شاکارە مەزنەی مێژوو و ئەدەبی فارسیش ـ جێ متمانەی مێژووزانان نییە؛ چونکە خەیاڵی شاعیرانە ڕاســـتییەکانی مێژووی گۆڕیوە. ڕاستییەکەی ئەوەیە پاش بەشکرانی کوردستان دەرەبەگایەتی کورد هەســـتی بەستەمی نەتەوایەتی کردووە و تا ڕادەیەکی زۆر دەستی لە تەعەسوبی مەزەبی ـ کە لەو سەردەمەدا پادشا زاڵمەکانی سەفەوی و سوڵتانە بلەوەزەکانی عوسمانی بۆ قازانجی خۆیان برەویان پێ داوە ـ هەڵگرتووە و کەوتوونە بیری سەربەخۆیی. ئەمیرخانی برادۆست، ئاڵاهەڵگری یەکەمی ئەم بیرە بووە و سەری وەبەر باری شاعەباسی سەفەوی ـ ئەو پادشا زاڵم و خوێنڕێژە نەهێناوە ـ و گوتوویەتی : «ئەگەر ئەو شایە منیش خانم». شا عەباس ئاگری گرتووە و لەشکری ناردۆتە سەری و بۆ خۆی کوشتووە و ژن و منداڵی یەخسیر کردووە و ماڵ و دەوڵەتی بەتاڵان بردووە و سوڵتانی ئەستەمبووڵیش هیچ لەســـەری نەکردۆتەوە؛ چونکە ڕاستە ئەمیرخان بەڕواڵەت دوژمنایەتی سوڵتانی نەکردووە، بەڵام ســـەربەخۆیی کوردســـتان دیارە بەقازانجی عوســـمانییەکانیش نەبووە. جارێ ئەو دوژمنایەتیی کۆنی خۆی دەگەڵ ســـەفەوییەکان وەلاناوە و لێی گەڕاوە ئەم دوژمنە تازەی بفەوتێنن. ئەگەر ســـوڵتان دڵنیابا ئەمیرخان ســـەر بۆ ئـــەو دادەنوێنێ، هەرگیز ئیجازەی

نەدەدا لە سنووری وڵاتەکەی، شا عەباس ئەو هەموو خراپە بکا. ئەمیرخانیش ئەگەر زانیبای سوڵتان لەسەری دەکاتەوە، قەت لە قەڵا نەدەخزی تا لە تینوان قڕ بێ.

ڕەنگ بێ بەیتبێژ ڕاست بکا و ئەمیرخان ویستبێتی لە دژمنایەتیی ئەو دوو دەسەڵاتدارە بە قازانجی ڕاپەرینەکەی خۆی کەڵک وەربگرێ و پیاوی بۆ کن سوڵتان ناردبێ؛ وەک دەڵێ:

ڕایان وابوو بە هەزاری

سوارکەن خدری بریندازی

بەچەپەر بچێ بۆ خزمەت خونکاری

وەزیر وای گوت بەبوێری

چاکە قاقەزێ بنێرێ

قەلاتی بۆ شای بەجێ بێڵی

بەڵام خونکار هەرگیز بەهاواری ئەمیرخانیەوە نەچوو؛ هەرگیز تۆڵەی نەستاندەوە هەرگیز ئیسفەهانی نەگرت. کە وابوو بەشی دوایی بەیتەکە لە ڕاستی دوورە.

جگە لەوە ڕەخنەیەکی دیکە لەسەر ئەو بەیتە هەیە. ئەویش تەعەسوبی مەزەبیی وشکە. زۆرداران هەمیشە بۆ قازانجی خۆیان لە هەستی مەزەبی هەژاران سوودیان وەرگرتووە. سەفەوی و عوسمانی بۆ پاراستنی دەسەڵات و فەرمانڕەواییی خۆیان ماوەیەکی زۆر لە شیعەگەری و سونیگەری کەڵکیان وەرگرت؛ خەڵکی هەژاریان بەناوی مەزەبەوە بەگژیەکدا دەکرد و بۆ خۆیان لە کۆشکە بەرزەکانیاندا خۆشیان ڕادەبوارد و ئەوەی خودا و پێغەمبەر پێیان ناخۆش بوو وایان دەکرد. من وەک کوردێکی ئێرانی دەردی تەعەسسوبی مەزەبی دەزانم و تێ گەیوم ئەم هەستە بەقازانجی زۆرداران و بە زیانی هەژارانە؛ بەڵام نەدەکرا دەسکاریی تێکستێک بکەم کە نزیکەی چوارسەد ساڵ لەوی پێش گوتراوە. هیوادارم خوێنەرەکان زەمان و مەکان لەبیر نەکەن و بزانن شاعیرەکانی دەرباری سەفەوی زۆر لەو شایەرەی ئێمە لە شیعەگەریدا بە تەعەسوبتر بوون.

بۆ ئەوەی تا ڕادەیەک مێژووی قەڵای دمدم و بەسەرهاتی ئەمیرخانی لەپزێڕین بۆ خوێنەران ڕوون بکەمەوە، هاتمە سەر ئەوەی، ئەوی ئەسکەندەر بەگی تورکمان - کە بۆخۆی لە گەمارۆدانی قەڵای دمدم و هەموو ڕووداوەکانی پاش گیرانی قەڵادا بەشدار بووە و لە کتێبە بەنرخەکەی خۆی (عالم آرای عباسی)دا نووسیویەتی بکەمە- کوردی.

دیارە ئەسکەندەربەگ کاتیبی تایبەتی شاعەباس و تەبعەن دژمنی ئەمیرخان بووە. هەرچی قازانجی شای تێدا بووە، ئەوەی نووسیوە، دڵ پەشاندنی پادشایەک کە پیاوکوشتنی پێ لە ئاو خواردنەوە بەسانیتر بووە، هەروا گاڵتە نییە و ئەسکەندەربەگ نەیتوانیوە جگە لەوی بنووسێ؛ بەڵام ئەوەندەش بۆ خۆی زۆرە و گۆشەیەک لە مێژووی نەتەوەکەمان ڕوون دەکاتەوە.

***

## باسی سەربێچی و لاساری ئەمیرخان برادۆست و چوونی جەنابی (ئیعتمادودەولە) بۆ مەڵبەندی ورمێ و گەمارۆدانی قەڵای دمدم و چلۆنایەتیی کارەسات و ڕووداوەکانی

بەسەرهاتی ئەمیرخانی چۆلاق، بۆ هەموو کەس دەبێ ببێ بە پەند، ئەی ئەو کەسەی بەدوای قسەدا دەگەڕێی! تاوێک گوێ ڕادێرە تا بەسەرهاتی ئەمیرخانت ـ کە لە عەشیرەتی برادۆستی کورد بوو ـ بۆ بگێڕمەوە.

لەسەردەمی شای بەهەشتیدا، قەراتاج ناوێکی کورد لە ڕیزی شاپەرستان و خزمەتکاراندا بوو و بەسەر تەرگەوەر و مەرگەوەر ـ کە بە مەڵبەندی ورمێ و (ئوشنی) شنووە نووساوە ڕادەگەیشت. پاش نەمانی شای بەهەشتی کە ڕۆمییەکان مرخیان لە ئازەربایجان خۆش کرد ـ عێل و عەشیرەتە کوردەکانی سەر بەم دەوڵەتە بایان داوە و ڕەگەڵ ڕۆمییەکان کەوتن. شا محەمەد ناوێک لە میرزادەکانی برادۆست، بەفەرمانی خوندکاری ڕۆم کرا بە مەزن و خاوەن دەسەڵاتی برادۆست.

ئەمیرخان سەری بۆ دانەواند و ملی بۆ ڕانەکێشا؛ هەردەمە ڕەگەڵ یەکێک لە ئەمیرە گەورەکانی کورد دەکەوت. ماوەیەک لەکن عومەربەگی حاکمی (سهران) ڕای بوارد. لە شەڕێک کە عومەربەگ دەگەڵ دژمنەکانی کردی، ئەمیرخان دەستێکی لە ئانیشکەوە پەڕی؛ ناوبانگی بەئەمیرخانی چۆلاق ڕۆیشت.

لەو ساڵەدا کە ئاڵای بەرزی پادشایەتی لە ئازەربایجان دەشەکاوە و شا بەو پێ و قەدەمە پیرۆزەوە بۆ داگیرکردنی نەخچەوان و ئێرەوان دەیاژوا، ناوبراو هاتە بەردەرکی بارەگای پادشایەتی و خۆی بەشاپەرست و خزمەتکار نیشان دا ئاوری ڕەحمەتی لێ داوە.

مەزنایەتی و دەسەڵاتداریی تەرگەوەر و مەرگەوەڕی پێ بەخشی و نازناوی خانی دایە و سەری بەرزکردەوە. مەڵبەندی ورمێ و شنۆی کە سەر بە ئازەربایجانە و لە سەردەمی شای بەهەشتیدا لەژێر فەرمانی یەکێک لە گەورەکانی قزلباشدا بوو- پێ ئەسپارد. لەسەر فەرمانی شا، وەستا زێڕینگەرەکان دەستێکیان لە زێڕی سوور دروست کرد و بەگەواهیرات و مرواریی بەنرخ ڕازاندەوە و لە باسکیان بەست. چونکە ئازا و مەرد بوو، خاوەن شکۆ زۆری ڕوو دەدایە و گەلێکی چاکە دەگەڵ دەفەرموو. ئەویش دەستی خزمەتکاریی لەسەر سینگی دانا. لە سایەی دڵسۆزی و چاودێریی خاوەن شکۆدا ڕۆژبەڕۆژ بەپێژەی مەزنایەتیدا چووە سەر و لە هەموو هاوشانەکانی خۆی تێپەڕاند. چەند ناوچە و مەڵبەندی لە ئەمیرەکانی کوردی سەر بە ڕۆم ئەستاندنەوە و وەسەر وڵاتی خۆی گێڕان و بەوجۆرە لەنێو ئەمیرەکانی کورددا بەپایەبەرزی ناوبانگی دەرکرد.

زۆر لە خێڵەکان و لە ئەمیرزادەکان لە دەوری هاڵان و خزمەتی ئەویان ڕەچاو کرد. هێندە پێ نەچوو هەوا و فیز لەسەری دا و لەخۆبایی بوو. لەو کاتەدا کە (جغاڵ ئۆغڵی) لەشکری بۆ ئازەربایجان کێشا و شەڕ لە دەوروبەری تەورێز قەوما- دەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر شەڕگە نێزیک بوو- خۆی بوارد و نەهاتە مەیدان و بە حوزووری خاوەن شکۆ نەگەیشت. پاش شکاندن و تاراندنی جغاڵ ئۆغڵی، لەشکری زاڵ بوو لە ناوچەی سەڵماس خستی. ئەویش بەدێر و ژوانەوە هاتە بارەگا؛ لاواندراوە و کەم خزمەتی و خۆبواردن و نەهاتنە مەیدانی بەڕوودا نەدراوە. بۆ ئەوەی دڕدۆنگ نەبێ ئەو و ئەمیرەکانی کورد- کە وەحشیترین تیرەی ئینسانن - دڵخۆشی درانەوە و چاکەیان دەگەڵ کرا. مەرەخەس کرا بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، بەڕواڵەت خۆی لە ڕیزی خزمەتکاران دادەنا؛ بەڵام لەبنەوە لەبەر تەعەسوبی مەزەبی و پیسیی دەروون دەگەڵ قزڵباشی دەوروبەری خۆی دژمنانە دەجووڵاوە. هەوای سەربەخۆیی و سەرەڕۆیی لەسەری دابوو. ئەوەندەی بروز ئەستاند کە خەریکی ئاوەدانکردنەوەی قەڵایەکی گەورە و قایم بێ. بەبارەگای دەوڵەتی ڕاگەیاند کە قەڵای ورمێ بنکۆڵ بووە؛ هەرەسی هێناوە و خۆڕاناگرێ و بۆ ئەوە نابێ پشتی پێ ببەسترێ. ئەگەر ئیزن بفەرموون، بناخەی چوار دیوارێک لە شوێنێکی لەبار دادەڕێژم، خاوەن شکۆ- کە هەر ڕواڵەتی ئەوی دەدی و ئاگای لە دەروو نەبوو- ئیزنیدا. ئەویش لە سێ فەرسەقی شاری ورمێ، لەسەر کێوێکی هەرەبەرز - کە کەوتۆتە بەشی تەرگەوەڕ- بناخەی قەڵایەکی قایمی داڕشت.

لەنێو کورداندا باوە دەڵێن: لەپێش ئیسلامدا لە زەمانی ساسانییەکان (اکاسرە)دا هەر لەو شوێنە قەڵایەک هەبووە کە پێی گوتراوە دمدم و دەستدرێژیی ڕۆژگار خاپوور و وێرانی

کــردووه. پیر بوداقخان، ئەمیــری ئەمیرانی تەورێز. کە پیاوێکی بەئەزموون و وشــیار و کارامە بووە. لە جووڵانەوەی دژمنانەی ئەمیرخاندا نیشانەی کەڵەوەکێشی و ملهۆڕیی بەدی کرد. بۆیە بەبارەگای پیرۆزی ڕاگەیاند کە: «ئەمیر خان لە ڕێگای ڕاســتی لاداوە و هەوای سەرپێچی و لاساریی کەوتۆتە سەر و بناخەی ئەو قەڵا بەرز و قایمەی بۆیە داڕشتووە کە لە ڕۆژی پێویستدا بەکاری بێ. ئەو غوڵامە دروستکردنی ئەو قەڵایە هیچ بە قازانجی دەوڵەت نازانم». فەرمانی پیرۆز بەم جۆرە بەڕێ کراوە:

«بۆخۆت ئەمیری ئەمیرانی ئەو سنوورەی؛ ئەگەر ئەو قەڵا دروستکردنە بەقازانجی دەوڵەت نازانی پێشگریی لێ بکە». پیر بوداقخان لەسەر فەرموودەی شاپیاوێکی باوەڕپێکراوی ناردە کن ئەمیرخان و پێی ڕاگەیاند: «کە ئەو لە ڕیزی ئەمیرە مەزنەکانی شــادا حیساب دەکری و پەروەردەی دەســتی خاوەن شــکۆیە و لافی پاکی و بەندەیی لێ دەدا. هەرچەند شــای عالــەم پەنا ئەو پــەڕی متمانەی پێهەیە، بەڵام بەو قەڵا دروســتکردنەی ئەو زمانی زمان پیســان دەکرێتەوە. ئەگەر ئەو قەڵایەی لە ترســی پەلاماری ڕۆمیان دروست دەکا، ئەگەر ڕۆمیــان بێنە ئەو وڵاتە هەتا قەڵای قایم و گەورەی وەک قەڵای تەورێز و ئێرەوان لە نێویدا بێ، ئەگەر ڕووداوێک بقەومێ ئێمە غوڵامانی بارەگای شــا. کە پاراســتنی ئەم سنوورەمان لە ئەســتۆیە - چۆن دەتوانین خۆ بنگخێنین؟ ڕەنگ بێ هەر ئەو عاشــوورە کۆنەی ورمێ بۆ ئەو بەس بێ. وا باشــە کە دەســت لەو قەڵایە هەڵبگرێ و زمانی پیاوخراپان لە خۆی نەکاتەوە و ئەو ئامۆژگارییەی دۆســتانەی ئێمە. کە قازانجی ئەوی تێدایە. لە گوێ بگرێ و خۆی نەکاتە نیشــانەی بوختان و دەمگۆی ئەوتۆ کە بۆنی لاساری و دووبەرەکیی لێبێ». بەڕاستی ئامۆژگارێکی دۆستانە و دڵسۆزانە بوو. چونکە بەپشت ئەستووریی ئەو قەڵایە بوو کە تووشی ئەو چارەنووسە ڕەشە هات و ئەوەی پێگەیی کە دەبوو پێی بگا.

بەکورتی ئەمیرخان هەر گوێی نەدا ئەو قسانە و پیاوەکەی پیربوداقخانیش، بەدەستی کوردە براذۆســتەکان کوژرا. قەڵایەکی یەکجار قایم و گەورەی دروســت کرد و ئازووخە و چەک و چۆڵی کێشاوە نێو قەڵاکەوە. ئەوجار لە ورمێڕا ڕای گوێزت بۆ ئەو قەڵایە. ڕۆژ بە ڕۆژ قەڵاکەی قایمتر و ئامرازی قەڵاداریی پەرداختر دەکرد و لە ڕاســتیدا هۆی چارەڕەشی و لێقەومانــی خــۆی زیاتر پێک دێنا و کاری ئەوتۆی دەکرد کە بەهیچ بارێک دەگەڵ پاکی و یەکڕەنگی یەکیان نەدەگرتەوە. بۆ نموونە، خان ئەبداڵی موکری برای شێخ حەیدەر. کە لە خاوەن شــکۆ یاغی ببوو و لە ترســی هێزی لەشکر لە هیچ شوێنێکی وڵاتەکەی خۆیدا حەجمیــن و حاوانــەوەی نەمابوو. بەخۆی و بیســت کەس لە دەســت و پێوەندەکانیەوە پەنــای بۆ هێنــا و ئەمیرخانیش پەنای دا و کردی بە هاودەم و هاونشــینی خۆی؛ بەڵام

بـــە فێڵ و ڕێوبیازی پیاوەکانی خـــۆی دەنارده دەرگای عالەم پەنـــا و خۆی بەفیدایی و یەکڕەنگ نیشان دەدا. لە کاتێکدا کە جەلالییەکان ناردرانە کوردستان، فەوجێکیان دەگەڵ ناردرا، پیربوداقخانیش ســـەرکردەی ئەو لەشکرە بوو. ئەمیرخان کە ئەو خەبەرەی بیست بەدەوڵەتی ڕاگەیاند: «نێوانی من و پیربوداقخان خۆش نییە و قسەی خراپ لەبارەی منەوە بەعەرز دەگەیەنێ. حاوانەوەی من لەنێو لەشـــکرێکدا کە ئەو سەرکردەی بێ، کارێکی زۆر گران و ئەستەمە».

بـــۆ دڵ ڕاگرتنی ئەو ئەم فەرمانە بەقەڵەم داهـــات: «لەبەر خاتری ئەو، پیربوداقخان ئەو کارەی لێ وەرگیراوە. لە جێی ئەو حەسەن خانمان تاعین فەرموو، کە لە ئەمیرەکانی عێراقە و پیاوێکی پاک و سەرووڕوو خۆشە. بەو حاڵەشەوە ئەگەر بۆخۆی ناتوانێ ڕەگەڵی کەوێ، یەکێک لە کوڕەکانی و ڕدێن ســـپێکی کارامە و دووســـەد سێسەد کەسێکی ڕەگەڵ بخا؛ با یەکڕەنگی و دڵپاکیی ئەو بۆ ئەمیر و حاکمەکانی کورد سووربێتەوە و خانەنشینیی ئەو بەخۆبواردن دانەنێن». ئەمیرخان ســـەرەڕای ئەو هەموو دڵسۆزی و مودارایەوە کە لە لایەن خاوەن شـــکۆوە دەگەڵی کرا، هەر لەســـەر لاساری و سەرەڕۆییی خۆی ڕۆیشت. کە حەســـەن خانی (ئیســـتاجلوو و گەورە گەورەکانی قزڵباش لە مەراغە گەیشـــتنە محەمەد پاشـــا و جەلالییەکان و بەرەو خزمەتـــی خۆیان کەوتنە ڕێ. بـــە ئەمیرخانیان ڕاگەیاند: «لەســـەر فەرمانی پیرۆزی خاوەن شکۆ ئەگەر بۆ خۆی لە توانایدا نییە بێ، چەند پیاوی باوەڕپێکراوی خاوەن ئەزموون کە لە چاک و خراپی کوردســـتان و ڕێگاکانی ئاگادار بن و ڕەوەی بکەون پرسیان پێ بکرێ و بۆ ڕاوێژ دەگەڵ کردن بشێن، ساز بکا و بنێرێ». ئەمیر چەند پەڵپ و بیانووی گرتن.

کورتـــەی بیانووەکان ئـــەوە بوو: «تیرەی جەلالی لاپرەســـەن و نەگونجـــاو و باوەڕ پێنەکراون. با گەورە گەورەکانی قزڵباشیش دەگەڵ بن، من ناتوانم ڕەگەڵ لەشکرێک بکەوم کە حەوت هەشـــت هەزار کەســـی جەلالیی دەگەڵ بێ. ئەوان لە هەر ڕێگایەکەوە دەیانەوێ برۆن، منیش لە پاشان هێندێک کەس بەدوای ئەواندا دەنێرم». ئەمیرە گەورەکانی دەوڵەت سەرکێشیی ئەویان لە سەرەتای سەفەردا بەدڵ نەبوو. ئەوەیان بەلاوە باش بوو ئێستا کە ڕێگایان بەلای ئەودایە، بەهەر بارێک بێ ڕامی بکەن؛ چونکە ئەگەر هاتوو ئەمیرخان ـ کە لە نیزیکانی دەرگای شـــایە ـ وا لاســـاری بکا و بە لاڕێدا بڕوا، دەبێ لە ئەمیرەکانی دیکەی چاوەنۆڕی چ بین؟ بۆیە وەسەر خۆیان نەهێنا و بە زمانێکی نەرم و خۆش لێیان ڕاسپارد خانەخوێیی باش بێ و چەند شـــەوێک ڕامان بگرێ؛ جا کە چاومان پێک کەوت، لەسەرخۆ ڕاوێژی لێ دەکەین و ئەوی قازانجی ئەوی تێدا بێ وا دەکەین. ئەمیرخان هەر جوابی نامە




و پەیامی حەسەنخان و ئەمیرەکانی دیکەی نەداوە و لەسەر کەللەڕەقی و کەڵەوەکێشیی خۆی توندتر ڕاوەستا.

کە پێشەکیی لەشکر گەیشتە ناوچەی بەرحوکمی ئەو، دەستەیەک لە کوردەکانی برادۆست بەرەنگاری بوون و دەگەڵ ئەو جەلالییانەی کە لە پێشدا بوون، بەگژیەکدا هاتن؛ دوو پیاوی جەلالی کوژران و چەند کەسیش لەم نێوەدا برینیان هێنا. حەسەن خان و ئەمیرەکان کە لەم نێوەدا برینیان هێنا. حەسەن خان و ئەمیرەکان کە لەو ڕووداوە ئاگادارکران پیاوەکانیان گێڕاوە پاشەوە و شەڕ و کێشەیان ڕاوەستاند و لەنیو فرسەقی قەڵا لە جێگایەکی پەسیو هەڵیان دا و لەشکریان خست. کوردەکان چوونەوە دە قەڵاوە و هۆردووگایان وەبەر تۆپاندا. حەسەن خان دیسان پیاوی ناردەوە کن ئەمیرخان و هۆی ئەو ڕەفتارە نالەبارەی لێ پرسی. هەرچی لەو لایەوە قسەی خۆش و دۆستانە کران، ئەو پەڵپ و بیانووی سەیرتری هێنا گۆڕێ و دەرگای دۆستایەتی و ئاشنایەتیی داخست. تووشی هەر کەس لە قزڵباش و جەلالی بووبان - کە بۆ جێبەجێکردنی کاروباری پێویست لە هۆردوو وەدەرکەوتن - دەیانکوشت و ڕووتیان دەکردەوە. دووپاتەبوونەوەی ئەو کارانە دژمنایەتیی لەنێو هەردوولادا بەهێزتر دەکرد. محەمەد پاشاش بۆ تۆڵەئەستاندنەوە لە جەلالییەکان وەکار کەوت و پیاوەکانی پۆل پۆل تا بەرقەڵا دەچوون و لەو لاشەوە کوردەکان لێیان وەخۆ دەکەوتن و بەپیریانەوە دەهاتن و لە هەردوو لاوە چەند کەس دەکوژران و بریندار دەبوون. کار لە کار ترازا و شەڕ و کێشە گەرمتر بوو. هێندێک کەس لە جەلالییەکان - کە لە محەمەد پاشا دڕدۆنگ بوون - بە تایبەتی محەمەدبەگی برای (تەویل) و دەست و پێوەندەکانی بایان داوە و چوونە کن ئەمیرخان. بەو جۆرە نیزیکەی سێسەد چوارسەد کەس ڕەگەڵ ئەو کەوتن. ئەوەش پتر ئەوی لە خۆبایی کرد و محەمەد پاشاش بەجارێکی هەراسان و جاڕز بوو. ئاگری دژمنایەتی لەنێوان ئەواندا هەڵگیرسا. فەرمانی قەزا لەبارەی کوردە یاغییەکاندا درا و ملک و وڵاتەکەیان داگیرکرا. حەسەن خان بەناچاری لەوێندەرێ دامەزرا و چلۆنایەتیی بەپێچکی تەختی پادشا ڕاگەیاند. ئەو خەبەرە لە ئەردەوێل بەعەرز گەیشت. وەک لە سەرەتاوە نووسیمان عالی جەناب (ئیعتمادودەولە) حاتەم بەگی بۆ ئەولای ڕەوانە فەرموو کە بە چاوێکی ژیرانە تەماشای ئەم سنوورانە بکا و ئەگەر ئەمیرخان هیچ جێ متمانە بێ دڵی بداتەوە و بەکەرەمی شاهانە هیواداری بکا. جەلالییەکان لە دەوری قەڵای ئەو ڕاگوێزێ و وەک سالان جێ هەواریان بداتێ. پێنج هەزار تومەن زێڕی نەغد لە خەزینەی دارماڵی شاهانە وەربگرێ و بیدا بە جەلالییەکان. جا ئەگەر ئەمیرخان هەر دانەمەزرا و کەللەڕەقی و کەڵەوەکێشیی کرد، ئاوێکی بەو ئاگرە هەڵپرژێنێ و ملکەکانی

ئه‌و به‌ســـه‌ر جه‌لالییه‌کاندا دابه‌ش بکا، تا له‌وێ نیشـــته‌جێ بن و ئاســـه‌واریش له کورده لاساره‌کانی دیکه ببڕێ.

***

## باسی چوونه ورمێی (ئیعتمادوده‌وله) و گه‌مارۆدانی قه‌ڵای دمدم و کاره‌ساته‌کانی ده‌وری قه‌ڵا

کـــه عالی جه‌ناب (ئیعتمادوده‌وله) له ئه‌رده‌وێڵه‌وه هاته ته‌ورێز و ده‌گه‌ڵ پیربوداقخان حاکمی ته‌ورێز و به‌رخورداربه‌گی ئه‌نیســـی تۆپچی باشـــی و تفه‌نگچییه‌کانی ئیسفه‌هانی و خوراسانی و ته‌ورێزی و بافقی وه‌ڕێ که‌وت، دووهه‌زار که‌سیش جه‌لالی که له تالآنی قراچه ئه‌رده‌هانه‌وه ده‌گه‌ڕانه‌وه و ڕه‌گه‌ڵ که‌وتن.

له سه‌ڵماس، خان وه‌له‌د غازی به‌گی حاکمی ئه‌وێش وێڕای ئه‌ولیابه‌گی کوڕی سه‌یفه‌دینه کوێره‌ی حاکمی ئه‌نزه‌لێ و سۆما، ڕه‌گه‌ڵ له‌شکر که‌وتن. ڕۆژی سێشه‌مۆ ـ بیست و شه‌شی شه‌عبان ـ گه‌یشته هۆردووی ورمێ. حه‌سه‌ن خان و مه‌حه‌مه‌د پاشا و گه‌وره‌کانی به‌پیریه‌وه هاتن و به خزمه‌ت گه‌یشتن. هۆردوو له جێگای باش دامه‌زرا.

ڕۆژی پاشـــێ، جه‌نابی (ئیعتمادوده‌وله) پیاوێکی باوه‌ڕپێکـــراوی ده‌گه‌ڵ مه‌لیک ئاغا محه‌مه‌دی (ته‌ســـووجی) که ئاشـــنایه‌تیی کۆنی ده‌گه‌ڵ ئه‌میرخان هه‌بوو ـ نارده کن ئه‌و. پاش ئامۆژگاری دۆســـتانه و خێرخوایانه داوایان لێ کرد که مل بدا و له ده‌وروبه‌ری قه‌ڵا بـــۆ دیدار ئاماده بێ؛ تا ڕێگایه‌ک بۆ نه‌هێشـــتنی ناکۆکی و ناته‌بایی بدۆزنه‌وه و دڵی ئه‌و بێننه‌وه جێ. ئه‌میرخان ملی دا و له قه‌ڵا هاته‌خوار و جه‌نابی وه‌زیریش به‌چه‌ند که‌ســـه‌وه چوو. چاویان به‌یه‌کتر که‌وت و له هه‌موو بابه‌تێک دوان.

ئه‌میرخان به ئاس و په‌لاســـدا ده‌چوو و به‌فرۆفێڵ و درۆ و ده‌له‌ســـه، خۆی به‌غولام و نوکه‌ر نیشـــان ده‌دا و ده‌یگوت : «له ترســـی به‌ره‌ڵڵایی و ئاکاری ناله‌باری جه‌لالییه‌کان و دڕدۆنگی له به‌رگریکردنی حه‌سه‌ن خان، په‌نام بۆ ئه‌و چوار دیواره هێناوه. محه‌مه‌د پاشا به‌هیوای مڵک و ماشـــی منه و منی له خزمه‌ت خاوه‌ن شکۆ بۆسۆ و به‌دناو کرد. ئێستاش تکام ئه‌وه‌یه جه‌نابی وه‌زیر له خزمه‌ت خاوه‌ن شـــکۆ عوزرم بۆ بخوازێته‌وه. له‌و زســـتانه‌دا





لێم گەڕێن بۆخۆم نەبزووم. یەکێک لە کوڕەکانم لە خزمەت ئێوەدا دەنێرمە بارەگای بەرزی. جا کە بەهاری خاوەن شکۆ بەرەو کوێستان هات، بۆخۆشم دێم بن ڕێسمەی ماچ دەکەم.

جەنابـی (ئیعتیمادودەولە) دڵنیای کرد هەموو شـتی لێ قبووڵ دەکرێ بەو مەرجەی بەڵێنـی خۆی بێنێتە جێ. بڕیـار وا درا چونکە قەڵاداری ئەو دەنگی داوەتەوە، بۆ ئەوەی خەڵک بزانن ئەو یاغی و سـەرکێش نییە، بەخۆی و کەسـوکار و دەسـت و پێوەندییەوە بێتـە نێو قزڵباش و دەگـەڵ گەورە گەورەکان یەکتر ببینن و هیچ ترسـی نەبێ. ڕۆژێک ئەو میوانی (ئیعتمادودەولە) بێ و ڕۆژێک (ئیعتمادودەولە) میوانی ئەو بێ؛ تا دەنگوباسـی نێوانخۆشی و یەکەتیی ئەوان لەو سنوورە بڵاوبێتەوە. ئەمیرخان بەوە ڕازی بوو و قەراری دا سبەینێ بێتە خوارێ.

جەنابی وەزیر کۆڕێکی جوان و باشـی ڕازاندنەوە. چونکە ئەمیرخان نەیدەویست چاوی بەجەلالیان بکەوێ، بڕیار درا تاقە کەسێک لەو تیرە لەم کۆڕەدا بەشدار نەبێ. ئەوێ ڕۆژێ هەرچی چاوەنۆڕبوون؛ سـوراخی ئەمیرخان نەبوو. دیسان ئاغا محەمەدی (تەسووجی) یان ناردە کنی، بزانێ بۆچی دیار نییە؟ پاش وتووێژێکی زۆر بە ئاغا محەمەدی گوت: «قسەی ڕاسـت ئەوەیە ڕیش سپیەکانی برادۆسـت لە فێڵ و دەهۆی قزڵباش و جەلالی ئەمین نین و پێیان وایە (ئیعتمادودەولە) ـ کە پیاوێکی تاجیک و خاوەن قەڵەمە- پێشـی ئەوانی پێ ناگیرێ و ئێمەی پێ ناپارێزرێ. بەکورتی یەخەی خۆم لە دەس ئێوە نانێم، ئەگەر بەقازانجی خۆمی بزانم کوڕێکم بەدیاری و پێشکێشەوە دەنێرمە خزمەت خاوەن شکۆ و ئەگەر خەیاڵێکی دیکەیان لەسەردایە، ئەوە لەو حەوشە خزاوم و جگە لە قەڵاداری چارێکم نییە».

کورتی ببڕینەوە، لەبنەوەبڕی و ناپاکیی ئەو ئاشـکرا بوو. دیاریدا کە وتووێژەکانی بۆ فروفێـڵ و خۆبواردن بووە. ئەو قەڵا قایمە لە خۆی باییی کردووە و ڕێگای سـەرەڕۆیی و لاساریی گرتۆتەبەر. عالی جەناب (ئیعتمادودەولە) دەگەڵ ئەمیرەکان ڕاوێژیان کرد و هاتنە سـەر ئەوە، هێندە نەرمکێشی لە ڕاسـت ئەمیرخان بەهیچ بارێک دەگەڵ قازانجی دەوڵەت ناگونجێ. هاتنی وەزیری گەورە و باوەڕپێکراوی دەوڵەت بۆ بن قەڵای ئەو بەدەست بەتاڵی گەڕانەوەی زۆر شوورەییە و قبووڵ ناکرێ. هەموو خۆیان لە قەڵاگرتن هەڵکرد، خەبەریشیان بە پێچکی تەختی شا ڕاگەیاند...

لەپێشـدا بەڵێنم دابوو ئەم چیرۆکەتـان وەک چۆن ڕووی داوە بەتەواوی بۆ بگێڕمەوە؛ جا بۆیە بەپێویسـتم زانی کەمێکتان باسی قەڵای دمدم بۆ بکەم: ئەو قەڵایە لەسەر دوندی کێوێکی یەکجار بەرز دروسـت کراوە کە یەک پارچە بەردێکی درێژووکە و تەسـکە و وەک

پشـــتی گا هەڵکەوتووە. لای شـــیمال و جنووبی دۆڵی زۆر قووڵن، کە لەژێرڵا بۆ ســـەرێ، دەبێ بە پەیژەی خەیاڵ بۆی بچی. لەبەر بەرزی پێویستی بە شوورە نییە و شوورەیان بۆ نەکێشاوە. دوو لایەکەی دیکەیان ـ کە پانایی قەڵاکەیە و لای ڕۆژهەڵاتی پاڵی وەبەرزایی چیا داوە و شوورەیەکی زۆر تەواوی بۆ کێشراوە و بورجی بڵندی هەن و دەرگایەکی هەیە. لای ڕۆژئـــاوای ـ کە لە گۆڕایی نیزیکترە ـ شـــوورەیەکی یەکجـــار قایمی هەیە و دەرگایەکی بەرەو جنووب دەکرێتەوە. لە دەروازەڕا بۆ عەرزی، ڕێگایەک بەنێو بەردیدا هەیە کە ئەوندە تەنگە بەزەحمەت ســـوارێکی تێوە دەچێ. سەنگەر بردنە پێش لەلای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە نەبێ ناکرێ. لەلای ڕۆژهەڵات تیرهاوێژێکی بۆ دەرکی قەڵا بمێنێ، یەکپارچە بەردی سەخت و تەخـــت و ڕەقە. لەبنـــەوە بوودڕی بۆ لێ نادرێ، کە بەردەکە بڕاوە بورجێکی زۆر بەرز و قایمیان لێ دروســـت کردووە کە بۆ خۆی قەڵاییچەیەکە. تا ئەو بورجە بەردەســـت نەکرێ ســـەنگەربردنە بن قەڵا محاڵە. ئاوی قەڵا لە حەوزێکی گەورەڕا دابین دەکرێ کە بەباران پڕ دەبێ. بەڵام لەلای شـــیمال ـ لەنێو گەڵیدا ـ نیزیکی قـــەڵا کانییەک هەیە؛ ئاوی زۆر کەمە. ئەمیرخـــان خۆگەی بۆ کێشـــاوە و ڕێی بۆ کردۆتەوە و دەحەوزەکـــەی کردووە. ئاوی ئەو کانییە لە ئێوارەوە تا بەربەیانی حەوزەکەی پڕ دەکا. ئاوەکەی بەشی ڕۆژێکی قەڵانشینەکان دەکا. گومبەزێکیان لە ڕێکی عەرزی لەســـەر حەوزەکە هەڵخستووە کە لە پێش چاوان ون بێ، پێی دەڵێن (ســـولق). بۆ پاراستنی حەوزخانەکە بورجێکیان بەباڵ قەڵاوە هەڵچنیوە. لە لای جنووبەوە ســـەهۆڵدانێکیان سازکردووە کە لە زستاندا بەبەفر و سەهۆڵ داخندرێ. لە تەنیشـــت وێ حەوزێک هەیە؛ تا ئەو بەفر و سەهۆڵەی لە گەرمای هاویندا دەتوێتەوە و دەبێتە ئاو بەفیڕۆ نەڕوا و لەوێدا کۆبێتەوە و لە کاتی کەم ئاویدا بەکاربێ. ئەو سەهۆڵدانەش قەڵاییچەیەکی لەسەر دروست کراوە و پاسەوان و تفەنگچیی لەسەر داندراوە؛ بەویش دەڵێن (بوزڵق) یا (قارڵق)، ڕێگای وێش وەک ڕێگای (سولق) لە دەرەوەڕا ونە.

بەکورتی ئەم قەڵایە لە پێنج قەڵا پێک هاتووە. یەکیان ئەسڵی قەڵاکە، یەکیان قەڵای خوارێ، یەک (سولق) و یەک (بوزڵق) و ئەوی دیکەیان بورجی گەورەی دەرەوەی دەرگای ڕۆژهەڵات کە لە پێشـــدا باسمان کرد. هەر پێنج ئەوەندە بەرز و قایمن کە پەیکی تیژڕۆی بیر و مێروولەی خەیاڵ ڕێیان تێ نابا و وێیان هەڵناگەڕێ.

جەنابی وەزیر بەلێزانی و بیرتیژی و وشیاریی خۆیەوە کەمەندی زیبک و زاکوونی هاوێشتە کۆنگرەی داگیرکردنی ئەو قەڵا ئەســـتەمە. خەریکی سازکردنی ئامرازی پێویستی قەڵاگیری بوو، لەو کاتەدا پێنجســـەد تفەنگچی لە لەشـــکری تایبەتی خاوەن شـــکۆ بەسەرکردەییی (ســـەفەرقولی) بەگی یوزباشـــی و قۆڕچییەکانی (چگنی) بۆ کۆمەک گەیشتنە جێ. گەنج

عەلی خانیش کە لە تەورێز بوو- بەلەشـــکرێکی پەرداخەوە هات. حەسەن خان و ئەمیرانی هاورێی ئەو و تفەنگچییەکانی ئیســـفەهانی و میرفەتاحی ســـەرکردەیان بۆ بەری ڕۆژهەڵات داندران و بەری ڕۆژئاواش بە پیربوداقخان ئەســـپێردرا. مرادخانی سوڵتان چینی و خەلیل ســـوڵتان و محەمەدتەقی بەگ بۆ بەرامبەر قەڵایچەی بوزڵف نێردران و پاراستنی دەروازەی ئەولا بە گەنج عەلی خان ئەســـپێردرا. تفەنگچی مازندەرانی دەگەڵ ســـەفەر قولی بەگ و قۆرچی چگنی، بۆ بەری شیمال تاعین کران. بەرخورداربەگی ئەنیس و تۆپچییەکان بەدوو تۆپی گەورە و یەکی (بالمیزە)ەوە دامەزران و قبان سوڵتان بێگدلی بە سەرکردەی تۆپخانە داندرا. جارێ تۆپێکی بچووکیان لە دەریای ڕەشەوە بەکەشتی هێنا و لە سەنگەری حەسەن خان دابەســـترا. محەمەد پادشا تووشی نەخۆشـــیی دڵ هات؛ خزمەتیکی پێ نەسپێردرا. بەڵام جەلالییەکان بەسەر بەشەکانی لەشکردا دابەش کران. پێنج هەزار تومەن زێڕی شایی عەباســـی - کە بۆ باربووی جەلالییەکان هێنرابوو- بەســـەریاندا بەش کرا. بۆ هەر هۆزێکیان جێ هەوارێک لە پێش چاو گیرا. لەشکر خێوەتی هەڵدا و هەر دەستەیەک چووە سەر کاری خۆی. ئەمیرخان خەبەردار بوو و ترسا. زۆرجار پیاوی نارد و خەریک بوو بەدرۆو دەلەسە ئەو کیشەی لە کۆڵ بکاتەوە؛ بەڵام چونکە فرۆفێڵەکانی ئاشکرا ببوون، گوێ نەدرا قسەکانی. بەناچاری ئەویش خەریکی بەرگری و قەڵاداری بوو. چەند کەس لە ئەمیرزادەکانی برادۆست لە قەڵا دەرپەڕین و هاتنە ڕیزی شـــا پەرســـتانەوە. هەرکەس لە قەڵاوە دەهات دەیگوت: قەڵانشـــینەکان لەبەر کەم ئاوی ســـەخڵەتن. چونکە لەبەر وشکە ساڵی و کەم بارانی ئاوی حەوزەکـــە زۆری لە کەمیی داوە و ئەوی ماوەش بۆگەن بووە و دیدەن بەچوار پێیان. ئاوی خواردنەوە بریتیە لە ئاوی سولٚق، ئەویش تاس تاس دەدرێ بە پیاوماقووڵان ئەگەر سولٚق داگیر بکرێ جگە لە خۆبەدەستەوەدان چارێکیان نییە. ئەویش بێتو لە بنەوەڕا بوودڕی بۆ لـــێ بدرێ، گێڕانی زۆر گران نییە. ئەو تەگبیرە ئەقڵ دەیگرت و ئەگەر بەو جۆرە ناچاریان کردبان خۆبەدەســـتەوە بدەن، زۆر لە شەڕ و خوێنڕێژی باشتر بوو. هەموو کۆششی خۆیان بۆ ئەو کارە تەرخان کرد. وەســـتا کەرێزکەنەکان خەریکـــی بوودڕلێدان بوون. تا عەرزەکە خاک و نەرم بوو بەهاســـانی چوونە پێش. کە گەیشـــتنە بەردی، سەوەیان چنین و شەوانە لە ڕێگای دوورەوە گڵیان دەهێنا و ســـەوەکانیان پڕ دەکرد و بەڕێز دایاندەنان و کۆڵانێکی سەرداپۆشـــراویان دروست دەکرد. حەســـەن خان لە لای ڕۆژهەڵاتەوە ئاوا دەچووە پێش. پیربوداقخانیش لەلای ڕۆژئاواڕا ســـەر بەرەو ژوور دەچووە پێش و هەر ئەو کارەی دەکرد. کوردەکان لە بەربەیانەوە دەڕژانە سەنگەرەوە و شەڕی باشیان دەکرد و دەم بەدەم هاڕەی تیری تیژپەڕی ئەوان پەیامی ئەجەلی بەگوێی غازییەکان ڕادەگەیاند و گوللەی تفەنگ وەک

ته‌رزه به‌سه‌ر ئازاکاندا ده‌باری. دوو سێ جار به‌ڕۆژی ڕووناک خۆیان ده‌سه‌نگه‌ران هاویشت و شـــه‌ڕی به‌سام و گرانیان کرد. غازییه‌کان زۆر سه‌یر، خۆیان ڕاده‌گرت و توندیان به‌رگری ده‌کـــرد. هه‌موو جارێ له هه‌ردوو لایان زۆر ده‌کوژران و بریندار ده‌کران. جارێکی په‌لاماری مه‌ته‌رێزی نیعمه‌تولْلا سولْتانی سۆفیان‌دا؛ سۆفییه‌کان ئازایه‌تی و مه‌ردایه‌تییه‌کی سه‌یریان نیشـــان‌دا. پێنج که‌س له زاره‌کـــی مه‌ته‌رێزه‌که یه‌ک له دوای یه‌ک کوژران و نه‌یانهێشـــت کورده‌کان خۆی تێ باوێن. هه‌ر که‌س ده‌کوژرا گیانبازێکی دیکه جێی دگرته‌وه. له‌و ڕۆژه‌دا هه‌موویان پیاوه‌تی و ئازایه‌تییان نیشان‌دا. له‌و شه‌ڕه‌دا حه‌وت هه‌شت که‌س غازی کوژران و پازدێک بریندار بوون. کورده‌کانیش تا بیست که‌سیان لێ کوژرا و سی چل که‌سیان برینی هێنا و چییان بۆ نه‌کرا و چوونه‌وه ده قه‌لاْوه. له ســـه‌نگه‌ری حه‌ســـه‌ن خانیڕا ئه‌و تۆپه‌ی به‌ره‌و بورجه‌که. دابه‌ســـترا بوو، پاش بیســـت ڕۆژ ـ به‌لْکه مانگێک ـ تۆپباران چرژێکی له بورجه‌که کردبوو؛ به‌لاْم هێشتا وا نه‌بوو پێدا وه‌سه‌ر بکه‌وێ. حه‌سه‌ن خان هه‌لْه‌شه‌یی کرد و سه‌ربه‌خۆ بێ ئه‌وه‌ی پرس به (ئیعتمادوده‌وله) بکا، ڕۆژێک هێرشی برده سه‌ر بورجه‌که، دوازده لاوی هه‌لْکه‌وتوو ئازایانه خۆیان گه‌یانده ســـه‌ر بورج. چه‌ند که‌ســـیان ئه‌نگووان و هه‌لْدێران. ئه‌وانی دیکه چاوترســـاو بوون و که‌س نه‌وێرا هه‌لْکشـــێ و خۆیان هه‌لْداشـــت. دووسه‌د که‌س که گه‌یبوونه بن بورجه‌که، له‌وێ دامه‌زران. تا نیوه‌شه‌و شه‌ڕ بوو و خه‌ریکی کۆلْینی دیواری بورج بوون.

له‌و کاته‌دا کورده‌کان له‌پڕ له‌پشـــته‌وه په‌لاماری غازییه‌کانیان دا و بووبه شـــه‌ڕه شیر. له‌ســـه‌ر بورجه‌وه‌ش گولله‌ی تفه‌نگ داباری، له قه‌لاْشـــه‌وه ده‌ســـرێژ ده‌کرا و کۆمه‌ک بۆ غازییه‌کان نه‌ده‌نێردرا. ناچار غازییه‌کانیان ده‌ســـتیان له شـــه‌ڕ هه‌لْگرت و گه‌ڕانه‌وه. لاوی ئازا و هه‌لْکه‌وتوو له‌و شـــه‌ڕه‌دا کوژران و بریندار بوون. حه‌ســـه‌ن خان له به‌ر ئازایه‌تییی شێتانه‌ی خۆی، په‌شیوان و شه‌رمه‌زار بۆوه. کارێک بوو کرابوو؛ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی جه‌نابی وه‌زیر له دوای چووان نه‌چوو و دلْخۆشـــیی داوه. له شه‌ڕێدا زۆر کاره‌ساتی وا ده‌قه‌ومێن. گرتنی قه‌لاْیان بێ کاره‌ساتی وا نابێ.

پاش ماوه‌یه‌ک که که‌رێزه‌که‌نه‌کان کاریان کرد، له بن عه‌رزه‌وه نه‌یانتوانی سه‌رچاوه‌که بدۆزنه‌وه. ســـه‌ریان لێ شێوا بوو و نه‌یانده‌زانی بوودڕه‌که به‌ره‌و کوێ لێ ده‌ن. به ناچاری هه‌رچه‌ند هه‌نگاوێکی ده‌چوونه پێش نیشـــانه‌یه‌کیان ده‌چه‌قاند؛ که دیاربێ بوودڕ بۆ کوێ ده‌چێ. به‌و نیشـــانانه کورده‌کان له که‌ینوبه‌ینه‌که گه‌یشـــتن. له‌به‌ر بێ ئاوی وه‌ک ماسی که‌وتبوونه تۆڕ و هه‌لْبه‌زهه‌لْبه‌زیان ده‌کرد. هه‌موو شه‌وێ هێرشیان ده‌هێنا سه‌ر بوودڕه‌که و ده‌گه‌لْ تفه‌نگچییه‌کانی مازه‌نده‌رانی و ســـه‌فه‌رقولی به‌گ و قۆرچی چگنی که پاسه‌وانی





بوودڕ بوون بەشەڕ دەهاتن. شەڕی زۆر گەورە دەکران و شەوبوێریان نەبوو. کەڕێزەکەنەکان دەرفەتی کارکردنیان نەبوو. سێ مانگەی ڕەمەزان و شەشـەکان و نێوجێژنان بەو جۆرە شـەڕ و کێشـە درێژەی هەبوو. دوو سێ جار خەڵکێکی زۆری شەڕنەکەر و ژن و منداڵیان لە قەڵاوە وەدەرنا کە ژمارەیان نیزیک بەهەزار کەس دەبوو.

ئەو خەڵکە شـڵەژاوی خۆیان دەگەیاندە ئاو. گەمارۆدراوەکان ئەو کانیلکەیان بە ئاوی حەیات دەزانی و فیداکارانە بۆ پاراستنی سوڵق تێ دەکۆشان. لەولایشەوە ئەوپەڕی هەوڵ بۆ دۆزینەوەی سەرچاوە درا و بێ سوود بوو. چونکە ئاوی حەیات ون بوو. جەنابی وەزیر تەگبیرێکی دیکەی کرد. بڕیاریان دا کە بەسـەر عەرزیدا بۆی بچن و سـەربانی گومبەزی سـوڵق کون بکەن و تۆپی گەورە لە دیواری پەیژە بەرەو داڵانی ئاو دابەسـتن و ئاگری بـدەن، کە کوردەکان نەوێرن هاتوچۆی کانییەکە بکـەن. بوودڕەکەش بەبن عەرزیدا هەر لێ بدەن. قەرار درا کە میر سـۆفی و میر پازووکی و میر موقەددەم لە سـەنگەرەکانیان بێنەدەر و سەنگەر بگوێزنەوە بۆ سەر سوڵق. حەسەن خان پیاوی کارامەی لە جێی خۆی دانان و بۆ خۆی سەرپەرشـتیی ئەو ئەمیرانەی وەستۆ گرت. پیربوداقخانیش سەنگەرێکی بەرەو سـوڵق دامەزراند. جەنابی (ئیعتیمادودەولە) ئەوەندەی ئەو قەڵا گرتنە بەلاوە گرنگ بوو کە بۆخۆی هاتە سـەر تۆپخانە. بیست و یەک ڕۆژ لەسەر تۆپخانەی بوو. لە بەیانەوە هەتا ئێوارە تۆپ هاویشـتن و پاراستنی سەنگەرەکان لەژێر چاوەدێریی خۆیدا بوو. هەموو شـەوێ هەر ئەرکێکی بەهەر ئەمیرێک ئەسـپێردرابایە، بەیانی لێی دەپرسـراوە و ئەگەر تەنەخی تێدا کردبا، سـەرکۆنە دەکرا. کوردەکان زۆر هەراسـان بوون. کە شەو ڕادەشکا لاوی تەیار و پەرداخ و چەکدار دەهاتنە دەرێ و لە دەورەی سوڵق شەڕ دەست پێ دەکرا و ئازایەتییان نیشان دەدا. لەم لایشەوە مەشخەڵ هەڵدەگیرسان و لەبەر ڕووناکیی مشخەلان، تفەنگچییەکان بەربەرکانیان دەکرد. هەموو شـەوێ ژمارەیەک لە هەردوو لایان دەکوژران و بریندار دەکران. لە لاپاڵی چیا، ئەشکەوتێک هەبوو کە بەسەر سوڵقدا دەیڕوانی. کوردەکان لەبن ئەشـکەوتەکەوە بوودڕێکیان لێ دەدا کە لە ئەشـکەوت بێنەدەر و لای سـەروو لە غازییەکان ببڕنەوە و دەریان پەڕێنن و بۆ هەمیشـە بەرگری لەو کارە بکەن. پاش ئەوەی ئەو خەبەرە بە ئەمیرەکان گەیشت، وایان بەباش زانی کە پێشدەستی بکەن و ئەشکەوتەکە بگرن، تا لە داگیرکردنی سـوڵقدا دەسـتیان بکرێتەوە. نزیکەی سی لاوی لەخۆبووردوو و هەڵکەوتوو ئەو ئەرکەیان وەستۆی خۆیان گرت. دەگەڵ گزینگی هەتاو ئەو لاوە ئازایانە لە زارکی سـەنگەرەوە بەبەر قەڵادا بەغار ڕۆیشتن و خۆیان دە ئەشکەوت هاویشت. لە قەڵاوە زۆریان تفەنگ پێوەنان، بەڵام لە یەک کەس زیاتریان لێ نەکوژرا.

کە شەو بەرگی عەباسییانی دەبەر کرد، ئەمیرە گەورەکان تا نیوەشەو لەسەر سەنگەرەکانی خۆیان ڕاوەستان و پاسەوانیان کرد. پاش نیوەشەو دوو دەستە لە کوردەکان هاتنە دەرێ، قۆڵێک ڕوویان دەسـەنگەرەکان کرد و شـەڕیان هەڵایساند و خەڵکیان بەخۆیانەوە خەریک کرد و قۆڵێکیش لەبن ئەشـکەوتەکەوە سـەریان دەرێنا و دەگەڵ ئەوانەی لە ئەشـکەوتدا بوون، شەڕیان دەست پێ کرد، ئەو لاوە ئازایانە چاک وەدەست هاتن و تا گوللەیەکیان پێ ما و تیرێکیان لە تیرداندا بوو، شـەڕیان کرد و ئەشکەوتیان بەدەستەوە نەدا. پاش ئەوەی چییـان پێ نەما و دە کەسیشـیان لێ کوژرا و چی وای نەمابـوو کوردەکان خۆیان دەباڵ باوێن و ئاسەواریان لێ ببڕن، ئەو بیست کەسەی مابوون دەستیان دا شیران و لە ئەشکەوت دەرپەڕین و بەنێو کوردەکان وەربوون، تا بەقوونەشـەڕ بـڕۆن و ئەوی ئەجەلی وەدەرنگی کەوتبێ بەزیندوویی بگاتە سەنگەر. هەشتی بریندارییان هەرچۆنێک بوو گەیشتنەوە و ئەوانی دیکە ڕێگای نەمانیان گرتە پێش. کوردەکان دوو بریندارییان کە یەکیان تفەنگچێکی و ئەوی دیکەیـان پازووکی بوو بە زیندوویـی گرت و بردیاننە قەڵایە. ئەمیرخان لە ئازایەتیی ئەوان سـەری سووڕمابوو و نەیهێشتبوو بیانکوژن و دەرمانی کردبوون و پاش ئەوەی برینەکانیان ساڕێژ ببۆوە ئیزنی دابوون بێنەوە دەرێ.

بەکورتـی، لەبەرەبـەری بەیاندا ئەو شـەڕە دوایی هات و کەلاکی کـوژراوەکان کە لەبەر زارک ئەشـکەوت کەوتبوون دیاربوو. غازییەکان کەمێکیان سام ڕێ نیشت. جەنابی (ئیعتیمادودەولە) دڵتەنگ بوو و هەڕەشـەی لە ئەمیرەکانی موقەدەم و سۆفی و پازووکی فەرموو.

بەڵام لە شەڕێدا ئەوانە هەر دەبن و ئەویش بۆ ئەوەی دژمن دڵخۆش نەبن، زیاتر لە ڕۆژان خەریکی کاروباری شەڕێ بوو. هەر ئەوێ ڕۆژێ چل غازی (ئیستاجلوو) کە لەگەڵ حەسەن خان بوون— ڕقیان هەستا و غیرەتیان بزووت و خۆیان بۆ گرتنەوەی ئەشکەوت ئامادە کرد. (ئیعتیمادودەولە) لە ئیزندانیان دوودڵ و لە ڕووداوی دوێشـەو نیگەران بوو. حەسەن خان زۆری هەوڵ دا و گوتی: ئەمشەو بۆخۆم ئاگام لەوانە دەبێ و بە سێسەد کەسەوە بەرگریی لە هێرشی کوردەکان دەکەم. جەنابی وەزیر لەیەک خۆش و لایەک ناخۆش ڕەزای دا و بە قبان سوڵتانی بیگدلی و ئیمام قولی سوڵتانی ئاجرلووی ئەسپارد کە پشتی حەسەن خانی لەو شەوەدا بەهەموو هێزی خۆیانەوە بگرن. لەسەر داوای ئەمیرەکان، دە کەسی دیکەیان ڕەگەڵ خسـتن و بەتێکڕایی بوونە پەنجا کەس. بەتەیاری و چەکداری، تێشوو و پێویستی چەند ڕۆژیان هەڵگرت و لینگیان دا بەرەو ئەشکەوت. کوردەکان لە ئازایی و خۆبەختکردنی ئەوان سـەریان سووڕما. کە شـەو داهات زووتر لە شەوێ دی هاتنەدەرێ و شەڕ قەوما و




شــەڕێکی یەکجار توند و گەورە. حەســەن خان و ئەمیران لە دەرەوە و کوڕەکۆڕەی نێو ئەشکەوت لە ژوورەوە بەگژ کوردەکاندا هاتنەوە و تا بەرەبەری بەیان شەڕ بوو و کوردەکان هەرچەندی تێکۆشان چییان بۆ بەچی نەکرا و بە شەڵەژاوی گەڕانەوە و غازییەکان پیاوانە ئەشــکەوتیان داگیرکرد. هەموو شــەوێ چەند کوردیان ـ کە تا بەیانی ئاویان دەکێشاوە ـ بە تۆپ و تفەنگ دەکوشــت و بریندار دەکرد. تا وردە ووردە ســەنگەر هەڵکشان و گەینە ســەربانی حەوزی سوڵق. گومبەزی حەوزخانەیان کون کرد و لەوێڕا ڕێگای ئاویان دیتەوە و زانییان سەرچاوەکەی لە کوێیە. کوردەکان خەریکی دۆزینەوەی چارەبوون. هەموو ڕۆژێ لەنێو بوودڕەکەوە شەڕیان دەکرد و بەرگرییان لەکاری ئەو کەسانە دەکرد کە بوودڕیان لێ دەدا. ئەمیــرە گەورەکان ڕۆژێ هــەژدەی مانگی قوربان جەنگی نیوەڕۆیە، کایەکی زۆریان دەکونی ســولق کرد و ئاگریان تێ بەردا. پاســەوانی حەوزخانە خۆیان لەبەر ئەو قانگدانە ڕانەگــرت و هەڵاتنەوە بۆ قەڵا. غازییەکان خۆیان فڕێدا خوارێ و ســوڵقیان داگیرکرد و ڕێگای ئاویان باش بەخشــت و قوڕ گرت، ئەوێ ڕۆژێ هەرایەکی گەورە لەبن قەڵا دەســت پێکرا؛ کوردەکان زۆر تێکۆشان بەرگری لەو کارە بکەن. بەڵام دەرۆست نەهاتن و هیچیان بۆ نەکرا. پاســەوانی سولق بە تفەنگچییەکانی مازەندەرانی ئەسپێردرا و ئەمیرە گەورەکان هەریەکە گەڕانەوە بۆ ســەنگەرەکانی پێشــووی خۆیان. جەنابی (ئیعتیمادودەولە)ش لە تۆپخانەڕا گەڕاوە بۆ مەزڵی خۆی.

ئەمیرخــان و گــەورە گەورەکان تا دە پازدە ڕۆژ بەئــاوی کەمی بوزلق و خەڵکەکەش بەئــاوی بۆگەنی حەوزی گەورە قەناعتیــان کرد و خەریکی قەڵاداریی خۆیان بوون چونکە داگیرکردنی سولق لە زستانەوە تا بەهاری کێشا. وەختی بارانێ هات و هەورەکان ئەمساڵ بەپێچەوانەی ســاڵی ڕابردوو وەک فیلانی مەست کەوتنە شریخ و هۆڕ و بەڕوحمی خوڵای کــە کەس نازانێ چەنــد زۆرە، نیزیکەی مانگێکی بێ نێوبڕ بــاران باری و لێی نەکردەوە و قەڵانشــینەکانی لە ئاو بێ نیاز کرد. چونکە تەگبیر تەقدیری پێ هەڵناوەشــێتەوە، ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشــانەی لەو سێ مانگەدا بۆ داگیرکردنی سولق ئەنجام درا بەفیڕۆچوو قەڵانشینەکان پتر لە جاران خەریکی قەڵاداری بوون.[1]

---

١ ـ ئەم کارەساتە تا ئێرە لە ساڵی بیست و سێیەمی پادشایەتیی شا عەباس سەفەویدا کە ڕێککەوتی ساڵی ١٠١٨ـ١٧ کۆچییە ڕووی داوە و لە لاپەڕەی ٧١٩ تا ٨٠١ کتێبی عالم ئارای عەبباسی نووسینی ئەسکەندەربەگی تورکمان، چاپی گوڵشەن، تاران، ١٣٥٠ نووسراوە. دوایەکەی دەکەوێتە ساڵی بیست و چوارەمی پادشایەتی شا عەباس. هێمن



## باسی داگیرکردنی
## قەڵای دمدم و کوژرانی ئەمیرخان و دەست پێوەندەکانی

هەروەها کارەســاتەکانی دیکە، کە هێندێکیان لە سەردەمی ژیانی (ئیعتیمادودەوله)دا و هێندێک پاش ئەو ڕوویان داوە.

چونکــە لەبــەر بارانی زۆر وەکو گوتمان ســولّق ئەوتۆی نەبوو، بڕیــاردرا کە هەموو ئامیــرەکان ســەنگەری خۆیان بەڕێگای کووچەی بەســەوەتاندا بەرنــە پێش و قەڵاکەی بەیارمەتیی خودا و هێزی باسک بگرن. جەنابی وەزیر لە مەزڵی خۆی باری کرد و بۆ لای سەنگەری حەسەن خان هات. سەنگەرێکی بەسەرکردەییی (سەفەرقولی) بەگ و پیاوەکانی تایبەتی شا کردە سەنگەری خۆی و لوێدا دامەزرا. لە هەموو لاوە شەو و ڕۆژ تێ دەکۆشان و شــتوومەک و کەرەستەیان دەکێشاوە. سەوە چنەکان، سەویان دەچنین و هێندێک گڵ و قوڕیان لە ڕێگای دوورەوە دێنا تا ســەوەکانی پڕ بکەن. ئاســنیان بەسەر تەختەیەکی ئەستووردا کێشابوو و گەردوونەیەکیان سازکردبوو کە کارگەرەکان لە پشت ئەوی کار بکەن و لــە گوللەی زەبرزەن و تفەنگ بپارێزرێن. بەو جۆرە شــەوانە کاریان دەکرد و گەزبەگەز دەچوونە پێش، دەگەڵ ئەوەشدا هیچ شەوێک نەبوو کە دوو سێ کەس نەنگێودرێن و لەنێو نەچن. دەپێشدا حەســەن خان و ئەلیاس خەلیفەی قەرەداغللو و میرفەتاحی مین باشی، تفەنگچییەکانی ئیســفەهانیان بەو جۆرەی گوتمان بردنە پێش و ســەنگەریان گەیاندە بن بورجی گەورەی دەرەوەی قەڵا و تەنیشت دیواری. قەرابەگ ناوێک کە وەکیلی ئەمیرخانی بوو، پاســەوانی لەو بورجەی دەکرد. کەرێزکەنەکان چەند ڕۆژ کاریان کرد و ئەو دارانەیان ئاگــر تێ بــەردا کە بۆ قایمی دەنێو چینەی دیواریان کێشــابوون. ئەو دارانە ســووتان، دیوارەکە هەرەسی هێنا و زگی دا و نیوەڕۆیەک ـ کە کارگەرەکان خەریکی نانخواردن بوون ـ لایەکی بورجەکە بزووت و تێک ڕووخا و دەستەیەک لە پاسەوانەکان دەگەڵ خاک و خۆڵ بۆ نێو دۆڵەکە جاڵەبوونەوە.

کە ئەوە ڕووی دا، جەنابی وەزیر بە حەسەن خانی دەستوور فەرموو کە ئیتر چ وەختی ڕاوەستانە، هێرش بۆ بورجەکە بەرن. حەسەن خان فەرمانی هێرشی دا. هەوەڵ کەسێکی پێی لەســەر بورجەکە دانا و تفەنگی لە قەرابەگ دا و ســەری بڕی و هێنایەوە، پاڵەوان مەحەمەد ناوێک بوو لە تفەنگچییەکانی خۆزانی ئیسفەهانی. لەپاش ئەو دوازدە کەسی دیکە




وەســـەر بورجەکە کەوتن و حەوت هەشـــت پاسەوانیان لە ســـەرێ سەر بڕی. خوشکەزای ئەمیرخان ـ کە لاوێکی زۆر جوان چاک و شەنگ و شۆخ بوو ـ هەڵدێرا و لە خوارێ دەگەڵ گێلەپیاوێکی تیرەی چینی ـ کە لە پاسەوانان بوو ـ تێک ئاڵقان و دەست بەیەخەبوون. هەر دەسبەجێ کوشتی و سەری بڕی و هێنایەوە جەنابی (ئیعتیمادودەولە) زۆری پێ ناخۆش بوو و گەلێک بەسەر کابرایدا هات و ئەو خەڵاتەی بەهیوای بوو نەیدرایە.

بیبڕینەوە، بودجەکە داگیرکرا و پاســـەوانەکانی زیاتریان کوژران و چەند کەسیشـــیان لەبن دار و بەرد و گڵدا خنکان. نووسەری ئەم پیتانە ـ کە لەو هاتوچۆیەدا ڕەفیقی جەنابی وەزیر بوو ـ ئەم چوار نیوە شیعرەی بەدڵدا هات و نووسی:

این بـرج کـه یافتـی بفتحـش تاییـد
از مطلـع آن برآمـدی چـون خورشـید
کوتـاه بُـدی ز رفعتـش کیـوان را
از دامـن خاکریـز او دسـت امیـد

یانی:

ئەو بوورجە کە بۆ گرتنی دەستت گیرا
لە ئاسۆی ئەوی وەک هەتاو هاتیەدەر
ئەوەندە بەرز بوو کە دەستی هیوای کەیوان
کورت بوو بۆ ئەوەی بگاتە توربە ڕێژی

کاتێک بورجی گۆڕین ـ کە وەک بەردی سەر ڕێگای غازیان بوو ـ گیرا، کار هاسان بوو. لە ماوەی دە ڕۆژدا ســـەنگەرکانیان گەیانـــدە دەورووبەری قەڵا و تۆپچییەکانیان دامەزراند. تۆپێکی گەورەی بالیمزیان بەرامبەر بە قەڵای سەرێ و تۆپێکی دیکەیان بەرامبەر بەقەڵای خوارێ لە ســـەنگەری پیربوداقخاندا دامەزراند و دەســـتیان بە گوللەباران کرد و تەنگیان بەقەڵانشـــینەکان هەڵچنی. ئەمیرخان سەری لێ شیوا و کوردەکان هێوابڕاو بوون، چونکە گەلێک لە خزم و کەسوکارەکانیان لەو شڕانەدا کوژران. قەڵانشینەکان دەستیان بەهاتنەدەر کرد. هەموو ڕۆژێ دە کەس و بیســـت کەس لە کوردەکان و لە جەلالییەکان خۆیان دەرباز

دەکرد و پەنایان بۆ سەنگەرەکان دەهێنا. لەسەر فەرمانی پیرۆز پەنا دەدران و خەڵات دەکران و دڵخۆشی دەدرانەوە.

بەکورتی کاری قەڵا گەیشتە جێگایەک کە ئەوڕۆ سبەی بگیرێ. کە ڕووداوی مەرگی (اعتماد الدوله) ڕووی دا[١]. ئەو ڕووداوە هەموو کەسی پەرێشان کرد و کاری قەڵای ـ کە نیزیک بە تەواو بوون بوو ـ کەمێک وەدواخست. قەڵانشینەکان خۆڕاگرتر بوون. تا محەمەد بەگی شاملوو ـ کە کرابووە سەردار ـ گەیشتە جێ. ئەمیرەکانی پێشوو تازە هاتوو بەوپەڕی لەخۆبووردنەوە خەریکی گرتنی قەڵا بوون. بەماوەیەکی کورت سەنگەرەکان لە خوارەوە گەیشتنە بن دیوار و بورجەکان بەزەبری تۆپە بەردوەشێنەکان وەلەرزین کەوتن و درز و کەلێنیان لێ پەیدابوو. لەلای سەرەوە، ئازایانی قەڵاشکێن هێرشیان هێنا و دوو سێ بورجیان داگیرکرد. لەلای سەنگەری پیربوداقخانیشەوە غازییەکانی تورکمان پەلاماریان بۆ بورجەکانی خوارەوە ـ کە کوڕە گەورەی ئەمیرخان فەرماندەی بوو، برد و پێی هەڵچوون و وەسەرکەوتن. پاسەوانەکان خۆیان بۆ ڕانەگیرا؛ دەستیان لێ هەڵگرت و ڕایان کرد بۆ قەڵای سەرەوە. حەوشەکە کراوە و لەوێڕا خەریکی هەڵکەندنی دیواری نێوان دوو قەڵاکان بوون. پاسەوانەکانی بوزڵق پیاویان ناردە خزمەت ئەمیرەکان و ئامانیان خواست و تەسلیم بوون و بوزڵقیان بەدەستەوە دا. سێ قەڵای قایم گیران؛ کوردەکان لە فرە کەوتن، هەموو ڕوویان لەماڵی ئەمیرخان کرد کە ئەویشیان کردبووە نارین قەڵا. غازییەکان بێ ترس خۆیان دەقەڵا هاویشت. جگە لە ماڵە ئەمیرخان، هەموو کەلێن و قوژبنی قەڵاکەیان داگیرکرد ئەمیرخان کە تەماشای کرد لە هەموو لاوە بەڵا دەورەی گرتووە، کوردەکانی لە شەڕکردن مەنع کرد و ناردیە کن محەمەدخان و تکای کرد کە بۆخۆی دەگەڵ غازییەکانی شاملوو بێتە نێوقەڵا؛ چونکە لە حەسەن خان دەترسم و زۆرمان خوێن لە یەکتر ڕشتووە ئەو ئاگاداریمان لێ بکا خۆم و کوڕەکانم و خێزان و دەست و پێوەندەکانم بەسەلامەتی بنێرێتە بەر بارەگای بەرزی شا.

---

١ ـ چلۆنایەتیی ڕووداوەکە ئەوەیە: ڕۆژێکی دەگەڵ ئەمیرەکان لە مەزڵی (گەنج عەلی خان) بوون. ئێوارێ کە هاتنەوە سەرێکی تۆپخانەیان دا، سەری شەوێ هاتنە دیوەخان. پاش بەجێ گەیاندنی نوێژان، تا دوو بەتڵ شەو ڕابرد وەک جاری جاران زۆر بە ڕووگەشی و ڕووخۆشی دەگەڵ خەڵکی مەجلیس قسەی کرد. کاتی خەو چووە جێی نوستن. نووسەری ئەم پیتانە هێشتا نەگەیبوومەوە مەزڵی خۆم کە بە دووامدا هاتن؛ منی هەژار سەرم سوڕما کە دەبێ هۆی بانگکردنم چ بێ؟ یەکی دیکە گەیشتێ و گوتی: جەنابی میرزای بەمەرگی موفاجات تەواو بوو. هەموو تووشی سەرسوڕمان و خەم و پەژارە بوون. خەبەرەکەمان بەخاوەن شکۆ ڕاگەیاند. هەر ئەو شەوی تەرمەکەمان لەبن قەڵا هێنا خوارێ و شووشتمان و کفنمان کرد. ئێوارەی ئەوێ ڕۆژێ ناردمانەوە تەورێزێ. ئەمیرەکان ناردیان لە دووی ئیمام قولی خان کە بەلەشکرێکی تەیارەوە لە سڵماس بوو.




لەو کاتەدا خـــان ئەبدالّی موکری بەچەند کەس لە نیزیکانی خۆیەوە هاتەدەر. ئەویان ناردە قۆناغی ئەلیاس خەڵیفەی قەراداغللو، کە میوانی ئەو بێ. لەپاش ئەو محەمەد بەگی برای (تەویل) بەو جەلالییانەوە کە لە قەڵادا بوون دەرکەوت. پاشان محەمەد بەگ لەسەر ویســتی ئەمیرخان چووە نێو قەڵا. ئەمیرخان و کوڕە گەورەکەی و نیزیکەی ســەد کەس لە عەشــیرەتی برادۆست، هەموو زرێپۆش و تفەنگ بەدەست و چەکدار، بەهەموو ئەسپابی شــەڕەوە لە ماڵێ هاتنەدەر؛ دەگەڵ محەمەد بەگ یەکتریان دی و دووسەد کەسێکیش لە قەڵادا مانەوە.

محەمەد بەگ پاسەوانی بەدیاریەوە دانان کە کەس وێیان نەڕژێ و ڕوو لە ماڵیان نەکا. ئەمیرخان و دەست و پێوەندەکانی هێنا ماڵی خۆی خێوەت و بارگایەکی گەورەی تایبەتی بۆ هەڵدان. ناردی لە دووی حەســەن خان و ئەمیرەکانی‌تر کە بێن ئەمیرخان ببینن. جا ئەودەمی هەرچی قازانجی دەوڵەتی تێدابوو ئەوەی بکەن. بۆخۆشی وێڕای براکانی دانیشت و بەگەرمی میوانداریی لێ کردن. کە حەســەن لــە خێوەتەکە نیزیک بۆوە ناردی بەدوای محەمــەد بەگی‌دا و بانگی کردە دەرێ. نەهاتنی حەســەن خان بۆ خێوەت و چوونەدەری محەمــەد بــەگ ئەوانی نیگەران و دڕدۆنگ کرد. حەســەن خان بــە محەمەد بەگی گوت: «سەرم لە کاری تۆ سوڕماوە و قەت وام لە تێگەیشتن و لێزانیی تۆ ڕانەدەدی کە بە خۆت و برایانەوە لەنێو ئەو یاغی و ســەرکێش و لاســارانەدا دابنیشــی کە دەستیان لە خوێنی خۆیان شوشتووە و جێ متمانە نین و نابێ بەهیچ بارێک بڕوایان پێ بکرێ. تەگبیر ئەوەیە کــە ئەوان لەبەر یەک بــڵاو بکەی، ئەمیرخان و کوڕەکەی و چەند کەســان بە ئەمیرێکی بسپێرە کە پاش ئەوەی فەرمانمان بۆ هات جێبەجێ دەکەین.»

محەمەد بەگ ئەو قســەی پــێ بەجێ بوو. پیاوی ناردە کــن ئەمیرخانی: «مانەوەی ئەو هەموو کەســە پێکەوە لە جێگایەک ئیمکانی نییە، بۆ خۆت و کوڕ و خزمەکانت لێرە بحەســێنەوە و ئەوانی دیکە دادەبەشین.» ئەمیرخان ملی ڕاکێشا؛ بەڵام ئاواڵەکانی ملیان نەدا و گوتیان: «بۆخۆت دڵنیای کە ئەمیرەکان سەربەخۆ ناوێرن ئەتۆ بکوژن، بەڵام یەکی لە ئێمە ناهێڵن. بڕیارمان وابوو کە لە خۆشی و ناخۆشیدا پێکەوە بژین، ئێستا وا دیارە تۆ ژیانی دوو ڕۆژت پێ باشترە. ئێمە لێک هەڵنابڕێین و ئەگەر بکوژرێین با پێکەوە بمرین».

جوابیان ناردەوە دەرێ.

لەکاتــی ئەو هاتوچۆیەدا لە ماڵە ئەلیاس خەڵیفە هەرا پەیدابوو، کاتێک خان ئەبداڵی موکریانــی ناردە قۆناغی ئەلیاس خەڵیفە، بۆ خۆی لە ســەنگەر بوو. پیاوەکانی خەریکی میوانداری و بەجێ گەیاندنی ئەرکی پێویســت بوون وشــەربەتیان بۆ هێنان. لەو حاڵەدا

خەڵیفە- کە پیاوێکی سۆفی و خاوەن ئاکارێکی ساکار- بوو بەسەردا هاتەوە و میوانەکانی زۆر بەخێرهاتـن کـرد و لـە پیاوەکانی تووڕە بـوو کە بەو گەرمایە بـۆ چەک و بەرگی شـەڕتان لە بـرادەران نەکردۆتەوە. خزمەتکارێک هات کە بەرگی شـەڕیان لێ وەرگرێ و سـووکیان بکا. خان ئەبـداڵ و ئاواڵەکانی خەیاڵێکی دیکەیان بەدڵدا هات. دەسـبەجێ لە جێی خۆیان ڕاپەڕین و شـیریان هەڵکێشـا و چەند شـیریان لە ئەلیاس خەڵیفە دا و چەنـد کەسـیان لە خزم و پیاوەکانی - کە بێ چەک بـوون - لەنێو خێوەت بریندار کرد. غازییەکانی قەراداغللو پێیان زانی و بەشـیری ڕووتەوە لە خێوەتی وەژووکەوتن. ئەلیاس خەڵیفـە و دوو کەس لە خزمانی کوژرابوون و چەند کەسـیش بریـندار بوون. ڕوویان لە خان ئەبداڵ کرد و ئەویان بە ئاواڵانەوە لەتوپەت کرد. ئەو ڕووداوە قسـەی حەسەن خانی وەڕاسـت گێڕا و کەس متمانەی بەوان نەما. قزڵباشـی غەزاکەر، ڕۆیبوونە شیران و دەسەر کەسـەوە نەچوون و شـیریان تێ نان. هەر کەس لەو ڕۆش پێشتر هاتبووە دەر- چ کورد چ جەلالی - کوژرا. چونکە بەردەسـتبوونی ئەو چینە غەدارە وەک ئیمانی ناهۆمێدی بوو. ئەمیرخان و ئاواڵەکانی هێرشـی قزلباشـیان بـۆ دەورەی خێوەتەکەیان دی و ڕاپەڕین و لبادیـان کون کـرد و غازییەکانیان وەبەر تفەنگەکان دا. لەولاشـەوە خێوەت گوللە باران کرا. بیسـت سی کەسـیان وەبەرهاتن و کوژران؛ ئەوانی دیکە بەشیری ڕووتەوە دەپەڕین و بەشـەڕکردن بەڕێگای نەماندا ڕابردن. لەشکری ڕق هەستا و وای دەست بەکوشتار کرد کە ئەو کەسـانەی شـەش مانگ لەوێ پێش هاتبوونە دەریش دەرباز نەبوون؛ تەڕ و وشک پێکەوە سووتا. ئەوانی لە قەڵاش مابوونەوە ئاسەواریان لێ بڕا. بەکورتی قەزاوقەدەر وای هێنابوو و ئەو ڕووداوە لەخۆیەوە قەوما. پاداشـی نمەک بەحەرامیی خۆیان وەرگرت. پاش لێکۆڵینەوە زاندرا کە ئەمیرخان و ئاواڵەکانی تەگبیریان کردبوو و هاتبوونە سەر ئەوە کە ڕزگاریان لە دەسـت قزڵباش ئیمکانی نییە؛ گوتبوویان؛ «بەرگی شـەڕێ لەبەر دەکەین و چـەک هەڵدەگرین و دەچینە دەرێ. هەموو ئەمیرەکان لەو کۆڕەدا کۆدەبنەوە؛ دەسـتیان لێ دەدەینە شـیران، تا لە دەرەوە ئاگادار دەبن چووقەواریان لێ دەبڕین. ئەگەر توانیمان وەدەرکەوین و خۆ ڕزگار بکەین، ئەوە باشە؛ ئەگەر نەمانتوانی، بەس نییە تۆڵەی خۆمان لەپێشدا کردۆتەوە و خوێنی خۆمان ئەستاندووە و پیاوانە کوژراوین». بۆیە ئەم ئازایەتییە لە خان ئەبداڵ ڕووی دا و لەپێشدا ئەلیاس خەڵیفەی کوشت. خودا بۆخۆی دەزانێ.

پاش ئەم ڕووداوە کوڕە بچووکەکانی و خاو و خێزانی ئەمیرخان ئەوی مابوون، هێنایانن بۆ هۆردووگا و ماڵ و سـامانی قەڵانشـینەکان بەسەر غازییەکاندا دابەش کرا. لە حاڵێکدا کە هۆردووی خاوەن شـکۆ لە (گاودۆڵ)ی مەراغە بوو، ئەوەی قەومابوو بەعەرزی پیرۆزی




گەیشت. لەسەر فەرموودە، چەند ڕۆژێک گەنج عەلی خان بەخۆی و تفەنگچییەکانێوە لەبن قەڵا مانەوە و ئەمیرەکانی دیکە بەلەشکرەوە ڕوویان لە دەرگای خاوەن شکۆی عالەم پەنا کرد. لە چیمەنی قەراچووق گەینە بارەگای پیرۆز. وڵات و سـامان و دەستەڵاتداری ورمێ، بە قبان خانی برای محەمەد بەگی بێگدلی ئەسـپێردرا. سێ هەزار تومەن زێڕی نەغدیش بۆ پێداویستەکانی قەڵای دمدم و یارمەتیی غازییەکان و پیاوەکانی ئەو دیاری کرا. فەرمان درا لە سـنووری ساردوقورغان و گاورووود تا سـەڵماس، هەموو ئەمیر و حاکمەکان لەبەر حوکمی ئەودابن و لە قسـەی دەرنەچن. ئەویش بە لشـکرێکی تەیارەوە چوو بۆ وێندەرێ و خەریکـی ئاوەدانکردنەوەی قەڵا بوو. گەنج عەلـی خانیش بەخۆی و تفەنگچییەکانیەوە تێکەڵی هۆردووی گەورە بۆوە.[1]

***

## باسی بەرەو مەراغە چوونی شا و ڕوو هەستانی لە تیرەی موکری و قەتڵوعامی ئەو تیرە

عەشیرەتی موکری لە پێڕەوانی ئەم دەوڵەتە و لە سنووری گاودۆڵی مەراغە و سندووس و میاندواودا نیشتەجێ بوون. لە سەردەمی شای بەهەشتیدا سەرکردەی ئەو تیرە بەدەست ئەمیرە ناوێکەوە بوو. پاش مردنی شا و لەسەر تەخت دانیشتنی سوڵتان محەمەد پادشا ـ کە سـوڵتانی ڕۆم بوو ـ پەیمانی بـاوک و باپیرانی خۆی هەڵوەشـاندەوە و دنیای هێدی و هێمنی ئاڵۆز و پەریشـان کرد. شـەڕ هەڵایسێنە بەدفەڕەکانی سـنوور، بازاڕیان گەرم بوو. ئەمیرەی ناوبراو ـ کە زۆر سـاڵان نمەک پـەروەردەی ئەم دەوڵەتە بوو ـ ڕێگای نمەک بەحەرامـی و یاغیبوون و هەڵگەڕانەوەی گرتە پێش، دەگەڵ ڕۆمیان ڕێکەوت و دەسـتی کرد بە تاڵان و کوشتار. لە سندوس و میاندواو و مەراغەدا هاتە سەر ڕەوەی (قەراچیوق) کە ڕەوەی تایبەتی حەزرەتی شـای بەهەشتی بوو و بەباشی ناوبانگی بەدنیادا ڕۆی بوو. ژمارەیەکـی زۆری لە ڕەوەدان و پاسـەوانی ڕەوە کوشـتبوون و ڕەوەکەی داگیرکردبوو.

---

١ ـ ئەم کارەساتە لە ساڵی بیست و چوارەمی پادشایەتیی شا عەباسی سەفەویدا ڕووی داوە کە ڕێککەوتی ١٠١٨ی کۆچییە. ئەسکەندەر بەیگی تورکمان لە لاپەڕەکانی ٨٠٧ ـ ٨١١ ی کتێبی عەلەم ئارای عەباسیدا باسی کردووە. حەیف ڕۆژ و مانگی گیرانی دمدم و کوژرانی ئەمیرخانی نەنووسیوە. هێمن




هەمیشـــە دەگەڵ ئەو ئەمیر و قزڵباشـــانەی دەبوونە حاکمی مەراغە شەڕ و کێشە هەبوو. دەمێکیش لە خراپە و کوشـــتار و بەدیل گرتنی ژن و منداڵ ڕانەدەوەســـتا. پاش مردنی ئەمیرەبەگ، شێخ حەیدەر بەدەستووری بێگلەربەگی ڕۆمیان بوو بە ئەمیر و لە باوکی زیاتر سەربەخۆیی پەیدا کرد.

بەڵام لە زەمانی فەرمانڕەوایی سوڵتان محەمەدخاندا لە ڕاس جەعفەر پاشای بێگلەربەگی تەورێز سەرکێشـــی دەکرد. چەند جار نیزیکانی خۆی ناردە بارەگای عالەم پەنای پادشای مەزن و بچووکی خۆی نیشـــان دەدا؛ تا شاهەنشـــا بۆ داگیرکردنی ئازەربایجان چوو. شێخ حەیدەر هات بۆ ڕێســـمە ماچکردن و لاواندراوە؛ حەزرەتی شای پایەبەرز و سێبەری خودا، هەڵەکانی پێشووی تیرەی موکری بەخشی. دەسەڵاتی مەراغە و دەوروپشتی ـ کە هەمیشە بەدەست یەکێک لە ئەمیرە مەزنەکانی قزڵباشەوە بوو ـ دا بە شێخ حەیدەر. ئەو لەبن قەڵای ئێرەوان وەک لەجێی خۆی باس کراوە ـ کوژرا. خاوەن شـــکۆ لەبەر هەقناســـی جێی باوکی دا بە قوبادخانی کوڕی کە هێشـــتا منداڵ بوو. بەکەیخوادا و ڕدێن سپیەکانی عێلی فەرموو تا کوڕ گەورە دەبێ لە قســـەی دایکی ـ کە کچی پیاوماقووڵێکی قزڵباش و ژنێکی وشـــیار و ئاقڵبـــوو دەرنەچن. بۆ ئـــەوەی قوبادخان خۆی بگرێ برایەکی شـــێخ حەیدەر کە ناوی ئەمیرخان بەگ بوو لەنێو عێل هێنادەر و جێ و پایەی دایە و کردی بە حاکمی گەرمڕوود. براکـــەی تری خان ئەبداڵ داوای مەزنایەتیی دەکرد و ســـەری بـــۆ برازاکەی دانەدەنواند و هێندێـــک پیاوخراپ و بەدفەڕی موکری لەخۆ هاڵاندبوو. چەند جار لەشـــکری ناردرا ســـەر و دەریان پەڕاند؛ تا ئاخری وەک باســـکرا پەنای بۆ ئەمیرخانی برادۆســـت برد و لەکن ئەو مایەوە. لوتف و دڵســـۆزی شـــاهانە قوبادخانی گرتەوە و سەربەخۆیی تەواوی پەیدا کرد و هەموو هۆزەکانی موکری بەردەست بوو. لەنێو سەرهۆزانی ئەم تیرەدا پیاوی بەراز سورشت و ڕێوی ســـیفەت هەبوون کە لە ڕێگای ڕاســـت دوورکەوتبوونەوە و لە چۆڵی ســـەرەڕۆییدا گەورە ببوون؛ دەگەڵ قزڵباشـــان ـ کـــە مەراغە خاوەن مڵک بوون ـ خـــراپ دەجووڵانەوە و بەزۆر زەوییەکانیان داگیر دەکردن. قوبادخانیش کە گەیشـــتێ، لەبەر نەزانی و پیســـیی دەروونـــی دەگەڵ قزڵباشـــان ڕەفتارێکی نالەباری گرتەپێش. هەرچەند لەو چەند ســـاڵەی دواییدا زۆر نافەرمانی و ئاکاری دزێو لە خۆی و لەژێر دەستەکانی دەبیندرا و گەرد لەسەر دڵی ممبارەکی شاهانە دەنیشت، بەڵام لەبەر بەزەیی و دڵسۆزیی تایبەتی خۆی و لە پێش چاوگرتنی خزمەتی شێخ حەیدەر، چاوپۆشیی لێ دەکرا. تا وای لێ هات ئاوی لە ئاوەڕۆیان دەرکرد و ســـەرەڕۆیی و لاســـاریی لە ڕادە بردە دەر. هەروەکوو ساڵی ڕابردوو حوکم کرابوو کە قوبادخان بچێتە کن (ئیعتیمادودەولە) و لە داگیرکردنی قەڵای دمدمدا دەگەڵ لەشـــکر

بەشداری بکا، خۆی لەو خزمەتەش بوارد و نەچوو.

لە بەهاریدا کە خاوەن شــکۆ خەریک بوو بۆ ڕێکخســتنی کاروباری ئەو ناوچەیە بەرەو ســنوور بچێ، قوبادخانیش ناچار بەخۆی و چەند کەس لە دەوروپشتەکانیەوە لە (یورت قشلاق) بە خزمەت گەیشت؛ چونکە دڵی پاک و ڕووناکی شاهانە لە سەرەڕۆیی و لاساریی ئەوان گەردی لێ نیشــتبوو، هاتە ســەر ئەوە کە ئەوانە شــیاوی لوتف و دڵسۆزی نین و ڕاوەســتان لە تەمێکردنی توندی ئەوان بەقازانجی دەوڵەت نییە و خراپە و کێشــەی پتری لــێ پەیدا دەبێ. خۆی لە تەمێکردنیان خۆش کرد. بەڵام بەلێزانی و وشــیاریی خۆیەوە، جارێ خۆی ڕاگرت و لوتفی دەگەڵ کردن تا گەیشتە مەراغە. قوبادخان و ڕدێن سپیەکانی موکری لەوە دەترســان شــا داوای ڕەوەی قەراچیوق بکاتەوە؛ بۆیە بەفێڵ، ئەسپە باش و هەڵبژاردەکانیان نارده جێگایەکی دووردەســت و چەند بارگینی نارەسەنی کوردییان لەوێ هێشــتەوە، تا ئەگەر باســی ڕەوە هاتە گۆڕێ ئەوان نیشــان بدەن. هەروەها ئاشکرا بوو کە هەمیشــە دەگەڵ ســەردارانی ڕۆمی کەینوبەینیان بووە و خراپەیان دەگەڵ لێقەوماو و هەژاران کردووە و لەبەر تەعەسســوبی مەزەبی زۆریان شــیعەکانی مەراغە ئازار داوە. کە وابوو دەستی زۆرداران دەبوو لە یەخەی هەژاران بکرێتەوە.

بەکورتی لەنێوبردنی ئەو تیرە بەدفەڕ و ســەرەڕۆیە- کە لە موســڵمانی هەر ناوێکیان هەبوو- ئەرکی سەر ئەستۆی شای دادپەروەر بوو. ئاگری ڕق و تووڕەیی وا لە دڵی خاوێنی شاهانەدا بڵێسەی گرتبوو کە تەنیا بەخوێنی ئەو بێ فەڕانە و وەکارکەوتنی شیری ئاگربار نەبایــە نەدەکووژاوە و دانەدەمرکاوە. لە کاتێکدا کە بارەگای بەرز لە گاودۆڵ هەڵی دابوو، ڕۆژێک قوبادخان بەخۆی و ســەد و پەنجا کەســەوە ڕوویان لە بارەگای بەرز کرد. ئێوارە وەخت بوو گەیشــتێ؛ دەگەڵ چوار کەس لە خزمەکانی بۆ حوزوور بانگ کران. کە وەژوور ســەراپەردە کەوت، لەسەر فەرمانی شــا لە وەختی چەکمە داکەنەندا غوڵامان بێ ئەوەی بێڵن ببزوون - کوت کوتیان کردن. کەلاکی پیســی ئەوانیان بۆ کووچەی پشت سەراپەردە ڕاکێشــا. بۆ ئەوەی زیانێک لەلایەن ئــەو پیاوخراپانەوە بەغوڵامان نەگا. فەرمان بە عەلی قوڵی خانی ئێشــک ئاغاسی باشی شــاملوو درا لەبەر دەرکی سەراپەردە ڕاوەستێ؛ یەک یەک بانگیان بکا بۆ مەجلیس. کە وەژوور ســەراپەردەی پیرۆز کەوتن دەسبەجێ غوڵامان بیانکوژن و کەلاکیان باوێژنە کووچەی پشــت ســەراپەردە؛ تا لە پێش چاوان ون بن. تا بیست سی کەس بەو جۆرە کوژران و یەک بەدوای یەکدا فڕێ دران. ئەوانی دەرێ کەمێک دڕدۆنــگ بوون. یەکیان کە هاتە ژوورێ تەماشــای کرد خوێــن زۆر ڕژاوە و قوبادخان و ئەوانیش دیارنین؛ قیژاندی و دەستی دا خەنجەر. موحیب عەلی خانی شاهی سیونی بریندار

کرد. دوو سێ کەس کە بەدوایدا دەهاتن کشانەوە و خەریکی ڕاکردن بوون.

غوڵامـــان و قورچییان تێیـــان وەرووکان، هەر لەوێ پارچە پارچەیـــان کردن. ئەوانی دەرەوە تێ گەیشتن، ڕایان کرد ئەسپان. هێندێک هەر لەو دەوروبەرە و هێندێک لە وەختی ڕاکردندا کوژران و تاقیان لێ بڕا. لەو وەختە بەســـامەدا خاوەن شـــکۆ هاتەدەر و سواری ئەسپی ڕەسەن و خۆشبەز بوو و ڕووی لە قەڵای گاودۆڵ کرد و سەربازانی قزڵباش کوشتن و تاڵانی عەشایری موکرییان پێ ئەسپێردرا. خاوەن شکۆ بەتلێک لە شەو چووبوو گەیشتە قەڵای گاودۆڵ.

هێشتا ئەم خەبەرە نەگەیبووە قەڵا کە لەشکر بەزۆور قەڵا وەربوو؛ هەرکەسیان وەگیر کەوت خستیان. عەلی قوڵی خان ناردرا بۆ حەوشەیەکی دیکە کە لەو نیزیکانە بوو. پەنجا شێست کەســـێکی دەست بەســـتراوی هێنا دەرگای بەرز. غازییە تۆڵەئەستێنەکان بەچاو قووچاندنێـــک هەموویان ناردنە وڵاتی نەبوون. زۆر لەو کەســـانەی دەیانهێنان خزمەتکار و پێمەڕەدارەکان هەر بەزەبری گۆپاڵ و پاچ و پێمەڕە سەر و مێشکیان دەکوتان و دەهاڕین. ئەسفەندیاربەگی ئاوچی باشی عەرەبکەرلوو، لەسەر فەرمانی خاوەن شکۆ بەسەر ڕەو ناردرا بۆ گەرمڕوود و بەفێڵێکی شەڕکەرانەوە ئەمیرخانی برای شێخ حەیدەر و ئەو پەنجا کەسەی لە تیرەی موکری کە دەگەڵ ئەو لە ورمێ بوون بەجارێک کوشت. حوسێن سوڵتان برازای شێخ حەیدەر و ئەوانەی دەگەڵ ئەو لە ورمێ بوون بەدەستی حەسەن خان کوژران.

بەکورتـــی قەتڵیعامی ئەو تیرە بەقەڵەمی تەقدیر لەســـەر لاپەڕەی ڕۆژگار نووســـرا. ئەو چەند ڕۆژەی کە شـــا لە قەڵای گاودۆڵ ماوە، هەموو ڕۆژێ دەستەدەســـتە و پۆلپۆل دەیانهێنان و لەســـەریان دەدان. بەهرامی خوێنخۆر تاوێک لە تیغ وەشاندن و خوێن ڕشتن ڕانەدەوەستا. هێندێک لە ئوێماق و ئیبی و ئوریاد کە لە نێو ئەوان مابوونەوە، بەو تاوانەی لەنێو تیرەی دژی دەوڵەتدا خۆیان ماتکردووە و لە کاتی دەســـتەڵاتی ڕۆمیاندا نەگەڕانەوە نێو قزڵباش هەموویان کوژران.

بیبڕینـــەوە ئاورگی تیرەی موکری کوژاوە و نێـــرەوەزەکان هەموو کەوتنە بەر مەودای شـــیری بەبڕشـــت و ژن و منداڵەکانیشـــیان بەدیل گیران. پاش چەند ڕۆژ بڵێســـەی ڕقی شاهانە تا ڕادەیەک دامرکاوە و شێربەگ ناوێک لەو بنەماڵە کە هەمیشە خۆی بەخزمەتکار دەزانی و مەخســـووربەگ ناوێک کە برای ئەو و لە ڕیزی ئێشـــک ئاغاسیانی بارەگای بەرزدا بوو، کرانە گەورە و مەزنی موکری و فەرمان درا ئەوانەی لە مەودای شـــیر ڕزگار بوون و لە کەلێن و پەســـیواندا مانەوە، پەنا بۆ ئەوان بەرن و لە کوشـــتن و تاڵان ئەمین بن. پاش

ئەم ڕووداوە شا چەند ڕۆژێک لەنێو ئەسپەکانی ڕەوەدا لە چیمەنی قەراچیوق ڕای بوارد و وڵاتی مەراغەی بە سوڵتان میر موقەدەم ئەسپارد.[1]

***

## باسی دەسەڵات پەیداکردنەوەی کوردانی برادۆست بەسەر قەڵای دمدمدا و دیسان وە دەسکەوتنەوەی بەتەقدیری خاوەنی ئاسمان و ئەستێران

خەبەرێکی بەسام کە لە مازەندەرانی بەگوێی خاوەن شکۆ گەیشت، ڕووداوی سەیر و سەمەری دەسەڵات پەیداکردنەوەی کوردانی برادۆست بەسەر قەڵای دمدمدا بوو. چلۆنایەتیی ڕووداوەکە ئەوەیە: وەک لە پێشدا باسمان کرد پاسەوانی و دەستەڵاتداریی ئەم ناوچە و قەڵایەکەی بە قبان خانی بێگدلی ئەسپێردرا بوو.

یەکێک لە ژنەکانی ئەمیرخانی چۆلاق ـ کە لە کچانی خەڵکی خوێرپی ئەو ماڵبەندە بوو، دەگەڵ هێندێک لە بۆورە پیاوەکانی نەناسراوی کورد لە قەڵادا مابوونەوە و خزمەتی قزڵباشیان دەکرد. قبان خان هەڵەکەی ئەوە بوو کە کوردی با نەناسراویش بێ ـ لە قەڵادا هێشتبۆوە. بۆ خۆشی جاروبار دەچوو بۆ ڕاوێ. (ئەلغ) بەگی برادۆست ـ کە خزمی ئەمیرخان بوو، وەک کوند لە وێرانەکانی ئەو سنوورە هەڵکورمابوو و دەگەڵ ئەو (عورت) ژنە و قۆڵچییە کوردەکان پەیوەندیی بەرقەرار کرد. بڕیار وا درا هەر کاتێک قبان خان بەشەو لە قەڵا وەدەرکەوت ئاگاداری بکەن.

ڕۆژێک قبان خان بۆ ڕاوی لە قەڵا وەدەرکەوت. بە ئەلغ بەگ ڕاگەیەندرا، شەوێ بەخۆی و چل پەنجا کەس کوردەوە هاتنە بن قەڵا. ئەوان بورجێکی سوڵقیان کە بەتەنیشت قەڵاکەوەیە کون کرد، ئەلغ بەگ و ئاواڵەکانی یەک یەک هاتنە ژوورێ؛ لەپڕ پاسەوانی ئەو بورجەیان کە لە خەودا بوو کوشت. هەر کەسێکیان لە هەر بورجێکیدا لە خەودا دی بەرەو نەمانیان بەڕێ کرد، چوونە نەقارەخانە و نەقارەی شادمانییان لێ دا، ئەو کوردانەی

---

[1] ـ بەداخەوە ئەسکەندەر بەگ ـ کە مێژوونووسێکی زۆر ورد بووە ـ ڕۆژ و مانگی ئەم کارەساتەی ڕوون نەکردۆتەوە؛ بەڵام چونکە لە ڕیزی ڕووداوەکانی ساڵی بیست و چوارەمی پادشایەتیی شا عەباسدا لە لاپەڕەی ٨١١ ـ ٨١٤ی عەلەم ئارادا نووسراوە، دیارە ئەو کارەساتە لە ساڵی ١٠١٨ی کۆچیدا ڕووی داوە. هێمن.

لـــه قه‌ڵادا بوون تێکڕا لێیـــان کۆبوونه‌وه. خه‌ڵکی قه‌ڵا وه‌خه‌بـــه‌ر هاتن و ئه‌وه‌ی هه‌رگیز به‌خه‌یاڵیاندا نه‌ده‌هات به‌چاوی خۆیان دی، سه‌ریان لێ شێوا و ده‌ستێکیان که‌وته ئه‌ملا و ده‌ستێکیان که‌وته ئه‌ولایه. به‌و شه‌وه ڕه‌شه هه‌راوهوریا له قه‌ڵادا په‌یدابوو، قزڵباشه‌کان به ئاغا و نۆکه‌ر و پێشخزمه‌ته‌وه که‌ له قه‌ڵادا په‌یدا بوون، بێ ئه‌وه‌ی ئاگایان له چه‌ندوچۆنی داگیرکه‌ران بێ، به‌دڵێکی پڕ ترســـه‌وه به‌ئه‌ملا و ئه‌ولای قه‌ڵادا خۆیان فڕێ دا و هه‌ڵاتن و تا به‌یانی تاقه‌که‌ســـێکیان له قه‌ڵادا نه‌ماوه. کورده‌کان له قه‌ڵادا مانه‌وه و ماڵ و ســـامانی قزڵباشیان داگیرکرد و له کورده‌کانی ده‌وروبه‌ر، داوای کۆمه‌ک و یارمه‌تییان کرد.

ئه‌و خه‌به‌ره به‌ســـامه به قبان خان گه‌یشـــت. ئه‌نگوستی په‌شـــیوانیی به‌ددان گه‌ست، ڕووی له‌لای قه‌ڵا کرده‌وه. ئاغا ســـوڵتانی موقه‌ده‌م له مه‌راغه خه‌به‌ری زانی و به‌ســـه‌ڕه‌و به‌یارمه‌تییه‌وه هات. یه‌کێک له هه‌ڵکه‌وته باشـــه‌کان ئه‌وه بوو که ســـه‌د و په‌نجا که‌س له کورده یاغییه‌کان که بۆ کۆمه‌کی قبان خان به‌ره‌و قه‌ڵا ده‌هاتن، تووشـــی ئاغا و سوڵتان و پیاوه‌کانی قبان خان هاتن، شه‌ڕ قه‌وما و کورده‌کان شکان، زۆریان لێ کوژرا و ئه‌وی مانه‌وه و ده‌رچوون هه‌ڵاتن. پیربوداقخان حاکمی ته‌ورێز و شه‌هیر سوڵتانی موکری له بیستنی ئه‌م خه‌به‌ره شـــه‌ڵه‌ژان؛ به‌تره‌ختان خۆیان گه‌یاندێ، قبان خانیش به‌شه‌رمه‌زارییه‌وه تێکه‌ڵ به ئه‌میره مه‌زنه‌کان بۆوه.

ڕوون بۆوه که قه‌ڵانشـــینه‌کان زۆر که‌من. له‌بیری هێرشبردندا بوون که ئاوی ڕه‌حمه‌تی خودا به‌سه‌ر ئه‌م ئاگره‌دا کرا. ئه‌لغ به‌گ ڕۆژێک باروت به‌سه‌ر تفه‌نگچییه‌کانیدا به‌ش ده‌کا، قه‌زاوقه‌ده‌ر وا جاری بوو پریشـــکێک ئاگر که‌وتـــه نێو باروت و گڕێ لێ بڵندبوو و لایه‌کی ڕوومه‌تی ســـووتاند و په‌کی خست. ئه‌و سووتاوانه‌ی ئاگری ناهومێدی، له قه‌ڵاداری که‌وتن و که ده‌وره‌ی قه‌ڵایان وا به‌ته‌ندراوی هاته پێش چاو، له گه‌یشـــتنی کۆمه‌ک ناهومێد بوون. ترس و ناهومێدی ته‌نگی پێ هه‌ڵچنین و جگه له ڕاکردن هیچیان ڕه‌چاو نه‌کرد. له شه‌وێکدا کـــه وه‌ک دڵی نه‌گبه‌تبـــاران ڕه‌ش و تاریک و تونوک بوو- هه‌رچی پێیان هه‌ڵگیرا و توانیان له ئه‌ســـپه حه‌ســـاوه‌کانی قه‌ڵایان نا و ئه‌لغ به‌گیان به‌که‌ڵاکی هاویشته سه‌ر ئه‌سپێک و له ده‌رفه‌تێکدا ده‌روازه‌یان کرده‌وه و هه‌ڵاتن. ئه‌میره‌کان پاش ئاگاداربوون وه‌دوایان خســـتن، به‌ڵام وێیان ڕانه‌گه‌یشتن.

جارێکی دیکه‌ش ئه‌و قه‌ڵایه که له قایمی و به‌رزیدا ده‌گه‌ڵ ئاسمانی شین به‌رامبه‌ری ده‌کا که‌وته‌وه ده‌ستی له‌شکری پادشا.[1]

---

١ ـ ئه‌م ڕووداوه له ساڵی ١٠٢٤ی کۆچیدا که به‌رامبه‌ری بیست و نۆهه‌مین ساڵی پادشایه‌تیی شا عه‌باسه قه‌وماوه و له لاپه‌ڕه ٨٨٨ـ ٨٨٩ی عالەم ئارای عه‌باسیدا نووسراوه. ئه‌وی بۆ من جێی داخه ئه‌وه‌یه که نووسه‌ر ناوی ئه‌م ژنه قاره‌مانه تۆڵه‌ئه‌ستێنه‌ی نه‌نووسیوه. هێمن.




## مەم و زین

دووەم بەیتــی کتێبی ئۆســکارمان، مەم و زینە. مەم و زیــن بەناوبانگترین چیرۆکی کوردییــە. کام کــورد هەیە ئاگای لە چیرۆکی مەم و زین نەبێ. یا هیچ نەبێ ناوی ئەو کچ و کوڕە ناکامانەی نەبیســتبێ. لە شــیعری شــاعیرە کۆن و تازەکانماندا ناوی مەم و زین هاتووە.

چیرۆکی مەم و زین هەر بە کوردی نەماوەتەوە. تا ئێســتا بە ئەڵمانی، فەرانســەیی، ڕووســی، ئەرمەنی و تورکی تەرجەمە کراوە. لە ســاڵی ١٣٤١ـ ١٩٦٢ دا ئەم بەیتەی لەم کتێبەدا هەیە، بەدەستی کاک (عوبەیدالله ئەیووبیان) هاتۆتە سەر ڕێنووسی کوردی و زۆر باشیش کراوەتە فارسی و چاپ کراوە.

ئەم چیرۆکەی لەم کتێبەدا چاپ کراوە (ڕەحمان بەکر) بۆ خۆی دەڵێ بە چوار ڕۆژان بۆ ئۆســکارمانی گوتووە و ئەویش تۆماری کردووە. من کە زۆر جارم ئەم بەیتە لە زمانی شایەرەکانی هاوچەرخم بیستووە ئەم بەیتەی زۆر بەتەواو دەزانم.

بەبڕوای من مەم و زین زۆر کۆنە. زۆر کۆنترە لەوەی ئێمە بیری لێ دەکەینەوە؛ بەڵام هەروا هاتووە و تازە کراوەتەوە و ڕەنگی گۆڕیوە. کەچی بەو هەموو گۆڕانەوەش نیشانەی ئاینی زەردەشــتی بەئاشــکرایی پێوە دیارە و ئەوەش بەڵگەی کۆنبوونی ئەم چیرۆکەیە. لەسەرانسەری بەیتی مەم و زیندا لە نێوان خودای خێر و شەڕدا ملانەیە؛ ملانەیەکی توند و بەربەرەکانێکی ســەخت و لە ئاشتی نەهاتوو. ئەگەر بەکرە مەرگەوەڕ، بەکری شۆفار و بەدفەڕ وەک خودای شــەڕ دەیەوەێ مەم و زین - ئەم کچ و کوڕە پاک و خاوێنانە ڕیســوا بــکا، خودای خێر (قەرەتاژدین) گەورەترین مەردایەتی و فیداکاری دەکا و بۆ پاراســتنی ئابــڕووی ئەوان ماڵــی خۆی ئاگر تێ بەر دەدا و خانی نەمریش کارەســاتەکەمان ئاوا بۆ دەگێڕێتەوە:

مــالا خــوە ژ ڕەنــگ قــوم زردشــت

دا ئاگــر و کازیــا خــۆ ڕاهشــت

ئاگـر کـو دگرتـە خـان و مانـان
وی گرتـە بـە گازی و فغانـان
ئـەقـوام و قبایـــل و عشـایر
بـالجملـە بزینـە دەفـــع ئاگـر
ئـاگاە کـو بـوون ئەمیـر و غلمـان
خالـی کـردن ئـەو سـرا و بسـتان
ئـوژی کـو بـزینـە وی هـــەواری
وی موتەهمـی وەگـــوتـە یـاری
تاژدیـن تـە دی چـە ڕەنگ ئـەدا کر
مووسـا لـە بەحـر غـەم زوا کـر

بەیتبێژی ساکاریش ئەو نەقڵەمان بەزمانێکی سەیر بۆ دەگێڕێتەوە:

قەرەتاژدینی لوڕی
بە زمانی عەرەبان[١] دە ژنێی خوڕی
دوور[٢]، گویتر، لانکی کوڕی
یا لە زمان خاتوون ئەستێوە دەڵێ:
نە ئەو ماڵەم دەوێ، نە ئەو حاڵە»
«نە ئەو منداڵەم دەوێ نە ئەو تفاڵە
«بەو شەرتەی لە دنیایە سڵامەت بێ، گەردنی زەرد و ڕووی پڕ لە خاڵە».

تاریکی بەری ڕووناکی دەگرێ، خودای شـەڕ بەسـەر خودای خێردا زاڵ دەبێ. بەکرە شۆفار واز ناهێنێ ئەو کچ و کوڕە بێ تاوانانە بەئاوات بگەن. بەڵام دیسان ڕووناکی پەیدا دەبێتـەوە، خێر زاڵ دەبێ؛ شـەڕ تێ دەشـکێ. بەکر دەکوژرێ. ئەمـا درەنگ؛ پاش لە نێوچوونی ئەو دڵبەر و دڵدارە بێ مرادانە.

---

١ ـ وێ دەچێ شایەر گوتبێتی (زمانی عەجەمان) لەبری (زمانی عەرەبان)؛ بەڵام ئۆسکارمان کە ڕەنگ بێ نە تورکیی زانیبێ و نە عەرەبی، وای وەرگرتبێ؛ دەنا ئەم دێرە تورکییە و لە موکریان بە تورک دەڵێن عەجەم. هێمن.

٢ ـ دور: هەستە. گویتر:ببە، هەڵگرە

خانیی نەمر- شاعیری مەزن و پایەبەرزی کورد- ژیانی هەتاهەتاییی دا بە چیرۆکی مەم و زین. شـاکارێکی دروست کرد کە تا دنیا دنیایە مایەی شانازیی ئەدەبی نەتەوایەتیمانە، بەڵام نەیتوانی بەیتە کۆنەکە لەنێوبەرێ و لەبیر خەڵک بەرێتەوە. ئەو بەیتە ئێستاش هەم بە شـێوەی بۆتانی و هەم بە شـێوەی موکریانی هەر ماوە. ئەگەر تۆماریش نەکرابا هەر دەماوە؛ بەڵام ڕەنگ بوو پتری گۆڕان بەسەردا هاتبا.[1]

بێگومان سـەرچاوەی مـەم و زینی خانی هەر ئەو بەیتە کۆنەیـە. هەروەک پێم وایە سەرچاوەی چیرۆکەکانی بیژەن و مەنیژە و ڕۆستەم و سوهراب و سیاوەش و... شانامەش هەموو بەیتی کۆن بوون و فیردەوسی تازەی کردوونەوە؛ بەڵام چونکە شیعری فیردەوسی ساکارتر و هاسانترن بەیتە کۆنەکان لەبیرچوونەوە و چونکە مەم و زینی خانی، وردەکاریی شـاعیرانە و سۆفیانەی زۆر تێدایە و هەروا ساکار و هاسان نییە و نەخیندەوار هیچ، نیوە خوێندەواریش باشـی تێ نـاگا، بەیتە کۆنەکەی مەم و زین هەر بەسـەر زار و زمانانەوە ماوەتەوە.

پیرەمێردی نەمر شاعیر و ڕۆژنامەنووسی هاوچەرخیش مەم و زینی هەیە. مەم و زینی پیرەمێردی ئیبداعێکی خۆیەتی و زۆر لە بەیتە کۆنەکە دوورە. چیرۆکێکی شـانۆییی باوی ڕۆژبـووە. تەنانەت بـەرەو ئەدەبی ڕۆژئاوایی چووە و وەک دراماکانی شکسـپیر دەچێ. ئەو شـیعرە ناسـکانەی خوارەوە- کە لە چاو هونەری شیعرییەوە بەرزن - لە مەم و زینی پیرەمێرد وەرگیراون:

هـەیـڕۆ ئیمـڕۆ ڕۆی شـین و ڕۆ ڕۆمـە
کـە مـەم ڕۆی ڕۆی پـەزارەی خۆمـە
ئـەو زوڵفـە لوولـەم بـۆ مـەم شانە کـرد
فەلـەک کـوێـر بـێ بـۆنێکـی نـەکـرد
ئـەو خـاڵ و میلـەی مـن بـۆ مەمـم ڕشـت

---

[1] ـ من لە مێژە بیر لەوەی دەکەمەوە چۆنە زۆر بەیتی کۆنی کوردیی وەک مەم و زین، فەرز و ستی، خەج و سیامەند، سەیدەوان، زەمبیل فرۆش و شێخی سەنعان بە هەردووک شێوەی موکریانی و بۆتانی هەن. ئایا لە ئەسڵدا بەکام شێوە بوون؟ کەی گۆڕاون؟ کێ گۆڕیونی؟ دیارە بۆم نەچۆتەوە سەر ڕ بنج و بناوانێک، بۆیە خۆی لێ دەبوێرم و باسی لێ ناکەم. هەر ویستم ئەو دیاردە بخەمە پێش چاوان، بەڵکە لە دوارۆژدا زانایانی کورد لێی بکۆڵنەوە.

پەیمانم وایە بۆی بەرمە بەهەشت
لێوم دانابوو بۆ گفتوگۆی مەم
عەهدە تا مردن واتەی پێ نەکەم
هەی مەم دەستی مەم نەگەیشتە تۆ
وا نووکی خەنجەر بوو بەسەزای تۆ
خەنجەر بۆ دڵە گەر ڕاستت دەوێ
ئاخ مەمی تیایە نەک بەری کەوێ

مەم و زینی پیرەمێرد بە نۆرەی خۆی پارچەیەکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتیی بەرزە. بە زمانێکی شاعیرانە و هونەرمەندانە رەخنەی لەو ڕەسمە کۆن و دزێوەی کوردەواری گرتووە کە کچان بەزۆرەملی دەمرێنن و دڵی دڵداران دەشکێنن و ئێستاش دەگەڵ سەردەمی خانیش فەرقێکی زۆری نەکردووە. بەڵام مەوزووعێکی نوێ و لاساکردنەوەیەکی ڕۆژئاواییە کە دەگەڵ ڕێوشوێنی کۆنی کوردەواری یەک ناگرنەوە و زۆر لە بەیتەکەش دووربۆتەوە. زین هەم لە بەیتەکەدا و هەم لە مەم و زینی خانیدا بەمردنی خۆی لە سوێی مەم مردووە و ئەوەش سۆزی ئەوین و وەفای پتر تێدایە، کەچی زینی پیرەمێرد خۆی دەکوژێ، قەدیم خۆکوشتن لە کۆمەڵی کوردەواریدا نەبووە، ئەو دیارییەمان زۆر لەمێژ نییە لە ڕۆژئاواوە بۆ هاتووە. ئاخر دیارییەکانی ڕۆژئاوا هەموویان هەر باش و بەنرخ نین و زۆریان بۆ ئێمە ماڵوێرانکەرن.

لە چیرۆکە کۆنەکانی کوردیدا باسی خۆکوشتن، تەنیا لە بەیتی خەج و سیامەندی موکریانیدا هەیە. خەج پاش مردنی سیامەند شینی بۆ دەگێڕێ و دوای خۆی لە تیکەشاخی کێلەسپیان هەڵدەدێرێ و بەپەلی دارەبەنێدا دەدا. ئەویش تەنیا لە سوێی سیامەند نا؛ بەڵکە لە ترسی براکانیشی کە زۆری لێ نیزیک ببوونەوە و لەوانەبوو بیکوژن. داستانێکم وەبیرهاتەوە؛ هەرچەند کەمێکمان لە مەبەست دوور دەکاتەوە، بەڵام پێم خۆش بوو بیگێڕمەوە. فەقێ بووم؛ لە گوندێکی گەورەی کوردستانی ئێران دەمخوێند، گوندەکە دوو مەلای لێ بوون، مامۆستاکەی من مەلایەکی ڕووناکبیر و خوێندەوار بوو کە تازەترین کتێب و چاپەمەنی دەخوێندەوە و ئاگای لە وەزعی دنیای ئەو سەردەمی هەبوو. مەلاکەی دیکەم پیاوێکی زۆر وشک و کۆنەپەرست بوو و هەموو شتی لە ڕوانگەی کتێبە کۆنە پەڕ




زەردەکانەوە دەدی و دژی هەموو شـــتێکی نوێ بوو. مامۆســـتاکەم گاڵتەی بەبیروباوەڕی کۆنەپەرستانەی ئەو دەکرد و زۆربەی فتواکانی بە بەڵگەی شەرعی هەڵدەوەشاندەوە.

ئـــەو گوندە کیژێکی زۆر شۆخوشـــەنگ و جوان و چەلەنگ و شـــەرمێون و بەئەدەبی لـــێ بوو؛ کچی وا جوان لەو گوندەدا نەبـــوو دەیانگوت دڵی بەلاوێکەوە هەیە. بەڵام کەس نەیدیبوو جارێکی پێکەوە ڕاوەســـتابن. دوو برای لۆزەندەر و یەســـک گرانی هەبوون؛ هیچ کامیـــان ژنیـــان نەبوو و ئـــەم کچە بناوانیان بـــوو. پیاوێکی پیر و دەوڵەمەند بەســـەری هەڵوەســـتا. برای گەورەی حازربوون ژن بەژنەی پێ بکا، کچەکە بدا بەبار بەکابرا پیرە و کچـــی کابراش بۆ خۆی بێنێ، کچ نەدەچووە ژێر بار بەئاس و پەلاّســـدا دەچوو، تەنانەت شـــکایەتی لە ئاغاژنیش کرد. بەڵام ئاغاکە لە هەر دوو لاوە پێشکێشی دەستاند، بەقسەی ئاغاژنی نەکرد و دادی نەپرســـی، بەزەبری خەنجەر و کوتەک ناچاریان کرد مل ڕابکێشێ، مامۆستا کە ئاگای لە هەموو شتێک بوو نەتەنیا بۆخۆی مارەی نەکرد، بەڵکە گوتی: بەهیچ شەرعێک مارەی نایە و هەرکەس مارەی بکا بەتاڵە.

بـــەڵام مەلا پیرە مارەی کرد، هێنـــدەی پێ نەچوو کچەکە ون بوو؛ هەرچی لێی گەڕان ســـۆراخیان نەکرد. دەپێشـــدا پێیان وابوو وەدووکەوتووە، بەڵام کەس لە دێدا ون نەببوو؛ تەنانەت ئەو کوڕەی دەیانگوت حەزیشـــی لێ دەکا. ژنە چەنەدرێژەکان بوختانیان پێ کرد و دەیانگوت: «بەخولای خوشـــکێ چۆتە شار و ڕەگەڵ ژنە خراپەکان کەوتووە». ئاخری باغەوانان بە بۆگەن کەلاکیان لەنێو دارستانێکی چغور و قەوغادا دیتەوە کە خۆی هەڵاوسی بوو. مەلا پیرە کە دەســـتێکی لەو تاوانەدا هەبوو، نە حازر بوو نوێژی لەســـەر بکا و نە تەڵقینی بدا و نەهێشتی لە گۆڕخانەی موسڵماناندا بینێژن و گوتی: «بە هیلاک چووە و بە موسڵمانی نەمردووە». براکانی کە تازە پەشیمان ببونەوە هاتنە خزمەت مامۆستاکەی من. ئەویش قسەی مامۆستا پیرەی بەڕاست زانی. ناچار ئەو کچە بێ مرادەیان بەتاقەوە ناشت. من زۆرم پێ ناخۆش بوو و بە مامۆستاکەم گوت: «چۆن دڵت هات بڵێی ئەو سووکایەتییە بـــەم کچە هەژارە بکەن». گوتی: «ڕۆڵە من لە تۆم زیاتر زگ بەم کچە دەســـووتێ، پێم خۆش نەبوو سووکایەتیی پێ کرا و لەو بڕوایەشدا نیم قیامەت ڕادەبوو ئەگەر لە گۆڕخانەی موســـڵمانان بنێژرابایە، بەڵام بابێتە پەند و کچی دیکە فێر نەبن خۆ بکوژن». تێ فکریم ئەوەش چەشـــنە چارێک بوو بۆ ئەو دەردە کە تازە بەکوردەواری وەربببوو و وەک ئێســـتا پەرەی نەستاندبوو.

هەژار شـــاعیری بەناوبانگی و هاوچەرخیش مەم و زینی هەر لەســـەر کێشـــی مەم و زینی خانی بەشـــێوەی موکریانی کردۆتە شـــێعر. شیعرەکانی گەلێک سوار و لەبار پاراو و

تێرمانان. چیرۆکەکەشی هەروەک خانی داڕشتوو و پەروەردە کردووە و سەری گرتووە. زمانەکەی یەکجار پەتی و بێگەرد و ساکارە. پڕە لە وشەی ڕەسەنی کوردی و بەڕاستی فەرهەنگێکی دەوڵەمەندی زمانی کوردییە. وشەی ناڕەسەن و داتاشراو و تازەکوورەی تاک تاک نەبێ تێدا نییە. بریا ئەوانیشی تێدا نەبان کە دەڵێی پەڵەی ڕەشن بەکراسی سپیی بووکەوە. ئەگەر خانی مەم و زینی کردۆتە بەهانە بۆ دەربڕینی هەستی پاکی نەتەوایەتی و بیروڕای سۆفیانەی خۆی، هەژاریش مەبەستی ئەسڵیی لە هۆندنەوەی ئەم چیرۆکە تۆمارکردنی وشەی ڕەسەنی کوردی بووە و پیاو هەق بڵێ زۆریش سەرکەوتووە.

مەم و زین چیرۆکێکی نەتەوایەتیی کوردییە. بۆ هەموو شاعیرێکی کورد ڕەوایە بە ئارەزووی خۆی دایڕێژێتەوە، بەو شەرتە زۆر لە ئەسڵەکەی دوور نەبێتەوە. نازانم هەژار بۆ دەڵێ: «مەم و زینی خانی هەژار کردوویە بە موکریانی». ڕەنگ بێ ئەگەر ناوی نابا مەم و زینی هەژار، بەرهەمەکەی نرخی پتر بووبایە و زمانی ئەو ڕەخنەگرانە بەسترابایا کە دەڵێن: «هەژار نەیتوانیوە ئەفکاری سۆفیانەی خانی بەوردی دووپاتە بکاتەوە».

من زۆرم سەر لە وردەکاریی سۆفیانە دەرناچێ و نازانم قسەی ئەو ڕخنەگرانە تاکوێ ڕاستە، بۆ ئەم مەبەستەش زانای بەڕێز دوکتور عیزەدین مستەفا کە بە عەرەبی لەسەر فەلسەفە و بیری خانیی نووسیوە هیوادارین کە دواڕۆژدا پەردە لەسەر زۆر لایەنی شاراوەی بیری خانی هەڵداتەوە؛ بەڵام دەڵێم مەم و زینی هەژاریش بەتۆرەی خۆی کتێبێکی بەنرخە و زۆر چیرۆکی واشم پێ شک دێ دوو شاعیر کردوویاننە شیعر و دیارە فەرقیان بووە.

ئەوەش نموونەیەک لە مەم و زینی هەژار.

زین بوخچەی دڵی لای مۆمی داگیرساو دەکاتەوە

جارێکی بەزاری مۆمی دەدواند
دەردی دڵی زاری ژاری دەنواند
ئەی هاودەم و ڕاز و هاونشینم
من تۆش وەکو خۆم بەسۆز دەبینم
فرمێسکێ لەگەڵ منا دەرێژی
چۆن وا دەبێ هیچ شتێ نەبێژی

نازانی دڵم بەخۆم دەمێنێ
یەک بگری لەگەڵم و نەمدوێنی؟

دەردی من و تۆ لە یەک جودایە
وەک خاوەر و زەردەپەڕ وەهایە

تۆ خاوەری شەوق دەدەیتە چاوم
من ڕۆژپەڕ و ئاگرین هەناوم

ناسووتێ لە تۆ مەگەر زمانت
وەک من نی بسووتێ تای ژیانت

شۆقت کە لەسەر سەری دیارە
سەوداگەری سەر سەری دیارە

من گیان بەبڵێسە دڵ بەپشکۆم
سووتا جگەر و هەناسە بۆسۆم

تیشکی سەری تۆ لە تۆ زمانە
گڕپەی دڵی من بە ئێش و ژانە

هی من بە لەهی و بە گێژەڵووکە
ناکوژێتەوە هی تۆ چووک و سووکە

شەو دەبیە هەواڵی شەو بێداران
ڕۆژانە دەنووی هەتا ئێواران

من ڕۆژ و شەو و سبە و ئێوارەم
یەک لا نییە ئایسانە کارم

جارجارە لە دەست دڵی بریندار
جاڕز لە ژیان دەبوو بەناچار

پەروا نەدەما لە ئاگری خەم
پەروانە دەما ببێتە هاودەم

مەم و زینی خانی و هەروەها هی هەژاریش هێندێک جیاوازیان دەگەڵ ئەم بەیتەدا هەیە، کە نوســکارمان تۆماری کردووە. یەکەم دیداری مــەم و زین لە بەیتەکەدا زۆر ڕۆمانتیکی و لــە واقیــع دوورە. پەری، زینێ بۆ مەم دەبەن؛ بەڵام خانی بەڕاســتی ئەم دیدارەی زۆر ئاســایی پێک هێناوە و لە واقیعی نیزیک کردۆتەوە. لە جێژنی نەورۆزدا، لەو جیژنە کۆن و نەتەوایەتییــەدا۔ تووشــی یەکی کردوون و بە تیرێکی دوو نیشــانەی ئەنگاوتوون. مەم باســی نەورۆز و ڕەســمەکانی ئەو جێژنەمان بۆ دەکا و هەم سەرەتای دڵداری مەم و زین دادەمەزرێنێ. من بەشبەحاڵی خۆم ئەو کارەی خانیم زۆر بەلاوە گرنگە؛ چونکە من دەزانم خانی گەلێک لەژێر تەئســیری ئەدەبی فارسیدا بەتایبەتی لەژێر تەئسیری شیعری نیزامی گەنجەویدا بووە. نیزامی گەنجەوی کە شیعردۆســتەکانی فارس بەخودای شیعری دەناسن ـ شــاعیرێکی زۆر بە دەســەڵات بووە. پێنج گەنجی نیزامی لە شاکارە بەرزەکانی ئەدەبی جیهــان دەژمێردرێن؛ بەڵام چیرۆکەکانی نیزامــی بەتایبەتی لەیلا و مەجنوونەکەی لایەنی ئەفســانەیی زۆر بەهێزترە. جگە لەوە ئەدەبی فارسی لە ســەردەمی سەفەوییەکان زۆر خراپ گەڕاوەتەوە دواوە و بەچوار ناڵ پاشەکشەی کردووە و لە واقیع دوور بۆتەوە؛ کەچی خانــی خەریک بووە لەوکاتەدا لە واقیع نیزیک بێتەوە. تەنانەت لە هێندێک جێدا کە دوور بۆتەوە، عوزری هێناوەتەوە، ئەوەیە گوتوویانە پیاوی هەڵکەوتە زەمان و مەکان ناناسێ.

مەم لە بەیتەکەدا تاقە کوڕەی براهیم پاشــای یەمەنە و لە ســێوی بەهەشت گووراوە. کەچی خانی ڕەســەنەکەی لێ ئەستاندۆتەوە و کردوویەتی بەکوڕی نووسەری میر، لاوێکی جوان و پاک و خاوێن، بەڵام ئاسایی بووە و هیچ لە سێوی بەهەشەت و شتی وا نەگووراوە و ئاوامان پێ دەناسێنێ:

تاژدیــن وەلــــەدی وەزیــــر دیــــوان
مــەم ژی خــەلــەفــی دەبیــر دیــوان

***

هەژار دەڵێ:

مــەم ڕۆڵــــەی نــــووســەرێکی میــر بــوو




## تاژدیـــن کــوڕی گـــــەورەتــر وەزیـــــر بــوو

لێرەشـــدا خانی لایەنی ئەفسانەییی بەیتەکەی بەرداوە، عرفۆ و چەکۆش لە بەیتەکەدا- وەک مەم - شازادەن و ئەوانیش گیرۆدەی زین و میوانی قەرەتاژدینن؛ کەچی خانی بەبرای قەرەتاژدینیان دەناسێ:

تاژدیـــن دوو بـــــرا هـــەبــوون دقـــلاش
مـــاننــد دوو شـــاهباز جمـــاش
دایـــم دلـــێ دژمنـــــان دەســـۆتن
یـــەک عارفـــــۆ و یـــەک چکـــۆ دگۆتـــن

بەنگینـــە کـــە لە بەیتەکەدا هاودەمـــی مندالّی و نۆکەری بەئەمەکـــی مەمە و ڕۆڵێکی گـــەورە دەگێـــڕێ. لە مەم و زینی خانیدا ناوی نییە و گورگینی پیاوی میریش جێگای ئەو ناگرێتەوە.

بەکر لە مەم و زینی خانیدا و لە بەیتەکەشـــدا هەیە و هەر خودای شـــەڕ و خراپەیە؛ بـــەڵام پلەوپایـــە و هۆی دژمنایەتیی دەگـــەڵ مەم و زین فەرقی هەیـــە. لێرەدا هەرچەند زۆر بەجەســـارەتی دەزانـــم، بەڵام پێم وایە لە بارەی بەکـــردا بەیتەکە لە واقیعی کۆمەڵی کوردەواری نێزیکترە. بەکر لە بەیتەکەدا گەورە پیاو و هاوشـــانی قەرەتاژدینە؛ ئینکەبەری دەگەڵ قەرەتاژدین دەکا و قسەشـــی لەکن میر ڕەواجی زۆرە. مەم بەقسەی مەلەک ڕیحان دەپێشـــدا دەچێتە ماڵە بەکر؛ بەڵام کەســـی لێ وەدەرناکەوێ و زیز دەبێ و دەچێتە ماڵە قەرەتاژدین. بەکر ئەوەی بۆ شـــانی خۆی بەســـووکایەتیی دەزانێ و دەیەوەێ تۆڵەی لە مەم و قەرەتاژدین بکاتەوە. بۆیە دەســـت دەکا بە شەیتانی و ئەو گوڵمەزە دەگێڕێ و ئەو هەموو خراپە دەکا و وڵات دەشێوێنێ. ماڵە قەرەتاژدین بەسووتاندن دەدا، مەم لە بەندێدا دەڕزێنێ و دەمرێنێ، زین بەو دەردە دەبا، خۆشی بەکوشتن دەدا و دوایی بەو چیرۆکە پڕ لـــە دەرد و ماتەمە دێنێ. ئـــەم ڕووداوە هیچ لە واقیعی کۆمەڵەی کوردەواری دوور نییە و پەیوەندی بەڕادەی ڕق هەستان و کار لەدەست هاتنی ئەو کەسەوە هەیە کە سووکایەتیی وای پێ دەکرێ. ئێســـتاش ئەو ڕەســـمە لەنێو هەموو توێژەکانی کۆمەڵی کوردەواری - بە

تایبه‌تی له‌نێو پیاوماقووڵه‌کاندا. هه‌ر ماوه‌ و ڕوو له‌ هه‌ر ماڵێکی کورد بکه‌ی و لانه‌ده‌ی و بچیه‌ مه‌ڵه‌ دژمنی ئه‌و، هه‌رچی له‌ ده‌ستی بێ له‌گه‌ڵت ده‌کا و ده‌بێته‌ دژمنت.

به‌کــر له‌ مه‌م و زینی خانیـــدا گه‌وره‌پیاو نییه‌؛ کوێخاده‌رکێکی خوێڕی و شـــه‌یتان و شـــۆفاره‌ که‌ دژمنایه‌تیی پێشووی ده‌گه‌ڵ مه‌م نییه‌ و هه‌ر له‌به‌ر پیسیی سرشت و نیهادی خۆی ئه‌و کێشـــه‌ و ئاشووبه‌ ده‌نێته‌وه‌. خانی ئه‌مر پاش باسێکی فه‌یله‌سووفانه‌ ئاوا باسی به‌کر ده‌کا:

القصـــــه بـــاقتضــای خلقــت
میــری بــه کمــال عــزّ و رفعــت
راگــرت ژ بــۆ خــۆ درگڤانــک
فتــــان زمانــه صــــی پصانــک
دایــم لــه دری وی قاپوچــی بــوو
قــلاّع و قــلاّش و قهوچــی بــوو
ئه‌ممــا بــه نسـب نه‌مــرد بوهتان
بلکـــــه متولـــدی دبــوهتـــان
اصلــی وی دبیــن مرگڤــر بــوو
محضــا وی بشــر بشــوور و شــڕ بــوو
نافــیٚ وی منافــق بکــر بــوو
بلکــه ژبلــوقیــا بتـــر بــوو
منــاع و مـــذبذبیـــــن و ابلیــس
خــدّا ع و خبــر بزیــن و تلبیــس
شــاگرد شـــــامتـــا وی شــیطان
شــرمنده ژ گـــــوهتنــا وی بوهتــان
بدچهـــــره ژ رنگــی دیــو کابــووس
بــد فعــل و ســتیزه‌کار و ســالووس




خانی ئەو سـۆفییە پاک و دڵ فراوانەی کە پێی خۆشـە شـەیتانیش ببەخشـرێ و نەسـووتێندرێ. بەکرە مەرگەوەڕیش پاش ئەو هەموو خراپە و تاوانە دەبەخشێ و نەتەنیا لێی خۆش دەبێ، بەڵکە لە بەهەشـتدا دەیکا بە دەرکەوانی کۆشـکی مەم و زین. بەڵام نەتەوەی کورد، بەکری نەبەخشـیوە و نابەخشێ و ئێستاش یەکێک لە ناخۆشەویستترین پیاوانی مێژووی کوردستانە و ڕۆژ نییە تووک و لەعنەتی بۆ نەچێ. وادیارە زەمانی پێشوو-باسـی ئێستا ناکەم - دووزمانی و شـۆفاری لە کۆمەڵی کوردەواریدا کردەوەیەکی یەکجار دزێو و ناشیرین بووە.

لـە پێشـەوە گوتـم بەیتەکـە دروشـمی ئاینـی زەردەشـتیی پێوە هەیـە؛ بەڵام چونکـە ویسـتی سـەرەتاییی ئینسـانان لە هـەر ڕەگەزێک بـن و بیروبڕوایـان هەر چۆنێـک بێ یەکە، ئەگەر ورد سـەرنج بدەینە ئەو بەیتە شـتی وای تێـدا دەبینن کە لە تەوراتـدا دیومانـە؛ ئایـا وەختێک تۆ دەخوێنیـەوە کە پەریان زین لـە جزیری بۆ مەم دەبـەن، وەبیـرت نایەتەوە کە چۆن دێو بڵقیسـایان لە سـەباوە بۆ سولەیمان برد؟ یـا ئەگەر گوێـت لێ دەبێ کاتێک مەم و بەنگین بۆ یەکەم جار تیشـکی هەتاویان دی و گوتیان «ئەوە خولایە»، حیکایەتی ئیبراهیم پێغەمبەرت وەبیر نایەتەوە؟

ئـەو بەیتانـە هەموویان پیـاوی هونەرمەند و بێ دەسـەڵات دایاننـاون و بۆ پیاوی دەسەڵاتداریان گوتوون. بەڵام بێ ئەوەی بۆ خۆیان ئاگادار بن ناتەباییی چینایەتی و ویست و ئاواتی خۆیان تێدا گونجاندووە و چاری غەیرە عیلمییان بۆ دۆزیوەتەوە. لە بەیتی مەم و زیندا شایەر ویستوویەتی نۆکەر جێی ئاغا بگرێتەوە. بەڵام نەک بە خەبات و بەربەرەکانی بەڵکە بەفیداکاری و وەفاداری. بەنگینە ئەوپەڕی فیداکاری نیشـان دەدا، تەنیا کەسـێکە کە ئاغای خۆی بەجێ نایەڵێ و ئەمەگداری خۆی دەسـەلمێنێ. مەمیش دەڵێ ئیدی ئاغا و نۆکەر نین و بووینە برای دایک و بابی. کەچی بڕیارەکەی هەڵدەوەشـێنێتەوە و هێندە پێ ناچێ وەک دیلێک دیبەخشـێ. شـایەر تۆڵەی ئەو بێ ئەمەگییە لە مەم دەکاتەوە و بەو دەردەی دەبا. بەڵام نایەڵێ بەنگین پەڵەی بێوەفاییی پێوە بنووسـێ. لەشکر دێنێ و تۆڵەی ئاغای خۆی دەسـتێنێتەوە. براهیم پادشای زگ سووتاوی وەجاغ کوێریش چاکەی دەداتەوە و شاری یەمەنێ بە بەنگینە دەسپێرێ. بەوجۆرە ئاواتی شایەر پێک دێ و نۆکەر دەگاتە پلەی ئاغایەتی.

***




# لاس و خەزاڵ

بەیتی سـێیەمی کتێبەکەی ئۆسکارمان لاس و خەزاڵە. ئەم بەیتە بەڕاستی شاکارێکی ئەدەبیی بەرز و کەم وێنەیە. زۆر شـتمان لە ڕێوشـوێنی کۆنـی نەتەوایەتیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. دەپێشـدا بەیتبێژ بە قسە، باسـی گۆڕان و لە دایکبوون و پێگەیشتنی لاس، قارەمانی چیرۆکەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە؛ ئەوجار شیعر دەست پێ دەکا.

شـیعرەکانی هەتا حـەز بکەی لەتیف و جوان و پڕ مانان. میسـرەعەکانی زۆر - زۆر درێژن؛ بەڵام وشـە ڕەسەن و جوانەکانی وا هەڵبژێردراون و لە تەنیشت یەک داندراون کە کێشـەکە دەپارێزن. جارجار نیوە شـیعرەکان کورت دەبنەوە. شیعرەکان جاری وایە زۆر لەسـەر قافیەیەک دەڕۆن و جاری وایە کەم. کورتی ببڕمـەوە باری ئەدەبیی بەیتی لاس و خـەزاڵ بە بڕوای من زۆر باشـە بێگومان ئەو بەیتـە زۆر کۆنە؛ لە مەم و زینیش کۆنتر دێتە پێش چاو. لاس دارێکی سەخت و چڕ و دڕکاوییە. دیارە ئینسانی کورد پێش ئەوەی کۆخێکی بۆ خۆی دروسـت بکا، هەر لەو وەختەوە کە لە ئەشـکەوت و زندۆڵ و لێڕەواردا ژیاوە ئەو دارەی ناسـیوەو و ناوی لێ ناوە. چونکە دارەکە سەخت و دڕکاوی بووە، دوایە کوڕیان بەناوەوە کردووە. ئەو ناوە کۆنە لە چیرۆکەکەدا هەر ماوەتەوە. ئەگەر ناوەکانی تر گۆڕاون، ئەگەر شتی تازەی هاتوونە نێو، ڕیشەی چیرۆکەکە هەر کۆن دیارە.

بەلێکدانـەوەی من ئەو بەیتە لە زمانی مێوەجاغی، یانی لەو سـەردەمەدا کە مێژووی خۆمان و دەوروپشتماندا نابینین. کۆنترین کتێبی شیعر و مێژووی فارسی (شانامە) دەڵێ کاتێک ساسـانیەکان پیاویان لێ بڕا و نێرەوەزێکی شـازادە و ڕەسەن نەما لەسەر تەخت دانیشـێ، دوو کچی خوسـرەو پەرویز ئازەرمیدوخت و پووران دوخت، یەک بەدوو یەکدا چوونە سـەر تەختی پادشـایەتی. بەڵام هەردووک زۆر کەمیان خۆڕاگرت. فیردەوسی زۆر بەپەرۆشەوە دەڵێ:

شـکوهی نمانـد درآن خانـدان
کـه بانـگ خـروس آیـد از ماکیـان




یانی:

مەزنایەتی لە خێزانێکدا نامێنێ

کە مریشک وەک کەڵەشێر بخوێنێ

فیردەوسی پتر کە هەزار ساڵ لەوەی پێش، مەزنایەتیی ژنی بەچارەڕەشی و لێقەومانی گەل و بنەماڵەی پادشـایەتیی زانیوە، کەچی تەماشـا دەکەین لەو بەیتەدا دوو ژن مەزن و سـەرۆکی عەشـیرەت و عێلی خۆیانن و دامـودەزگای مەزنایەتیـان هەیە و لە هەموو خۆشتر، لەسـەر لاوێک نێوان ناخۆشـییان لەنێو پەیدابووە. تەواو بەپێچەوانەی مێژووی تۆمارکراومان، کە زۆرجار بیسـتوومانە دوو مەزنی پیاو لەسەر کیژێک دژمنایەتییان بووە و بەگژیەکدا چوون.

هەر شـتێک پیشەیەکی نەبێ لک و پۆپی لێ نابێتەوە. ئەم بەیتەش دەبێ پیشەیەکی هەبووبێ؛ ڕۆژگارێک لە ناوچەیەکی ئەو کوردسـتانە دوو ژن سـەردار و مەزن بوون. جا گرنگ نییە ئەو ناوچە کوێیە و ئەو ژنانە خانزادی حەریری و یای خەزاڵی مەلا نەبیانن یا دوو ژنی دیکەن.

خەزاڵ مەزن و هەمەکارەی خێڵی مامودینانە. مەلا نەبی باوکیشی ماوە و کەچی خەزاڵ هەر وا بۆخۆی پێ ڕادەگا. بە ئاشکرایی دەگەڵ لاس دڵداری دەکا.

بیریکەنـەوە، لەو زەمانانەدا کە کـورد مەلا نەبیی لێ پەیدابووە و قەننەداری گرتووە، ڕێوشـوێنی نەتەوایەتی و بیر و بڕوای مەزەبی دەسـتەڵات و ئیختیاری وای داوە بە ژن؟ دڵداریـی لاس و خـەزاڵ وەک دڵداریی مـەم و زین نییە. خـەزاڵ وەک زین کچۆڵەیەکی بێدەسەڵات و بێ ئەزموون نییە.

خەزاڵ ژنێکە کە تەنانەت لاسیشـی هێناوەتە ژێر فەرمانی خۆی. خانزادیش ئەگەرچی لاس بێ وەفاییی دەگەڵ کردووە و بەجێی هێشـتووە، یا باشـتر بڵێم خەزاڵ لاسـی لێ داگیرکردووە، دیسان هەر مەزن و دەستەڵاتداری عێڵ و عەشیرەتی خۆیەتی.

باری دڵداریی بەیتی لاس و خەزاڵ زۆر شـیرین و جوان و تەواوە. باری حەماسیشـی گەلێک بەهێزە. پیاو کە دەیخوێنێتەوە، شـیعرەکانی شانامەی فیردەوسی وەبیردێتەوە کە ڕۆستەمی پاڵەوان لە مەیدانی شەڕێدا بەخۆی هەڵدەڵێ:

«چـو فـردا برآیـد بلنـد آفتـاب
مـن و گـــرز و میـــدان افراسـیاب
چنانـش بکوبـم بگـــرز گـــران
کـه پـــولاد کـــوبنـد آهنگـران»

لاسیش دەڵێ:

شەڕی کاوڕان نییە شەڕی بەرانە

ژنانو دەکەمە ئێخسیر، جێ ماڵو دەکەمە سەبزیخانە

ئەوی لەو بەیتەدا دڵی خوێنەر یا گوێگر دەسووتێنێ و پیاو خەمناک دەکا، بێوەفاییی لاســە دەگــەڵ خانزاد کە هیچ وەک کردەوەی پاڵەوانــی بەناوبانگ ناچێ. ئەو لاوە ئازا و زەبریەدەســتە و گیــرۆدەی خەزاڵ بــووە. پاش وەی خەزاڵ ئیجازەی دەدا بچێ ســەری عەشیرەتی خۆیان بدا، هەزار سوێندی بۆ دەخوا کە لەبزی دە لەبزی خانزاد نەگەڕێ. لاس دەچێتــەوە بەرەو هەواری خۆیان. خانزاد پێ دەزانێ، تەدارەکی بۆ دەگرێ؛ خێر و خێرات دەکا؛ تەنانەت سوپاسی خەزاڵیش دەکا کە لاسی بۆ ئیزن داوە و دەڵێ:

«خەبەری یای خەزاڵم بۆ بێنن دەگەڵم وەکو خوشکانە،

«لاسی ناردۆتەوە ئێرەکانە،

«پێڵاوی لەسەر چاوانە.

بەڵام لاس ناپیاوی دەکا و ســەری لێ نادا و ئەحواڵی ناپرســێ و زوو دەگەڕێتەوە بۆ هۆبەی خەزاڵێ و کە دەگاتەوە وەک ترسەنۆکێک دەڵێ:

«یای خەزاڵ بەسەری تۆ لەبزم دە لەبزی خانزادخانی نەگەڕامەوە.

«خانزادی دڵشکاویش تووکی لێ دەکا و دەڵێ:

یا ڕەبی لاسەشۆڕ هەڕۆ بڕۆ سەر نەیەنیەوە دواوە،

«بزانە دەگەڵ ئەو عێل و مەخلووقەی چم لێ قەوماوە،

«هەزار و حەوسەد ماڵی باڵەکیان بەسەر ئەمندا بەجێ ماوە.

لاس دەگەڕێتەوە و خەزاڵ لە وەڵامی لاســدا کە دەڵێ: پێم نەکراوە هیچ دیارییەکت بۆ بێنم، دەڵێ:

«هیچم ناوێ لاسەشۆڕە وەکازی دەستانم،

«ئەمن خانەخوێم ئەتوو ببە میوانم»

بێ ئەوەی بیر لە حاڵی خانزاد بکەنەوە خەریکی کەیف و ئەهەنگی خۆیان دەبن.

«لاس لەوێ دەبێ هەتتا سبحەینانێ،

«ئەوێ شەوێ خۆش ڕادەبرێ دەگەڵ گوزەرانێ.

خوشـــگوزەرانی زۆر دەوام ناکا. خەزاڵی هەوەسباز و جوانی پەرەست لاسی پاڵەوانی ئازا و زبەربەدەست، بەلام ئالی و بێ دەسەلات، دەنێرێتە چلپلەی عومانێ گوڵی شۆڕانێی بۆ بێنێ و دەڵێ:

«چ بکەم ئەوەش دەبێتە خەم، ئەمن بابان وێرانێ،

«پێیان گوتم گوڵی شۆڕانێ هەن لە چل پلەی عومانێ،

«چرا و لالەت ناوێ سەربەخۆ داییسێ هەتتا سبحەیانێ.

لاس دەڵێ:

یای خەزاڵ بزانە چۆن کارانت بۆ پێک دێنم،

یان سەری خۆم دادەنێم یا گوڵی شۆڕانێت بۆ دێنم.

لاس بـــەدوای هـــەوای خەزاڵدا دەڕوا بۆ چل پلەی عومانێ. ئەو ســـەفەرە کورت و پڕ مەترسییەی، ئەو حەوت خوانی ڕۆستەممان وەبیردێنێتەوە. ڕاستە گوڵی شۆڕان بۆ خەزاڵێ دێنێ، بەلام ســـەری خۆشـــی دادەنـــێ. وەبەر تیری چڵکنان دێ و بریـــندار دەبێ خانزاد بەبرینداری نایەتە ســـەری، دەگەڵ ئەوەشدا خەزاڵ لە دوای دەنێری. بەلام کە دەمرێ دێ و وێڕای خەزاڵ شـــینی بۆ دەگێڕێ. ئەم تیری چڵکنانە من دەباتەوە نێو قووڵایی مێژوو، گەڕانەوەی دە هەزار ســـوارەی یۆنانـــی و گەزەنەفۆنم وەبیردێنێتەوە کە دەڵێ: کوردەکان بۆسەیان بۆ دادەنایەوە و تیرەکانیان لە ناکاو گورچووی دەبڕین.

***

# ناسر و ماڵ ماڵ

چواره‌م به‌یتی کتێبه‌که‌ی ئۆسکارمان ناسر و ماڵ ماڵه؛ به‌یتێکی ڕه‌وان و خۆشی دڵداری و حه‌ماسییه. زۆرجار له زۆر که‌سانم ئه‌و به‌یته بیستووه؛ ته‌نانه‌ت به‌چاپکراویش دیومه. ڕه‌نگه ئه‌و تێکسته له هه‌موویان باشتر و ته‌واوتر بێ. ئه‌م به‌یته زۆر کۆن نییه، کوێستانی گاگه‌ش باوه‌مه‌ر ئێستاش ناوی نه‌گۆڕاوه. له کوردستانی ئێران و له مه‌ڵبه‌ندی مه‌نگوڕانه؛ له نێوان سه‌رده‌شت و مه‌هاباد هه‌ڵکه‌وتووه. له هه‌ردووکان نیزیکه. کوێستانێکی یه‌کجار زه‌نوێر و سازگار و بژوێن و زه‌مه‌ند و ئاووهه‌وا خۆشه. به‌هاران چاوی کوێری پێ ڕوون ده‌بێته‌وه و به سوێسن و هه‌ڵاله و به‌یبوون و شلێره ده‌ڕازێته‌وه. قه‌بری ناسر و ماڵ ماڵ له نێوان گوندی گاگه‌ش و شه‌کربه‌گ هه‌ریه‌که له‌سه‌ر گردێکی بچووک ئێستاکه‌ش ماون. چوومه سه‌ریان گۆڕی ساکارن، هیچیان له کێله‌کان نه‌نووسراوه، به‌ڵام زۆر درێژ هه‌ڵخراون. له‌وه درێژترن که پیاو بڕوا بکا پیاوی ئه‌وه‌نده که‌ڵه‌گه‌ت له کوردستاندا هه‌بوون. دیاره به‌ئانقه‌ست بۆ ئه‌وه‌ی پاڵه‌وانه‌تیی ئه‌وان نیشان بده‌ن گۆڕه‌کانیان وا درێژ هه‌ڵخستوون.

قه‌بری کورده‌ش له‌سه‌ر گردێکی دیکه هه‌ر ماوه. ئه‌و به‌رده‌ی کورده له‌سه‌ری دانیشتووه له خۆی نه‌بزووتووه. کانی ناسر و ماڵ ماڵان وشک نه‌بووه ئه‌وانه هه‌موویان نیشانه‌ی ئه‌وه‌ن که به‌یته‌که زۆر کۆن نییه. جگه له‌وه چیرۆکه‌که به‌جوانی لێی وه‌ده‌رده‌که‌وێ که له پاش دابه‌شکردنی کوردستان و بێده‌سته‌ڵاتیی ده‌ره‌به‌گایه‌تیی ناوخۆی کوردستان ڕووی داوه. سه‌یریش نییه ده‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا که گاگاش که‌وتۆته نێو سنووری ئێران له به‌غداوه مه‌زنی بۆ داندرابێ. ناوچه‌که زۆر له سنوور دوور نییه، وێ ده‌چێ له زه‌مانی قاجاڕاندا بووبێ، که ده‌وڵه‌تی ئێران زۆر بێده‌سته‌ڵات بووه.

به‌و لێکدانانه‌وه ناتوانین ڕاستییه‌که‌ی بدۆزینه‌وه، به‌ڵام ده‌وه ده‌گه‌ین کاره‌ساتی ناسر و ماڵ ماڵ له زه‌مانێکدا قه‌وماوه که ده‌ره‌به‌گی کورد ڕێوشوێنی بێگانه‌کان - به‌تایبه‌تی عوسمانییه‌کانی - ڕه‌چاو کردووه. ژن له سه‌رده‌می ده‌ره‌به‌گایه‌تیی خۆمانه‌دا زۆر سووک نه‌بووه و تا ڕاده‌یه‌ک ڕێزی لێ گیراوه، له‌و به‌یته‌دا به‌ته‌واوی بۆته دیل و کۆیله‌ی باب و برای. ته‌ماشا بکه‌ن خاتوون ته‌ورێزی له وه‌ڵامی گله‌ییی ماڵ ماڵدا ده‌ڵێ چی؟

«خوڵاکه‌ی بزانه سووچ و تاوانی من چییه؟




«ئەمن بابم لێ ڕاوەستابوو بە خەنجەرێ، برام بە شیری ڕووتییە،
«کوشتن و مردنم قبوول دەکرد نەمدەداوە وەکیلییە،
«بۆیەکم وەکیلی داوە، تا دەگەڵ ناسر و ماڵ ماڵان نەیێتەوە دیدار ئاخرەتییە،
«دەگەڵ ئەتوو نا ماڵ ماڵ ئەمما دەگەڵ ناسری ئی من و ناسری خوشک و برایەتییە،
«چ بکەم ئەتوو ئەمنت ناوێ کاری خولای ڕەبببیە».

باری ئەدەبیی بەیتەکە باشــە و باری حەماسیشـــی هەروا؛ شــیعرەکانی مەوزوون و قافیەدارن. نیوە شـــیعرەکانی کورت و درێژیان هەیە. لەسەریەک بەیتێکی باشە. ڕەحمان بەکر کە لە ئاخری هەموو بەیتەکان ناوی خۆی دێنێ، دیارە تێ گەیشتووە کارەکەی نرخی هەیە و قازانجی نەتەوەکەی تێدایە، بۆیە دەڵێ: «هەزار ڕەحمەت لە بابی (ڕەحمان بەکر) ی ئەو بەیتـــەی ڕۆناوە؛ خولا دەوامی ئیمپراتۆری بدا ئەگەر (ســـاحیبی) ئاڵمانی ناردووە عیلمی کوردی بکا تەواوە».

***

## برایمۆک

بەیتی پێنجەمی ئەم کتێبە، بەیتی برایمۆکە .ئەو بەیتەی زۆر مەشهوورە. گەلێک جارم ئەو بەیتە بیســـتووە. وەک لەبیرم بێ ئەوەی لە سەید عەلاوی سەید مینەم بیستووە، زۆر درێژتر و جوانتر و خۆشـــتر بوو لەو تێکستەی ئۆســـکارمان بۆی تۆمار کردووین. وادیارە ڕەحمان بەکر لەو بەیتەدا زۆر وەســـتا نەبووە. خۆ مەرج نییە بەیتبێژێک هەموو بەیتەکان باش بزانێ. ڕەخنەیەک کە ئەو کتێبە دەگرێتەوە ئەوەیە بەشـــی هەرەزۆری بەیتەکان هەر شایەرێک گوتوونی.

ڕەحمان بەکر خۆی شـــایەرێکی زۆر وەســـتا بووە. بەیتی داناون و بەیتە کۆنەکانیشی زانیـــون. لە هێندێکیاندا یەکجار وەســـتا بووە و هێندێکی بـــاش نەزانیون. بەو حاڵەوەش برایمۆکی ڕەحمان بەکر زۆر ڕێکوپێک و لەبارە. نیوە شیعرەکانی زۆربەیان درێژن، درێژ و مەوزوون؛ قافیەگۆڕیی تێدایە. بەڵام جاری وایە زۆر لەسەر قافیەیەک دەڕوا.

بەشێکی چیرۆکەکە بە قسە دەگێڕێتەوە. چیرۆکێکی دڵدارییە نۆکەرێک حەز لە خوشکی ئاغاکەی دەکا و لەو ڕێگایەدا زۆر ڕەنج و جەفا دەکێشێ. لەسەر تکای گراوییەکەی، حەوت ساڵی ڕەبەق ئاغا گولەکەی دەگێڕێ تا بە دەرمانێکی سەیر و ئەفسانەیی چاری دێ.




میرشێخ لە کاتی نەخۆشیدا بەڵێنی دابوو پەریخانی خوشکی بدا بە برایمۆکی. تەنانەت سوڵتانی ئەستەمبووڵیش فەرمانی لەو بارەدا مۆرکردبوو. نازانم بۆ میر خۆی گێل کردووە و برایمیش بێدەنگ بووە، تا میرحەج براکەی دیکەی خاتوون پەریخان بەو کەینوبەینەی زانیوە. ڕەگی دەرەبەگایەتیی بزوتووە و بە چلووی زستانێ برایمۆکی دەرکردووە.

دەرکردنی برایمۆک ئەوندە بێڕەحمانە و ناپیاوانە و ڕزگاربوونی لە سەرما و بەفری زستانێ ئەوندە سیروسەمەرە بووە کە بۆتە زەربولمەسەل و ئێستاش لەبیر نەچۆتەوە. لە کوردەواریدا ئەگەر یەکێک دەرکرا دەڵێن بە دەردی برایم چوو. یا ئەگەر ئاغایەک هەڕەشەی لە مسکێنێکی دەکا، دەڵێ: «وەک برایمۆکی بە چلووان دەرت دەکەم». ئۆسکارمانیش لە پەراوێزێکدا ئیشارەی بەو مەبەستە کردووە.

ئەم بەیتە تازەیە لە زەمانی دەستەڵاتی عوسمانییەکان بەسەر کوردستاندا گوتراوە. زۆر بەڕێزەوە باسی سوڵتانی ئەستەمبووڵێ دەکا. دەیگەیەنێتە ڕیزی پیاوەکانی خودای. ئەو سەردەمەمان وەبیر دەخاتەوە کە لە سوڵتانەکانی عوسمانی بەناوی دینەوە بەشی زۆری موسڵمانانیان دەچەوساندنەوە و وایان فریودابوون کە بەخۆیان نەدەزانێ.

لەو بەیتەدا بەیتبێژ هەڵەیەکی زۆر گەورەی کردووە و ئۆسکارمانیش تێی نەگەیشتووە و ئەوی لە زاری هاتۆتەدەر نووسیویەتەوە. منیش ئەو هەقەم بەخۆم نەدا هەڵەکە ڕاست بکەمەوە. هەروەک چۆن نووسراوە نووسیم. بەڵام پێویستم زانی خوێنەر وشیار بکەمەوە. خوێنەر پاش ئەوەی بەیتەکەی خوێندەوە دەزانێ ئەو کەسەی گول بووە و برایمۆک گێڕاویەتی و ئەو هەموو جەفایەی دەگەڵ کێشاوە، میرشێخە و ئەوەی ئەو هەموو خراپەی دەگەڵ دەکا و ئەو پەیوەندەی بەسەردێنێ و بە چلووی زستانێ و بە مانگی کانوونێ دەری دەکا لە وڵاتی، میرحەجە. لە زۆر جێی بەیتەکەدا ناوی میرشێخ بەگول براوە. کەچی کاتێک میر حەج دوولکی لەسەر ئەستۆی برایمی دادەگرێ و هەردووک پێی لێ دە کەوشێک دەکا و حوکمی لەسەر دادەنێ بڕوا، برایم چاکەی خۆی بەچاویدا دەداتەوە و دۆ و دۆشاوی تێکەڵ دەکا و دەڵێ:

«میر بەقوربانت دەبم، خۆ نانی ئاغایان بۆ نۆکەران منەتی نینە،

« هەر نانی خۆت بەفکرە ئەمەگی منی قەلەندەرت بەفکر نینە،

«ئەتوو گولێک بووی لەوانی نفرینە،

«حەوت ساڵانم سواڵ بۆ کردی، سێبەرم بۆ دەکردی لە گوێی کەرێ شینە،

«بەوانەش قایل نەبووم بردمیە ئەستەمبووڵێ بۆ خزمەت سوڵتانی ئەمینە،

دەچوومە کن شوان و گاوانان دە قاپێلکی کیسەڵاندا چۆرەچۆرەی شیرم بۆ توو هینا.
«ئێستا دەڵێی دەرت دەکەم بەدڵ و یەقینە».

ئەو حەوت دێرانە سـیمای بەیتەکە دەگۆڕن و سـەر لە خوێنەر دەشێوێنن چاککردنیان هاسان بوو. بەڵام هەق نەبوو دەستیان لێ بدەم. چۆن نووسرابوون هەر وام نووسینەوە.

پاش ئەو چەند دێرانە برایم هەسـتی دەروونی خۆی دەردەبڕێ و بەخاتوون پەریخان هەڵدەڵێ و بەڕاستی بەندەکانی ناسک و جوانن.

برایمۆک بە هەزار کوێرەوەری و دەردی سـەری دەگاتە ماڵە میرشێخی و بەبێ سەر و زمانی لە کانییە خومارۆیەی دێننەدەرێ. (جێی هەرە ئینسانی چیرۆکەکە ئێرەیە). میرشێخ بەتایبەتی ژنە گەورەکەی، ئەمەگی برایمۆک دەدەنەوە. چارێک بۆ برایمی کەسیرە و سرپوو دەدۆزنـەوە و فیداکارییەک بـۆ ڕزگاریی ئەو لە چەنگاڵی مەرگ ئەنجام دەدەن؛ کە ڕەنگە وێنەتان لە هیچ چیرۆکێکیدا نەخوێندبێتەوە.

برایمۆک لە مردن ڕزگار دەبێ، میرشێخ دەنێرێ خاتوون پەریخان بە فێڵ دێنێتە ماڵە خۆی و لە برایمی مارەدەکا و برایم بەئاوات دەگا:

«کاری هەرتیکیان بوو تەواوە،
«موبارەک بێ بووک و زاوا،
« (ڕەحمان بەکر) ڕاوەستاوە،
«لەنێو کوردی زۆر بەناوە،
«لە سابڵاغی دانراوە،
«حوکمی[1] خاریجەگەری بەوی دراوە،
«ئەلحەملای کارمان تەواوە».

***

---

١ ـ وا دیارە ڕەحمان بەکر لە پاداشی ئەو کارەی کە بۆ ئۆسکارمانی کردووە، کراوە بە تەبەعەی دەوڵەتی ئەڵمان. ئەو سەردەمەی قانوونی کاپیتولاسیۆن لە وڵاتی ئێران هەبووە، ئێرانی زۆریان بوونە تەبەعەی دەوڵەتە گەورەکان و قانوونی ئێران نەیگرتوونەوە. نەمبیستووە پیاوی هەژار و کەم دەست بووبنە تەبەعەی بێگانە، ڕەنگ بێ ڕەحمان بەکری کرمانج لە سایەی هونەرەکەیەوە یەکەم کرمانج بووبێ کە ئەم کارەی بۆ جێبەجێ کرابێ. هێمن




# شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی

شەشـــەم بەیتی کتێبەکەمان بەیتی شـــێخ فەرخ و خاتوون ئەستییە. ئەو بەیتە پاش مەم و زین لە هەمووانی پتر جێ گرتووە. (ڕەحمان بەکر) لەو بەیتەدا زۆر وەستا و شارەزا بووە. زۆر بەڕێ و جێی گوتووە و باش تۆمارکراوە.

دەڵێن فەرخ و ئەستی بە زاری کرمانجی ژووروش چاپ کراوە، بەڵام بەداخەوە وەگیرم نەکەوت تا لەبەریەکیان ڕانێم و جیاوازییەکانیان بخەمە بەرچاو.

بەیتبێژ دەپێشدا بە قسە دەست پێ دەکا و زۆر بەکورتی باسی لە دایکبوونی فەرخمان بۆ دەگێڕێتەوە. (نازانم بۆ بەپێچەوانەی جاران ڕەحمان بەکر قسەکانی پچکر پچکر و تێکەڵ پێکەڵن). پاشان دێتە سەر شیعر. شیعری جوان و ڕەوان، شیعری سوار و ساکار، شیعری بەتاموخوێ و تەڕوپاراو. لەســـەر کێشـــی خۆمانە و تایبەتی و کۆنی کوردی. بۆ دەربڕینی مەبەســـت، جاری وایە نیوە شـــیعرەکانی تەواوێک درێژن و جاری واشە زۆر کورتن. بەڵام لە هەموو حاڵێکدا کێش و موســـیقا پارێزراوە. قافیەی زۆر بەگرنگ گرتووە. شـــیعری بێ قافیەی تێدا نابینی. بەڵام قاعیدەیەکی ڕێکوپێکی نییە، جاری وایە زۆر لەســـەر قافیەیەک ڕۆیوە و جاری وایە هەر تاقە دوو نیوە شـــیعر لەســـەریەک قافیەن. بەستەیە بەهاسانی و گرانیی قافیە، ئەگەر هاســـان بووە زۆری لەســـەر ڕۆیوە و ئەگەر گران بووە خۆی ماندوو نەکـــردووە و زووی بڕیوەتەوە. شـــایەر کۆنەکان دووپاتەکردنەوەی قافیەیان لە شـــیعردا بەعەیب نەزانیوە. ئەم کێش و قافیەیە نەبۆتە هۆی ئەوە شـــایەر لە مەبەســـتی بنەڕەتی دووربێتەوە و لە گێڕانەوەی چیرۆک دامێنێ. ئەم بەیتە بەندی زۆر جوان و مەزموونی نۆر ناسک و شـــاعیرانەی تێدا هەن، تابلۆی زۆر ڕەنگین و هونەرمەندانەی کێشاوە. زمانەکەی زۆر تەڕ و پاراوە. وشـــەی گەلێک ڕەسەن و شـــیرینی کوردیی بەکارهێناوە. بەپێچەوانەی بۆچوونی ئۆســـکارمان، بەیتبێژ لە شـــێوەی موکریانیدا گیری نەخواردووە و لە زاراوەکانی دیکەش گەلێکی کەڵک وەرگرتووە. بەتایبەتی ئەگەر پێداویستی بەقافیە بووبێ.

ئەوەی لەو بەیتەدا سەرنجی منی ڕاکێشاوە و بێگومان سەرنجی خوێنەرە بەڕێزەکانیش ڕادەکێشـــێ تەنیا باری شـــیعر و زمان نییە؛ بەڵکە باری دارشتنی چیرۆکە. ئەم بەیتە لە

کۆمەڵێک چیرۆکی جۆربەجۆر پێک هاتووە کە تێکەڵ کراون و پێکەوە جۆش دراون و ئەم چیرۆکە سەیرەسەمەرەیان لێ پەیدابووە. من زۆرم چیرۆک بیستوون و کەمیشم نەخوێندوونەوە. تا ئێستا: چیرۆکی کورتی وام نەبیستووە و نەخوێندۆتەوە کە ئەوەندەی لکوپۆپ لێ بێتەوە و ئەوەندەی ڕووداوی سەیر تێدا بێ.

ئەم چیرۆکە کورتەی کە شایەری نەناسراوی کورد بۆ ئەوەی بتوانێ بەشەوێک تەواوی بکا، ناچار بووە کورتی بکاتەوە تا شاباشی ئاغای پێ بگا، تا قاوەچی کرێی بداتێ، یا هیچ نەبێ، دانیشتوانی هونەردۆستی مزگەوتی لادێ، ڕەحمەتی بۆ دایک و باوک بنێرن و دەم خۆشێکی پێ بڵێن، ئەگەر بەبیری نووسەرێکی وەک (ئەلکساندر دوما)دا هاتبا، بێگومان چەند بەرگ ڕۆمانی شیرین و درێژی لێ دروست دەکرد.

بەیتبێژ بێ ئەوەی بیڵێ هەودای چیرۆک بپسێ، زۆر باری ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵی کوردەواریمان بۆ دەگێڕێتەوە. ئەو ڕێوشوێنە تایبەتییەش باش و درێوانەمان نیشان دەدا کە ئێستاش ماون و بە تایبەتی لە لادێدا کەمیان گۆڕان بەسەردا هاتوو. ئەگەر ژنێک زا، چۆن ژنانی ئاوەدانی لێی کۆدەبنەوە. ئەگەر کوڕی بوو، چۆن مزگێنی بۆ باوک و کەسوکاری دەبەن؛ چۆن ڕووژووی دەکەنەوە؛ نێوکی دەبڕن و دەیهاوێنە سەر بێژینگ تا حەوتووی دەچێ. ژنی زەیستان چۆن دەکەوێ و مەلۆتکەی لە تەنیشت دادەنێن و بۆ ئەوەی شەوە منداڵەکە نەخنکێنێ و ئاڵ خۆی نەبا، قورعان و دوعای لەسەر دەخوێنن؛ یا هیچ نەبێ قورعانێکی لە پشت سەری دادەنێن. پاش ئەوەی حەوتووی چوو دایک خۆی دەشوا و جلک دەگۆڕێ و منداڵ ناو دەندرێ و داوێژرێتە سەر پشتی لانک و گوێزەبانەی بۆدەگرێ. بەڵام قارەمانی ئەم چیرۆکە گوێزەبانەی بۆ ناکرێ؛ چونکە کارەساتێک دەقەومێنێ کە خزم و کەسوکاری هۆشی ئەو کارەیان نامێنێ. پاش ئەوە باسی مردوو و مردن و شووتن و ناشتن سەرەخۆشی و پرسە و لە مزگەوت کۆبوونەوەمان بۆ دەکا. ئەو ڕێوشوێنەی کە هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە و لەلادێدا هەروەک خۆی ماوە[1].

---

١ - بیستوومە لە ناوچەی پشدەر شەخسێک هەیە ناوی شێخ فەرخە. خەڵکی ئەو ناوچە زۆریان پێ گەورەیە و گۆڕەکەی مەزارە و بۆ نیاز و مرادان دەچنە سەری. ماوەیەک لەوەی پێش لاوێکی خوێندەوار و ڕووناکبیری پشدەری بەڵێنی پێ دام زانیارییەکی تەواوم لەسەر ئەو پیرە بۆ بنووسێ و بۆ بنێرێ. ئەویش بەڵێنی خۆی بەجێ هێنا و نووسراوەکەی لە شوێنی خۆیدا چاپ دەکرێ. شێخ فەرخی پشدەر شێخێک بووە وەک ئەو هەموو شێخانەی دیکە. کەشف و کەراماتی نواندووە و چاکەی دەگەڵ خەڵک کردووە و لە خراپەی گێڕانەوە.

ئەو کەسانەی (تذکره اولیا)ی شێخی عەتار شاعیر و نووسەر و سۆفی بەناوبانگی فارسیان خوێندبێتەوە، دەزانن شێخی وا هەبوون و کاری وایان کردووە پیاو سەری سووڕدەمێنێ و پێی بە عەرزەوە وشک دەبێ. بۆ نموونە لەو کتێبەدا خوێندوومەتەوە ڕۆژێک دوو شێخ لە قوون تەندوورێک کە هەروا نێلەی دەهات پێکەوە ڕۆنیشتبوون. جامێکی ئاوایان بۆ دانان. یەکیان دەستی دە ئاوەکەی هەڵدا و ماسییەکەی زیندووی دەرێنا. ئەوی دیکە گوتی: «جا ئەوە چییە، ماسیماڵی ئاوێیە». ئەوجار بۆ خۆی دەستی ڕۆهێشتە تەندوور و ماسیێکی هێنادەر. ئەویش نەک ماســی برژاو، بەڵکە ماســی زیندوو. یا ئی وایان هەبووە دەرزی دە بەحر هاویشــتووە و دوایە گوتوویەتی دەموێتەوە. هەزاران ماســی لە دەریا هاتوونەدەر و هەریەکە دەرزیێکی زێڕ و زیوویان بەدەمەوە بووە شێخ نەیویستوون و تا ئاخری ئی خۆیان دۆزیوەتەوە و بۆیان هێناوەتەوە! زۆریان بەرماڵی ممبارەکیان هاویشــتۆتە ســەر دەریا و پێی پەڕیونەوە، یا باریان لە شــێری دڕندە ناوە و هەژدیهایان وەک گوریس پێ هەڵداوە. شــێخی عەتار زۆر شتی ســەیرتریان لێ دەگێڕێتەوە. شێخ فەرخی پشدەریش یەکی وەک ئەوانە بووە و کاری وەک ئەوانی کردوون.

بەڵام شــێخ فەرخەی کە خەیاڵی شایەرێک کوردی نەخێندەوار دروستی کردووە، کاری لە کەشف و کەراماتی شــێخانەدا نەهێشتووە و موعجیزاتی پێغەمبەرانەی کردوون. سەیر ئەوەیە بەپێچەوانەی پیاوچاکان، بەباری خراپەدا کەڵکی لەو هێزە خواپێداوە وەرگرتووە.

فەرخ هەر لە دایکی بەردەبێتەوە، وەک عیسا قسە دەکا، خەڵک سەریان سووڕدەمێنێ و بــە ڕموزنی دەزانن. فەرخ لە قەرەواش و مامان و ژنەکانی دەوروبەری دایکی ڕادەخوڕێ و هەڕەشــەیان لێ دەکا و تەنانەت لە هەڕەشەکەیدا وشەی بێگانەش بەکاردێنێ، تا بزانن جگە لە زمانی زگماکی، زمانی دیکەش دەزانێ و دەڵێ:

«ئەو پیرێژن و مامانچی و سەرسپییە،

«هێندێک کێشکچی بن هێندێک بەرن مزگێنییە،

«زۆرو دەدەنێ کەم نییە،

«ئەگەر هێناتانەوە هەموویان لێ بەش دەکەم بە برایەتییە،

«هەر کەس پووڵێکی بدزێ بەحەقی ئەو خولایەی ڕەبییە،

«سەری دەتاشم سواری کەرێی دەکەم (بیروونی) دەکەم لە شاری داودییە».

فەرقی فەرخی دەگەڵ عیســا دوو شــتە. یەکیان: عیسا کە بە ساوایی قسەی کرد، بۆ پاکانەکــردن کە دایکی بوو، قســەکانی باش و خێربوون. بــەو موعجیزە مریەمی بوختان

پێکراو و ئابڕووبراوی کرده ژنێکی پاکی مێژوویی. بەڵام فەرخ، زمانی بەباش و خێر نەگەڕا. جگە لەوەی هەڕەشـــەی پێ لە خەڵک کرد، بەو زمانە تەڕ و پاراوە تووک و نزای لە دایک و باوکە بەســـتەزمانەکانی خۆی کرد و کوشـــتنی. ئەوە یەکەم کاری باشـــی فەرخۆڵەیە، شـــاکارەکانی دیکە دوایە دەبینن. فەرقی دووەم ئەوەیە وەک دەزانن عیسا دڵداری و شتی وای نەکردووە و تا لەسەر عەرزی بووە بە ڕەبەنی ماوەتەوە؛ بەڵام فەرخۆڵەی ئێمە هەر لە زگی دایکیدا ئاشقی خاتوون ئەستی کچی مامی بووە و دایک و باوکە هەژارەکانیشی بۆیە مراندن تا بەکەیفی خۆی کاو لە خاتوون ئەستی ببینێ.

مامی فەرخی ترســا خەبەر بە ســوڵتانی ئەســتەمبووڵێ ڕابگا کــە ڕموزنەی وا لە بنەماڵەکەیاندا پەیدابووە و ئازاریان بدا. دەستووری دا لە تەویلەی کەڵ و گامێشاندا بدەن تا لەبن پێیاندا بچێ.

ئەوە ئەفسانەی زاڵی باوکی ڕۆستەمیمان وەبیر دێنێتەوە. بە قسەی فیردەوسی ئەویش منداڵێکی سەیر بووە. کە هاتۆتە سەر دنیا ڕیش و سمێڵێکی پیاوانەی هەبووە. باوکی کە پاڵەوان و ڕەســـەنزادە بووە، پێی شوورەیی بوو تۆرەی وا سەیروسەمەرەی لەپاش بەجێ بمێنێ. بۆیە ناردی لە بیابان فڕێیاندا. سیمرغ بردی و بەخێوی کرد و عاملاندی و کردی بە پیاوێکی ئەوتۆ کە باوکی شانازیی پێوە بکا[1].

کە فەرخیان هاوێشتە سەر لانک و دەسرازە توند توند شەتەکیان دا، کارێکی وای کرد کە بێگومان لە مێژوودا وێنەی نییە و نەبیســتراوە؛ با لە زمان بەیتبێژەوە کارەساتەکەتان بۆ بگێڕمەوە؛

«تەمەنای کرد لە ڕەبییە،

هەموو کەس خەوی گران بییە،

«وەڵڵاهی چیدی دەو لانکەیدا نابم ئەو شەو دەچمە پاڵ خاتوون ئەستییە.

«فەرخ هاواری دەکردە خولای جەبباری،

«دەسرازەی بەسەر خۆیدا فڕێ دەدا لە لانکێ دەهاتە خوارێ بە یەکجاری»

بە ســـەرینی خاتوون ئەستیە هەڵدەگەڕا، دەرزیی لە بەرۆکی دەرهێنا پێی دە یەخەی کێشـــا بۆ خۆی چووە نێو ســـینگ و مەمکانی بە یەکجاری. دڵداری وا سەیروسەمەرە کێ بیســـتوویەتی؛ مەلۆتکەیەکی ســـەر حەوتوو و چلوان خۆ لە لانـــک هەڵدێرێتە خوارێ، بە

---

١ ـ ئێستاش لە کوردەوایدا ئەگەر ویستیان باسی زانایی و وریایی کەسێک بکەن، دەڵێن دەست پەروەردەی سیمرغە.

سەرین هەڵگەریٚ، بە دەرزی بەرۆکدا خۆ لە ژووریٚ ڕۆکا و بچنە زگ کیژێکی سەر و عوزر شۆڕ. جا توخوا خاتوون ئەستی هەقی نەبووە بڵیٚ: «گولە! ئەتوو دێیە کن ئەمن چت پیٚ دەکریٚ؟» ئەو ژوانانە درێژەیان دەبیٚ و شتی سەیر لەو بابەتەوە لە بەیتەکەدا دەخوێننەوە کە پێویست ناکا من بۆتان بگێڕمەوە.

لەپڕ ڕووداوێکی تازە ڕوودەدا؛ ئاشقێکی دیکە بۆ خاتوون ئەستییە پەیدا دەبیٚ. شێخاڵە کەچەڵێک قوت دەبێتەوە. گەورەپیاوێکی وڵاتی خۆیەتی، کەچی لە سویٚ خاتوون ئەستییە دەبێتە شوانی ماڵی باوکی.

لکێکی تر لە چیرۆکەکە دەبێتەوە. شێخاڵ لەباتی شەرتی شوانی داوای خاتوون ئەستییە دەکا. براکانی و دایک و باوکی ناچار دەبن بەزۆرەملی خاتوون ئەستییە لە شێخاڵ مارە بکەن. بەو مەرجە شێخاڵە کەچەڵ بە (گۆڕەمەرگی) یانی تا مردن بۆیان بچێتە بەرمەڕی. شایەر لێرەدا دیمەنێکی دزیو و ناشیرینی ڕێوشوێنی کۆمەڵایەتیی کوردەواریمان نیشان دەدا. ڕێوشوێنێک کە ماکەی چارەڕەشیی کۆمەڵە دیلی و بێدەستەڵاتی کچ و زوڵم و زۆری برا و ماڵپەرستی و بێبەزەییی دایک و باوک.

خاتوون ئەستی نارازییە، کەس ئەو کارەی پیٚ خۆش نییە. تەنانەت ماڵپەرستی و تەماح، کەسوکاری کچەکەیان ناچارکرد ئەو کارەی بکەن. ئەوان مەڕەکەیان لە کچەکەیان پیٚ بەنرختر بوو، دەنا پێیان خۆش نەبوو شێخاڵ ببێتە زاوایان. لەو نێوەدا تەنیا دوو کەس بەکەیفن، دیارە یەکیان شێخاڵە کەچەڵە. ئەوی دیکە کیٚ بیٚ باشە؟ ڕەنگ بیٚ بەلاتانەوە سەیربیٚ ئەگەر بڵێم ئەوی تر کەس نییە فەرخۆڵەی دڵتەر و شەوگەڕ نەبیٚ، بەڵیٚ. فەرخۆڵە گوێ ناداتە ئەوی گراوییەکەی بەزۆری و بەنابەدڵی بە مێرد دەدەن. بۆچی؟ چونکە دەترسا یەکی دی بەسەر خاتوون ئەستی هەڵوەستیٚ و خاتوون بەبووک بچیٚ؛ بەڵام شێخاڵ زاوابەندە و قەراریش وایە تا خاتوون ئەستی بۆخۆی مل نەدا، بەدەستی نەگریٚ. کەوابوو جاریٚ فەرخ دەرفەتی هەیە کەیفی خۆی بە دۆستەکەی تەخت بکا.

لەو بەیتەدا شتێکی ترمان لە واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆنی کوردەواری و تەئسیری وەزعی ئابووری لەسەر ڕێوشوێنی کۆمەڵایەتیی گەلان بۆ ڕوون دەبێتەوە. ئەمیرێکی کورد کە ئەگەر چیرۆکەکە بخوێننەوە تیٚ دەگەن زۆر بڕوای بە جیاوازیی چینایەتی هەیە- کە حازر دەبیٚ کچی خۆی بدا بە شوانێک. بۆ؟ چونکە تا ئەم دوایانە کورد گەلێکی کۆچەر بووە و بەمەڕداری و ئاژەڵ بەخێوکردن ژیاوە و زۆر کەمی ئاوڕ وەسەر کشتوکاڵ داوەتەوە. دیارە شوانێکی چاک چەند بەکاری مەڕداری دیٚ. لە کتێبەکانی دینیدا خوێندوومانەتەوە




زۆربەی پێغەمبەرەکان شوان بوون و شوانی سوننەتە. ئەوەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی مەڕداری کاری ئەسڵی گەلانی کۆچەر بووە[١].

دیســـان شایەر لکێکی دیکە لە چیرۆکەکە دەکاتەوە و شێخاڵ گرنەی دەگرێ کە دەبێ خاتوون ئەســـتی بێتە مەڕ دۆشـــین. ئەگەر ئەو شوانە، ژنیشی دەبێ بێری بێ. ئەو لکەی چیرۆکەکە هەم زۆر شیرین و خۆشە هەم شتی سەیری تێدان، هەم چەند ڕێوشوێنی کۆنی ســـەردەمی دەرەبەگایەتیی کۆمەڵی کوردەواریمان نیشـــان دەدا کە تا ئێستاش بەتەواوی بنەبڕ نەبوون. شـــیو و کوڵی کیژە ئەمیران، چوونە مەڕی ناســـکە بێرییان، بێر و هاوێری مەڕی و شتی دیکەی وا. فەرخیش بێ کار نییە و ڕۆڵی ئەسڵی هەر ئەو دەیگێڕێ. کچەکان دەخەوێی دەکەن و دەچنە شیو و کوڵ، کە وەخەبەر دێ وەدوویان دەکەوێ. ئەوان خۆیان ڕووت کردۆتـــەوە و خەریکی کاری خۆیانن. فەرخ لە کەلێنی بەردی پاردەوە تەماشـــایان دەکا. کارێکی ســـووک و منداڵانە و بێ شـــەرعییە. ڕاستە لە ڕاست خوشکەکانی خاتوون ئەســـتییە چاو دەقوچێنێ؛ بەڵام هەر لەبەری پێوە تا تۆقی ســـەری دە خاتوون ئەستییە دەفکرێ. بە چ هەقێک ئەو کارە دەکا، مەگەر خاتوون ئەســـتی مارەکراوی پیاوێکی دیکە نییـــە؟ گریمـــان فەرخ زۆر ڕووناکبیر بووبێ و لێکی دابێتەوە خاتوون ئەســـتی بەزۆرەملی مارەکراوە و مارەی لە شـــێخاڵ نەهاتووە، دیسان هەقی نەبوو ئەو کارە ناشیرینە بکا. بۆ ئەوەی ســـەرنجی خاتوون ئەستی ڕابکێشـــێ، کارێکی سەیرتر دەکا. بەردان بەسەر خۆیدا دەڕووخێنێ و بەئانقەست خۆی دەگەیەنێتە حاڵی جاوی. وسو ئاغای بانگ دەکەن یاسینی لەسەر بخوێنێ؛ بەڵام لەپڕ زیندوو دەبێتەوە و نایەڵێ وسو ئاغا- کە ئەویش دڵی بەخاتوون ئەستییەوە هەیە- بێتە پێش.

پاشـــان وســـو ئاغای دەکاتە نۆکەر و پیاوی خۆی. ئەویش بە چ فێڵێک؟ وسو ئاغا لە تـــۆرەی بەکرە مەرگەوەڕە؛ لە جزیری بۆتان هەڵی نەکـــردووە، پەرپیوەی ئەم وڵاتە بووە. کەس بەو ڕازە نازانێ فەرخ نەبێ، چونکە غەیبزانە. کە ئەوەی بە وســـو ئاغا ڕادەگەیەنێ، وسو ئاغا دەست و داوێنی دەبێ ڕاستی لێ نەڵێ. خاتوون ئەستی بەخوشکی خۆی قبووڵ دەکا و بۆ هەمیشە دەبێتە پیاو و پشتیوانی فەرخ و خزمەتی بەنرخی پێ دەکا. تێگەیشتن دووزمانی و شۆفاریی چەند تاوانێکی گەورە بووە؟ تۆرەی پیاوێکی شۆفار بۆ ئەوەی ڕازی نەدرکێ، بەهەموو دەستەڵاتی خۆیەوە ملی بۆ منداڵێک ڕادەکێشێ.

---

١ - مووساش بە زاوابەندی شوانەتیی کردووە.

گوتمان فەرخ کە لە دایک بوو موعجیزەی عیسای نواند، بەڵام بەباری باشدا نا. ئێستا دەبینین موعجیزەی مووســـاش دەنوێنێ؛ دیسان بەباری خراپدا. مووسا وەکارێکی هەبوو دەیکردە هەژدیها. گیانی وەبەر بێگیانێکی دێنا، بۆ ئەوەی سـیحر بەتاڵ بکا؛ بۆ ئەوەی جادووگەران ببەزێنێ؛ بۆ ئەوەی فیرعەونی زاڵم و زۆردار بترسێنێ. بەڵام فەرخ گیاندارێک بێ گیان دەکا؛ ئینسانێک دەکاتە بەرد.

خاتوون ئەســتی و دایکی بۆ دڵدانەوەی شـێخاڵ دەچنە مەڕێ. فـەرخ ناحەجمێ و وەدوویان دەکەوێ. دایکی خاتوون ئەستییە سیری دەخوا و زمانی دەسووتێ و ناماقووڵی دەکا و ئێســتر وەسەر فەرخ دەپەڕێنێ. فەرخ ڕقی لێ هەڵدەگرێ. دەپێشدا تۆڵەیەکی لێ دەســتێنێتەوە و کارێکی وا دەکا کە منداڵی هەرە قۆشمە و بەدفەر نەبێ نایکەن. دڕووی وەبن کلکی ئەو ئێسترە دەدا کە پیرێژنە سەر بەسۆدرەکە سواری بووە. دڕوو وەبن کلکی ئێستردان گاڵتە نییە؛ ئێستر شێت دەبێ. جیفڕک هەڵداوێ. ئەملا و ئەولا دەکا، تا پیرێژن هەڵدەدێرێ و چی وا نامێنێ مل بشکێنێ. فەرخ بەوەشی لە کۆڵ نابێتەوە. دوعای لێ دەکا و دەیکاتە بەردێکی شین.

دەچنە مەڕێ لکێکی شیرین و جوان لە بەیتەکە دەبێتەوە. نامەوێ باسی بکەم. دیسان فەرخ هێزی خۆی نیشـــان دەدا و شـــێخاڵ ڕەق دەکا. کەیفی خۆیەتی شێخاڵ بێ ئەدەبیی دەگـــەڵ کـــردووە؛ بەڵام ئێزندانی گورک بۆ نێو مەڕ، کارێکـــی پیاوچاکانە نەبوو و زەکات بەگورگیدان بەهیچ شـــەرعێک دروســـت نییە. کەچی فەرخی ئێمە بێ ئەوەی ئەو شیعرەی سەعدی لەبیر بێ:

ترحـم بـر پلنـگ تیـز دنـدان
سـتمکاری بـود بـر گوسـفندان

گورگان دەنێرێ لەبەر چاوی باشـــقە شـــوانی مامی، مەڕی بخۆن؛ هەر بۆ ئەوەی هێزی خۆی بە شـــێخاڵ نیشان بدا. لە گەڕانەوەدا خاتوون ئەستی زۆری لەبەر دەپاڕێتەوە دایکی نەجـــات بدا. ئەویش لەبـــەر ئەو گیانی وەبەر دێنێتەوە. بەڵام جارێ تا دەگەنەوە شـــاری دەیکاتە دێڵەســـەگ و نایکاتەوە ئینســـان. ڕاســـتە ئامۆژنی ژنێکی باش نەبوو؛ بەڵام ئەو تۆڵەئەســـتاندنەوەش زۆر بـــێ ڕەحمانەیە. ئامۆژنی نەقڵەکە بـــۆ کوڕەکانی دەگێڕێتەوە و ئەوانیش ئەو ســـووکایەتییەیان پێ قبووڵ ناکرێ. لە فەرخ دەخەفتێن و خەریک دەبن بێ

بەتلێنن. ناچار ڕادەکا و دەچێتە ماڵە وســوئاغا. ماڵە وســو ئاغا زۆر ڕێزی لێ دەگرێ. لەوێش ئیعجازێک دەنوێنێ کە (شەقڤو لقەمەمان) وەبیر دێنێتەوە. هێشتا سێ ڕۆژی ماوە ڕەمەزان تەواو بێ، مامی ڕادەگەیەنێ هەرکەس مزگێنیی جێژنم بۆ بێنێ جوانوو ئەســپێک و کەوڵێکــی جێژنانــە دەدەمێ. فەرخ زەمان دەگۆڕێ و جێژن ســێ ڕۆژە وەپێش دەخا و مانگ دەبیندرێ و جێژنانەی وەردەگرێ. لە هەموو کارەکانی سەیرترە؛ دەستەڵاتێکی زۆری ئینســانە بەسەر تەبیعەتدا. کەس شــتی وای لە دەس نەهاتووە. جگەلەوە تەنیا کارێکی قارەمانی چیرۆکەکەمانە کە قازانجی خۆی تێدایە و بەزیانی کەسیش تەواو نابێ.

کــوڕە مامەکانــی ئەوجار بەفێڵ و دەهۆ خەریکن لەنێوی بەرن. خاتوون ئەســتی پێ دەزانێ نایەڵێ دە داو کەوێ. فەرخ چی دی خۆی پێ ناگیرێ؛ دەپێشــدا کارێکی گەلێک خراپ و ئەتکێکی زۆر گەورە بە کوڕە مامەکانی دەکا.

یەکێک لە ڕەسمە هەرە دزێو خراپەکانی کوردەواری کە بەداخەوە ئێستاش هەر ماوە، گیشــە و گەڵ و خەرمان ســووتاندن، زگی گا دڕین. کلک و گوێی کەر و ئێســتر بڕین و ڕەفیسکە و ڕەمانەی یەکسم هەڵبڕینە. فەرخیش پێش ڕۆیشتن ئەو کارەی کرد. با شایەر بۆتان باس بکا:

« کێ، بوو؟ فەرخۆڵەی نازدارە،

شیری بابی وەچنگ کەوت ئەو جارە،

دەستی دایە بۆ یەختەخانەی ماڵی مامی چووە خوارە،

دەرکی کردەوە چوو لە تەویلەی گرتی قەرارە.

بەتەویلەیدا هات لە ڕەفیسکەی هەموو ماین و ئەسپانی داوە.

قەت یەکێکی بەساغی نەماوە».

پاش ئەو کارە ناشیرینە لێی سواری جوانوولەی خۆی دەبێ و دەچێ بۆ شام بۆ ماڵی خاڵی. لە ڕێگادا تووشی زۆر کوێرەوەری دەبێ؛ بەسەر هەموو کۆسپێکدا زاڵ دەبێ. دیارە نەک بەهێزی شان و باهۆ، بەڵکە بەهێزی مەعنەوی. بەفر دەتوێنێتەوە و نەقڵی شەقبوونی نیلمان بەئیشارەی مووســا وەبیردێنێتەوە، بەزەحمەت لە زێ دەپەڕێتەوە. پیرە باگینێک ئەسپەکەی بریندار دەکا، هەرچەند دوایە پەشیوان دەبێتەوە، فەرخ لێی نابوورێ و تووکی خراپی لە خۆی و تۆرەمەی دەکا.

فەرخ ئەو جار ئیعجازی سولەیمانی پێغەمبەر نیشان دەدا؛ زمانی باڵندان دەزانێ. دوو ڕەشیشــەی نێر و مێ ئەســپەکەی دەڕەوێننەوە، ڕازێک بۆ نێرەکە دەگێڕێتەوە کە دەبێتە

هۆی ئەوە هەموو ســەری مێیەکەی هەڵبچڕێ. لەو موعجیزەش کەڵکی خراپ وەردەگرێ، بەڵام دوایە پەشــیوان دەبێتەوە و دوعای باشــیان بۆ دەکا. لە کەوانیش توورە دەبێ و دوعای لە کەوانیش دەکا. دوعاکەشی گیرابوو.

نازانم لە پیش ئەوەیدا فەرخ دوعا لە کەوان بکا چۆن بوون؟ بەڵام ئەوانەی لە کوێستان ژیاون دەزانن کەوی تیژباڵ دەبەفری یەک نوا و تەڕدا هەر یەک باڵ و دوو باڵ دەفڕێ. کە باڵی تەڕبوو سەری لە بەفرێ ڕۆدەکا و قوونی قووچ دەکاتەوە و بە دەستی دەگیڕێ.

کورتی ببڕینەوە فەرخ بەهەزار ناری عەلی گەیشــتە شــامێ و ماڵی خاڵی. بەڵام ئەو پەندەی پێشینیانی لێ وەڕاست نەگەڕا: «خاڵان خوارزا مەزن کرد، مامان برازا بزر کرد». خاڵــی نەک هــەر بەخێرهاتنی نەکرد، نەک هەر بەپیرییەوە نەچوو، نەک هەر ڕێی نەدا بۆ ماڵــی خۆی، بەڵکە جاڕێ ڕاکێشــا، کەس ڕای نەگرێ. فەرخ پەنای بۆ تەکیەی شــێخان برد.

دیســان لکێکی دیکە لە چیرۆکەکە دەبێتەوە. لکێکی خۆش و شیرین و تەنانەت سەیر و پڕ گاڵتەوگەپ. من نامەوێ لێرەدا باسی ئەو بەشەیان بکەم، تەنیا دەمەوێ ڕێوشوێنێکی ســەیری سیاســی کۆمەڵی کوردەواریتان بخەمە بەرچاو. لەو بەیتــەدا و لە زۆر چیرۆکی دیکەی کوردیدا هەیە و بێگومان ئەســڵێکی هەبووە. کاتێک ئەمیری شارێک دەمرێ یا لێ دەکەوێ، بازی دەوڵەت هەڵداوێن و لەســەر هەر کەس نیشــت ئەوی دەکەنە ئەمیر. سەیر نییە کۆمەڵێک ئینســانی خاوەن عەقڵ و بیروڕا و تەگبیر، ئیختیاری خۆیان بدەنە دەست باڵندەیەکی بێ عەقڵ، گەورە و مەزنیان بۆ هەڵبژێرێ؟ فەرخیش بەو جۆرە بوو بە ئەمیری شــامێ. لەو چیرۆکەدا لەباتــی دەوڵەت کە لە کوردەواریدا زۆر مەشــهوورە دەڵێ: (بازی یەقین)، من ئەوەم هەر لەو بەیتەدا بیســتووە. بەڵام ئەوە زۆر هەیە ئەگەر کەسێک چاکی بۆ هات، کوردە دەڵێ:

«بازی دەوڵەتی لەسەر نیشتووە»

فەرخ بە ئەمیری و مەزنی و تەخت و بەختیش خاتوون ئەســتی لەبیرنەچووە. دیسان بەشــێوەی ســولەیمان پێغەمبەر قاسیدی ناردەکن خاتوون ئەســتی. بەڵام قاسیدی ئەو باڵندەیەکی جوان و پاک و خاوێن بوو. پەپووسڵەمانەی بۆگەن نەبوو؛ قورینگ، قورینگی جوان و نازدار بوو.

باســی ڕازیکردنی شــێخاڵ و ناردنی خاتوون ئەستی بۆ شامێ، دیسان لکێکی دیکەی چیرۆکەکەیە. لەســەر ڕۆینی لێرەدا پێویســت ناکا. بەڵام فەرخی ئەمیر و مەزن، شیرین




کارییەکی دیکە دەکا. پێی وابووە بەربووە و هەمیشــە بۆی دەلوێ، دیسان بەدزی پارێزێ بۆ خاتوون ئەســتییە دەبا کە لە قەراخ شــاری هەڵــی داوە. خەریک دەبێ وەک زەمانی منداڵی دەباڵی خزێ؛ کەچی پاسەوان پێ دەزانن. دەیگرن، جا وەرە لێی دە؛ کوێت دێشێ. هێندیان لێ دا تا دەنگی لە زگی هات. دوایە خاتوون ئەستی ناسییەوە. بۆچی وای کرد؟ بۆخۆی دەزانێ. ئەگەر تا بەیانی سەبری کردبا ئەو لێدانەی دە کیسەیدا دەماوە.

پاش ماوەیەک خاتوون ئەستی دەگەڕێتەوە و دەمرێ و فەرخیش ئۆقرە ناگرێ و دێتەوە وڵاتی خۆی. کە دەزانێ خاتوون ئەســتی مردووە، دەچێ دەســت دە کێلەکەی وەردێنێ و لــە خوڵای دەپاڕێتەوە، یا بیکوژێ یا خاتوون ئەســتییەی بۆ زیندوو بکاتەوە. نزاکەی بە زیانی خۆی گیرا دەبێ:

« هەرچەند دوعای کرد فەرخ بەستەزمانە،

« لێی نەهاتە جواب خاتوون ئەستیی نۆجوانە،

« لە بارەگای خوڵای دەهات میوانە،

« ڕوحیان لێ وەردەگرت ئەو بەستەزمانە،

« دەهاتنە سەری ئەو هەموو خزمانە،

« زەریفیان دەشوت سەید و مەلایانە،

« کن خاتوون ئەستییەی لێ بوو گۆڕخانە

« فەرخ لە خاتوون ئەستییە میوانە».

خوێنەری خۆشەویســت! بەو کورتە باســە بەیتی شــێخ فەرخ و خاتوون ئەستی شی ناکرێتەوە. من تەنیا ویستم سەرنجی ئێوە بۆ لای ئەو بەیتە ڕابکێشم، دەنا ئەگەر کەسێک بیەوێ ئەو بەیتە شی بکاتەوە دەبێ سەدان لاپەڕەی لەسەر بنووسێ. بەدوودڵییەوە دەڵێم وێ دەچێ ئەو بەیتە لە ئەســاتیری یۆنانی وەرگیرابێ. ئاخــر یۆنانییەکان ماوەیەکی زۆر لە کوردســتاندا ماونەتەوە. ئێســتاش بەڵگەمان هەیە بۆ ئەوەی ڕۆژگارێک لەو کوردستانە خەڵک هەبووە بڕوای بە (ئەربابی ئەنواع) بێ. خێوی کانی، خێوی شەو و خێوی دارستان، ئێســتاش لە کوردســتاندا ناوبانگیان هەر ماوە. من بۆ خۆم لە پیرێژنانم بیســتووە هەزار ســوێند و قورعانیان خواردووە کــە خێوی کانییان بە دوو چاوی خۆیــان دیوە. بۆیە تا ڕادەیەکی زۆر پێم وایە ئەسڵی ئەو بەیتە پاشماوەی ئەساتیری یونانییە لە زمانی کوردیدا. دیارە زۆری لەسەر سوور نیم و چی دیی لەسەر ناڕۆم.

# مەمەڵ و برایمی دەشتیان

زۆر پێویســـت ناکا ئەو بەیتەیان کە حەوتەمین بەیتی کتێبەکەیە بۆ شـــی بکەمەوە. بەیتبێژ دەپێشـــدا بە قسە و پاشـــان بە شـــیعر چیرۆکەکەتان بەڕەوانی و ڕێکوپێکی بۆ دەگێڕێتەوە. قسەکانی زۆر ساکار و جوانن و شیعرەکانی گەلێک سوار و ڕەوانن. هەرچەند باســـی ئەوەیە کە کچە ئەمیرێک خۆی بەئەستۆی شوانێکدا بڕیوە، بەڵام لانی دڵداریی بێ هێزە. ســـۆزی ئەوینی تێدا نییە. ئەو شـــیعرە ناسک و پڕ ســـۆزانەی کە لە مەم و زین و برایمـــۆک و لاس و خەزاڵدا هەن، لەو بەیتەدا نایەنە بەرچاو. زۆر ڕووناکە؛ بۆچی؟ چونکە هەوەس کچە ئەمیری ناچار کردووە خۆی بەستۆی شوانەوێڵەدا ببڕێ و ترس شوانی ناچار کردووە دەســـت دەگەڵ ئەو شازادە هەوەسبازە نەخۆشە، تێکەڵ بکا. کە وابوو سەیر نییە کە شیعری دڵداری و ئاشقانەی تێدا نەبێ.

چیرۆکی ئەسڵی ئەو بەیتەش بەبڕوای من زۆر کۆنە. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ میوەجاغی (دایک شـــایی). تێ بفکرن؛ میـــر زۆراب خان بۆخۆی پیربـــووە، ناتوانێ مەزنایەتی بکا. مەزنایەتی و پادشایەتیی بەخاتوون پەریخانی کچی ئەسپاردووە. دەگەڵ ئەوەشدا کە کوڕی هەبووە، بەڵام کوڕەکەی هێشتا منداڵ بووە و کاروباری دەوڵەتی پێ بەڕێوە نەچووە. شتی وا لە مێژووی نوێی گەلی کورد و گەلانی ڕۆژهەڵاتدا نییە. ئێســـتاش شـــای وا هەن کچی گەورەیان هەیە و کوڕی بچووکیان کردۆتە وەلیعادی خۆیان.

خاتوون پەریخان پادشـــایەکی بەزیبک و زاکوون بووە. بەڵام دیارە نەخۆشیی جینسی هەبووە. زانســـتی نوێ ســـەلماندوویەتی ئەو ژن و پیاوانەی تووشـــی بێ بەشیی جینسی دەبن، ئینسانی زۆر خوێنڕێژ و بێ بەرز و پیاوکوژیان لێ پەیدا دەبێ. وێنەی پەریخان لە مێژوودا کەم نین. بۆیە پێم ســـەیر نییە ئەگەر بەیتبێژ بەو زمانە ســـاکارەی خۆی دەڵێ: «خاتوون پەریخان زۆری کەیف لە پیاوان بوو، هەر کەســـێک بەکوچەیدا ڕابردبا خاتوون پەریخان کەیفی دەیگرت». خاتـــوون پەریخان دەیگوت: «وەرە حەزم لێ بکە». ئەویش قبووڵـــی نەدەکرد. خاتوون پەریخان دەیگوت: «بڵا بیســـووتێنن نەکو لەکن خەڵقی بڵێ. ئابڕووم دەچێ». پیاوی دەگرت، دەنێو چیفی دەنا، نەفتی پێدا دەکرد، دەیســـووتاند. بە بڕوای من هەموو پیاوکوژێک شـــێتە و نەخۆشە، بەڵام نەخۆشییەکان جیاوازە. یەک شێتی





جیگا و پایەیە، یەک شێتی ماڵ و سامانە، یەک شێتی جینسیە و یەک هەست بەکەمایەتی دەکا. تا نەخۆشــییەکەی توندتر بێ پیاوکوژەکەش بەســامتر و بــێ بەزەیییانەتر دەبێ. دیارە نەخۆشــیی خاتوون پەریخان زۆر توند بووە، کەوا دڕندانە پیاوی ســووتاندوون. لە دوو زیاتر نییە، یا ئەو کچە ئەوەندە دزێو و ناشــیرین بووە کە کەس لێی نەبۆتە پیاو، یا ژنێکی ئاســایی نەبووە و نەیتوانیوە لەزەتی جینسی لە هەموو پیاوێک بەرێ. لەهەردووک حاڵدا ئەو بێ بەشییە بۆتە هۆی ئەوەی تۆڵەی لە پیاوان بستێنێتەوە و تا نەیسووتاندوون تێرخۆزنی نەهاتۆتێ. بۆ خۆی بەمەحمەڵ دەڵێ: «مەحمەڵی دەشتیان ئەمن میر غەزەب نیم هەموو ڕۆژێ پیاوێکی دەچیفی وەردەگرم، دەیخنکێنم، قسەی دڵی خۆم دەکەم لێم قبووڵ ناکەن، ئەمنیش بۆیە ئەو عالەمەی وا لێ دەکەم».

مەحمەڵ کامڕەوای کردووە، ئەویش ڕەدوای کەوتووە. یا باشتر بڵێم، خۆی بەئەستۆیدا بڕیوە و دەستی لە خەڵک سووتاندن هەڵگرتووە زیاتر شێتەکانی جینسی بەبێ ڕەحمی لە مێژوودا ناوبانگیان هەیە.

لەبیرمە جارێک دەگەڵ مامۆســتایەکی مێژوو کێشــەمان هەبوو. مامۆستا کە هەستی نەتەوایەتیــی زۆر بەتین بوو دەیگــوت: «لە مێژوودا پیاوی لە کەریم خانی زەند کە کورد بووە دادپەروەرتر نییە. ئەو پیاوە گەورە بەو هەموو دەستەڵاتەوە پێی شوورەیی بوو ناوی پاشا لە خۆی بنێ و بە (وكيل الرعايا) مایەوە. گوتم: مامۆستا منیش کەریمخان دەناسم، منیش زۆر شتم لەبارەی ئەو پیاوەدا بیستووە و خوێندۆتەوە. منیش دەزانم کەریمخان زۆر لە پادشــاکانی پێش خۆی و پاش خۆی کەمئازارتــر و کەمفیزتر بووە. بەتایبەتی دەگەڵ نادرشای ئەفشار کە ئەویش وەک کەریمخان لە خوارێڕا پێ گەیشت و خۆی لێ گۆڕا و ئەو هەموو خراپەی کرد و ئەو هەموو خوێنەی ڕشــت، هیچ وێک ناچن. بەڵام من بەشبەحاڵی خۆم کەریم خان بە بەرپرسی ئەو هەموو تاوان و خوێنڕشتن و پیاوکوشتنەی ئاغا محەمەد خانی قاجار دەزانم. گوتی بۆچی؟ گوتم چونکە پێم وایە ئەگەر کەریم خان نەیخەســاندبا و گریمانەی ڕووحی بۆ پەیدا نەبووبا، مەعلووم نەبوو ئەو جانەوەرە خوینخۆر و بەدفەڕەی لێ پەیدا بێ. مامۆســتا کەمێک ڕاما و گوتی: قســەکەت جێی سەرنجە، بەڵام کەریمخانی کوردی ساکار و نەخوێندەوار ئاگای لە زانستی پیسکۆلۆجی نەبووە. دەبێ بیبەخشی. پێ کەنیم و گوتم من نایبەخشم دەڵێم چی، بەڵام ڕەنگ بێ زانست نەیبەخشێ.

ئاغا محەمەد خانی خەسیدە و بێبەش تۆڵەی کەریم خانی لە بنەماڵەی زەند و گەلانی ئێران کردەوە. زۆری پیاو کوشــت. زۆری خوێن ڕشــت، زۆر تاوانــی دزێو و ناپیاوانەی ئەنجام دا. ئەو گەورە پیاوانەی بەدیلی دەگرتن دەپێشــدا پیاوی دەباڵ دەکردن، جا دوایە

دەیکوشـــتن. ئەوە نیشـــانەی شێتیی جینسییە، ئەوە نیشـــانەی هەست و بێ بەشی و بە کەمایەتـــی کردنە. ئەویش وەک خاتوون پەریخانی ئێمە خەڵکی ســـووتاندووە. دەگێڕنەوە جارێک چۆتە شارێک و ئەهلی شارەکە باشیان پێشواز نەکردووە. بە حاکمی شاری فەرمان داوە بیست هەزار جووتی چاو بۆ دەربێنێ. حاکم نەیوێراوە لە قسەی دەربچێ، چاوەکانی دەرێنـــاوە و بۆی هێناوە. تەماشـــای ئینســـان، وەرە تۆ ئەوەندە خـــراپ بی. بەکاوەخۆ دانیشتووە و چاوەکانی بژاردووە، جووتێکیان کەم بووە، دەسبەجێ دەستووری داوە چاوی حاکمیان دەرێنان.

گوتم باری دڵداری بەیتەکە بەهێز نییە. بەڵام باری حەماسی یەکجار بەهێز و پێزە:

کێ بوو؟ لە مەحمەڵی بچووکە،

بە دەستێکی خەنجەری دەبانە بە یەکێکی کێردووکە،

دەنێو سواری چەلیان گەڕا وێنەی تەیر و باشووکە،

***

کێ بوو لە مەحمەڵی فەرخە،

دە باغەڵێکدا هەیە کاری ساوا دە ئێدیکەیدا بەرخە،

دەنێو سواری چەلیان گەڕا بە گێرە و چەرخە،

میـــر زۆراب خان کـــە دوور نییە ئاگای لـــە ئاکاری کچەکەی بووبێ و لەپێشـــدا هیچ وەسەر خۆی نەهێنابێ، کە زانیویەتی ڕەدووی شوانێک کەوتووە، کێچی کەوتۆتە کەوڵی و لەشـــکری کێشاوەتەوە سەر برایم و مەحمەڵان. بەدرێژی لە بەیتەکەدا باسی ئەو کارەساتە هەیە. وا دیارە میر ئەوەی پێ شوورەیی نەبووە کە کچەکەی پیاوان دەباڵ خۆی دەکێشێ و دوایە دەیانســـووتێنێ؛ ئەوەی پێ بێناموو‌ســـی بووە کە دەگەڵ کرمانج ڕۆیشتووە و زۆر جار دەڵێ: «دەگەڵ کرمانجم لێ قەوماوە».

دوا سەرنجم ئەوەیە پاش ئەوەی کوڕی مەحمەڵ و خاتوون پەریخان دەگەنێ و کودیتا لە میرزۆرابخان دەکەن و دەیکوژن و تۆڵەی باوک و مامان دەکەنەوە، ســـەرلەنوێ دایکیان دەکەنەوە پادشا. ئەوەش بەڵگەیەکی ترە بۆ کۆنیی چیرۆکەکە.




# قوچ عوسمان

هەشتەم بەیت لە کتێبەکەی ئۆسکارماندا قوچ عوسمانە، کە ئاوا دەس پێ دەکا:

«بە خالەقی بەرقەرارە،

«بەوەی ڕۆی نابوو ڕۆژگارە،

«مەخلووق بەبێ ئیختیبارە،

«ئەو لە بۆ عەبدی هەژارە،

«قوچ عوسمان پیاوێک بۆ ڕووت و قووت و لە وی دە بێکارە»

سەرانسەری بەیتەکە شیعرە. بەشی زۆری لەسر ئەو قافیەی سەرەوەیە. نیوە شیعرەکانی کورت و درێژییان هەیە، بەلام کێش پارێزراوە. باری ئەدەبیی زۆر باشە؛ تەنانەت دەتوانم بلێم بەرزە، چیرۆکێکی مێژووییە، پاش دەستەلات پەیداکردنی عوسمانییەکان و کەمهێزبوونی دەرەبەگایەتیی نێوخۆ ڕووی داوە. ئەمیرێکی کورد ئەسپێکی باشی بووە؛ بەلام شتی باش هەر بۆ سولتان چاکە. سولتان بۆ ئەسپەکەی ناردووە. ئەمیر ئەسپی خۆی نەداوەتێ و هەلپەڕیوەتەوە. سولتان ڕقی هەلستاوە و لێی خەفتاوە:

«سولتان تەگبیری دەکرد بە مەخلووقی دنیایە:

«ئەوە تەماحی هەیە لێم داگیر بکا بەغدایە.

«میر سەیفودین دەلێ:

« ئەمن سولتانم بۆچییە

ئەمن قبوول دەکەم لەمسە و ئورووسی سولتانم قبوول نییە.

«سێ سالان دەگەل قوچ عوسمانی گەڕان نەهاتنەوە ئاوەدانییە.

«سولتان کە زانی بەهاسانی ناتوانێ بەردەستی بکا، عادەتی هەموو دژمنانی کورد کەوتە فێڵ و تەلەکان و بە دەهۆ دەگیری خست:

«کێ بوو؟ لە سولتان ئاقلدار و دانا،

«بۆ میر سەیفودینی مۆرکرد قورعانە:




«هەڵستی بێتە ئێرەکانە».

کوردی ســاکار و بەدین نەیدەزانی ئەو کەســەی لەسەر بەرماڵی مێغەمبەری دانیشتووە، بڕوای بە قورعانێ نییە. فریوی خوارد. خزمەکانیشی گوتیان:

«دووروو[1] نابێ بۆ سوڵتانی.

«دەبێ نۆکەری قەدری بزانی،

«بچۆ بۆ خۆت و قوچ عوسمانی،

«ئەودەمی لەوێ خۆی زانی».

«هەر گەیشتە ئەستەمبووڵ سوڵتان گوتی:

«ئەگەر هات گەییبە دیوەخانێ،

«ئەسپی بەرنە ئێختەخانێ

«دەملی کەن کۆت و زەوڵانێ،

«خەلیفەی ئیسلام ئاوای ئیحتیرامی سوێند و قورعان گرت و بەلەبزی موبارەکی فەرمووی:

«مەیدوێنن،

«قورقوشمی بۆ وەتوێنن

«نابێ بەزێڕی بخنکێنن».

لە بەیتەکەدا بەدرێژی باسی کوژرانی میر سەیفودین کراوە. قۆچ عوسمان نایەڵێ سوڵتان پێ دە ڕکێفی ئەسپی بۆرە بنێ؛ پاشووی دەپەڕێنێ و دوایە ئەویش دەکوژرێ.

لەم بەیتەدا بۆ یەکەم جار هەم لە زمان ئەمیر و هەم لە زمان دایکیەوە شــایەر قســەی ســووکی بە ســوڵتان گوتووە و نە مووی لەســەری زمانی هاتووە و نە ڕۆقنایی چاوی دارژاوە. ئەوە نیشــانەی ئەوەیە چینەکانی بەرەژێر وشــیاربوونەوە و هەستیان بە ستەمی نەتەوایەتی کردووە. بەڵام چینی ســەرەوە بەتایبەتی مەلا و شێخ و خوێندەوارەکانی ئەو سەردەمە هەروا بڕوایان بە گەورەیی و پاکی خەلیفەی ئیسلام ماوە[2].

---

١ ـ لە ئەسڵدا وایە، ڕەنگە ـ درۆ ـ بێ.

٢ ـ هیچ دوور نەڕۆین، مێژوونووسی بەناوبانگی کورد لە شەرەفنامەدا باسی ئەم میرە و کوژرانی بە دەستی خەلیفە دەکا. بەڵام زۆر بەڕێزەوە ناوی سوڵتان دێنێ. بۆ ئاگاداری زیاتر بنوارنە لاپەڕەی ٤٩٢ی شەرەفنامەی کوردی.





شایەر لەو بەیتەدا هێندێک ڕێوشوێنی نەتەوایەتیمان بۆ دەگێڕێتەوە. ئێستاش کەمتاکورتێک ماون و لەبیر نەچوونەوە. بەبیری من لە موکریان ئەگەر هەواوبان خۆش با و سەرماوسۆڵ لێ گەڕابایە، هەموو ڕۆژێ چواشـــەمۆیان و جێژنان خەڵکی هەر مەڵبەندێک دەچوونە سەر چاکـــی بەناوبانگی مەڵبەندەکەی خۆیان. لەوێ بەتەقەی دەهۆڵ و زوڕنا دەیانکردە داوەت و ڕەشـــبەڵەک و تەقڵە و ڕمبازی. تا پەیدابوونی حکوومەتی پۆلیســـی ئەم ڕێوشوێنە هەر بەردەوام بوو. ئێســـتا بەو بەربڵاوییە ناکرێ و ئیمکانیش نییە. بەڵام چوونە سەر چاک بە ڕۆژی چوارشـــەمۆ و جێژن و شـــایی گرتن هەر ماوە. ئەو ڕێوشوێنە لە کەیەوە هەیە؟ بۆ ڕۆژی چوارشـــەمۆ هەڵبژێراوە؟ بۆ کورد ڕۆژەکانی‌تر دەچێتە سەر قەبران دەگری و دەچێتە ســـەر چاکـــی دەپاڕێتەوە و لەو ڕۆژەدا هەڵدەپەڕێ و دەهـــۆڵ و زوڕنا لێ دەدا؟ بێگومان ئەسڵێکی هەیە و نایزانین. بزانن شایەر چەند شاعیرانە ئەو دیمانەتان دەخاتە پێش چاو:

«تەماشا دەکا لە دەشتی بالێنێ ڕەشبەڵەک بووە، سەلەلات بە چ قەرارە

«تەماشا دەکا داوەتە و لۆتی و ڕەقاسە لەو کارە

«لەلای سەرچۆپی گرتوویانە پیاوی بە کێرد و کەمبەرە و چەکمەدارە

«لەلای نێوەڕاســـتی گرتوویانە کیژی بەژن باریک و سینگ سەدەف و چاو بەڵەک لەوی گوێ بەگوارە

«لەلای گاوانییە گرتبوویان پیاوی ژن جوان و زۆرخۆر و بێکارە».

شـــایەر ڕێوشوێنێکی دیکەمان وەبیردەخاتەوە؛ ئەویش بازاڕی دەشتەکی و گشتییە. ئەو ڕێوشـــوێنەش لە کۆنەوە هەر بووە و ئێســـتاش کەمتاکورتێک ماوە. خەڵک لە دەشتێکی پانوبەریندا کۆدەبێتەوە و هەر کەسە شتی خۆی بۆ فرۆشتن ڕادەنێ[1].

***

---

١ ـ گەورەترین بازاڕی موکریان بازاڕی قەباغکەندی بوو. هەموو ڕۆژێ پێنج شەمۆیان بازاڕە، تا ئێستاش هەر ماوە، بەڵام وەک جاران نییە. زەمانی پێشوو نە تەنیا خەڵکی هەموو ناوچەکانی کوردستان و بەشێکی زۆری ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات دەهاتنە ئەو بازاڕە، بەڵکە لە کوردستانی عیراقیشەوە کڕیار و فرۆشیار دەهاتن. هەزاران سەر ئاژەڵی جۆربەجۆری لێ ڕادەگیرا. زۆر کەسیش هەر بۆ سەیر دەچوو.

شتێکی سەیرم وەبیر هاتەوە و پێم ناخۆش نییە بۆ خوێنەوارانی بگێڕمەوە. دەوروبەری ئەم بازاڕە دەشتێکی پڕ خێر و بێرە و دێی گەورە گەورەی لێ هەن. بەیانی پێنج شەمۆیان سەگەلی ئەو دێیانە زۆر پێش ئەوەی خەڵک کۆبێتەوە، لە جێ بازاڕ مڵومۆیە دەکەن! کێ بەو سەگانە ڕادەگەیەنێ ڕۆژی بازاڕە و چۆن دەزانن؟ جگە لە بازاڕی قەباغکەندی بازاڕی خورگە و مەمەلیانیش هەبوون. دیارە ئەوەندەیان خەڵک لێ کۆ نەدەبۆوە.

# جولندی

من کە ئەو ناوەم خوێندەوە پێکەنینم هات. ناوێکی سەیرە؛ قەت ناوی وام نەبیستووە. وەک نـــاوی جندۆکان دەچێ؟ پێـــم وابوو بەیتێکی گاڵتەوگەپـــە. کەچی کە خوێندمەوە، تەماشـــام کرد بە پێچەوانـــەی بۆچوونی من نەک هەر گاڵتەوگـــەپ نییە، بەڵکە بەیتێکی دینیشـــە. جولندیش جندۆکە نییـــە و لە جندۆکە خراپترە. پادشـــایەکی کافرە و دژمنی حەزرەتی عەلییە. شـــایەر ناخۆشـــی دەوێ و بۆیە ئەو ناوە ســـەیرەی لێ ناوە. ئەوەش هونەرێکی گەورەیە لە چیرۆکدا کە ناوی ناخۆش بۆ قارەمانی خراپ بدۆزیەوە.

جولندی بەیتی نۆیەمە لە کتێبەکەی تۆســـکارماندا. تێکەڵاوێکە لە شـــەڕی خەندەک و خەیبەر. شـــایەر باسی ئەو شەڕانەی لە مەلای ئاوەدانی بیستوون؛ تێکەڵاوی کردوون؛ ئەو بەیتەی هۆندۆتەوە و بە خەیاڵی ناســـکی شایەرانەی خۆی ڕازاندوویەتەوە. ئەو بەیتە کە لەپێشـــدا بە قسە دەست پێ دەکا و دوایە دەبێتە شیعر، ئەوەندەش باش دروست کراوە، ئەوەنـــدە ڕەوان و شـــاعیرانە هۆندراوەتەوە، من پێم وایە دەبێ کاری عەلی بەردەشـــانی بێ. زۆر وەک شـــێوەی ئەو کەڵەشـــایەرە بەناوبانگە دەچێ. شیعرە ڕەوانەکانی، تەعبیرە جوانەکانی، وشـــە ڕەســـەنەکانی، ئەم گومانەیان لە دەڵی من پەیدا کردبوو. دوایە شـــکم پەرپیە ســـەر ئـــەوەی ڕەحمان بەکر بۆخۆی ئەو بەیتەی دانابـــێ؛ چونکە لە ئاخرەکەیدا دەڵێ:

«وا جولندین کردووە فەنا،

«ئەو لەشکرەی کافرێک نەما،

«ڕەحمان بەکر بۆتە وەستا».

ڕەحمان بەکریش شایەرێکی پایەبەرز، وەستایەکی زۆر شارەزا و شاگردێکی باشی عەلی بەردەشانی بووە. لام وایە بۆخۆی توانیبێ بەیتان بهۆنێتەوە.

شـــایەرەکان لەبەیتی دینیدا بە دندووک پێوە دەبن و خراپ گیر دەخۆن. ئەوان دڵتەڕ و جوانی پەرســـتن. ئەوان دەبێ قسەی تەڕ و پاراو بکەن. ئەوان دەبێ بەندی جوان و شیرین بڵێن. ئەوان دەبێ هەستی دەروونی خۆیان دەرببڕن. دەبێ باسی ژن، باسی دڵداری و حەز لێکردن بکەن. لە بەیتی وشـــکی دینیدا ئەو هەستە چۆن دەرببڕن؟ ئەو باسە چۆن بکەن؟





ڕەحمان بەکر یا هەر کەسێکی دی کە ئەو بەیتەی دانابێ، ئەو مەسەلەی ژیرانە- بەڵکو شەیتانانە- چارەسەر کردووە. عەشقێکی پیرۆز و خاوێنی هێناوەتە گۆڕ؛ باسی خۆشەویستی و ئەوینی ژن و پیاوێکی مەزنی موسڵمانی کردووە. لە زمان عەلی و فاتیمەوە ڕازونیازی ئاشقانەی دەربڕیوە. کێ دەوێرێ فزەی لەبەر بکا؟ کێ دەوێرێ متەقی لەبەر بێتەدەر و کێ دەوێرێ ڕەخنەی لێ بگرێ؟[1]

***

## خەزێم

بەیتی دەیەم لە تۆمارکراوەکانی ئۆسکارمان بەیتی خەزێمە. خەزێم شاکارێکی ئەدەبیی کەم وێنەیە. ڕەنگ بێ ئەو بەیتە ڕۆژگارێک وەک بەیتی شەم و شەمزین داوەتی پێ گەڕابێ. وێ دەچێ ئی عەلی بەردەشانی بێ. ئەگەر ئی خۆی نەبێ ئی شاگردێکی زۆرباشی ئەو وەستا نەمرەیە. دوور نییە ڕەحمان بەکر دای نابێ؛ لە ئاخری بەیتەکەدا دەڵێ:

«هەزار ڕەحمەت لە بابی ڕەحمانی

«خەزێمی فێرکرد بە ساحیبی ئاڵمانی»

دیارە ڕەحمان بەکر لە دوایی زۆربەی بەیتەکاندا ناوی خۆی هێناوە و نابێ بەوەیان بەهەڵە بچین. بەڵام ئەو بەیتە شێوەی شیعری عەلی بەردەشانی ئەوەندە پێوە دیارە کە پیاو بیریکاتەوە ئەگەر عەلی بەردەشانی دای نەنابێ، ئی شاگردێکی باشی ئەو بێ.

---

١ - لەکاتی ساغکردنەوەی ئەو بەیتەدا دۆستێکی شارەزا و لێزان هاتە لام. گوتم: «کاکە من سەرم لەوە سوڕماوە، بەشی زۆری کوردی موسڵمان سونییە و هەر چوار یاری پێغەمبەری پێ بەرهەقن. لە خەرمان پێواندا کە گەیشتە چوار دەڵێ: «چوار، چوار یارەی نەبی، ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی».

کەچی جارێ باسی ئەبوبەکر و عوسمان لە فۆلکلۆری ئەدەبی کوردیدا دەکوولەکەی تەڕیشدا نییە و باسی ئیمامی عومەریش جاروبار نەبێ ناکرێ و باس هەر باسی عەلییە. لە بەهنەسادا، لە بەیتی ئیمامی عەلی و محەمەد حەنیفە و حاتەم و ئیمامی هەمزەدا فەتح هەر عەلی دەیکا. ئەوەتا لەو بەیتەشدا قارەمانی ئەسڵی هەر عەلییە. گوتی: «برا ئەوە هیچ پەیوەندیی بە هەستی مەزەبییەوە نییە. ئازایەتی بەلای کوردانەوە سیفەتێکی بەرزە، هەرکەس ئازا و شیروەشێن بێ خۆشیان دەوێ و باسی دەکەن. بۆ کەمیان باسی ڕۆستەم کردووە؟ کەمیان بە (خاڵندی بنی وەلی) هەڵگوتووە؟ ئیمامی عەلیش ناوبانگی بە ئازایەتی ڕۆیشتووە و شایەرە کوردەکان بۆیە ئەوەندەیان باس کردووە». قسەکەم بەدڵەوە نووسا و سەلماندم.

ڕەحمان بەکریش یەکێک لە شاگردە هەرە باشەکانی عەلی بەردەشانییە.

لە بەیتی خەزێمدا باسێکی مێژوویی و سیاسی و حەماسی نییە. پارچەیەکی ئەدەبیی یەکجار بەرز و لەتیفە. بەڵام شۆڕشێکی ئەدەبی لە فۆلکلۆری ئەدەبی نەتەوەی کورددا پەیداکردووە. باسی دڵداریی کوڕە پاشا و کچە ئەمیر نییە. باسی گورز و گۆپاڵ و شیر و مەتاڵ و ئەسپ و زرێی تێدا نەکراوە. حیکایەتی پەلاماری دژمن و بەرگری مەزنەکانمان بۆ ناگێڕێتەوە. باسی ئەوینێکی ساکار و ئاساییی کچ و کوڕێکی دۆمی ڕووت و گەڕۆکە.

شیعرەکانی ئەوەندە ڕەوان و جوانن، وشەکانی ئەوەندە شیرین و ڕەسەنن، کە پیاو لە خوێندنەوەیان تێر نابێ:

بیناییی چاوم گەوهەر و دوڕم
من باڵدار نەبووم بە باڵان بفڕم
محەندەک نەبووم بە خۆم بخوڕم
بچمە میسر و شام کراسێک بکڕم

تەماشای کوڕە دۆمێکی ڕەش و ڕووت - بەڵام قیتوقۆز و گورجوگۆڵ - کە هەموو سامانەکەی بریتییە لە خێوەتێکی شڕ و پەتوور، دوو پیرە کەری پشت بریندار، تاژییەکی نینۆک شکاوی قرخەمەرەس، جووتە کەوێکی ڕاونەکەری چوو، کە زافی ڕەش دەکا تا دوو تەشی و چوار شانە دروست دەکا، چ کراسێکی بۆ یارەکەی دەدروێ. پیاو ئەم نیوە شیعرەی حافزی وەبیردێتەوە: «خشت زیر سر و بر طارم هفت اختر پای». چاکیان گوتووە: «دۆم تا ڕووتتر بێ مەزاقی خۆشترە».

«سەد وەستام دەوێ لە پایە عەرزی،
«دوو سەد شاگرد بێ، بۆخۆی و دەرزی،
«کراسی بدروێ لە گوڵووکی ڕەزی،
«لەبەژنی یارم بۆ خۆی بلەرزی».

شایەر ئیبداع دەکا؛ کێش دەشکێنێ و لە زمانی کوڕە دۆمەوە دەڵێ:

«سەد وەستام دەوێ لە بانی کۆیە
«هەشتا لە مووسڵێ، شێست لە شنۆیە
«کراس بدروون، لە گوڵی لیمۆیە
«دەبڵا تەنک بێ،
«بۆ چاو هەڵۆیە،




«سێ سەد وەستا بێ، لەلای دریازێ،
«شێست بێن لە مووسڵێ، چل لە شیرازێ،
«کراس بدروێ، لە گوڵی پیوازێ،
«دەبڵا تەنک بێ،
«ناسک و شلک بێ،
«بۆ بووکەی نازێ».

لەوەی خۆشــتر، کچە دۆمێک کە لەبن خێوەتدا لە دایک بووە، لەبن ئاســمانی شیندا گەورە بووە، پێستی کەلەکەی بەدرزی کراسی خامی شیندا دیارە و قامکی پێیان بە کونی کەڵاشی کەچدا وەدەوکەوتووە و ڕۆژێ دەبێ چوار دێیان بگەڕێ تا چەند خولخولە و تەشی و شانە و چەند زارجوو بنێشت و کەمێک دمکانە بفرۆشێ و چەند هەتیوی دێ لێی ڕەبادەن تا چەقۆیان بەدەست تیژبێ، چەند بەنازە و کراسی وای ناوێ و کوڕ دەڵێ:

«بۆ خاتری خوڵای ئەمن بناسە
یار دەبەرناکا قەت ئەو کراسە»

ڕەنگە ئەوەندەی ئەو بەیتە هەستی من دەجووڵێنێ، هەستی لاوێکی تازە پێگەیشتووی شارســتانی دەجووڵێنێ. هەقیش وایە. من تەمەنێکــی درێژم لە دێ ڕابواردووە، زۆر کچە دۆمی نەشــمیلانەی قسەخۆشی ڕوو هەڵماڵاوی چاو ڕەشێ کوڵمە سووتاوی خوێن شیرین سەرنجیان ڕاکێشاوم. زۆر کچە لادێیی جوان - بەڵام هەزار- م دیون کە ڕۆژی داوەتێ لەبن دیواری هەڵترووشــکان و وەک بارێزە بەچاویاندا هاتۆتە خوار؛ چونکە کراســیان نەبووە، کەوشــیان دڕاوە و پێیان شــوورەیی بــووە بچنە داوەتێ. ئاخــر کوڕەگەلی دێ - دەگەڵ ئەوەشدا بۆخۆیان ڕانکی شڕ و چۆغەی بێ گرۆڵیان لەبەردا دەبوو، گاڵتەیان بەکچی ڕووت دەکرد، تەنانەت شایەر دڵ ناسکەکانیش فریان داوێتنێ[1] .

---

١ - پوور جەواهیر ژنێکی قسەخۆشی جیرانمان، زۆر جار بۆی دەگێڕامەوە دەیگوت: «ساڵێکی دەگەڵ مستەفا سریلەی کاکم کە شایەرێکی بەناوبانگ بوو دەچووینە بەرخان. ڕۆژێک لە نیزیک گوندێک کە داوەتی لێ دەگەڕا، بەرخەلمان چێشتاو دا. کاکم گوتی ئەتۆ لێرەبە تا من دەچمەوە تێ دەوەشێنم؛ زۆر دژوێنم. ئێستا دەگەڕێمەوە. دیارە فریوم نەخواردبوو، دەمزانی دچتەوە بۆ کن براژنم. گوتم باشە. ئەو چۆوە بۆ دێیەکەی خۆمان. هەر ئەو ئاوابوو، منیش دام قەڵاشت بۆ لای داوەتێ. ئەگەرچی بەڕاستی ڕووت و ڕەجاڵ بووم، بەڵام خۆم تێ هاویشت. هێندە پێ نەچوو کاکم پەیدابوو. کوڕگەلی دێ بەپیریەوە چوون و لەبەری پاڕانەوە چەند بەندیان بۆ بڵێ. کاکیشم دەستی دەبناگوێی نا و ڕووی لە من کرد و گوتی:
تەماشای بزگوڕ و پەڕۆی،
دەڵێی نێری چاو لە کۆی،

شەریفی کوڕی عەدۆی،
ژنی دێنێ بۆ برای خۆی،
بۆ لە کێوێرا دەڕۆی؟
هەرسێک تەڵاقم کەوێ
جەواهێر پلاوێ ناخۆی.
***
تەماشای ترِوتیتۆڵی،
تەماشای پشتی بەخۆڵی،
تەماشای قوونی دەهۆڵی،
دەڵێی مریشکی کۆڵی،
لە من بە بۆڵەبۆڵێ،
هەرسێک تەڵاقم کەوێ،
دەوری پلاوێ ناکۆڵی
***
سەری وەک تەپڵەگوێنی
جلی کەرانە نوێنی،
چەند چڵکن و دزوێنی،
چۆنم هەڵگرتووە شوێنی،
بەوەی مەلا دەیخوێنی،
کوڕینە هەرکەس هەڵی گرێ،
ئەمن ناستێنم خوێنی
بەیتی پوور جەواهیر زۆر لەوەی درێژتر بوو، بەمنداڵی هەمووم دەزانی، بەڵام ئێستا هەر ئەوەندەم لەبیرماوە.
مام مستەفاشم دیبوو. کە من وەبیرم دێ تۆبەی کردبوو، بەیت و باوی نەدەکوتن. بەڵام زۆر سەیربوو، قسەی ئاساییی هەموو نەزم بوون.





# کاکەمیر و کاکە شێخ

بەیتی یازدەهەم؛ بەیتێکی کورتی مێژوویییە. من ئەو بەیتەم زۆر بیستووە. بەیتەکە هەر شینی دوو خوشکانە بۆ برایان؛ زۆر مەحزوونە. زۆر لەوەی درێژترە کە ڕەحمان بۆ ساحیبی ئاڵمانــی گوتووە؛ جا یا ڕەحمان ئــەو بەیتەی نەزانیوە، یا ئەوانەی لەو دوایانەدا بۆ منیان گوتووە بۆ خۆیان لێیان زیادکردووە. درێژی و کورتیی بەیتەکە هیچ لە ئەسڵی کارەساتەکە ناگۆڕێ. کارەساتەکە هەر ئەوەندەیە کە بەیتبێژ دەیپێشدا دەیڵێ.

باسی ئەو کارەساتە بەکورتی لە لاپەڕەی ٥٢٣ی شەرەفنامەی کوردیدا نووسراوە. هەر بەوەی دەزانین قارەمانی چیرۆکی ئێمە و ئەوی کە شــەرەفنامەدا نووسراوە یەکن، چونکە ناویان وێک دەچێ و شوێنی کوژرانیان جێگایەکە. دەنا ئەوەی شەرەفخان نووسیویەتی و ئەوی بەیتبێژ گوتوویەتی، عەرز و عاسمانیان تەفاوەتە. بە قسەی شەرەفخان ئەم ڕووداوە لە ساڵی ٩٤١ ک (١٥٢٣ز) دا ڕووی داوە.

حاجــی شــێخی ئەو لە حاڵی نوێژدا بە دەســتی مەرەگەییی بڵــح و غەیان کوژراوە. بەیتبێژەکەی ئێمە ئاگای لە ســاڵی کوشــتنی نییە و دەڵێ لەبەر بێ ناموسی بەدەستی پیاوی بەغیرەت و ناموسپەرەست ـ کە لە دەست ئەو پیاوە زاڵمە زاڵەیان لێ پەیدا ببوو و گوریســیان گەیبووە هێچکان لەتوپەت کراوە. من بەشــبەحاڵی خۆم بڕوا بە بەیتبێژەکە دەکەم، چونکە دەزانم ئەگەر ڕاست نەبایە هەرگیز بەیتبێژ و شایەرێکی مسکێن، نەیدەتوانی بوختانێ بۆ ئەمیرێکی مەزنی دەســت پەروەردەی سوڵتانی ئەستەمبووڵێ بکا و بە بەیت بــۆ گەورە گەورانی بڵێ. زانایەک دەڵێ: «مێژووی هەمــوو گەلان بە قازانجی زۆرداران و بە زیانی هەژاران نووســراوە. دەبێ حەقیقەتی مێژوو لە لابــەلای فۆلکلۆری ئەو گەلانەدا بدۆزینەوە».

بەڕاستی ئەگەر ئەو کارەساتە لە سینگی شایرەکانمدا نەپارێزرابایە و زانایەکی ئاڵمانی تۆماری نەکردبایە، کێ (هەیدەر گۆران) ئیسپارتاکۆســی کوردی دەناسی. هەیدەر گۆرانێک کــە دیلەکانی کۆکردەوە و ســوێندی دان و ئامادەی کردن بۆ ئــەوەی تۆڵەی خۆیان لە ئەمیرێکــی گورگەمێش و داوێن پیس بکەنەوە. ڕەنگ بێ هەیدەر گۆران یەکەم بۆرەپیاوی کورد بێ کە ڕاپەڕینێکی سەرکەوتووانەی ڕابەری کردبێ.

بەداخەوە من هەر ئەوەندەی لەســەر دەزانم کە شــایەر لەسەری گوتووە، نازانم چیی بەسەر هاتووە. ڕەنگە خۆی دەربازکردبێ. ڕەنگە دەستی کەسوکاری میرشێخی نەگەیبێتێ. چونکە شــەرفنامە باسی کوڕ و نەوەکانی دەکا و هیچ بۆ ئەوەی ناچێ کە تۆڵەیان لەوانە کردبێتەوە کە میرشێخیان کوشتووە. هیوادارم مێژوونووسانی دواڕۆژمان شتی نوێ لەسەر ئەم پیاوە بدۆزنەوە. تەنانەت ئەوەندەم بۆ نەچۆوە ســەریەک: هەیدەر، گۆران بووە؟ یانی لــەو کوردانە بووە کە پێیــان دەگوترێ گۆران، یا لەبەر ئەوەی لــە پێش ئەم ڕووداوەدا جاروبار دەستی ڕەماڵی زۆرداران خستووە، ئەم ناوەی بەسەردا براوە؟ چونکە لە موکریان تا ئەم دوایانە نازانم بۆچی بە دزیان دەگوت گۆران.

***

## لەشکری

لەشکری بەیتی دوازدەهەمی کتێبەکەمانە. بەداخەوە ڕەحمان بەکر ئەو بەیتەشی باش نەزانیوە. ئەو بەیتە کە ئاهەنگی گوتنی یەکجار خۆشــە، ئێستاش بەسەر زار و زمانانەوە ماوە. من بۆخۆم شــریتێکم هەیە کە زۆر لەوەی تەواوتر و درێژترە. بەڵام شــریت کۆنە. شایەریش پیرە و بەپەلەشی گووتووە، پیاو لە زۆر جێگاکانی ناگا و هێنانە سەر کاغەزی دژوارە، دەڵێن لەشکری شایەر و خۆشخوانی سولەیمان بەگی قوڵی بەگیان بووە. گیرۆدەی ئەوینی خانزاد- شــێرەژنی مێژوویی گەلی کورد بووە. ئەوین هانی داوە خەیانەت بەئاغای خۆی بکا. جاسووســەکانی سوڵتانی ئەستەمبووڵ بەڵێنیان داوەتێ ئەگەر سولەیمان بەگ دەرماندا و بکا خانزادی لێ مارە بکەن. ئەویش ژەهری بۆ ســولەیمان بەگ لە قاوە کردووە و کوشــتوویەتی. خەیانەتەکە ئاشــکرا بووە. خانزاد لە چینەی دیــواری گرتووە؛ دەڵێن ئــەو بەیتەی لەو حاڵــەدا گوتووە (من بڕوا ناکەم). خانزاد لەوێ ڕاوەســتاوە و گوێی بۆ هەڵخستووە تا تەواو بووە، ئەوجار بە دەستی خۆی تۆپێکی قوڕ بەدمی داداوە.

بەهەرحــاڵ ئەوەی ڕەحمان بەکر گوتوویەتی دەگەڵ ئەو بەیتەی ئێســتا باوە فەرقیان هەیە. دەپێشــدا وا دەســت پێ دەکا: «بابی لەشــکری دەڵێ». بۆیە من بیر دەکەمەوە




ئەو بەیتە باوکی لەشـــکری داینابێ و دەگەڵ بەیتەکەی لەشکری جیاواز بێ. ئەو بەیتەش ئەگەرچی زۆر کورتە، دیســـان گەلێک بەنرخە، شـــیعرەکانی جوانن، وشەکانی ڕەسەنن و هێرش دەباتە ســـەر دژمنان و تاوانی بڵحەڕۆمیان ئاشـــکرا دەکا. بەڵام سوڵتان دەپارێزێ و وەک شـــایەری بەیتی قۆچ عوســـمانی ڕەپ و ڕاست بە سوڵتان دانادا و خۆی گێل دەکا و دەڵێ:

«ڕەنگە سوڵتان بەو کارەی نەزانێ».

***

## قەر و گوڵەزەر

بەیتێکی درێژە. بەیتێکی ئاشـــقانەیە. چیرۆکێکی قووڵ و ســـەیر و پڕ کارەسات نییە. کوڕە قزڵباشـــێکی ئێرانی ئاشـــقی کچە دەرەبەگێکی کوردی ئەودیوی ســـنوور بووە. ئەو ڕووداوە پاش دابەشکردنی کوردستان لە نێوان سەفەوی و عوسمانییەکاندا قەوماوە. ئەوی لەو چیرۆکەدا جێی ســـەرنج بێ دوو شـــتە: یەکیان مەسەلەی ســـنوورە کە شایەر جوانی شـــەرح داوە. مەزنێکی کورد کە کەوتۆتە بەشی عوسمانی نەوێراوە شوانێک لە کوێستانی دیـــوی ئێرانەوە دەگەڵ خۆی بەرێتەوە دیوی گەرمێنێ؛ هەروەها نەیتوانیوە کچی خۆی بدا بـــە کوڕی پیاوێکی گەورەی قزڵباش. قزڵباشـــەکەش نەوێراوە بووکی لەو دیوڕا بۆ کوڕی خۆی بگوازێتەوە. ئەوی دیکەیان ئەوینی پیاوێکی دەوڵەمەند و ســـەوداگەرە. بەکر شێخان بازرگانێکی گەورەیە کە هاتوچۆی هەردووک بەشـــان دەکا و کاروانی پێشـــی ناگەڕێتەوە. ئەویش ئاشـــق و ســـوێندخۆری خاتوون گوڵەزەرە. تا قەر بە شـــوان دەزانێ گاڵتەی پێ دەکا و دەڵێ حەمەدی پاشـــاغان بۆ شوانەوێڵەیەک نابێ؛ بەڵام کە دەزانێ کوڕە قزڵباشە؛ بۆخۆی حاکمی سندووسیە؛ ئەگەر دڵی بێشێنێ ڕێی ئەودیوی لێ دەبەستێ و سەرمایەکەی دەکەوێتە مەترســـییەوە، نەک هەر دەس لە خاتوون گوڵـــەزەر هەڵدەگرێ، بەڵکو دەبێتە دەڵاڵ و نێوبژیکەریش. هەرچەند بۆخۆی دەڵێ: «بەڕدێنی سپیەوە دەڵاڵی بەمن ناکرێ»، بەڵام لە ڕاستیدا دەڵاڵیی کردووە و زۆر باشیشی کردووە. قسەی قەری بۆ گوڵەزەر بردووە

و قاقەزی گوڵەزەری بۆ قەر هێناوە. ئەدی دەلالی چۆن دەبێ؟

ئەو سۆز و چێژەی لە بەیتە عاشقانەکانی تردا هەیە لەو بەیتەدا نییە. کوڕە دەرەبەگ خەریکە بە زۆری کچە دەرەبەگ بستێنێ. چی وا نامێنێ سوڵتان و شاعەباس لەسەر ئەم کارە بچووکە بەگژیەکدا بچن و دیســـان کوردستان ببێتە مەیدانی شەڕ لە نێوان دوو هێزی بەدەســـتەڵاتی ئەو سەردەمەدا. شـــا دادەنوێنێ و فەرەجوڵلا خانی باوکی قەر، حاشا لە کوڕی وادەکا کە هۆی نێوان ناخۆشیی سوڵتان و شا پێک بێنێ. لە دواییدا مەعلووم نییە چارەنووسی قەر و گوڵەزەر چ بووە؛ بەیتەکە بەنیوەچڵی دەبڕێتەوە.

چیرۆکەکە دەپێشـــدا بە قســـەیە و دوایە بە شیعرە. شـــیعرەکانی ڕێکوپێک و باشن. وەزن و قافیەیـــان هەیـــە. زمانەکەی پوخت و پاراوە. ڕەحمان بەکریش باشـــی زانیوە و ئۆسکارمانیش چاکی تۆمارکردووە.

***

## بەیتی زەمبیل فرۆش

بەیتی چاردەی تۆمارکراوەکانی ئۆسکارمان بەیتی زەمبیل فرۆشە. کەم کوردی وا هەیە لە کوردســـتان ژیابێ و ئەو بەیتەی نەبیستبێ. چیرۆکێکی سۆفیانەیە. چیرۆکێکی یەکجار کۆنـــە؛ قارەمانـــی ئەم چیرۆکە لە هیندیدا بوودایە، لە فارســـیدا ئیبراهیمی ئەدهەمە و لە کوردیدا زەمبیل فرۆشـــە. ئەوانە هەرسێیان دەپێشدا پادشابوون، خاوەن دەستەڵات و ماڵ و سامان بوون. لە ترسی مردن، لە تاوی قەبر، دەستیان لە پادشایەتی هەڵگرتووە؛ وازیان لە بێنە و بەرە و بگرە و بەردە هێناوە. بوونە سۆفی و گۆشەگیرییان ڕەچاوکردووە. بوودا و ئیبراهیمی ئەدهەم تا ژیاون هەر گۆشـــەگیر بوون؛ بەڵام شـــایەری کورد دانووی دەگەڵ ســـۆفیگەری و گۆشـــەگیری ناکوڵێ. ئەم جۆرە ژیانەی پێ خۆش نییە. بۆیە چارەنووسی قارەمانی چیرۆک دەگۆڕێ. بەشی دووەمی ئەم چیرۆکە لە کوردیدا وەک حیکایەتی یوسف و زولەیخـــا دەچێ. ئەوینی خاتوونی میری جیاوازی دەگەڵ زولەیخا کەمە، خۆپاراســـتنی زەمبیل فرۆش لە یوســـف زیاترە. نەک هەر وەک یوسف لە دەست خاتوون ڕادەکا، بەڵکو




خـۆ لە بان هەڵدێرێ؛ تەنانەت لە وەختێکی زۆر ناسـکدا پێ دەزانـێ فێڵی لێ کراوە و ڕادەکا. یوسف ئەو فێڵەی لێ نەکراوە و لەبن لێفەوە دەرنەپەڕیوە. زەمبیلفرۆش نەچۆتە گرتووخانە و ئـاوارە و دەربەدەر بووە. ئەنجامی هەردووک چیرۆک یەکە. ژنەکان بەئاوات گەیون؛ نەک هەر خۆشەویستەکەیان پێ براوە، بەڵکو هاتوونەوە سەر حەدی چاردە ساڵی. زەمبیل فرۆشی ئێمەش بۆتەوە خاوەن کۆشک و باخ و ماڵ و سامان.

بەیتبێژ دەپێشـدا حیکایەتەکەمان بەدرێژی بە قسە بۆ دەکا، ئەوجار دەیکاتە شیعر. شـیعرەکان لە سەرەتاوە بەشـێوەی کرمانجی سەرو و لەسەر کێشـی عەروزن. پڕن لە وشـەی عەرەبی و فارسـی. ئۆسکارمان ئیشـارەی بەوە کردووە و گوتوویەتی ئەو بەیتە بەشێوەی موکریانی نییە و دیارە شاعیرێکی خوێندەوار دایناوە. ڕەحمان بەکریش نەیزانیوە و خولا هەڵناگرێ باشـی سەر و گوێلاک شـکاندووە. دوایە وەڕەز بووە و وازی لە بەیتی خوێندەوارانەی ڕەقوتەق و پڕ لە وشـەی نامۆ هێناوە و هاتۆتە سـەر شێوەی موکریانی و کێشی خۆمانە. جا ئەوجار دادی شاعیری داوە و جوانی هونەر نواندوە. فەرمایشەکانی زۆر خۆش و ڕەنگینن؛ بۆیە لە دواییدا دەڵێ:

«دەستێک گوڵ بەنادری،
ساحبی ئاڵمانی نەمری!
ئەوە فەرمایشی ڕەحمان بەکری».

***

# به‌یتی باپیرئاغا مه‌نگوڕ بابی هه‌مزاغا

یه‌کێک له کاره‌ساته دڵته‌زێنه‌کانی مێژووی کوردستان پاش موکری قڕانه‌که‌ی شا عه‌باسی سه‌فه‌وی ـ کاره‌ساتی قه‌تڵوعامکردنی عه‌شیره‌تی مه‌نگوڕه له مه‌راغه. که به‌داخه‌وه مێژوونووسانی خۆمانه و بێگانه شتێکی ئه‌وتۆیان له‌سه‌ر نه‌نووسیوه. من زۆر تێ کۆشام، ته‌نانه‌ت سه‌رچاوه‌یه‌کی باوه‌ڕپێکراوم وه‌گیر نه‌که‌وت که ساڵی ئه‌و کوشتاره‌م بۆ ڕوون بکاته‌وه.

خانه‌کانی موکری که له مێژبوو حکومه‌تیان ده‌کرد و خه‌ڵکی ئه‌م مه‌ڵبه‌نده له‌به‌ر خاتری بوداغ سوڵتان زۆریان ڕێز له‌و بنه‌ماڵه ده‌گرت. بوداغ سوڵتان که ئه‌میرێکی کوردی زۆر دادپه‌روه‌ربووه له سابلاخ زۆر خۆشه‌ویسته. وه‌ک پیاوچاکێک ده‌چنه سه‌ر مه‌زاری و سوێند به گومبوزه‌که‌ی ده‌خۆن. دیاره زۆری حه‌ز له ئاوه‌دانکردنه‌وه بووه؛ پردی سوور و مزگه‌وتی سوور و کۆخی کورته‌ک ـ که ئێستاش هه‌ر ماون ـ له کاره باشه‌کانی ئه‌ون. له زه‌مانی مه‌زنایه‌تیی ئه‌ودا موکریان سه‌ربه‌خۆ بووه و هیچ بێگانه‌یه‌ک ـ نه عوسمانی و نه سه‌فه‌وی ـ پێدا ڕانه‌بردوون. سکه‌ی بۆخۆی لێ داوه. دیاره هونه‌رمه‌ند و خوێنده‌واری زۆر خۆش ویستوون. کوڕه‌کانی خۆی فێره هونه‌ر کردوون. به‌رده نووسراوه‌که‌ی سه‌ر ده‌رکی مزگه‌وتی سوور که له ساڵی ١٠٨٩دا سوهراب خانی کوڕی ئه‌و ئه‌میره هه‌ڵی که‌ندووه، ئه‌م حه‌قیقه‌ته‌ش ده‌سه‌لمێنێ.

به‌ڵام به‌داخه‌وه ئه‌و بنه‌ماڵه‌ش پیاوی گه‌ندیان لێ په‌یدابوو. خه‌ڵک له ده‌ستیان وه‌زاڵه هات. باپیر ئاغای مه‌نگوڕ که پیاوێکی به‌ده‌سته‌ڵات و مه‌زنێکی ئازا و لێهاتوو بووه خه‌ریک بووه حوکمات له ده‌س ئه‌و بنه‌ماڵه بێنێته ده‌رێ. پێیان زانیوه، به‌ڵام نایانوێراوه به‌گژیدا بچن. په‌نایان بۆ بێگانه، بۆ شای ئێران ـ بردووه. ئه‌ویش ئه‌حمه‌دخانی موقه‌ده‌م، حاکمی مه‌راغه‌ی ـ که دژمنایه‌تیی کۆنیشی ده‌گه‌ڵ خانه‌کانی موکری هه‌بووه ـ کردۆته مه‌ئمووری کوشتنی باپیر ئاغای مه‌نگوڕ. ئه‌حمه‌دخان فێڵی له باپیر ئاغا کردووه؛ بانگهێشتی کردووه بۆ مه‌راغه. باپیر ئاغاش به‌خۆی و نۆسه‌د سواری هه‌ڵبژارده‌ی مه‌نگوڕه‌وه چۆته ئه‌و شاره. سواره‌کانیان به‌سه‌ر ماڵاندا بڕیون. له شه‌وێکی دیاریکراودا هه‌رکه‌س میوانی خۆی له خه‌وێدا سه‌ربڕیوه. له‌و نۆسه‌د سواره ته‌نیا سوارێک ده‌رچووه که ناوی وه‌ستا

عوسمان بووە. وەک گوتم مێژوونووسانی خۆمانە و بێگانە شتێکی ئەوتۆیان لەسەر ئەو کارە نامەردانە نەنوسیووە. دەڵێن عەشیرەتی مەنگوڕ پاش ئەو کارەساتە پیاویان لێ براوە. وەستا عوسمان ژن و منداڵی باپیرئاغای دەرکردووە و ماڵ و دەوڵەتی هەموو عەشیرەتەکەش بەتاڵان چووە. هەمزاغای مەنگوڕ کە پیاوێکی شۆڕشگێڕ و بەناوبانگە و نزیکەی سەد ساڵ لەوی پێش لە ڕاپەڕینی ڕزگاریخوازانەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریدا بەشداریی کردووە؛ کوڕی باپیرئاغای بووە؛ زۆر شتی سەیر و قارەمانانە لەو پیاوە دەگێڕنەوە کە دەرفەت نییە بۆتان بگێڕمەوە. پاش تێشکانی جووڵانەوە ناکامڵەکەی شێخ، هەمزاغاش بەدەستی حاکمی کوردی سابڵاخ (ئەمیرنیزامی گەرووسی) دیسان بەفێڵ وەک باوکی کوژراوە. ئەمیرنیزامی پیاوکوژ و خوێنڕێژ، خۆی نووسەرێکی زۆرباشی فارسی بووە کە لە ساکارنووسیندا ناوبانگی هەیە. بەو قەڵەمە لووسەی خۆی، باسی کوشتنی هەمزاغای بە دوورودرێژی نووسیوە. حەیف بەدەستەوە نییە دەنا وەرم دەگێڕا سەر کوردی.

باپیرئاغا کە کوژراوە هەر کوڕێکی بەژن و ماڵی هەبووە. بۆیە جگە لەبەرەی خدری بەرەکانی دیکەی مەنگوڕان هەموو بەناوی دایکیانەوە ناودەبرێن. بەرەی زێڕینێ، بەرەی شەمێ، بەرەی زینێ، بەرەی مرۆتێ، بەرەی ئامانێ. من بەمنداڵی مام بایزئاغای کوڕی باپیرئاغام دیوە کە دەیانگوت تەمەنی لە سەد ساڵی هەڵبواردووە و ژنی مردووە و دەیەوێ ژن بێنێتەوە؛ بەڵام لەنێو عەشیرەتەکەی خۆیدا کەسی پێ ناشێ؛ هەموو برازانی.

ئەگەر مێژوونووسەکانمان لەسەر ئەو کارەساتەیان نەنووسیوە، شایەرەکان ـ کە هەموو ڕووداوێکی سەردەمی خۆیان کردۆتە شیعر ـ لێرەشدا بێدەنگ نەبوون. شایەر لەو بەیتەدا کورتەی کارەساتەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە. دەڵێن و نووسیویانە کە ئەم بەیتەش ئی عەلی بەردەشانییە. هەرکەس ج عەلی بناسێ؛ ئەو گومانەی بۆ پەیدا دەبێ. چونکە ڕەوانیی شیعر، پوخت و پاراویی زمان، ساکاریی بەیان و گێڕانەوەی چیرۆک، ئەم شکەمان بۆ پەیدا دەکا. بەڵام من بۆم ڕوون نییە ئی عەلی بێ؛ بەو دەلیلانەی خوارەوە:

١ـ ئاشکرا نییە و نازانین عەلی پاش باپیرئاغا ژیاوە یان نا؟

٢ـ ناوی زۆر گوندی نێو مەنگوڕان و دەوروبەری سابڵاخی تێدایە کە نیشانەی شارەزاییی شایەرە لەم ناوچەیەدا. ئایا عەلی ئەوەندە لە موکریاندا ماوەتەوە کە ئەو شارەزاییەی هەبێ؟

٣ـ وشەی (پیاوبوون) لەبری (دابەزین) هەر لە شێوەی شاروێران و شاماتدا هەیە و بۆ خۆم لە هیچ جێگایەکی تری کوردستان نەمبیستووە. ئەم وشە لەو بەیتەدا بەکارهاتووە:




«مەنگوڕی دە مێ وەچاعێ،

پیاوبوون لە سابڵاغێ، (یانی لە سابڵاخێ دابەزین)

تەدارەک بۆ مەراگێ».

٤ـ عەلی لاســای شاعیرە خوێندەوارەکانی کردۆتەوە و ناوی خۆی لە هەموو بەیتەکاندا هێناوە. لەو بەیتەدا ناوی عەلی نەهاتووە. ســەیرە ڕەحمان بەکریش ناوی خۆی نەهێناوە. ڕەنگ بێ شــایەرەکەی ناسی بێ، بۆیە ئەو کارەی نەکردووە. ڕاستە ئەم شیعرە بەهێزانە وەک شیعری عەلی، مامۆستای شایەرانی کوردستان دەچن:

هۆی سولەیمانی خەزاڵی

نەوەی ڕۆستەمی زاڵی

حەوت قوبەی لە مەتاڵی

پیم نەڵێن ئەتوو منداڵی

لە جلیتێی نەکرد خاڵی

وەک هەوران بە گەواڵی

یا:

«بانگم وەبەر پادشای لە ژوور

خان ناردنی دوور بە دوور

بڵباس هاتن بە جەمبوور

ڕانک ڕەشی چەکمە سوور»

بەڵام مەرج نییە ئی ئەو بن. ئاخر لە بیرتان نەچێ عەلی بەردەشانی شاگردی زۆر باشی پـــەروەردە کردوون. پێم خۆش بوو زانایەک لەو بارەدا تەحقیقی کردبایە و ڕوونی کردباوە ئەم بەیتە ئی عەلییە. چونکە بەڕاســـتی حەیفە شایەرەکەی نەناسرێ. بزانن شایەر چەند وەستایانە باسی تاڵان و بڕۆکەمان بۆ دەگێڕێتەوە:

بداخان بوو لە دوایی

هەزار مەڕی شۆگایی

هەر هەرزان و خۆڕایی
دەیاندا مەڕ و شایی

***

بزنێک بێنێ دوو کارە
لە مووی بکرێ دەوارە
بەهای بزنێم دوو پارە

***

هەزار گای بێ جووتبەندە
قیمەتی گای خولاّبەندە
«بلّباسان کاریان گەندە»

***

## بەیتی عەبدوڕەحمان پادشای بەبە

ئەم بەیتە- کە عەلی بەردەشـــانی بە عەبدوڕەحمان پاشا بابانی هەڵگوتووە- شاکارێکی کەم وێنە و دوڕی سەر خەزێنەی بەیتە جوانەکانی کوردییە. زۆر شت لەسەر عەبدوڕەحمان پاش نووســـراوە و پێویســـت ناکا من دووپاتەیان بکەمەوە. بەڵام هەرچی لەســـەر عەلی بەردەشـــانی بگوترێ و بنووسرێ هێشتا کەمە؛ کەسـێکی حاجی قادری کۆیی - شاعیری مەزن و نەمری کورد - ئاوای باس بکا.

دوو عەلین، شاعیرن وەکوو حەسسان
بەردەشان و حەریرە مەسکەنیان

دەبـێ چ هونەرمەندێکی خاوەن بەهـــرە و مەزن بووبێ؟ عەلی هەمـــوو ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی کردۆتە شیعر. عەلی شایەرێک بووە کە وشەی کوردیی وەک مێو لە دەسدا بووە و هەرچۆنێکی ویســـتوویەتی دەری هێناوە. هەموو شـــایەرەکانی پاش ئەو عەلییان بە مامۆســـتای خۆیان زانیوە و بەڕێزەوە ناویان هێناوە. من بۆ خۆم عەلی بەردەشانی بە مامۆســـتای خۆم دەزانم و زۆر شـــتی لێ فێربووم. لە بیرمە زوو پارچە شـــیعرێکم لەسەر

ئەو کێشـــەی کوردی ـ کە لە پێش عەلیشدا هەبووە، بەڵام عەلی برەوی پێ داوە و ئێستا زۆربەی شـــاعیرەکانمان شـــیعری پێ دەڵێن، گوتبوو. بۆ شیعرناسێکم خوێندەوە. گوتی باشت کردووە وەدووی مامۆستا گۆران کەوتووی و لەسەر ئەو کێشە شیعرت داناوە. گوتم من زۆر ڕیز بۆ گۆران دادەنێم و بە شـــاعرێکی زۆر مەزنی دەزانم؛ بەڵام لە شیعردا ئیلهامم لە عەلی بەردەشانی وەرگرتووە کە زۆر دەپێش مامۆستا گۆراندا دەڵێ:

پاشای بەبان جیهانگیری

وەک ڕۆستەمی زاڵی پیری

تەحا بەڕاو و تەگبیری

:ڕانابوێرێ بە ڕەزیلی

ناکەم خزمەتی وەزیری

نانی دەستێنم بەشیری

هیچ بیرتان لەو نیوە شیعرەی دوایە کردۆتەوە؛ وەک قسەی ئەو پیاوە سیاسییە گەورە دەچێ کە دەڵێ: «هەق لە لولەی تفەنگدایە». بەداخەوە زۆربەی شیعرەکانی عەلی لەبیر چوونەوە. ئەگەر هەموویان کۆکرابانەوە، فەرهەنگێکی دەوڵەمەندمان دەبوو. من پاش ئەو بەیتە ئوســـکارمان ١٤ بەنـــد و وردە مەقام و گۆرانی ئەو ســـەردەمەی تۆمار کردوون کە بەختەوەرانە ئێستاش لەبیر نەچوونەوە و بۆ خۆم هەمووم لەبیر بوون. گۆرانی بێژەکانیش هەر دەیانڵێنەوە:

زۆرم بیر لەوەی دەکردەوە کە بۆچی شـــاعیرانی چەرخی نۆزدەی شـــاری سولەیمانی بەشـــێوەی موکریانی شـــیعریان گوتووە. بەخەیاڵی خۆم وام دانابوو کە ئەوان بەتایبەتی (نالی) کەوتوونە بیری دروســـتکردنی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی و ئەو شێوەیان بەئەسڵ داناوە؛ تەنانەت لەو بارەدا شتیشـــم نووســـی، بەڵام پاش ئەوەی سەرنجم دا ئەو بەیتە و شیعرەکانی عەلی بەردەشـــانی، زانیم بەهەڵەچووم. زمانی بارەگای عەبدوڕەحمان پاشای بەبە ئەوە بوو کە شـــاعیرانی چەرخی نۆزدەمان شـــیعریان پێ گوتووە. یەعنی سابڵاخ و ســـولەیمانی؛ دوو پاتەختی ئەو ســـەردەمی کوردستان بەیەک شێوە قسەیەن کردووە، کە بە داخەوە ئێســـتا زۆر لێک جوێ بوونەوە. ئەگەر وا نەبایە عەلی کە شـــایەری تایبەتی و نانخۆری پاشـــا بووە، شیعری بەشێوەیەک دادەنا کە پاش پێی خۆشە و زمانی خۆیەتی و نەیدەگوت:




ئەزم عەلی بەردەشانی

دەبەندێم نەکەی زبانی

بەیتێ دەڵێم بە دیوانی

مەدحی پاشای کوردستانی.

***

مەدحی پاشای کامیان باشە

شایەد ڕۆم و قزڵباشە

هەرجارێ شیری دەکێشا

هەموو دەهاتنە تەماشا

عالەم ئالآیە[1] چاوەشە

مەردە عەبدوڕەحمان پاشا.

مـــن ئەو هونەرەی بە عەلیمەوە دیوە بەهیچ شـــاعیرێکمەوە نەدیوە. عەلی چیرۆکێکی خەیاڵیی دروســـت کردوو. دەگەڵ قوڵەشین شـــایەری جندۆکان فرپیان هاویشتۆتە یەک و شـــەڕە شـــیعریان کردووە. ئەوی لەباتی خۆی گوتوونی هەموو لێـــک و لووس و جوان و ڕەوانــن. ئەوی لەباتی جندۆکەی گوتوون بەرەژێرترن و لەنگولۆریان تێدایە و قوڵەشـــینی بەو فێڵە بەزاندووە بۆیە شایەرەکانی دوای عەلی دەیانگوت:

«بابە مەمانان چۆن دەوێرین خۆ لە عەلی بدەین، ئەو فێرکردەی جندۆکانە». بڕواشیان بەو قســـەی خۆیان هەبوو. ڕەنگ بێ یەکێک لە هۆیەکانی فەوتانی شـــوێنەوارەکانی عەلی بەردەشانی ئەوە بێ کە هەموو کەس دەخۆی ڕانەدیوە بەیتەکانی ئەو بڵێتەوە. هیچ شایەر و بەیتبێژێک هەقی وەی بە خۆی نەداوە دەس لە شـــیعری عەلی وەر بدا و وشەیەک پاش و پێش بکا. کەچی پاش ئەوەی نووسرانەوە کەمتاکورتێک دەستیان تێ وەردراوە.

خۆزگـــە ئەو کەســـانەی بۆیان دەلوێ زیاتر زەحمەت بـــۆ کۆکردنەوە بەیتەکانی عەلی بکێشن. خۆزگە هەموو شوێنەوارەکانی عەلی پێکەوە چاپ دەکران و بڵاو دەبوونەوە.

---

١ ـ عالم آرا

یا خوڵا هه‌روا گه‌رد و تۆز بێ

ده‌سرۆکه‌ی له ملان ئاڵۆزبێ

له‌یلا جێژنه‌ت لێ پیرۆز بێ.

***

دیسان شه‌و هات بۆ حاڵی من

له‌و دڵه‌ی پڕ خه‌یاڵی من

ئاله‌م سووتا له ناڵه‌ی من

پاش ئه‌و گۆرانییانه به‌یتی عه‌لی عاشــقه. به‌یتێکی کورته؛ هه‌موو یازده به‌نده. به‌ڵام شیعره‌کانی تا تا بڵێی هه‌ست بزوێن و جوانن. ئۆسکارمان ده‌ڵێ ئه‌م عه‌لی عاشقه لاوێکی کورد بووه؛ زۆری حه‌ز له کچێکی کردووه. ئه‌و شه‌وی کچه‌یان بۆ گوێزتۆته‌وه له‌به‌ر ده‌رکی په‌ردوو مردووه. به‌ڕاستی پارچه شیعرێکی جوانه و بۆیه ده‌بێ زۆر جار چاپ بکرێته‌وه:

عه‌لی ئاشق! ئه‌گه‌ر ئیشقت زوبانی بێ،

سه‌د جار عومرت زوو فانی بێ

حه‌یفه ئیخلاس په‌نهانی بێ

مه‌لا زاده به‌خێر هاتی.

ئاخر به‌یت مه‌م و زینێکی بچووکه که لاپه‌ڕێکی کتێبه‌که‌ی ته‌واو نه‌گرتووه. ئۆسکارمانیش ده‌ڵێ شتێکی ئه‌وتۆ نییه و کۆپیه‌ی ناشیرینی به‌یتی برایمۆکه.

خوێنه‌ری به‌ڕێز و خۆشه‌ویست!

ماوه‌یه‌کی دووروودرێژ به‌و کاره خه‌ریک بووم. زۆرم شــه‌و، شــه‌ونه‌خوونی کێشا. زۆرم ڕه‌نج و کوێره‌وه‌ری دی. گه‌لێک ماندوو و شــه‌که‌ت بووم. تا توانیم ئه‌و تێکســتانه ســاغ بکه‌مه‌وه و بیانهێنمه ســه‌ر ڕێنووسی ئێستای کوردی. ده‌شزانم نه هونه‌رێکم نواندوه و نه کارێکم کردووه. هونه‌ر هونه‌ری ئه‌و خۆوێژ و شایه‌رانه‌یه که ئه‌و به‌یتانه‌یان داناون. هونه‌ر




هونەری ئەو مرۆڤە بێ ناونیشــانانەیە کە بە درێژاییی مێژوو؛ سینگاوسنگ پاراستوویانن. هونــەر هونەری ڕەحمان بەکــری نەمرە کە ئەو هەمــوو دوڕ و گەوهەرانەی لە خەزێنەی مێشــکی پڕی خۆی هەڵێنجاون و دەکۆشــی گەوهەرناسێکی وەســتای وەک ئۆسکارمانی کــردوون. کار کاری ئۆســکارمان، ئەو زانا و مامۆســتا گــەورە و مەزنەیە کە ئەو دوڕ و گەوهەرانەی وا بە ڕێکوپێکی هۆندوونەوە و کردوونی بەو ملوانکە و بەرموورە کە لە بازاڕی هونەردا نرخی تەواو نابێ.

ئۆســکارمان ئەو کارەی بە هەر مەبەســتێک کردبێ، خزمەتێکی زۆر گەورەی بە زمان و ئــەدەب و فەرهەنگی و مێژووی نەتەوەی کورد کردووە؛ خزمەتێک کە فەرامۆش ناکرێ. خزمەتێــک کە وێنەی کەمــە. خزمەتێک کە ناوی ئەو زانا بێگانە و دڵســۆزە لە مێژووی ئەدەبی گەلەکەماندا بەنەمری دێڵێتەوە.

لێــرەدا نابێ خزمەتی ئەو ڕۆڵە کــوردە زانایەش (دوکتور جەوادی قازی) لەبیر بکەین کە بە گیان و دڵ یارمەتیی ئەوی داوە.

تەنیــا کارێکی من کردوومە و دەبوو دەپێشــتردا کرابایە ئەوەیە: ئەو ملوانکە بەنرخە و ئەو بەرموورە نایابەم لە کۆنە ســندووقە تۆز لەســەر نیشتووەکان هێنادەر و دامەوە بە خاوەنی خۆی؛ بە کۆمەڵانی هەروای نەتەوەی کورد. میراتی باوک و باپیری خۆیانە و هەر پیرۆزی خۆیان بێ.

سوپاسی کوڕی زانیاری کورد دەکەم کە ئەم ئەرکەی بە من ئەسپارد. دیسان سوپاسی دەکەم کە چاپی کرد و نەیهێشت ڕەنجم بەفیڕۆ بچێ.

سوپاســی کاک (ج) و کاک (ر) دوو هــاوڕێ و بــرای نیزیکم دەکەم کــە هەڵەکانی نووسینیان دەسنیشان دەکردم و زۆریان یاریدە دام. سوپاسی برای خۆشەویستم کاک (خ) دەکەم کە لە کاتی نووســیندا سەرانسوێی دەکردم و پێویستەکانی ڕادەپەڕاندم. سوپاسی تەمەنی خۆم دەکەم کە تەواو نەبوو تا تەواوبوو.

هێمن

١٩٧٥/١/١٩



# سەرەتا



ئەمەسەرەتای کتێبە نایابەکەی oskar mann ە، کوردیزانی بەناوبانگی ئەڵمانیا، کە لە ساڵی ١٩٠٦ لەژێر ناوی (شێوەی کوردانی موکری)(kurden ـdie mundart der mukri) لە بەرلین لە چاپی دا. من لە ئەڵمانییەوە کردمە کوردی.

ناجی عەباس

ئـــەم پارچە ئەدەبیاتە کە لەم بەرگـــە بڵاودەکرێنەوە، کە بریتین لە بەیت (epik واتا هەڵبەستی درێژی مێژوویی) چیرۆکی پەخشان و دێرە هەڵبەستی فۆلکلۆری لە مانگەکانی حوزەیران و تەمووزی ســـاڵی ١٩٠٣ لە شـــاری سابڵاخ، کە ســـەر شاری ئەیالەتی موکری کوردســـتانە- کۆکرانـــەوە. بۆ زانینی بارەی جوغرافی ئـــەم ئەیالەتە بچووکە- کە لە لایەن حاکمێکەوە سەرپەرشـــتی دەکرێ و پەیوەندیی هەیە لەگەڵ حاکمی ئازەربایجان لە تەبریز- تەماشای بەرگی دووەمی کتێبەکەی de morganم کرد mission scientifique en perse بعثەیێکی علمی لە فـــارس، لاپەڕەیەک و لەوەپاش[1]. h.c. rawlinsio عالمێکی کۆنتر، لە ساڵی ١٨٣٨ باری خێڵەکان و جێگای بڵاوبوونیانی باش ڕوون کردەوە[2].

---

١ ـ شکڵی نووسینی ناوە جوغرافیەکانم وەک de morgan دانەنا، بەڵکو لەپاش لێپرسینەوە من خۆم بەدیقەت دامنان. ئۆسکارمان

٢ ـ هەندێ مەعلوومات لەلایەن ئەو گەشتەوە کە لە تەبریزەوە بەناو کوردستانی ئێراندا کرا لە مانگی تشرینی یەکەم و دووەمی ساڵی ١٨٣٨، گۆڤاری جڤاتی (جەمعیەتی) جوغرافیەزانەکی ئینگلیز، بەندی دەیەم، لاپەڕەیەک و لەوە پاش. ئۆسکارمان.

ڕاولنســن بێجگە لەوە هەندێ لە مەعلووماتەکەی مێژووزانی کورد شــەرەفەدینی نرخ پــێ داوە. کتێبەکەی ئەم مێژووزانە کە لە ســاڵی ١٨٦٠ لە چاپ درا و بڵاو کرا لە لایەن خێڵــی موکرییەوە مەعلووماتی مێژوویی تریمان دەداتێ؛ ئەو خێڵە کە ئێســتا زۆربەیان لە باشــووری جەنوبی و باشووری ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوای گۆمی ورمێ دەژین. شەرەفەدین لە بەرگی یەکەم لاپەڕە ٢٨٨ باســی بنچەی (ئەســڵی) میرەکانــی موکری دەکا و دەڵێ ئەمانــە لە بەبەکانــەوە پەیدابوون، کە لە ســولەیمانی و دەوروپشــتی دەژین کە تابعی تورکن (واتا عوسمانییەکان) کە پێشتر لە ئەیالەتی شەهرەزوور جێنشین بوون[1]. وا گومان دەکەم ئەمە ڕاســتە، وە شــێوەی موکری - هەروەکو لە پاشــان پێشان دەدرێ - عەینی شــێوەی بەبەیە. لە پاشا ئیمرۆش خێزانە ناودارەکانی سابلاخ وا دەگەینن کە لە بنەواندا دەچنە ســەر بەبە. بێجگە لەمانە بەپێی ئەو مەعلووماتە (زانیارییە) کە ڕواڵنسن لەبارەی موڵکایەتی لە ئەمارەتی بەبە دەماندانێ، خێزانە ســەرکەوتووەکان بەهێزی شیر توانویانە بەســەر لادێییەکانا زاڵ بن و زەوی و موڵکەکانیان لەناو خۆیانا دابەش بکەن. ئەم جۆرە موڵکایەتییە لە وڵاتی موکریان ئێســتاش باوە و باش دیارە. مێژووزانی کورد شەرەفەدین دەڵێ خێزانە سەرکەوتووەکان لە وڵاتی سولەیمانی ئێستاوە هاتوون. کاتی ئەم سەرکەوتن و زاڵبوونە لە زەمانی ئیمساعیل سەفەویی یەکەمەوە زۆر دوور نییە. لەبەر ئەوە بەڵگەیێکی وامان بەدەستەوە نییە کە بڕوا بە قسەی شەرەفەدین نەکەین.

ئەو خێڵانە کە موکرییەکان بەســەریانا زاڵبوون. وەکو خۆیان کورد بوون. لەمەدا نابێ گومان بکرێ. چونکە دەمی پەلاماردان و زاڵبوون تەنیا ٤٠٠ ساڵ دوورە. ئێستا لەم وڵاتە پاشماوەی تورک زمان و ئیدیەم (idiom)ی تورکی[2] نەماون. لێرە تەنیا دەبێ بیر لە تورک زمــان بکرێــت کە لە ڕۆژهەڵاتی موکریان دەژین و نابێ بیر لە پاشــماوەی نەتەوەی دیکە بکرێت. چینی جووتیاران - کە لە ڕەعیەتیان پێ دەڵێن - زۆرتریان لە خێڵی (دێبۆکری)ن. زۆربەی ئەم دێبۆکرییانە لە بەشی ڕۆژهەڵاتی موکریان لە ناوچەی شارویران و لە دۆڵەکانی جەغەتــوو و تەتەهــوی نیزیک میاندواب دەژین. وا دیارە ئــەم دێبۆکریانە لە لایەن خێڵە موکرییەکانــی هاوزمانیان - لە پاش دەس بەســەرەوەنانی موڵکەکانیان - لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات دەرکران.

---

١ - وابزانم لێرەدا نووسەر هەڵەی کردووە. چونکە لە سەدەی ١٩ شاری سولەیمانی تابعی ئەیالەتی شارەزوور بوو کە ئەودەمە مەرکەزەکەی شاری کەرکوک بوو. ناجی عەباس

٢ - وەک قسەی نەستەق و پەندی پێشینیان ن.ع




ئێستا دەتوانین سنووری ڕۆژهەڵاتی ناوچەی زمانی موکری باش دابنێین. ئەو خەڵکانە کە لە ڕۆژهەڵاتی دۆڵی جەغەتوو دەژین بە تورکی قسە دەکەن و ژمارەیێکی زۆری ئەمانە لە دەشــتی میاندواب جێنشــینن. کە ڕوو دەکەینە باشوور (جەنووب) دەگەینە ناوچەکانی سەقز و بانە کە دانیشتووەکانی دیسان بە شێوەی موکری قسە دەکەن. کە چەند سەعات لەم دوو شــارە بچووکەوە بەرەو خوار بکشێین دەگەینە ناوچەی (مەریوان) کە دەکەوێتە نیزیک ســنووری تورک (واتا عوســمانییەکان). کە لە مەریوانەوە بەرەو ڕۆژهەڵات بڕۆین دەگەینە خێڵی تیلەکۆ کە لە هەرێمی هۆبەتوو دەژین. ئەم تیلەکۆیانە بە شــێوەی ســنە قسە دەکەن و تابعی ئەیالەتی (کوردستان)ن. بێتوو لە سابڵاخەوە- کە مەرکەزی موکریان دەگرێت - بەرەو ڕۆژئاوا بڕۆین، لە بەشــی شــمال دەگەینە سێ خێڵی بلباس: مەنگوڕ کە تەواو دەکەونە ڕۆژئاوای باشــووری (جەنووبی) ســابڵاخ. مامش کە لە هەرێمی لاجانن و پیران کە لە بەشــی ڕۆژئاوای باکووری ئەو هەرێمە دەژین. شێوەی پیران زۆر کەم لە هی سابڵاخ جیا دەبێت. لە دەشتی (شنۆ)وە بەرەو باکوور (شمال) بڕۆین ئیتر شێوەی موکری نامێنێ. هەندێ کەس لە هۆزەکانی (ڕەوەندی)[1] - کە لە باشووری (جەنووبی) شنۆ پێیان گەیشــتم - بە قسەی موکری قســەیان دەکرد. بەڵام هەرێمی ڕەوەندییەکان لەوێوە بەرەو ڕۆژئاوا هەتا دۆڵی زێی گەورە دەکشــێ. کە لە ســابڵاخەوە بەرەو ڕۆژئاوای باشووە بڕۆین دەگەینە سەردەشــت و بانە. لەو ناوە نیزک ســنووری تورک خێڵی (گەورک) دەژین کە شــێوەی موکری بەکاردێنن. حەیف و مەخابن من ئیــزن نەدرابووم لە هەرێمەکانی تورک (واتا عیراقی ئێســتا) لەســەر تۆژینەوە دەوام بکەم. لەبەر ئەوە بەداخەوە ناتوانم بڵێم شێوەی موکری لەولای ســنوور هەتا کوێ دەکشێ[2]. بەڵام ئەو ئاخاوتنانەم لەگەڵ هەندێ کەسی خەڵکی سولەیمانی و دەوروپشتی و لەگەڵ هەندێ شاعیری خۆشەویست لە سابڵاخ، کە خەڵکی کەرکووک، دەربەند و دێهاتی ســولەیمانی بوون، پێشــانی دام کە جیاوازییێکی ئەوتۆ نییە لە بەینی شــێوەی موکــری و ئەوانیتری. تۆژینــەوەی chodzko لە بابەت شێوەی سولەیمانی - کە لە پاشان باس دەکرێ - ئەم قسەیەی من بەڕاست دادەنێ.

شەرەفنامە باسی مێژووی موکرییەکان دەکا هەتا کاتی خۆی کە نزیک دەبێ لە ساڵی

---

١ - وابزانم لێرە مەبەستی لە (ڕەوەندی) ئەو ڕەوەندانەیە (کۆچەرانەیە) هاوینان لەوێ لە ژێر خێوەت دەژین؛ وەک هەرکی و سوورچی و خێڵیتری. (ن.ع)

٢ - وەکو بزانم شێوەی موکری تەواو و پەتی لە هەرێمی پژدەر و ڕانیە بڵاوە. لە هەرێمی باڵەکی ڕۆژهەڵاتی ڕەواندز خەڵکی حاجی ئۆمەران، زینوی شێخ و ڕایەت بە شێوەی موکری قسە دەکەن. لە دەربەندی ڕایەت شێوەی سۆران دەس پێ دەکا. ن.ع.

١٥٩٥. بێتو بمانەوێ پاش ئەم ساڵە بەشوێن ئەم مێژووە بڕۆین دەبێ دەس بخەینە ناو مێژووی عەجەم؛ بەتایبەتی مێژووی سەفەوییەکان. من لەم بابەتەوە هەندێ تۆژینەوەم کرد؛ بەڵام ئێستا ماوەی ئەوەم نییە لەسەری بڕۆم و تەواوی کەم.

میرزا ئەسکەندەر لە مێژووە میرییەکەی (ڕەسمییەکەی) کە بۆ شا عەباسی نووسیوە بەناوی (تاریخی عالم آرائی) باسی شەڕە درێژەکانی موکری و برادۆست دەکا. کە خزم و دراوسێی موکرییەکانن بەرامبەر لەشکری شاه عەباس. ئەسکەندەر میرزا خۆی لەگەڵ لەشکری عەجەم بووە، لەبەر ئەوە مێژووەکەی بە ڕاپۆرتێکی ڕاست دادەندرێ. کوردەکان لەلایەن ئەم شەڕانەوە بەیتێکی مێژوویی درێژیان داناوە کە باسی بەرگری و ئازایەتیی قارەمانانەی کوردەکان دەکا لە قەڵای دمدم لەژێر سەرکردەیی ئەمیرخانی سەرۆکی برادۆست کە بە (خانی لەپزێڕین) بەناوبانگ بوو[١]. ئەم بەیتی دمدمە یەکێک لە جوانترین و بەناوبانگترین داستانی میللی کوردە.

لەمێژووی نادرشای میرزامهدی خانیش لە بابەت موکریانەوە دەسکەوتی باش دەدۆزرێ.

ڕاولنسن rawlinson لە وتارە باشەکەی بەدرێژی باسی هاتنی قەرەپەپاغی تورک دەکا کە لە وڵاتی جورجیای قەفقاسەوە بۆ هەرێمی سولدوز کۆچیان کردووە. سولدوز دەکەوێتە ڕۆژئاوای باشووری گۆمی ئورمێ.

زۆربەی خێڵەکانی موکری ئێستا جێنشینن و لە دێهات دەژین کە بریتییە لە خانووی قوڕی خراپ و ناپەسەند. هاوینان خانووەکانیان بەجێ دەهێڵن و، هەتا دەغلودانیان کۆ دەکەنەوە، لە ژێر ڕەشماڵی ڕەشدا نیزیک دێیەکان دەژین. تەنیا بەشێکی بچووکی ئەم کوردانە نیوە کۆچەرن (نیوە ڕەوەندن) کە زستانان نیشتەجێن و لە خانوودا دەژین و خۆیان کەمتر لەگەڵ کشتوکاڵ خەریک دەکەن. هەر ئەوەندە دەغڵ دەچێنن کە بەشی خۆیان بکەن. ئەم نیوە کۆچەرانە کە بەهار هات خانووکانیان بەجێ دەهێڵن و لەگەڵ مێگەلەکانیان دەچنە کوێستان و هەتا پایز لە مێرگێکەوە دەچن بۆ مێرگێکی دیکە. کە پایز هات دەگەڕێنەوە دێیەکانیان و کۆمەکی ئەو چەند خێزانە دەکەن کە لەوێ ماون بۆ چاودێریی دەغڵ و باغات و پێکەوە ئیتر بەرهەمەکەیان (مەحسوولەکەیان) کۆ دەکەنەوە. ئێستا لەم هەرێمەی کوردستانە کۆچەری تەواو نەماون کە زستان و هاوین لەژێر خێوەتا

١ - میرزا ئەسکەندەر، وەکو دوژمن. ن.ع - نازناوی (چۆلاق)ی پێ دەدا، کە بە تورکی مەعنای دەس کۆج یان دەس شکاو دەگرێ. تۆسکارمان




بژین و تەنیا مەڕومالاّت بەخێوکەن و دەست لە کشتوکالّ نادەن.

لە بابەت زمانی ئەم خێلّە کوردانە هەتا ئەم ڕۆژانە تەنیا دوو نووسراوی کورت هەیە:

١ـ a.chodzko شۆدزکۆ: تۆژینەوەییێکی زمانسازیی زمانی کوردی (شێوەی سولەیمانی) کە لە گۆڤاری ئاســـیایی ســـالّ ١٨٥٧ بلاّو کراوە. شۆدزکۆ مەعلووماتەکەی لە سەرۆکێکی بەبە کۆکردۆتەوە کە ســـالّی ١٨٥٣ ماوەییێکی درێژ لە پاریــس ماوە. زمانزانی بەناوبانگ p.lerch لێرەش باسی بەرهەمەکەی شۆدزکۆ دەکا. من لێرە تەنیا بەراوەردی ئەو شێوەیە دەکەم کە شۆدزکۆ باسی دەکا لەگەلّ شێوەی موکری.

٢ـ schindler ـa. houtum هوتـــوم ـ شـــیندلەر، لەلایەن وشـــەی کوردییەوە. ئەم بەرهەمە بەنرخە کەمێک ڕێزمانیشی تێدایە.

٣ـ de morgan دێ مۆرگان: بیعســـەییێکی علمی لە فـــارس کە پێنج بەرگە. بەرگی یەکەمی ـ کە لە ســـالّی ١٨٩٤ و ١٨٩٥ بلاّوکرایەوە. باســـی شـــێوەی موکری دەکا لەگەلّ شێوەکانی تری، بەلاّم زۆر قسەی هەلّە و چەوتی تێدایە[1].

ئەو مەعلوماتە کە لە سابلاّخ کۆم کردەوە بریتین لە چوار شت:

١ـ ڕێزمانی شێوەی موکری.

٢ـ ژمارەییێکی زۆر لە وشەی کوردی کە بۆ ژیانی ڕۆژانەی خەلّک بەکار دەهێنرێن.

٣ـ ٢٠٠٠ غەزەل و قەسیدەی شاعیرانی کورد کە زۆریان نوێن.

٤ـ چیرۆکی پەخشان، بەیت و چەند گۆرانی ناو خەلّک.

من بەختم هەبوو لە ســـابلاّخ تووشـــی میرزاییێکـــی گەنجی ژیر بـــووم و خێرا کردمە منشـــیی[2] خـــۆم. ناوی میـــرزا جەواد بوو و لە یەکـــێ لە خانەدانەکانـــی موکری بوو، کە پشتاوپشـــت دەچووە ســـەر خانەدانی ئەمارەتی بەبە. کەسانی ئەم خانەدانە لەناو خەلّک بەفامیلەی (قازی) بەناوبانگن. ئەم گەنجە لە عەرەبی و شەریعەتی ئیسلام زۆر شارەزا بوو و زۆر حەزی دەکرد فێری زانســـتیەکانی ئەورووپا بێ. من ویســـتم لە پیش هەموو شـــتێکا زاراوەی بنجی (مستەلەحاتی ئەساسی) ئێمەی (ئەلّمانی) بۆ ڕوون کەمەوە؛ چونکە میرزا بەزانینـــی ڕێزمانی عەرەبی، لـــە لێکدانەوە لە زمانێکی هنـــدو- جەرمانی پەکی دەکەوت.

---

١ ـ لێرە ئۆسکارمان لەلاپەرە ٢٢هوە هەتا ٢٥ی سەرەتا بەدرێژی و توندی ڕەخنە لە دێ مۆرگان دەگرێ و پەلاماری دەدا کە پێی ناوێ لێرە بیکەمە کوردی. لە وێنەکان کە ئۆسکارمان پەلاماری دەدا وا دیارە دێ مورگان کوردیی باش نەزانیوە. ناجی عەباس

٢ ـ ئەم وشەیە ئۆسکارمان بە حروفی ئەلّمانیی نووسیوە وا دیارە لەودەمە زاراوەییێکی کوردی و فارسی ئێران بووە. لای ئێمە میرزا یان کاتبی پێدەوترێ. ناجی عەباس

لەپێشــدا نەختێ ئینگلیزیم فێرکرد و هەندێ دەستووری (قواعدی) زمانی ئینگلیزیم پیشان دا. لە پاشــا زۆر بەدڵخۆشــی تەماشــام کرد کاک میرزا وەک کوردێک بیر دەکا لە زمانە زگماکەکەی خۆی و شیی دەکا و وردە وردە دەستووری بۆ دەدۆزێ. ئینجا لەگەڵی دەسم کردووە تۆژینەوەی رێزمانی کوردی و خوێندنی پارچە هەڵبەستی کوردی. ئەو هەڵبەستانە کە میرزا دەسخەتێکی زۆری ـ داخەکەم زۆر تازەی ـ هەبوو. لەماڵەوە بەکۆمەکی براکەی لیستەی وشەی کوردیی لەگەڵ فارسییە بەرامبەرەکەی دانا. من لە پاشان نیشانەم دانابوو بۆ ئەو دەنگانە کە تایبەتی کوردین و ئەم نیشانانەم فێری میرزا کرد و شتە کوردییەکانم پێ نووسیەوە.

ئەو شــەش چیرۆکە پەخشــانە کە لەم کتێبە بڵاوکرانەوە لەگەڵ هەندێ لەو گۆرانییە بچووکانە کە لە ژێر پیتی (C) دانراون لە میرزا جەواد وەرگیراون. هەڵبەستە بچووکەکانی تریم لە شوان و قاترچی وەرگرت. هەڵبەستەکەی (عەلی عاشق) و هەندێ پارچەی (مەم و زین)م لە مەریوان[1] لە کوردێک وەرگرت کە لەوێ لە دایک بووبوو و ماوەییێکی درێژ لە بانە و ســەقز و ســابڵاخ ژیابوو. ئەو کوردە وای پیشان دەدا کە شێوەی موکری باش دەزانێ؛ بەڵام ئەو پارچانە کە لێم وەرگرت جیاوازییێکی زۆری هەیە لەگەڵ پارچەکانی تری[2].

ئەو هەڵبەســتانە کە لە مەریوان بەدەســم کەوت لە ســابڵاخ بەشــێوەی موکری بۆم خوێندرایــەوە. کە بەراوەردی شــێوەی مەریوانمان کرد لەگەڵ هی ســابڵاخ، دەبینین لە هەڵبەســتدا جیاوازێکی کەمتر هەیە لە هی پەخشان. هەڵبەستی (عەلی عاشق ژمارە ١٥) لەلایــەن لاوێکی هــەرزەکارەوە دانراوە کە بۆ خواســتنی کچێک ماوەیێکــی درێژ هەوڵی دەدا؛ بــەڵام لــە دواییدا کە توانی مارەی کا، رۆژی شــایی لە پڕێکا پیزێک هەڵبەســتی بەخۆشەویستەکەی ـ کە ناوی پەریزادە بوو ـ هەڵگوت و لە بێڵای (عەتەبەی) ژووری بووک بەمردوویی کەوتە خوارەوە.

زۆربەی ئەو کۆمەڵە تێکســتە (سایانە= text) کە لەم کتێبە بڵاو دەکرێنەوە بریتین لــە گۆرانیی بەیت (لــە لاپەڕە ١٢ەوە هەتا ٢٩٧) کە بــەدەم خەڵکەوەیە. ئەمانە لەلایەن ڕەحمانی بەکری شاعرەوە[3] پێم نووسراو کە لە هەرێمی سابڵاخ بەڕەحمانی بەکری بەیتبێژ

---

١ ـ مەریوان شارێکی بچووکی ئەیالەتی ئەردەڵان یان کوردستانە کە تەواو لەسەر سنووری تورکە و نیزیک پێنجوێنە. ئۆسکارمان.

٢ ـ چیرۆکێکی مەم و زین زۆر لە هەڵبەستەکەی برایمۆک دەکا کە لە ژێر ژمارە پێنج لەم کتێبە بڵاوکرایەوە. ئۆسکارمان.

٣ ـ وا دیارە مەبەستی ئۆسکارمان لە (شاعر) (شایەر)ە کە بە گۆرانیبێژ دەوترێ.

بەناوبانگە؛ کە دێبۆکرییە و خەڵکی دێی حاجی حوسێنە[١]. کە دێیێکی بچووکە لە دەشتی میانـــدواب. تەنیا ژمارە ١٦ (لاپەڕە ٢٩٣) دەروێشـــێکی موکری پێی نووســـیم، کە خۆی بەشـــانازییەوە بەئوســـتاد دادەنا. لەگەڵ ئەوەشـــدا ئامادە بووم پاداشـــی باشی بدەمێ؛ داخەکـــەم جارێکی تری نەهاتە لام و وا دیاربوو چە هێزێک نەیدەتوانی ئیقناعی بکا تاکو بێتە لام. لە ڕۆژی پۆســـتە کە بۆ من ڕۆژی پشـــوودان بوو- داوام لە میرزا جەواد دەکرد ئەو هەڵبەســـتانە کە ڕەحمانی بەکر لەبەریەتی بەڕێنووسی فارسی بۆم بنووسێ. لە پاشا میرزا ئەو هەڵبەســـتانەی بۆ دەخوێندمەوە و من دەمنووســـی. من چەشـــنە ڕێنووسێکی کوردیم دروســـت کرد کـــە لە دوا لاپەڕەکانی ئەم کتێبە لە چـــاپ دراوە. ئەو پارچانە کە ڕەحمان پێی دەنووســـیم، ڕەحمان بە شـــێوەی ناو خەڵک بۆی دەخوێندمەوە بەڵام میرزا جەواد کە خوێندەوار بوو وشـــە عەرەبیەکانی ناو زمانی کوردی باشـــتر تێ دەگەیشـــت و دەیخوێنـــدەوە. بەڵام هەندێ جار (وەک پارچەکانـــی ١٣، ١٤، ١٥) من زۆرم لێ دەکرد کە خەڵکی نەخوێندەوار چۆن دەیڵێن وام پێ بنووسێ.

بەیتـــی ژمارە یەک (مێژووی دمدم) لەگەڵ (ناســـر و ماڵ ماڵ)م جارێکی‌تری بیســـت لەنـــاو کوردەکانـــی ڕەوەند لە دێی عەینی ڕۆم کە ڕەشـــماڵ دێیێکی[٢] بچووکە لە باکووری شـــنۆ. گۆرانیبێژەکانی ڕەوەند لە تێکستی ڕەحمان خۆیان لانەدا. وشەکانی دێری یەکەمی دمدم تەواو وەک ئەوە بوو کە لای من نووســـرابوو. بەڵێ هەندێ جیاوازیی هەبوو لە وشـــە و دەنگـــەکان، بەڵام زۆر کەم. داخەکـــەم ئەودەمە نەمتوانی زیاتر لەناو ڕەوەندەکان بمێنم و گۆرانییـــان لـــێ وەرگرم؛ چونکە چەند ڕۆژێ بوو تام لێ هاتبـــوو و کارم پێ نەدەکرا و دەربەســـت بووم ئەوەندەی پێم بکرێ زووتر بەســـواری بچمە ئورمێ و لەوێ خۆم بگەینمە لای پزیشکێک تاکوو چارەم بکا.

لـــە وەرگێڕانی بەیتەکان بۆ ســـەر ئەڵمانی کـــە لە بەرگـــی دووەم بڵاودەکرێتەوە لە تێبینینەکانی socin_prym سوودم وەرگرت.

بێجگە لەو فێرگانە (قوتابخانە و مەدرەســـانە) کە زۆریان لەژێر سەرپەرشتیی مەلاکانن، هەنـــدێ فێرگـــەی گۆرانی هەن کە لەوێ گەنجەکان فێری بێژینـــی ئەو بەیتانە دەبن کە لە

---

١ ـ کاک هێمن دەڵێ من بەڵەدی ئەو ناوەم لەوێ دێیەک نییە ناوی حاجی حسەین بێ، بەڵام بەناوی حاجی حەسەن دێیە هەیە. وا دیارە ئۆسکارمان هەڵەی کردووە، یان لە چاپدا تووشی هەڵە بووە. ناجی عەباس.

٢ ـ لە هەرێمی شنۆ ڕەشماڵدێ نییە کە زستانیش تێدا بژین. وا گومان دەکەم عەینی ڕۆم ناوی هاوینەهەوار بێ.

بەخشان و هەڵبەســتی کوردەواری پێک هاتوون. ئەو گەنجانە کە دەنگیان خۆشە دەچنە لای وەســتایێک (کە بە فارسی ئوســتادی پێ دەبێژرێ) تاکو فێری بێژین و چڕینی هەموو ئەو هەڵبەســتانە بن کە ئەو وەســتایانە دەیانزانن و لەبەری کــەن. بەم جۆرە ئەو پارچە هەڵبەســتانە دەماودەم دەپارێزرێن. ئەو بەیتبێژانە بەدەگمەن خوێندن و نووسین دەزانن؛ تەنانەت ڕەحمانی بەکر نەخوێندەوار بوو. بێتو ئەو گەنجانە بیانەوێ باشــتر فێری پیشەکە بن، دەچنە لای وەســتایێکی دووەم و ســێیەم و دەبنە شــاگردی؛ بەڵام نەک بەخۆڕایی. شاگردەکە بەخزمەتکردن لە ماڵی وەستاکەی، یان بەهێنانی شتی پێویست (وەک چا و گەنم و ڕۆن...) پاداشتی دەدا.

لە پاشــا ئــەم گۆرانیبێژانە لە ماڵــی ناودارەکان مەشــق دەکەن؛ ئێــواران دەچنە دیوەخانەکانیان و دەس دەکەن بە گۆرانی وتن. بەرامبەر ئەمە ئەو ماڵانە بەرگی بەنرخیان پێ خەڵات دەکەن، یان شــتی‌تریان پێ پێشــکەش دەکەن، لەم بابەتــەوە نابێ ڕەزیلی بنوێنن. لە دێیەکان بە دەرخواردنی پڵاوگۆشــتێکی باش دڵخۆشیان دەکەن. لە شارەکان زۆر چایخانە هەن هەندێ جار ئەم چایخانانە ســەرتاپا پڕ دەبێ لە خەڵک کە پاڵ بەیەک دەدەن بۆ گوێگرتن لە گۆرانیبێژێک کە بە هەڵکەوت هاتووەتە ناو شار[1].

ئــەو گۆرانییانە بــۆ ئێمە (واتا بۆ ئەڵمان و ئەورووپاییەکانی تری) یەکنەســەق بوون و پیاویــان وەڕەس دەکرد. لە دێرە درێژەکان، گورانیبێژ وشــەکانی بەپەلە یەک لە دوای یــەک لە زار دەردەپەڕاند. لە دێرە کورتەکان، وشــەکان بــە هونەرمەندی درێژ دەکرێ و بەنــدی دوایــی بەهێز، بەڵام بەنزمــی و نەرمییەوە بەدەنگێکی لــەرزۆک و خۆش لە دەم دەردەهێنرێ.

وا دیــارە بیری (زاکرەی) ســەیر و غەریبی ئەم پیاوانە بەگۆرانییەکانەوە بەســتراوە. ڕەحمــان ـ کە گۆرانیەکانی پێ دەنووســم ـ نەیدەتوانی دێــر بە دێر بیری لێ بکاتەوە بێ ئەوەی بیر لە هەموو گۆرانییەک بکاتەوە. بیتەبع هەندێ جار گۆرانیبێژ بەســەرپێیی وشە و دەنگ دەگۆڕێ؛ بەڵام لەوە کەمتر کە من لەپێشــدا بڕوام دەکرد. کە من بەراوەردی ئەو تێکســتە (زەمبیل فرۆش ژمارە ١٥) م کرد لە ڕەحمان وەرم گرتبوو لەگەڵ هی دووانەکەی

---

١ ـ لە سابڵاخ ئەو ڕۆژانە کە ڕەحمان گۆرانییەکی پێ دەنووسیم ڕۆژانی جەژن بوو. ڕەحمان کە لە ساڵی جارێک و یەک ڕۆژ بۆ سابڵاخ دەهات، کە ماوەیێکی درێژ بۆ من لە شار دەمایەوە، لە کاتی پشوودان و حەسانەوە دەچووە یەکێ لە چاپخانەکان و لەوێ گۆرانی دەبێژنی کە دەمی کارکردن بۆ من دەهات یەکێکم دەنارد تاکوو بۆ لای من بهێنن، بەڵام ئەو کەسانە هەموو جارێ زۆر بەزەحمەت دەیانتوانی لەدەس گوێگرە بەشەوقەکان ڕایکێشن و بۆ کارکردن بۆ لای منی بهێنن. ئۆسکارمان.

زمانزان socin_prym جیاوازییێکی ئەوتۆم نەدی. پیاو واقی وەڕدەمێنێ لەوە کە کوردەکان چۆن توانیویانە پارچە هەڵبەستەکانیان دەماودەم وا باش بە وردی و باشی بگێڕنەوە.

هەڵبەســـتەکان هەموو بەیەک form دروســـت نەکراون؛ بـــەڵام گۆرانیبێژ لە چڕیندا جیـــاوازی ناکا و لە بەین هەڵبەســـتێکی دێر درێژ وەک مەم و زیـــن یان پارچەیەکی دێر کورت وەک هەڵبەستی نومرە دەی جوڵندی julindi زمانەکەی بەتێکڕایی یەکە (موحدە). ئەویش شـــێوەی سابڵاخ و دەوروپشتیەتی. بەڵام هەندێ جار تووشی وشەی جیاواز دەبین بەتایبەتی لە دروســـتکردنی ســـەجع. بۆچی ئەدیبەکان ئەمە دەکەن؟ ئایا بۆ خاتر سەجع ئیزنی ئەوەیان دراوە وشەیێک بەسەربەستی بەشکڵێکی (فۆرمێکی) غەریب بەکاربێنن، یان ئەو وشانە لە هەڵبەستی شێوەکانی‌تری بەکار هێنراون ئەمانیش دەتوانن لێیان وەرگرن؟

تەنیـــا بەیتی زەمبیلفرۆش، کە لە ژمارەی ١٤یە، فۆرمی لە بەیت و هەڵبەســـتەکانی جیاوازیی هەیە. چونکە دێرەکانی ئەم بەیتە تەرکیبێکی تایبەتی هەیە و بۆ ئامانجێکی ئاین و تەســـەوف دانراوە. من دڵنیام ئەم بەیتە لە دەم خەڵکی نەخوێندەوارەوە پەیدانەبووە و یەکێکی لادێیی ناو کێوەکانی موکری دای نەناوە.

لێرە ماوەی ئەوەم نییە ئەم جۆرە پرسیارانە لێ بکۆڵمەوە، با هەڵی گرم و دوای خەم بۆ جێگاییێکی‌تر.

***



## شێخ فەرخ لە چەند دێڕێکدا

ماوەیەک لەمەوبەر شـــاعیری پایەبەرز و ئاوارە، شاعیری گەل (هێمن)ی خۆشەویست، داوای لێ کردم کە دەربارەی (شێخ فەرخ) زانیاری و شارەزاییی خۆمی لە چەند لاپەڕەیەکدا بـــۆ تۆمار بکـــەم. منیش بەڵێنـــم دایە و هەر ئەوڕۆ بۆ ســـبەینێم لێ کـــرد و تا بەرگی لەبیرچوونەوەم لەبەر بەڵێنەکە کرد. بەڵام بۆچی ئەو بەرگەم بۆ بەڵێنەکە دروی؟ ئەوەیان بەلای منەوە گرنگە.

بەســـەرهاتی شێخ فەرخ لە داستانێکی ئەفسانەاویدا بەشێوەی بەیت ماوەتەوە. هەرچی گوتەش هەیە لە پەراوێزی ئەو بەیتانە دادڕاون. داستانەکە بابەتی شەوچەرەی دیواخان و کۆڕی کوڕوکاڵی لادێکانە.

بەهۆی بوونی مەزارێک بەناوی شـــێخ فەرخەوە تا ڕادەیەک ئەو داستانە کاری کردۆتە سەر مێشک و دەروونی خەڵکی سادە و نەخوێندەوار.

بەبـــاوەڕی من بەیتەکان زۆریان دراوەتە پاڵ و لە ئەندازەی ڕاســـتی بەدەرن. تەنانەت درۆشـــی تێکەڵ بووە. کار بەوەشـــەوە نەوەســـتاوە کەلێن و لایەنی ئەوتۆی تێکەڵ بووە، ناوهێنانیان نیشانەی دواکەوتوویی و ژیانی دەوری بەردمان بەباڵا دەبڕێ. هەرچی واقیعییە و ئـــەوەی بەچاوی خۆم دیومە بەبۆنەی پشـــدەرایەتیم تۆماری دەکـــەم و هەرچی واتەی خەڵکـــی ناوچەکەمان هەیە لەو بەرەیەوە فەرامۆشـــی ناکەم. بەباوەڕی من شـــێخ فەرخ

هەبووە. بەڵام شێوەی ژیانی و کار و کرداری بەم جۆرە نەبووە کە لە بەیتەکاندا ئەدرێتە پاڵی...

چوونە ناو ناوەڕۆکی باسی شێخ فەرخ ئەبێ بکرێت بە چەند بەشێکەوە:

١- مەزار و شوێنەواری شێخ فەرخ:

مەزاری شـــێخ فەرخ لە گوندی (داودێ) لە ناوچەی پشدەرە، (داودێ) هەشت نۆ ماڵێک دەبێ و ماوەی ٩ کیلومەتر لە شاری قەڵادزەوە دوورە. دەکەوێتە بەشی خوارووی ڕۆژهەڵاتی قەڵادزە.

مەزارەکە لە گۆرەپانێکدایە و بەشـــی سەرووی شاخێکە و بەشی خوارووی شێوە و خڕ و دۆڵە تا دەگاتە چۆمی (مەرزەوانان). وارشـــێکی گەورە بۆ ئارامگاکەی کراوە کە درێژیی وارشـــەکە نزیکـــی ٢٠٠٠ هەزار مەتر دەبـــێ و پانیی نیو مەتر و بـــەرزی مەترێک دەبێ[1]. ئارامگاکەی بەتاشەبەرد و کێلی گەورە داڕێژراوە، دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتی داودێ.

داودێ، کانـــی و ئـــاوی زۆرە. بەناوبانگترین کانی (کانی خاتوو ئەســـتی)یە کە ئاوی خواردنەوەی قەڵادزە لەو کانییەوە بە بۆری ڕاکێشراوە و دەکرێتە تانکییەکی گەورە و دوای ئەوە دابەش دەکرێت.

گوندی داوە بەهۆی مەزاری شـــێخ فەرخەوە بۆتە ســـەیرانگا و کۆڕی شایی و لوغان. بەهاران کەســـێک نامێنێ نەچێتە داودێ، تەنانەت خەڵکی سەنگەســـەر و ڕانیە و کۆیەش بەشداری قەڵادزە دەکەن لەو ڕۆژانەدا. هەرچەندە لە داودێ دارودرەخت کەمە؛ بەڵام خەڵکی ئەوەیان بەلاوە گرنگ نییە، لەبەر چەقی هەتاو بەپاڵ گردەکانەوە سەماوەری خۆیان گەرم دەکەن. لە ڕۆژانی سەیراندا بۆ (داودێ) کەرێکی شەل بەنرخێکی زۆر وەدەست ناکەوێ.

دوای سەیرانکردنی پۆلی ژن و کچ ڕێچکە دەبەستن بۆ زیارەتی شێخ فەرخ و هەریەکە و داواکاری خۆی بە ســـرپە دەدرکێنێ. هەندێک شـــەمۆلە دەگرنەوە، هەندێک بەرد دەنێن بە کێلی ژوور ســـەریەوە، هەندێک پەڕۆ لە ئاڵاکان دادەڕن. لەولاشـــەوە کۆڕی لاو و کچی شۆخ دەیکەن بەڕەشبەڵەک. دەنگی تەپڵ و دوزەلە منداڵ و پیریش دەهێنێتە سەما. هەر شاباشـــەهۆ دەکرێ. هەر ڕیزی چەکە دەنگ دەداتەوە. هەر نیشانەیە و ناپێکرێ. لەلایەک ســـێبازە و لەلایەکیتر جۆلانەیە و داخراوە؛ لەلایەکیتـــر ڕمبازێنە ئەکرێ. پێش خۆرئاوا خەڵکی بەرەو شار دەبنەوە.

---

١ - بەسەرهاتی ئەم وارشە لە شوێنی خۆیدا باس دەکەین.

ئەوەی بەلای منەوە جێگای سەرسوورمانە ئەوەیە خەڵکی داودێ لەو ڕۆژانەدا خۆیان بۆ خزمەتی سەیرانکەران ئامادە دەکەن؛ بەبێ ئەوەی چاوەڕێی هیچ پاداشێک بن. هەرچەندە زۆریش زەرەریان پێ دەگا؛ بەڵام دەربەســـت نایــەن. ئەوەیان گرنگە پێم وایە ئەو هەموو خەڵکە بە میوانی شێخ فەرخ دەزانن و لەبەر ئەو دەنگ ناکەن.

٢- واتەی خەڵکی:

الف : دەڵێن شێخ فەرخ وەلییەکی عاشقە؛ کەرامەتدارە.

ب - دەڵێن شێخ فەرخ نەمردووە و ئاگای لە هەموو شتێکە.

جـ دەڵێن هەر ژنێک سکی پڕبێ و بچێتە سەر ئارامگاکەی؛ کە منداڵەکی بوو نیشانەی پێوە دەبێ. ئەو نیشانەیە لە شێوەی (خاڵ)دا دەبێ. ئەوەی جێگای سەرسوورمانە نموونە بۆ ئەمە زۆرە.

د- دەڵێن ئەو دووعایانەی شێخ فەرخ کردوونی تا ئەمرۆش ئاکاریان ماوە.

هـ- دەڵێن مارەی خاتوو ئەستێ و شێخ فەرخ لە ڕۆژی ئەزەلەوە بڕدراوە.

گەلــێ دەڵێنیتریش کە هەمووی لە یــەک قاوغدا خۆی پێچاوەتەوە. بەکورتی خەڵکی ناوچەکە- بە تایبەتی کۆنەکان - زۆر ڕێز لە شــێخ فـــەرخ دەبێن و ڕازی نین کەس هیچی دەربارەی بڵێ.

ئەحمەد ڕەسووڵ پشدەری

# چیرۆکی یەکەم

ئەحمەد خان لەپ زێڕین جێگای قەڵای دمدمی بوو؛ لە زەمانی شـــاە عەباسیدا بوو. لە دێیەک لە دێهاتی ورمێ ساحبی عێل بوو. یاغی بوو لە شاە عەباسی. قەڵایەکی دروس کرد. لە پاشان شاە عەباس لە ئیسفەهانێ لەشکری نارد بۆ سەر خان ئەحمەد خانی؛ شەڕێکیان کرد. خان ئەحمەد خان شـــکا. چوو بۆ ئەســـتەمبووڵێ؛ چووە کن خونکاری. شەڕێک بوو لەگەڵ عرووسی. خان ئەحمەد لەو شەڕەیدا سەری سەرکردەی عرووسی بڕی. وەدەستیان پەڕان لەو شـــەڕەیدا. خونکار خەڵاتی کرد، دەســـتی زێڕی تێ گرت، ناردیە وەڵاتی خۆی، کردیە حاکمی وەڵاتی خۆی. کە هاتەوە وەڵاتی، عێلاتی وێی لێ خڕبوونەوە. دیسان یاغی بوو؛ دەســـتی کرد بەقەڵات دروسکردنێ؛ شـــارێکی بینا نا. خەریک بەتاڵانی دەورەی خۆ بوو؛ فەعلەیان دەگرت ڕۆژێ بەپێنج قڕانان؛ نەیدێشت فەعلەکان بچنە دەرێ. شاە عەباس لە ئیســـفەهانێ بەرگی دەروێشـــییەی لەبەرکرد؛ گوتی:«بزانم ئەوە چ ئەحمەدخانێکە یای بووە».

بەکوردســـتانێدا هات؛ تا هاتە لاجانێ. شـــەوێ میوانێ دەروێشێکی بوو. بەدەروێشی گوت: خانە خۆی! شـــوغڵت چییە؟ گوتی: «شـــوغڵم کەو گرتنە»؛ گوتی: «ســـێ ڕۆژە هیچم نەگرتووە». شا عەباسی گوتی: «ئەمشۆکە بچۆ بەبەختی شاە عەباسی». دەروێش گوتی: «شاە عەباسێکی لە ئیسفەهانێ، ئەمنێکی لێرە چلۆن بەبەختی وی بچم؟» گوتی: «قەیـــدی نییە، بچۆ». دەرویش ڕۆی؛ ئەوێ شـــەوێ پێنج کەوی گـــرت. هاتەوە گوتی:

«خـــزم! به‌خولآت ســـوێند ده‌ده‌م، ئه‌تو خه‌ڵقی کوێی؟ به‌ختی تـــوو زۆر له زیادیه‌دایه. ئه‌مشـــۆ به‌به‌ختی توو پێنج که‌وم گرتووه. ئه‌تو شـــاه عه‌باس نی؟ گوتی:«ده‌روێش چت لێ بشـــێرمه‌وه، ئه‌من شاه عه‌باســـم. ده‌چمه قه‌ڵای دمدمی. گوتی: ده‌روێش! زۆرت چاکه ده‌گه‌ڵ ده‌که‌م، ئه‌توو ئه‌گه‌ر ئه‌من بشێریه‌وه». ده‌روێش گوتی: (چاک) شه‌وێ هاتنه سه‌ر ده‌روێشـــی؛ گوتیان «فه‌عله‌ت ســـبحه‌ینێ بێ بۆ قه‌ڵایه». شاه عه‌باس گوتی: «ده‌روێش ئه‌من بنێره له‌جیاتی خۆت». ده‌روێش گوتی: «چاکه». ســـبحه‌ێنی شاه عه‌باس ڕۆی بۆ قه‌ڵاتی، ده‌ســـتی کرد به‌کارکردنێ. خان ئه‌حمه‌د خان هاته ســـه‌ر فه‌علان؛ ته‌ماشای کرد: پیاوێکی جوانچاک له‌نێو فه‌علانه‌دایه؛ به‌ســـه‌رکاری فه‌علانـــی گوت:«ئێوارێ بیهێنه کنه خۆم؛ بۆ خۆم حه‌قی ده‌ده‌مێ». ئێوارێ شـــاه عه‌باس به‌دزی ڕۆی. ســـبحه‌ینێ هاته‌وه. دیسان خان چاوی پێ که‌وت، ناسییه‌وه؛ گوتی: «ئێوارێ ئه‌و فه‌عله‌ی بێننه کنه خۆم». دیسان ئێوارێ شـــاه عه‌باس خۆی دزیه‌وه. سبحه‌ینێ نه‌هاته‌وه کارێ. خان ئه‌حمه‌د خان هاته‌ده‌ر؛ فه‌عله‌که‌ی نه‌دی. پرسی: «چی لێ هات؟» عه‌رزیان کرد: «ئه‌مڕۆ نه‌هاتۆته‌وه». خان ترســـا. پیاوی له ده‌روازان دانا: هه‌رکه‌ســـێ بچێته‌ده‌ر له قه‌ڵایه بیگرن. شاه عه‌باس چووه ماڵه‌کی میوان بوو؛ زۆر پاڕاوه؛ گوتی «ئاشـــکرام مه‌که‌ن، ئه‌من شـــا عه‌باسم؛ زۆرم چاکه بۆتان ده‌بێ». ئه‌وێ شه‌وێ له‌وێ بوو. سبحه‌ینێ هه‌ڵستا؛ ناڵی که‌وشی ئاوه‌ژوو لێ دا، بۆ خاتر ئه‌وکو کێشـــکچی بزانن له ده‌رێ هاتۆته ژوورێ؛ که‌س له ژوورێ نه‌چۆته‌ده‌ر. به‌دزی ســـبحه‌ینێ وه‌ده‌رکه‌وت. کێشکچییان ته‌ماشایان کرد، که‌س له قه‌ڵایه نه‌چۆته‌ده‌ر؛ به‌ڵا یه‌کێک هاتۆته ژوور؛ وه‌دووی نه‌که‌وتن. شـــاه عه‌باس ڕۆیه‌وه ئیســـفه‌هانێ، له‌شکری خڕکرده‌وه ناردی بۆ ســـه‌رخانێ. شه‌ڕیان کرد.. له‌شـــکری خانی شکا چوو ده قه‌ڵایه‌وه؛ قه‌ڵابه‌ندی بوون. قاســـیدێکی نارد بۆ ئه‌سته‌مبووڵێ؛ نووســـی بۆ خونکاری «کۆمه‌کم بۆ بنێره». خونکار جوابی نووســـییه‌وه:«مانگێکی دی له‌شـــکر ده‌گاتێ». قاســـد گه‌ڕاوه؛ هاته‌وه. هه‌تا گه‌یشته‌وه قه‌ڵایه، ماندووبوو له‌وێ خه‌وی لێ که‌وت؛ له‌شکری شاه عه‌باسی هاتنه ســـه‌ری. کاغه‌زه‌که‌یان له به‌غه‌ڵی ده‌رهێنا؛ خوێندیانه‌وه. نووسرابوو: مانگێکی دی له‌شـــکرت بۆ ده‌نێرم کاغه‌زه‌که‌یان گۆڕی له‌جیاتی مانگێکی کردیانه حه‌وت ســـاڵ. قاسد سبحه‌ینێ هه‌ڵستا. ده‌رکیان لێ کرده‌وه چووه‌کن خانی، کاغه‌زی دا به خانی. نووسرابوو: حه‌وت ســـاڵی دی له‌شـــکرت بۆ ده‌نێرم. خان گوتی «تا حه‌وت ســـاڵی دی ئه‌من لێره له برسان ده‌مرم؛ مه‌سڵه‌حه‌ته وه‌ده‌رکه‌وم بۆ شه‌ڕی». ده‌رکی قه‌ڵایه‌ی کرده‌وه، به‌له‌شکره‌وه ده‌رکه‌وت. له‌شـــکری شاه عه‌باسی پێیان زانی، هاتنه پێشێ، ده‌ستیان کرد به شه‌ڕێ. له شه‌ڕێدا خان ئه‌حمه‌د خان گه‌یشت به سه‌رکرده‌ی شاه عه‌باسی کوشتی. یه‌کێکی دی له





ســـەرکردان گەیشتە خانی، شیرێکی لە دەستی دا دەستی پەڕان، ئاخری خانیان کوشت. لەشکری خانیان شکان هەموویان قەتلوعام کردن. ژن و منالیان بەیەخسیر بردن. قەلایان وێران کرد. لەشکر گەڕاوە بۆ ئیسفەهانێ.

***

## چیرۆکی دووهەم

لــە دێیەک لە دێهاتی لاجانێ دوو ئامۆزا تفەنگیان دە شــانی کــرد، چوونە ڕاوی گا کێوی. ئەوێ ڕۆژێ پێنج گا کێویان کوشــت. شەویان بەسەردا هات؛ چوونە ئەشکەوتێکی ئاوریان کردەوە؛ کەبابیان کرد. دەستیان کرد بە خواردنێ. یەکیان گوتی: «ئامۆزا! ئەمن ئەوە دەنووم؛ ئەتۆ کێشکێ بکێشە. خەوت لێ نەکەوێ، ئێرە بەترسە. خەوی لێ کەوت: ئەوی دیکە زۆری خەو دەهات؛ نووست. نیوەشەوێ وەخەبەر هات. تەماشای کرد ئامۆزای نەماوە. ئاوری خۆش کرد، تەماشــای کرد خوێن زۆر ڕژاوە. لە ئەشــکەوتەکەیدا کونێکی دییــەوە ڕووناکاییی دەدا. چوو دە کونەکەیەوە، تەماشــای کرد لــە بنەبانێ جانەوەرێک دانیشــتووە؛ ئاوری کردۆتەوە، کەبابی دەکا. کێردێکی بەدەستەوەیە، کەلاکی ئامۆزای لە تەنیشــتێتی، بە کێردەکە دەیبڕێ، لەســەر ئاوری دادەنێ؛ نیوەبریشتوو دەیخوارد. کابرا سەرســام بــوو. تفەنگی خۆی پڕکرد؛ ڕووی لە ســینگی وی کرد؛ لێی ئــاوردا. دەعباکە گوللەکەی بەدەســتی گرتەوە. بۆڵژنێکی لێ هات، گوللەکەی بۆ هاویشت، کابرا زۆر ترسا. چــوو تفەنگی ئامۆزاکەی هێنا، پڕی کرد؛ دوو گوللەی تێ هاویشــت، لە پشــتی ئاور دا جانەوەرەکە بۆڵژنێکی لێ هات کەوتە ســەر عەرزی. کابرا چووە سەری، دوازدە خەنجەری لێ دا. جانەوەرەکەی کوشت ئەوێ شەوێ لەوێ بوو؛ سبحەینێ هەڵستا چووە دێ؛ ڕدێنی ســپی ببوو، خەڵقی نەیانناســیەوە. گوتی: «بابە، حیکایەتێکی وام بەسەرهاتووە، ڕدێنم بۆیە سپی بووە؛ وەرن، بچین، مەیتەکەی بهێنینەوە». چوون هێنایانەوە.

چیرۆکی سێیەم




پیاوێکی ئاوفرۆش لە شــاری غەزنەیدا ئاوفرۆشــیی دەکرد. خولا وای بۆ بڕیبۆوە، کە هەمـــوو ڕۆژێ تمەنێکی پەیدا دەکرد. شــەوێ لە ماڵە خــۆی. هێندێکی برادەر بوون، بۆ وانـــی خەرج دەکرد. شـــەوێ لە ماڵە وی خەریکی بەزمی دەبـــوون، قەدەر پەیامایکی وای ڕابوارد، شەوێکی سوڵتان مەحموود دە شاری غەزنەیدا دەگەڕا، هاتە ئەو کووچەی، گوێی هەڵخســـت، تەماشای کرد گۆرانی و تار دەهات. بەجلکی دەروێشی چووە ژوورێ. سەلاوی کرد. ســاحب ماڵ جێی پێ نیشـــان دا؛ دانیشـــت. بەخێراتنی کرد. قەدەرێکی دانیشت، خەڵقەکە بلاوەیان کرد. سوڵتان مەحموود فکری کردەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی:«ئەو پیاوە ئـــاوزەی ماڵێی هیچ نییە؛ ئەو بەزمەی لە چی دروس کـــرد؟ ناڕۆم هەتا نەزانم، لە کوێی بووە». خۆی داگرت، نەڕۆی. خانەخۆی گوتی: «دەروێش ئەتۆ بۆ ناڕۆی؟» گوتی:«بابە، ئەمشۆ میوانم، لێرە زیاتر چ جێم نییە».

ســـاحب ماڵ گوتی: «دەروێش، قەیدی نییە ئەوشـــۆ لێرە بە». سەعاتێکی پێ چوو پرســـی: «خانەخۆی بە خولات سوێند دەدەم، ئەو خەرجەت لە کوێ پەیداکردووە؟ ئەمن دەبینم ئەتوو هیچت نییە». گوتی: «دەروێش! بنوو. لەو قســـانە گەڕێ». زۆر پاڕاوە لە ســـاحب ماڵی. گوتی : «دەروێش، ئەمن هەموو ڕۆژێ ئاوفرۆشـــی دەکەم، تمەنێکم وەگیر دەکەوێ، بۆ ڕەفیقان خەرجی دەکەم. هەموو شەوێ حاڵم وایە وەکی دەیبینی». دەروێش گوتی: «ئەگەر ســـوڵتان مەحموود حوکمی بکا کەس ئاوێ نەفرۆشێ چ دەکەی؟» گوتی:

«دەروێش خولا لە سولتان مەحموودی گەورەترە؛ بنوو». دەروێش نووست تا سبحەینێ. سبحەینێ زوو ڕۆی چۆوە سەر تەختی، حوکمی کرد: «ئەمڕۆ کەس ئاوێ نەفرۆشێ». جاریان لە شاریدا کێشا؛ کابرا گوێی لێ بوو. قسەی دەروێشی وەبیرهاتەوە؛ گوتی: «ئەو دەرویشە شەیتان بوو». چوو لە ماڵێ، گوریسێکی هەڵگرت، خەریکی حەمباڵی بوو. ئەوێ ڕۆژێ دیسان تمەنێکی پەیدا کرد، شەوێ بۆ ڕەفیقان خەرجی کرد. سولتان مەحموود دیسان هاتەوە سەلاوی کرد. ساحب ماڵ بەخێراتنی کرد، دانیشت. پاش قەدەرێکی خەڵقی ڕۆین، گوتی: «دەروێش بۆ ناڕۆی؟» گوتی: «چ جێم نییە بیچمێ؛ ئەمشۆش لێرە دەبم» دیسان دەروێش پرسی: «ئەمڕۆکە سولتان مەحموود بیستم حوکمی کردووە، کەس ئاوێ نەفرۆشێ، ئەتو خەرجی ئەمشۆت لەکوێ بوو؟» ساحب ماڵ گوتی: «دەروێش! وەک قەلێ دەقڕی، ئەمن شەوێ دیم پێ گوتی: خولا لە سولتان مەحموودی گەورەترە». دەروێش گوتی: «ئەگەر سولتان مەحموود حومکی بکا کەس نابێ حەمباڵی بکا، چ دەکەی؟» گوتی: «دەروێش! خولا لە سولتان مەحموودی گەورەترە». دەروێش نووست حەتا سبحەینێ، سبحەینێ زوو ڕۆییەوە سەر تەختی. جاڕیان ڕایەشت، کەس نابێ حەمباڵی بکا. کابرا زۆر مات بوو، هیچ کاسبیی دیکەی نەدەزانێ. مەحتەل بوو تا ئێوارە هیچی وەگیر نەکەوت. جلی بێکاریی لە ماڵێ بۆ دەبەری کرد، هاتە سەر کووچەی! ڕاوەستا. تەماشای کرد، دوو لادێیی شەڕیان دەکرد. خۆی لێ کردنە داڕۆغە، چوو دوو سێ داری لێ دان، گرتنی؛ گوتی: «دەتانبەمە کن سولتانی». پیاوەکان ترسان! گوتیان: «بابە، دوو تمەنت دەدینێ مەمانبە کن سولتانی». دوو تمەنەکەی لێ وەرگرتن، چۆوە ماڵە خەرجی کرد. شەوێ سولتان چۆوە دیتی بەزمی ئەمشۆ لە هەموو شەوان زیاترە. چۆوە ژوورێ دانیشت. تا درەنگێکی پرسی: «ڕەفیق، ئەمڕۆ بیستم سولتان حوکمی کردبوو، هیچ کەس حەمباڵی نەکا؛ خەرجی ئەمشەوت لە کوێ بوو؟» گوتی: «زۆر بەدفەڕی، ئەتۆ چت بەسەر ئەو قسانە داوە؟». گوتی: «دەروێش، حیکایەتی وابوو». دەروێش گوتی: «ئەگەر سولتان سبحەینێ بتباتە کنە خۆی شیرێکی لە قەدت بەستێ، تا ئێوارە چ دەکەی؟» گوتی: «دەروێش! سولتان چی بەسەر ئەمن داوە؟» دەروێش گوتی: «بەڵکی لە دووی ناردی». ئەو شەوی نووست؛ سبحەینێ هەڵستا، ڕۆییەوە سەرتەختی دانیشت؛ پیاوی نارد کابرایان هێنا شیرێکی لە قەدی بەست، ڕای گرت تا ئێوارێ. ئێوارێ کابرا خۆی دزیەوە، شیرەکەی بردە کن شیرگەرێکی، گوتی: «وەستا شیرێکی دارم بۆ دروس بکە، ئەو شیرەش گرۆی بیستمەنی بێ، حەتتا سبحەینێ پووڵت دەدەمەوە». پووڵەکەی لێ وەرگرت. چوو خەرجی کرد. ئەوێ شەوێ میوانییێکی چاکی دورس کرد. سولتان مەحموود ئێوارێ




ڕۆی بۆ ماڵە کابرای گوتی: «بزانم، ئەمشـــۆ چی هەیە بیدا بە میوانان». ڕۆی تەماشـــای کرد مەجلیســـی ئەوێ شەوێ لە هەموو شـــەوان خۆشترە. سوڵتان سەرسام بوو، خەرجی ئەوشۆی لە چی پەیدا کردووە؟ ڕۆیە ژوورێ. سەلاوی کرد. ساحب ماڵ گوتی: «وەدەرێی بنێن، زۆر بەدفەڕە؛ هەموو شـــەوێ ســـەدەقم لێدەدا، هەرچی ئەو دەڵێ وام بەسەردێ». دەروێش زۆر پاڕاوە. دانیشـــت هەتا شـــەو درەنگ بوو. خەڵقی ڕۆین، دەروێش بەجێ ما ساحب ماڵ گوتی: «دەروێش بڕۆ». دەروێش گوتی: «ئەگەر بڕۆم حەسەسان دەمگرن». گوتـــی قەیدی نییە، هەرچی ئەتۆ بڵێی چاترم بۆ دێ». دەروێش گوتی: «بیســـتم ئەمڕۆ ســـوڵتان ئەتۆی بردبووە کنە خۆی، تا ئێوارێ لەوێ بووی. خەرجی ئەمشـــەوەت لە کوێ پەیدا کرد؟». حیکایەتەکەی بۆ گێڕاوە؛ دەروێش گووتی: «ئەوێستا شیرەکە دارە؛ ئەگەر سوڵتان سبحەینێ بتبا گوناباریکی بێنێ، بڵێ سەری ببڕە چ دەکەی؟» گوتی: «دەروێش، بنوو، خولا لە ســـوڵتان مەحموودی گەورەترە». سبحەینێ دەروێش ڕۆیەوە سەر تەختی، گوتـــی: «بچن فولان کەس بێنن». چوون هێنایان. شـــیرەکەی بەقەدەوە بووە. گوتی:« بچن، گرتووێکی بێنن، ئەو پیاوە ســـەری ببڕێ». هێنایان. دایانە دەســـت ئاوفرۆشی کە ســـەری ببڕێ. سوڵتان چاوی لێیە؛ کابرا گوتی: «یا ڕەبی! ئەو پیاوە ئەگەر گوناباریی نییە شـــیرەکە ببێ بەدار». شیری دەرکێشا. لە ئەســـتۆی کابرای دا؛ نەیبڕی، شیرەکە ببوو بەدار. ئاوفرۆش بە سوڵتانی گوت:«قوربان! ئەو پیاوە گوناهی نییە؛ بۆیە شیرەکە بوو بە دار». سوڵتان زۆر پێ کەنی. خەلاتی کرد و کردی بە نۆکەری خۆی.

دەسکێک گوڵ دەسکێک نێرگز
مەرگی ئەو جەماتەی نەبینم هەرگیز

***

# چیرۆکی چوارەم

لە وڵاتی دارســـتانێ کچێک دەگەڵ منداڵان چووە گێلاخان. هەتا ئێوارێ لە دەشـــتی بوون. ئێوارێ کچەکە لە ئاواڵان هەڵبڕا. ورچێک تووشـــی بوو هاویشتیە سەر قەڵاندۆشی. بردیـــە کونی خۆی. چوونە نێوێ. ورچ هاتـــەدەرێ. بەردێکی زەلامی بەکونەکەیەوە نا. بۆ خۆی ڕۆییبە گەڕانێ. شـــەوێ منداڵەکان چوونەوە؛ خەبەریان دا بەدایک و بابی کچەکەی. خەڵقـــی دێ وەدەرکەوتن، زۆر گەڕان نەیاندییەوە؛ هاتنەوە. ورچەکە هەموو ڕۆژێ دەچوو میوەی دەدزی دەرخواردی وی دەدا. بەسێ چوار ڕۆژان مەڕێکی بۆ دەدزی. بۆی دەهێناوە؛ ســـەری دەبڕی، کەوڵی دەکرد، دەیشـــتەوە؛ بۆی دەکردە کەبـــاب. کچەکەش دەیخوارد. ورچەکە بەدەســـت و بەچاو دڵخۆشـــیی دەداوە. قەدەر ئەییامێکی دەگەڵی بوو لە پاشان دەســـتی دەگەڵ تێکەڵ کرد. ســـاڵێکی لەکن بوو منداڵێکی بوو؛ نیوەی لەشـــی ورچ بوو نیوەشـــی ئینسان بوو. هەموو ڕۆژێ ورچ بۆ خۆی دەچووە ڕاوێ بۆ مەڕ دزینێ، بەردێکی زەلامی بەدەرکی کونەکەیەوە دەنا، هەتا ژنەکە نەتوانێ بڕوا. ژنەکەش هەموو ڕۆژێ خەریک بوو، بەردەکەی پێ لانەدەچوو؛ تا ورچ دەهاتەوە. ئەگەر ئەو دەهاتەوە، بەردەکەی لادەبرد، دەچووە ژوورێ؛ ژنەکە لە ترســـان نەیدەوێرا بڕوا. سێ ساڵان پێکەوە بوون سێ منداڵیان بوون. ورچەکە زۆری خۆش دەویســـتن هەموو ڕۆژێ لـــە کۆڵی دەکردن. ڕۆژێکی ورچەکە چووە دەشتێ، لەبیری نەبوو دەرکی کونەکەی بگرێ. ژنەکە پاش ڕۆینی ورچی لە کونەکەی وەدەرکـــەوت، ڕۆیەوە بۆ دێی خۆی؛ بێچووە ورچەکان ڕەدووی کەوتن، هەرچی حەولی دا،




نەگەڕانەوە. هەتا گەیشتنەوە ماڵان خەڵقی نەیانناسیەوە. حیکایەتی خۆی گێڕاوە؛ گوتی: «بابە، ورچەکە لە دوام دێ، بچن بیکوژن». تفەنگچی وەدەرکەوتن تەماشـــایان کرد. ورچ بەهەڵینگدان هات، بەردی زەلامی هەڵدەگرت، بەخەڵقەکەی دادەدا. هەرسێک بێچووەکانی لەوێ دین؛ هەرسێکی بەباوەشی هەڵگرتن، لەسەر ڕا بە عەرزێی دادان. هەرسێکیان مردن، ورچەکە هەڵات، تفەنگچییان وەدووی کەوتن، ورچەکەشیان کوشت.

***

## چیرۆکی پێنجەم

دەگێڕنەوە ڕێوییێک شەوێکی چوو بۆ مریشک خواردنێ. چووە سەربانی خمخانێکی، لە ڕۆچنێڕا دە خمی کەوت. هەموو گیانی شین بوو. بەگونکەیدا وەدەرکەوت. تەماشای کرد هەموو گیانی شین بووە، چووە کن کەڵەبابی. کەڵەباب گوتی: «مام ڕێوی، بۆ کوێ دەچی؟» گوتی: «مەڵێ مام ڕێوی؛ بڵێ حاجی. تۆبەم کردووە؛ دەچمە حەجێ. ئەتۆش دەگەڵ خۆم دەبەم». کەڵەباب گوتی: «ئەمن حەجم لێ نەکەوتووە؛ نایەم». ڕێوی گوتی: «خێر؛ دەبێ بێی. خەرجت بۆخۆم دەکێشم». کەڵەباب لە ترسان نەیوێرا بڵێ نایەم، ڕەگەڵی کەوت. لە دڵی خۆیدا ددانی لە کەڵەباب تیژکردبوو؛ بەزاهیری دوعای دەخوێند، زیکری دەکرد، تا کەڵەباب بزانێ ڕێوی تۆبەی کردووە. کەڵەباب لە ترسان هەر پێ دزیلکەی بوو؛ ڕۆین هەتا گەیشتنە مێشێکی تەماشایان کرد پەپوسڵەمانکەیەک لەسەر دارێیە. ماندوو نەبوونی لە ڕێوی کرد. گوتی: «مام ڕێوی! ئۆغربێ». کەڵەباب گوتی: «مەڵێ مام ڕێوی بڵێ حاجی، ڕێوی تۆبەی کردووە، دەچێتە حەجێ. ئەمنیش دەگەڵ خۆی دەبا. ئەتۆش وەرە بچین». پەپووسڵەمانکە گوتی: «ڕاوەستن، دەچم خوڵا حافیزێی لە ماڵێ دەکەم، زوو دەگەڕێمەوە». لەسەری ڕاوەستان هەتا دێتەوە. ڕێوی لە دڵی خۆیدا خۆشی خۆشیی بوو، دەیگوت: «دوو نێچیرم وەدەست کەوتووە». پەپووسڵەمانکە زوو گەڕاوە؛ ملی ڕێیان گرت و ڕۆین هەتا گەیشتنە سەر چۆمێکی؛ تەماشایان کرد مراوێک لە ئاوێدا هاتوچووی دەکرد. ماندوو نەبووبی لێ کردن، گوتی: «بەخێرا بۆ کوێ دەچن؟»

ڕێـــوی گوتی: «تۆبـــەم کردووە دەچمە حەجێ». کەڵەباب گوتـــی: مراوی! ئەتۆش وەرە نیزیک مردنتە تۆبەیەکی بەحەق بکە، بەڵکی خولا بتبەخشێ». گوتی: «زەریفە ئەمنیش دێم». لە ئاوێ وەدەرکەوت ڕەگەڵیان کەوت. ڕۆین هەتا گەیشـــتنە دارێکی؛ قشـــقەڵەیەک لەســـەر دارێکی بوو، ماندوو نەبووَنی لێ کردن، گوتی: «بۆ کوێ دەچن؟» گوتیان: «دە خزمەت ڕێویدا دەچینە حەجێ». گوتی: «ماڵو شێوێ، ئەنگۆ شێت بوون؛ ڕێوی هەمووتان دەخوا». گوتیان «نا؛ مام ڕێوی تۆبەی کردووە؛ هەموو ڕۆژێ بەڕۆژووە؛ لە ئاوی شـــەوێ پارێـــزێ دەکا. دەچێتـــە حەجێ». زۆریان دەبەر قەڵێ هەڵخوێنـــد؛ ئاخری هاتە خوارێ. ڕەگەڵیان کەوت. ڕێوی لە ڕێییە هەر لەبەر خولای دەپاڕاوە. شـــەوێ گەیشـــتنە کێوێکی؛ شەوێ لەوێ مەنزڵیان گرت. ڕێوی کونێکی دیوە، هەمووی دەوێ کردن. بۆخۆی لە زارکی کونەکەی دانیشـــت. نیوەشـــەوێ زۆری برسی بوو؛ چونکە ئەوێ ڕۆژێ هیچی نەخواردبوو. زۆریش ماندوو ببوو، گوتی: «وێستا وادەی خواردنیانە». قشقەڵە لە ژوورێدا پێی گوتن: «ماڵوێرانینە، دیتان چلۆنو خۆ دەگیر خســـت؟ وێســـتا ڕێوی هەموومان بانگ دەکا. یەک یەکـــی دەمانخوا. هەرکەس مەردە خۆی نەجات بدا». ڕێـــوی هەوڵێ کەڵەبابی بانگ کرد گوتی:«وەرە، دوو ســـێ قســـان بکە نەزیرێکم بۆ بگێڕەوە». کەڵەباب لە ترســـان هاتە زارکی کونەکەی. ڕێوی گوتی:« کەڵەباب، ئەتوو بۆچی خەوت لە خەڵکی حەرام کردووە؛ نیوەشـــەوێ دەس دەکەی بەقیژەقیژێ؟ مەگـــەر ئەتوو چی وادەکەی؟ مەگەر خولا ئەتۆی بۆیە دروس کردووە؟» کەڵەباب گوتی: «حاجی ڕێوی، ئەمن قازانجم هەیە بۆ خەڵکی، بۆ نوێژیان وەخەبەر دێنم، بۆ کاسبیان وەخەبەر دێنم». ڕێوی گوتی: «زەریفە، ئەو عوزرەت لێ قەبووڵ دەکەم؛ ئەمما ئەتۆ زۆر بێشەرمی لەپێش چاوی بەنی ئادەمی سواری مریشکی دەبی شەرمێ لە شای ناکەی». کەڵەباب دەستی بە قسان کرد؛ ڕێوی توند بەئەستۆی دا نووسا خنکاندی و خواردی دەمولوتی خۆی ئەسترِی، بانگی مراوی کرد. مراوی لە ترسان هاتەپێشـــێ. ڕێوی گوتی: «مراوی ئەتوو بۆ لەبەحراندا هەر چشتی خۆش دەخۆی، گوێ نادەیە کەس؟» مراوی لە ترســـان لەرزی، لەسەرڕا بەعەرزیدا کەوت. ڕێوی ئەویشی گرت خواردی. زاری کونەکەی گرتەوە، نەیەڵێ ئەوانی دیکە برۆن. بانگی پەپووسڵەمانکەی کرد، گوتی: «وەرە، سەرگوزەشـــتێکم لە حیکایەتی سولەیمان پێغەمبەری بۆ بگێڕەوە، ئەتوو زۆر خزمەتی ویت کردووە». پەپووســـڵەمانکە لە ترسان هاتەدەرێ. ڕێوی گوتی: «ئەتوو ئەو تاجە چییە لەسەرخۆت ناوە؛ مەگەر ئەتوو پاشای یا وەزیری؟ درۆیان دەکەی؛ دەڵێی ئەمن زۆر خزمەتی سولەیمان پێغەمبەر کردووە». گورجێکی گرتی و خواردی.

بـــەری بەیانی بوو، ڕێوی زۆری برســـی ببۆوە، بانگی قشـــقەڵەی کرد، گوتی: «وەرە

پێشـــێ». قشقەڵە لە ترسان هاتە پێشـــێ. ڕێوی گوتی: «ئەتۆ بۆچی زەرعاتی خەڵکی دەخۆی، وە هێلکەی ئەوان دەدزی؟ مەگەر خەڵکی کاسبێ بۆ ئوو دەکا؟» قشقەڵە گوتی: «ڕاســتی گوناهم زۆرە ئەمما لە ڕێی خزمەتییەوە شــتێکت پێ دەڵێم؛ لە پاشــان کەیفی خۆتە». ڕێوی گوتی: «بڵێ بزانم». قشقەڵە گوتی: «کەڵەباب و مریشکێکم پێ شک دێ لە زەمانی حەزرەتی ئادەمییەوە ماون هەتا ئەوڕۆ. ئەگەر ئیزنم بدەی، دەچم، بۆتیان دێنم؛ لە پێشدا ئەوان بخۆ، لە پاشان ئەمنیش بخۆ». ڕێوی گوتی: «زەریفە زۆرم برسییە، زوو وەرەوە، ئەگەر بێی ئەو کارەی بکەی، ناتخۆم». قەڵ ڕۆی چووە دێیەکی. سبحەینەی زوو بوو دوو سەگ لە حەسارێکیدا گەپیان دەدا؛ خۆی بەسەیەکان نیشان دا، سەیەکان ڕەدووی کەوتن. بەقەســتی زۆر بە قندە قندە دەڕۆیی، هەتا وەدووی کەوتن هێنانی هەتا گەیشتنە ڕێوییێ، قەڵ ئیشــارەتی کرد لە ڕێوییێ، گوتی:«ئەوەتان». ڕێوی کە ســـەگەکانی دی، دەســـتی هەڵوەشاند، گوتی: «قبووڵە، مەیانهێنە پێشێ. قشقەڵە بە قسەی نەکرد، ڕێویی بە سەیەکان نیشان دا؛ سەیەکان وەدووی کەوتن، ڕێویان کوشت. تۆڵەی ئەو دەعبایانەیان لێ کردەوە. بۆیە وێستا ڕێوی ئەگەر سەگی تێ بەردەدەن، دەستی هەڵدەوەشێنێ.

* * *

# چیرۆکی شەشەم

لە زەمانی قەدیمدا پادشـــایەک بوو کوڕێکی بوو نێوی ئەحمەد بوو. پادشـــا زۆری ئەو کوڕە خۆش دەویســـت؛ ئەنگوســـتیلێکی بوو، هەرچی حوکمت لێ کردبا، جێبەجێ پێکی دەهێنا. پادشـــا هاتە وەی بمرێ. ئەحمەدی بانگ کرد؛ گوتی: «ڕۆڵە، ئەو ئەنگوستیلەی دە قامکی هەڵگرە؛ لە پادشـــایەتیی تۆ چاترە». کوڕەکە ئەنگوســـتیلەکەی هەڵگرت، دە قامکی کرد. دوو ســـێ ڕۆژ پێ چوو، پادشـــا مرد. ئەحمەد ناشتی، لە پاش سەرەخۆشیی لەسەر تەختی دانیشت. قەدەر ئەیامێکی پێ چوو، هەوەسی ژنێی کەوتەسەری. کچی مامی خۆی خواست. ڕۆژێکی ئەنگوستیلەکەی بابی وەبیرهاتەوە. لەکن ژنەکەی دەستی بەسەردا هێنا؛ تەماشـــای کرد چەند دێوێـــک پەیدابوون. گوتیان: «ئاغـــا دەفەرمووی چی بەجێ بێنین؟» گوتی: «لەنگۆم دەوێ قەڵا و باڵەخانێک، خشتێکی لە زێڕی، خشتێکی لە زێوی بـــی». گوتیان: «بەڵێ»، لە مودەی مانگێکدا تەواویان کرد، هاتن گوتیان: «ئاغا! تەواو بووە» ئەحمەد دەگەڵ ژنەکەی چوون، تەماشـــایان کرد خانووبەرێکە هیچ پادشایەک هەتا وێستا نەیبووە. لەوێدا دانیشتن. ژنەکەی گوتی: «دەبێ ئەو ئەنگوستیلەی بدەی بەمن». ئەحمەد گوتی: «ئافرەت! خەساری دەکەی، بۆ توو نابێ؛ ئەگەر دەتەوێ هەتا، سەد هەزار ئەنگوســـتیلەی جەواهێراتت بۆ دروس بکەم». ژنەکە گوتی: «حوکمەن ئەو ئەنگوستیلەی جەواهێراتـــت بۆ دروس بکەم». ژنەکـــە گوتی: «حوکمەن ئەو ئەنگوســـتیلەم دەوێ». زۆری لێ پاڕاوە، ئەنگوســـتیلەی لێ ئەستان. جوولەکەیەکی جیرانیان بوو، خاسیەتی ئەو

ئەنگوستیلەی دەزانی. زۆر خەریک بوو، ئەو ئەنگوستیلە بدزێ. هەرچی حەولی دا ڕێی نەبوو. فکری کردەوە گوتی: «مەسڵەحەت وایە ژنی پادشای بکەمە دۆستی خۆم». هەرچی ماڵ و دەوڵەتی بوو، هەمووی کردە پووڵ، لە ژنی پادشـــای ڕاپەسپارد، کە حەزم لێ بکا؛ ژنی پادشای زۆری جنێو بۆ ناردەوە. جووە زۆر خەریک بوو، هەتا ژنی پادشای کردە ڕەفیقی خۆی. قەدەر ئەیامێکی پێ چوو، جووە زۆر هاتوچۆی ماڵە پادشـــای دەکرد هەتا وای لێ هات، دەستی دەگەڵ ژنی پادشا تیکەڵ کرد. شەوێکی گوتی: «ئەمن و توو مەسڵەحەتە، پادشای ببەتڵێنین، ئەمەش لێ دەین بڕۆین». ژنەکەی گوتی: «خۆ من زۆر حەزێ دەکەم؛ بـــەڵا بۆمان ڕێک ناکـــەوێ». جوولەکە گوتی: «ئەگەر حەزێ بکەی، هاســـانمان بۆ ڕێک دەکەوێ» ژنەکە گوتی: «چ بکەین؟» جووە گوتی: «ئەو ئەنگوستیلەی پادشا داویە بە تۆ ئەگەر بمدەییێ، ئەمن پادشـــای دەبەتڵێنم». ژنەکەگوتی: «ئەوە هاسانە. لەو وەختییەوە پادشا ئەو ئەنگوستیلەی داوە بە من هیچ لێی نەپرسیوەتەوە». ئەنگوستیلەی دا بە جووی دەستی بەسەردا هێنا، دێوەکان پەیدا بوون. گوتیان: «دەفەرمووی چی؟» جووە گوتی: «لەنگۆم دەوێ وێســـتاکە ئەحمەد پادشای لەســـەر تەختی هەڵگرن، فڕێی دەنە دەشتێ؛ ئەو خانووبەرەشم بۆ لەنێو بەحری دابنێن». هەر ئەوێ شەوێ خانووبەرەکەیان هەڵگرت، بردیان لە نێوەڕاستی جزیرێکیان دانا. ئەحمەد پادشا سبحەینێ هەڵستا تەماشای کرد، نە ژن ماوە و نە ماڵ و نە خانووبەرە؛ زۆر گریا. جوولەکە و ژن لەوێ خەریکی عەیشێ بوون؛ هەرچی پێیان ویســـتبا، حوکمیان لەو دێوانە دەکرد بۆیان دێنان. ئەحمەد پادشا سەیەک و پشـــیلەیەک و مشکێکی بوو لە ماڵێدا. زۆری خۆش دەویستن. ئەو وەختەی کە ئەحمەد پادشا وای لێ قەوما، شەو ڕۆژێ لەکن ئەحمەد پادشای دەکەوتن. ڕۆژێکی سەگ بە مشک و پشیلەی گوت: «ڕەفیقینە، ئەمە زۆرمان ئەمەگی ئەو پیاوەی لەسەرە. ئەمڕۆکە وای لێ هاتووە، وا چاکە ئەمە خزمەتێکی دەبێ بۆ پیاوەی بکەین. وەرن بچین، ئەو ئەنگوستیلەی بۆ بێنینەوە». مشـــک و پشـــیلە گوتیان: «زۆر چاک دەڵێی، هەستە بڕۆین». چوونە کن ئەحمەدی، خوڵاحافیزییان لێ کرد؛ ڕۆین». پشـــیلە بە ســـەگی گوت: «ئەمە چووزانین، جووە چۆتە کوێ؟» ســـەگ گوتی: «ئەنگۆ دەنگـــێ مەکەن، ئەمن دەزانم چۆتە کوێ؟» ڕۆیین هەتا گەیشتنە سەر بەحرێ. سەگ گوتی: «جووە، هاتۆتە نێو ئەو بەحرەی؛ دەبێ بپەڕینەوە». هەرسێکیان مەلەیان چا دەزانی. لە ئاوێیان دا، چوونە جزیرەکەی. لەوێ هەر چلۆنێکی بوو، خۆیان دە قەلعەکەی هاوێشـــت. ئەحمەد پادشـــا بە دووی واندا، هاتە سەر بەحرەکەی، چاوەنۆڕی وان بوو. سەگ ڕۆژێکی بە پشیلە و مشکی گوت: «ئەمن ڕێی ژووریم نییە؛ ئەنگۆ بچن بزانن جووە ئەنگوستیلەی لەکوێ داناوە؟» مشک و پشیلە ڕۆینە ژوورێ؛

تەماشایان کرد، ئەنگوستیلەکە لە قامکی جولەکەدایە، وەختێکی دەنوێ، ئەنگوستیلەکەی لە کەپۆی دەنێ. پشـــیلە هات بۆ سەگی گێڕاوە. ســـەگ گوتی: «وا مەسڵەحەتە، مشک کلکی خۆی لە ئەســـپۆنێ وەر بدا. وەختێکی جـــووە دەنوێ، بچێ کلکی خۆی دە کەپۆی جوولەکەی بنێ، دەپشـــمێ؛ ئەنگوســـتیلەکە دەردەپەڕێ، ئەو وەختەی ئەتۆ پڕی بدەیە، بیهێنە دەرێ، لێ دەدەین، دەڕۆین». مشـــک چوو، کلکی خۆی دە ئەســـپۆنێ وەردا، چوو کلکی خۆی دە کەپۆی جوولەکە نا. پشـــمی؛ ئەنگوســـتیلەکە دەرپەڕی. پشیلە پڕی دایە و وەدەرکەوت. مشـــکیش وەدووی کەوت؛ بەخۆشـــی خۆشی ئەنگوســـتیلەکەیان بردە کن ســـەگی. سەگ گوتی: «هێناتان؟» گوتیان: «بەڵێ». ئەنگوستیلەکەیان لە پێش سەگی دانا. سەگ هەڵی گرت، هاتنە سەر بەحرێ. پشیلە گوتی: «ئەنگوستیلەکەی بدەن بەمن، هەڵی گرم هەتا دەپەڕینەوە، ئەو وەختی دەیدەمەوە بە ســـەگی». ســـەگ گوتی: «بەتۆ هەڵناگیرێ، ئەمن هەڵی دەگرم». پشـــیلە گوتی: «زۆر دەترســـم، لێت بکەوێ، ئەتو زۆر دەوەڕی هەر شتێکی ببینی پێی دەوەڕی». سەگ گوتی: «نا، ناوەڕم» لە ئاوێیان دا، تا گەیشتنە نێوەڕاستی ئاوێ. ماسییەک وەدەرکەوت، سەگ پێی وەڕی، ئەنگوستیلەکەی لێ دەئاوێ کەوت؛ ماسییەک قووتی دا، سەگ زۆر خەجاڵەت بوو، پشیلە گوتی: خوڵا غەزەبت لێ گرێ؛ نەمگوت زۆر دەوەڕی، ئەنگوســـتیلەکە دە ئاوێ دەکەوێ. ئەحمەد پادشـــا ئەو لەوبەری بەحرێ چاوەنۆڕی مەیە، ئەنگوســـتیلەی بۆ بەرینەوە. وێستا ئەوا خەجاڵەتی وی بووین» ســـەگ لە شەرمان هیچ قسەی پێ نەدەکرا. هاتن هەتا گەیشتنە ئەوبەری. چوونە کن ئەحمەد پادشـــای؛ لێی پرسین «کوا ئەنگوســـتیلەکە؟» حیکایەتەکەیان بۆ گێڕاوە. ئەحمەد زۆر عاجز بوو تۆڕەوانێک لەســـەر بەحری بوو؛ ئەحمەد چوو کنە وی بە نۆکەری. ڕۆژێ چوار ماســـی دەستان؛ یەکی بۆ خۆی دەخوارد سێیەکانی دیشی دەدا بە دەعباکان. ڕۆژێکی ماســـییەکیان دا بەوی؛ زگی دڕێ تەماشای کرد، ئەنگوستیلەکەی لە زگی ویدایە، ئەنگوســـتیلەکەی هەڵگرت و سەگ و پشیلە و مشـــکی بانگ کرد. بۆی گێڕانەوە. زۆریان خۆشـــی خۆشی وێ کەوت؛ ئەحمەد پادشا دەستی بەســـەر داهێنا، دێوەکان پەیدابوون؛ حوکمی لێ کردن گوتی: «وێستا خانووبەرەکەی خۆم دەوێتەوە». گوتیان: «زۆر چاکە». دێـــوەکان ڕۆیین، خانووبەرەکەیان هەڵگـــرت، هێنایانەوە جێی خۆی. ئەحمەد بەدێوەکانی گوت: «جووە و ژنەکەی بێنن». چوون هێنایانن لە پێش چاوی وی هەردووکیان شـــەقە کێشـــان، کەلاکەکانیان هاویشتە پێش ســـەگەکەی، خواردنی. ئەحمەد ئیدی بەخۆشحاڵی بەسەری برد. هیچ ژنی دیکەی نەهێنا، تۆبەی لە ژنێ کرد.



## دمدم

دڵم ڕاناوەستێ لەبەر ئەوێ غەمێ لەبەر ئەوێ ژانێ

بانگێکم وەبەر خوڵای، ئەوی دیکەم بەر پیغەمبەری ئاخر زەمانێ

بانگی دیم وەبەر چاکی گەرمێنێ و لە کوێستانێ

بانگی دیکەم وەبەر پیر سولەمانی لە بانێ

بانگی دیکەم وەبەر سوڵتان سەمەدی ماڵە خۆی دەکرد لە دەشتی ورمێ دەگەڵ کەونە لاجانێ

بانگی دیم وەبەر سـوڵتان بایاقووبی ماڵەخۆی دەکـرد لە کێوی فەرەنگێ بەرامبەری گردی گۆزەگیرانێ

بانگی دیم وەبەر شێخ مارفی ماڵەخۆی دەکرد لە دەشتی مەحمەشەی بەرامبەر بەگردی گۆڕخانێ

بانگی دیکەم دەبەر بەرماڵ سپی لە چۆمەلانێ

بانگی دیکەم وەبەر خدری زیندە و خدرەلیاسـان، نەمرن، سەیاحن کەس بەمەنزڵیان نازانێ

بانگـی دیکەم وەبەر ئیمام حەسـەن و حوسـێنی غەریب، مەرقەدیان لە مەشـەد و کەربەلایە عەجەم و کلاوڕەشیان دەچنە زیارەتێ

دەڵێن: ڕۆژی قیامەتێ، خولا دەماندات ئیمانێ

بانگی دیکەم وەبەر حەزرەتی عەلی ڕۆژی جومعە و جەماعەتان سوار دەبێ لە دوڵدوڵی، دەست دەداتە زولفەقاری دەچێتە خەزای گاورقڕانێ

بانگی دیم وەبەر سەوزەپۆشیێ لە حاجی خۆشی لە ترشەکانێ

بانگی دیم وەبەر ئەو شۆڕەسوار سوڵتان سەعد وەقاسی، ماڵەخۆی دەکرد لە تڕۆپکی کوێستانێ

کەوم لێ بەجووت ئەنگوتن لە قسقەپانێ

کەڵم لێ یاغی بوو لە چیمەنی هۆزانێ

لەبن گوێیانم خۆش دێ هاڕەی قاڵنیە دەگەڵ چریکەی کۆتانێ

خانم چوونە سەر بورجی دمدمی، خۆیان هەڵدەدێرن بەرامبەری بەردی شمشیر خانێ

دڵی خانی بەبرینە چەند بەبرین برینە، زەینی خۆمدا چیمەنی هۆزانێ، چەند شـــین و نازەنینە چۆمی باراندێزی دێتە خوارێ، چەند زوڵاڵ و شیرینە

دیواندڕێ، بازاڕ بەتاڵکەرێ بۆ کەس نەماوە، بۆمەش نامێنێ.

خانی برادۆستان گوتیان بەخان ئاڵدەڵی موکرییە:

بڵا بۆت بم بەبرایەکی دایک و بابییە،

دەســـتت بۆ باوێمە ســـەر باڵچۆغەی شـــیران، کێلانانت بۆ بەجێ بێڵم، لە بنەبانێی دمدمییە.

خەنجەرانت بۆ دەشکێنم جوێ لە نێرۆییە

شیرانت بۆ دەشکێنم جوێ لە دانزغییە،

دەمانچانت بۆ دەشکێنم جوێ لە میسرییە،

تفەنگانت بۆ دەشکێنم، خانی خۆم، جوێ لە وەستا شاقوڵییە،

ڕمبانت بۆ دەشکێنم، خانی خۆم، جوێ لە نەزەرییە،

مەتاڵانت بۆ دەشکێنم، خانی خۆم، جوێ لە کەرگەدەنییە،

زرێیانت بۆ دەپسێنم، خانی خۆم، جوێ لە داودییە،

ئەسپانت بۆ دەپسێنم، خانی خۆم، جوێ لە سەگڵاوییە،

پیاوانت بۆ دەپسێنم، خانی خۆم، جوێ لە سی ساڵییە.

مەگەر ئەو شـــەڕە کێ کردبی، ڕۆســـتەمی مازەندەرانێ، لەبن کێوی دەماوەندێ سپی دێوی دەهێنا زەوتی شیرییە،

مەگەر ئەو شەڕە کێ کردبی، کوڕە ئێرانیان بە خوێنی سیاوەشییە.
دڵی خانی بەبرینە، چەند بەبرین برینە!
بۆت دەچمە گۆلی دمدمی، چ دمدمێکی ڕەنگینە،
چۆمی باراندێزی دێتە خوارێ، چەندی زولاڵ و شیرینە!
لێم بوویە قەسرێکی جندییە خەمخواری دەبڕیەوە.
بلا هەر لە شای هەتا خونکاری
هەر لە خونکاری هەتا شاهییە.
شا بە ئەبداڵی گەڕایە،
هۆ لە دمدمی دی دەزگایە،
لەئیسفەهانێ لێ لێ کرد ڕایە
شا عەباس دەڵێ: حەسەن خانە!
بلا بکەین تەگبیر و ڕایانە
بەسەرمان داهات زستانە
زستان چوو و ڕابرد هاوینە
ڕابە دڵ و یەقینە
زووکە شوغڵم بۆ پێک بێنە
دمدمم لە بۆ بستێنە
ئەو سالّ حەوت ساڵە لە من یاغینە.
دەڵێ: شا! جێی ئاسێینە، ئەز نایچۆمێ
هیمدادی بۆ دێ لە ڕۆمێ
دەنشکێنێ، تێک دەدا کۆمێ
دەنکەن بە بەردی بن گۆمێ
خەڵقی بەعام دەنکەن لۆمێ
شا عەباس دەڵێ: حەسەن خانی بە غەرەزە
بەس بکە، قسەی دە ناتەڕزە
هەستە لە پێشم ڕابەزە
لە هیمدادت دەیەم ئەزە
دمدم لە زگی بەغەرەزە




حەسەن خان دەڵێ: شا! بەسم لەسەر بکە ناز و ئەرجووان
ئەگەر نەمئەستان بەوان زووان
ڕەشم بکەن هەردووک ڕووان
دامنێ لە جێ ماڵێ جووان
مەیتەر ئەسپیان دەرهێنانە
زینیان دە پشتی دەکوتایە
تەدارەک و ناڵبەندانە
چەپەر چوو بۆ سەر ئێلانە
بەسەر شار و وڵاتانە
ئەو ئیرات و ئیرەوانە
ڕەشت و کشمیر و گێلانە
بێت لە ورمێ و لە لاجانە
سندووس بێت و موکریانە
سنە بێ، سننوور بێ، کرماشانە
دەرگەزێنە، ڕژدستانە
هەوێز و شووشتەر و مەریوانە
سەد هەزار خان و سوڵتانە
پایتەختیان ئیسپەهانە
وەدەرکەوت لە ئیسفەهانێ
لە قۆشەنێ، لە توغیانێ
دار و بەرد هاتە هەژیانێ
تۆز گرتی بەری ئاسمانێ
بووە ڕۆژی ئاخر زەمانێ
دە قۆشەنان کەوت غللوە
لەشکر تیپ تیپ ئاوابووە
مەنزڵێکیان، هات قافلانتووە
لەو کافری دە بەفێڵە
سەری ڕەمبیان دەڵێی بێڵە

لەشکر لە دووی بوو بەخێڵە
مەنزڵێکیان، هات ئەردەوێڵە.
کافر داژوێن لە مەجێزە
مەلعوونە دێن ڕێز بەڕێزە
مەنزڵێکیان، دەشتی تەورێزە.
دێ لرفەلرفی بەیداغان
دێ دەنگی زرێ و قۆڵچاغان
مەنزڵ لە بناو و مەراغان
قۆشەن دێ ڕێ بەڕێیە
دەڵێ: خانی موکری لە کوێیە؟
مەنزڵێکیان، لە دەشتی خوێیە
لەشکر ئاژوای بەمەخسووسی
لە خانی موکری دەپرسی
لەشکر لە دەشتی سندووسی
چەند لەشکرێکی ئەنگامەیە
بەقۆشەن و زەمزەمەیە
هات، گرتی گەڵی دارنەیە
(ڕەحمان بەکر)یان دەگەڵ هەیە
جواب چوو لە بۆ خانییە
چاکە خۆ بکا قەوییە
عالەم بۆ ئەو بزووتییە
چاک شەڕێک لەسەر دینییە
خان دەڵێ: ئەو شا بێ، ئەمنیش خانم
خالەق بێ پشتیوانم
غوڵامی ڕەوێک شێرانم
قاتڵی کوللی شیعانم
ڕۆژێکی بەیانی بەردا
لەشکری شای هات لەسەردا

دای پۆشیبوو، دار و بەردا
هات، لەبن دمدمی وردا
دمدمم بەردی مەیدانێ
لێی دەن تۆپی ئیسفەهانێ
تۆز گرتی بەری ئاسمانێ
مەرد چاک تێدا دەگرن مانێ
بۆ ڕۆژێ ئاخر زەمانێ
دمدمم بەردی لە نزاری
لێیان دا تۆپی هەوشاری
حەوت شەو و ڕۆژان ئاور باری
دونیای داگرت بەیەکجاری
خەبەر چوو لە بۆ هەوشاری
دمدم بەردی لە بەردی
لێی دەن بەتۆپی نەبەردی
تا ڕۆژی مەردی و نامەردی
دمدمم بەردێکی زۆپە
لێیان دا تۆپخانە و تۆپە
دمدمم بەردێکی پانە
لێیان دا تۆپ و تۆپخانە
قەڵاتی پێ بکەن وێرانە
دمدم بەردی مەیدانێ
لێی دەن تۆپی لە کارخانێ
کاریتەی گەییە هۆزانێ
دمدمم بەردی دەبەیە
لێی دەن بە تۆپی کەڵەیە
کاریتەی گەییە کۆکەیە
خان بەخەزایە مەشغووڵە
دمدمم بەردێکی خڕە




چوار تەرەفی لێوەبرە
بەهەشتێ بە شیر بکرە
خان بە خەزایە مەشغووڵە
دمدم بەردێکی شینە
چوار زستانە، پێنج هاوینە
تێیدا خانی لەپ زێڕینە
زەفەریان پێ نەبردینە.
وەکیل و وەزیر دەڵێن: خان، ئەوەه کینە؟
خان فەرمووی: ئەوە کاروانینە.
خان بە خەزایە مەشغووڵە
خانێک ڕابوو لە کوردانە
کێ بوو، لە حەمەد بەگی لێتانە
ڕووی ڕەش بێ دەگەڵ جووانە
لەسەر یەک نیمچوون نالآنە
زیزبوو، چوو بۆ نێو ئەوانە
پێی نیشان دان سووڵەخانە
کێ بوو؟ لە کافری بێ ئیمانە
تێیان کرد هاش و دەرمانە
پێی قڕ دەبوون موسڵمانە
لەوان بووە ڕۆژی تەنگانە
لە کنیان ئاخرەت زەمانە
چەند گریان ئەو خاتوونانە
لێیان تێک چوو جیی و مەکانە
خولآیان بێت پشتیوانە
خاتوونێک دێتە مەیدانێ
لە دڵی خانی دەدا تانێ
لێت حەرام بێ جێی کابانێ
ئاو نییە پێی بکەین شێلانێ

خاتوونێک دێ و دەبەزێ:
ڕەببی، خانە، مارت گەزی
لێم ڕەش بوون سەر و کەزی
خاتوونێک دێ بەفەقیری
چۆکی دادەدا لە پێش میری
خان، سەڵا لە منی فەقیری
خان ئاو نییە پێی بکەین هەویری
خان حەیفە، تۆ بێ مودەبیری
خان بەخەزایە مەشغووڵە
کێ بوو؟ لە خانی لەپ زێڕینە
لە شەرافەتی خاتوونی شیرینە
بەفرێک باری بەهاوینە
لە شەرافەتی خانی لەپ زێڕینە
حەوت شەو و ڕۆژان بەوی ژینە
ڕایان وابوو بە هەزارێ:
سوارکەین خدری بریندارێ
بە چەپەر بچێ بۆ خزمەت خونکارێ.
وەزیر وای گوت بەبوێری:
چاکە قاقەزی بنێری
قەڵاتی بۆ شای بەجێ بێڵی
کێ بوو؟ لە خانی جندییە
گوتیە تایفەی خەزانییە
هەرچی هەڵێ قەیدی نییە
هەرچی بمرێ فیداییە
هەرچی بکوژرێ خەزاییە
تایفێک بوو، تایفە کافری
گوتیان بە خان: پووچ و ناماقوڵت کرد تا سەرت هەڵدەگری
دەس بە شیر دەچین بۆ لەشکری




کێ بوو؟ لە خانی جندییە
دەڵێ: بانگی حەق وەبەر ئەوییە
بێ شەریکە، هیچ شەریکی نییە
غەیرەز خوڵا هیچ کەس نییە
یا بێ شێخی گەیلانییە
شێخ جونێدی بەغداییە
سوڵتان مەعرووفی کەرخییە
یا بێ فەرخی داودییە
یا بێ ڕابیعەی عەدەوییە
یا بێ شەمسی تەورێزییە
شێخ موحەمەدی باڵەکییە
عەبدولعەزیزی شنۆییە
شێخ ڕەشی گەرگەڕۆییە
لە مەیدانێ شەڕە قەرقەشە
لە جێڕاوگان کەوتبوو لەشە
خان دەپرسێ: ئەوەە کێیە؟
خان! کوڕەی ئەسحابە ڕەشە
سوارێک هاتووە ئەسپی شێیە
خان دەپرسێ: ئەوەە کێیە؟
خان ئەو کوڕەی پیرۆتی مەرگێیە
سوارێک هاتووە بەنادری
کەس نییە چەکانی وەرگری
خان دەپرسێ: ئەوەە کێیە؟
خان، ئەوە عەزرەتی خدری
سوارێک هاتووە لەبۆ گەشتێ
بەویە سووڕەتی بەهەشتێ
خان دەپرسێ: ئەوەە کێیە؟
«ئەوەە وەیسی ماهیدەشتێ

سوارێک هاتووه له کارخانێ
به‌ویه سووره‌تی ئیمانێ
خان ده‌پرسێ: ئه‌وهه کێیه؟
خان، شێخ عه‌بدولقادری گێلانێ
سوارێک هاتووه هونه‌رمه‌نده
ئاسپابی ده‌عوایه‌ی ڕه‌نده
خان ده‌پرسێ: ئه‌وهه کێیه؟
خان، ئه‌وهه شاهی نه‌خشبه‌نده
سوارێک هاتووه ئه‌سپێ تازه
مل به قه‌تلا پڕ ئه‌نگازه
خان ده‌پرسێ: ئه‌وهه کێیه؟
خان، ئه‌وه‌ش سوڵتان سه‌عدی وه‌قازه
سه‌لاح شۆڕان ده‌ست دا چه‌کان
ده‌گه‌ڵ سه‌فی ده مه‌له‌کان
دێت گوڕه‌ی شێخی باڵه‌کان
خان به خه‌زایه مه‌شغووڵه
هات عه‌شه‌ڕه‌ی ده موبه‌شه‌ڕه
هه‌مزه و هه‌باس و هه‌یده‌ره
ده‌گه‌ڵ مه‌قلووبی په‌ڕ به‌سه‌ره
ئاڵاچی سوڵتان سه‌مه‌ره
با بێ ئاڵای نه‌بییه
حه‌وت تیپی تێک په‌ڕاندییه
خان ده‌پرسێ: ئه‌وهه کێیه؟
کۆڕژنێ حه‌زره‌تی عه‌لییه
با بێ به‌یداغی پێغه‌مبه‌ری
هه‌مزه بێ ده‌گه‌ڵ عومبه‌ری
بێ خالیدی ئیبنی وه‌لی
خان به خه‌زایه مه‌شغووڵه




خان دەڵێ: ئابداڵ بەگە[١]، ڕۆڵەی بابی
بە من دەکەی چاک چاک دەبی
دەڵێ: بابە! چ بکەم، لێڕەوارە، دوایی نابی
با بکەین مەدحی هورمز بەگی
ڕەمبی نەزەری بە چەنگی
لە هەزاری دەبڕێ مەرگی
خان ئەبداڵ و کاکە خانە
حەوت شەوان و حەوت ڕۆژانە
شەڕیان دەکرد بە شیرانە
شیران نەیاندی کێلانە
لەش کەوتبوون وەکی گردانە
خوێن ڕۆی هەر وەک جۆگانە
باڵچۆغەی شیران نەمانە
شەهیدیان کرد کاکە خانە
خان دەڵێ: خانی خەزاییمە
هەتا لە دەنێ ئەز بژیمە
بۆخۆم پەرژینی شەڕیمە
خان ئەوداڵ و کاکە خانە
گرتبوویان وەعدە و پەیمانە
دەست هەڵناگرن لەو کارانە
بانگم وەبەر میری میران
خان بۆخۆی دەکا تەگبیران
حەوت پۆلی دایە بەر شیران
بانگم وەبەر پادشای قودرەتێ
خانیان شەهید کرد بە کوتکی خێوەتێ
هاوار و ڕۆڕۆ دمدمە

---

١ ـ ئەو نێوە بەسێ جۆر: ئالداڵ، ئابداڵ، ئاوداڵ، تۆمارکراوە، بەڵام هەر یەکێکە.




ڕۆژێکی تاو هەلاتێ

عەجەم دەکاتن غەباتێ

سەبر هەڵدەکشا بۆ بن قەڵاتێ

کوانێ سواری دە نازەنین

کێ بوو لە ئاڵی ئادەمان

قەڵاتی هەڵگرت بە زەمان؟

کێ بوو لە ئاڵی ئادەمانە

قەڵاتی هەڵگرت بە زەمانە؟

حەوت شەو و (ئوند)[1] حەوت ڕۆژانە

شەڕی دەکرد بە تۆپانە

قەڵاتی لە دوو نەدانە

کوانێ سواری دە نازەنین؟

کێ بوو لە ئاڵی بەجەرگە؟

لەوانی کردەوە دەرکە

لە خەنجەری دەمنی زەرگە

لە هەزاری دەبڕی مەرگە

هاوار و ڕۆڕۆ دمدمە

کێ بوو لە خاتوون پەروەرێ

گوتی: کاک ئاڵێ ئەتۆ ماوی ئەتۆش هەڵێ

کێ بوو لەبەر کاک ئاڵییە

گوتی: خاتوونێ، پووچ و ناماقوڵت کردییە

بەشی خۆم خەزا کردییە

شەهیدیان کرد کاک ئاڵییە

هاوار و ڕۆڕۆ دمدمە

کێ بوو؟ لە خاتوونی خانی

قبووڵ ناکەن کافرستانی

---

١ ـ ڕەنگە ئەم (ئوند)ە هەڵە بێت و لە ڕاستیدا خۆی واوی عەتف بێت.




خۆمان هەڵدەێریان لە چل کەوانی
ئەی دمدمی بەردی دە لان
جێگەی خان و خان و ئاودەلان
ئێستا بووی بە مەسکەنی خەرتەلان
کوانێ سواری دە نازەنینی
لە سوڵتان ئەمینی
ئەگەر قامەتێ دێنی
ماڵە خوڵای دەبینی
لە سوڵتانی موحتەبەر
دەڵێ بەئیزنی خوڵای لەسەر
پشتیوانم پێغەمبەر
دەچم بۆ سەر شای قەجەر
ڕاوەستان لەسەر وەعدان
ئەسپی خۆیان ناڵ لێ دان
خورروش کەوتە کۆلانان
بە داو دەکەن پێکۆڵێ
وەدەرکەوت لە ئەستەمبووڵێ
کەنگێ وەکەم وێ تۆڵێ
جووجێک[1] هەبوو زەمانێ
ئەو بە سوڕان دەزانێ
دوازدە وەزیری دەرگای
بوون بە وەکیلی خانی
لە سوڵتانیان دەستوور دا
شیریان لە قایشان هەڵ دا
لە سەری دوازدانیان دا
چ غەیان بوو لێیان دا

---

١ - پێم وایە (جوییێک)ە.

سوڵتان دەکاتن نازێ
بدەن لە تەپڵی بازێ
بدەن لە تەپڵی بازێ
هات و گەییە سیوازێ
سوڵتان دەکا تەڵەبێ
لە قۆشەن و دەبدەبێ
هات و گەییە حەڵەبێ
سێ بەش دەکەن چۆپییە
سوار دەکەن ڕمبازییە
هات و گەییە ئەمەدییە
لە هەیبەتی ڕۆمییان
لە کەوڵ و یەنگیچەریان
گەییە توولە و تاوییان
ڕۆژێکی بەیان بەردانێ
سوڵتان گەییە لاجانێ
ڕۆژێکی نوێژی نێوڕۆیە
سوار دەکەن هۆبەهۆیە
گەییە دەشتی شنۆیە
قۆشەن دێ ڕێ بەڕێیە
سەد لەکە بە زرێیە
گەییە دەشتی ورمێیە
لە سوڵتانی ئەنوەرە
هەم سەید و سەروەرە
ناردی موهر و دەفتەرە
لەبۆ پادشای قەجەرە
ئەگەر هەڵێ ماکەرە
شا گوتبووی لە دیوانە
ڕەببی خۆش بێ سوڵتانە

دەگەڵم نەکا بەتۆپانە
شەڕێ دەکەین بە شیرانە
یان شا دەبێ، یا سوڵتانە
سوڵتان دەڵێ: قەسەم بە زاتی نەبی
هیچ ماڵی ئاورم پێ نەبی
هەرچی شا دەڵێ: بلا وەبی
یا خولا هەر خۆش بێ سوڵتان
حەوت شەوان، حەوت ڕۆژان
شەڕیان دەکرد؛ بە شیران
لەش کەوتن وەک گردان
خوێن ڕۆیی هەروەک جۆگان
نە شا شکا، نە سوڵتان
وەزیر گرتیان دیوانە
یا خولا خۆش بێ سوڵتانە
عەجەم بەفێڵ و زۆرزانە
پی ناوەستین بە شیرانە
وەزیری ئەستەمبۆڵێ کیایە
حەوسەد تۆپیان هێنایە
دە لبادان پێچرایە
بەرەو قۆشەنی شایە
ئەگەر ئاوریان دایە
سەد هەزاری کوژرایە
یا خولا خۆش بی سوڵتان
لە ئیسفەهانێ گرت دیوان
عامی کردن موسڵمان
مزگەوتی لە بۆ دانان
بانگی حەقی لەنێو دان
ئەوجار گەڕاوە سوڵتان




گوێ لە من بێ، گەلی جوانمێران

هەرچەندی بەردی لەبەر ئەستێران

هەرچەندی گیای سەر دەردێنێ لە حەوشان، لە زەنوێران

سەد هەزار سەڵەوات لە پێغەمبەری دەگەڵ گوێدێران

***



## مەم و زین



براهیم پادشـــای یەمەن، هیچ کوڕی نەبوو. دەگەڵ وەزیری خۆی هەڵســـتان، ڕۆین بۆ ماڵە خولا؛ دوازدە مەنزڵان ڕۆین. خولا ڕەحمی بەوان کرد؛ وەیســـەلقەرەنی ماهی دەشتێی ناردیە کن ئەوان، دوو ســـێوی پێدا نارد. نووســـتبوون؛ لە پشت سەری وانی دانا. ئەوانە بگەڕێنەوە؛ نێنە (نەیەنە) بێتولڵلا. ئەوانە بۆ کوڕی هاتوون؛ بچنەوە ماڵە خۆیان. شـــەوی جومعەی دەسنوێژی هەڵگرن. ئەو سێوەی لەتی بکەن؛ لەتێکی بۆخۆی بخوا، لەتێکی ژنی. جیماع دەگەڵ ژنی خۆیان بکەن. ژنی وان زگیان پڕ دەبێ ئینشاڵڵا: یەکی کوڕێکیان دەبێ. کوڕی براهیم پادشای دەبێ نێوەی کاکە مەم بێ، کوڕی وەزیری نێوی بەنگینە بێ. دەبەر خوێندنیـــان نێن بخوێنن. نێویان لێ نـــان، ئاغا و نوکەر، کاکەمەم و بەنگینە. بە دایانیان دان؛ دوو ساڵ لە کن دایانێ بوون. لە پاشان بە لەلەیان دان؛ سێ ساڵ لە کن لەلەی بوون. لە پاشـــان سواریان کردن؛ دوو ساڵان سواربوون. ئەوجار هێنایانن بردیاننە مەدرەسەی لە خزمەت مامۆستا دانیشتن. حەو ساڵان دە ژێرخانێدا بوون. ڕۆژ و شەویان لێ قەدەغەکردن؛ شـــەو و ڕۆژیان نەدەزانی چییە. ڕۆژێکی سەروپێیان لێ ئابوو. نەهاریان بۆ وان هێنا. مەم و بەنگینە نانیان خوارد ئێســـکی ســـەروپێیان گەپیان پـــێ دەدا؛ ئاویتیان وە پەنجەرەی کەوت. شووشەی شکان؛ چووە دەرێ. تیشکی ڕۆژێ هاتە ژووڕێ؛ ئەستەغفیروڵڵا! گوتیان: «ئەوە خولایە». مامۆســـتای وان لـــەوێ نەبوو هەر ئامێزیان کە تیشـــکەی وەدەرهێنا؛ بۆیان نەدەگیرا. مامۆســـتا هاتەوە، کاکە مەم و بەنگینە گوتیان: «مامۆستا خولا هاتۆتە

نێو ئەمە». مامۆستا گوتی: «ڕۆڵە، ئەوە خولا نییە؛ ئەوە شەمس و قەمبەرن. خولا ساحیبی ئەوانەیە. ئەوە یەکیان شەوە، یەکیان ڕۆژە. ئەگەر ڕۆژ دەبێ، ڕووناک دەبێ؛ ئەگەر مانگ هەڵدێ، تاریک دەبێ؛ ئەو دەبێتە شەو». دەڵێ: «مامۆستا! ئەگەر دنیا وا خۆشە بۆ لەمەت قەدەغە کردووە؟» دەڵێ: «ڕۆڵەینە! خەتای من نییە. حوکمی براهیم پادشایە. براهیم پادشای ساحیبی یەمەنێیە؛ گەورەی هەر چوار پادشایانە». کاکەمەم گوتی: «دەچمە دەرێ؛ مامۆستا! مامۆستا گوتی: «ڕۆڵە، میرمەم! سەبرێکی بگرە؛ زەحمەتی من بەخۆڕایی مەدە. لەمێژە زەحمەتی دەگەڵ ئەتوو دەکێشم؛ بەڵا بچم عەرزی براهیم پادشای بکەم، بزانم چ دەفەرمووێ؟» دەڵێ: «مامۆستا هەڵستە بچۆ خەبەرم بۆ بێنەوە». مامۆستا هەڵستا؛ چووە خزمەتی براهیم پادشای. سەلامی کرد لە براهیم پادشای: براهیم پادشا، عەرزم هەیە. ئەوڕۆ دایکی کاکەمەمی سەروپێی بۆ کاکەمەمی ناردبوو. ئێسکی گۆشتی بە شووشەبەندیدا دابوو، شووشەی شکاندبوو. چووبووە دەرێ؛ تیشکی ڕۆژێ هاتبووە نێو ئەوان. دنیای ڕوونیان چاو پێ کەوت؛ گلەییان دەکرد لە من، دەیانگوت: «ئەو دنیا خۆشەت بۆ چ لەمە قەدەغە کردووە؟ ئەگەر شەو و ڕۆژ هەیە ئەمە بۆ دەو ژێرخانەیداین. حوکمە دێینە دەرێ. مۆڵەتم لێ خواستوون هاتوومە خزمەت توو. ئەتۆش کوڕی خۆتە؛ کەیفی خۆتە، بەڵا زەحمەتی من بەهیچێ نەچێ». پادشا هەلێ گرت، قاقەزێکی بۆ میرمەمی نووسی: «ڕۆڵە فرزەند سەبرێکم لێ بگرە هەتاوەکو کۆشک و تالارت بۆ دروس دەکەم». هەڵی گرت، قاقەزی بردەوە مامۆستا. کاکەمەم بەپیر قاقەزی بابیەوە هات. وەری گرت؛ ماچی کرد؛ لەسەر سەری خۆی دانا. زۆری کەیف خۆش بوو، گوتی: «مامۆستا، بە وادەی چەندی ئەمن لێرە ڕادەگری؟». گوتی: «ڕۆڵە بابت قاقەزی نووسیوە، ئەمن نازانم؛ بۆخۆت بیخوێنەوە، بزانە چیی نووسیوە». قاقەزەکەی بابی خوێندەوە پێی قایل نەبوو. گوتی: «مامۆستا! هەڵستە بچۆوە خزمەت پادشای؛ پێی بڵێ ڕاناوەستم هەتا خانووبەرە تەواو دەبێ، بەڵام بۆ خاتری وی حەوت ڕۆژی دی سەبرێ دەکەم». هەڵستا مامۆستا چوە خزمەت پادشای عەرزی کرد: «میرمەم عەرز و سەلامی لە توو دەکرد بۆ خاتری وی ئەوە حەوتووێکی دیکە ڕاوەستام. بە سەری موبارەکی وی چی دی گیرنابم دێرەدا؛ مەرخەس بفەرمووی دێم دەبمە مەیتەر». هەڵی گرت. قاقەزێکی بۆی نووسی: «ها فرزەن! ئەلحەمدولیلا ئەتوو هاتیە وجوود. ئەمن دنیای ڕوونم بۆ توو دەوێ؛ ئەمما سەبرێکم لێ بگرە هەتا حەوت مانگی دی؛ هەتاوەکو کۆشک و تەلارت بۆ دروس دەکەم». هەڵی گرت مامۆستای ناردەوە. قاقەزەکەی وەرگرت لە مامۆستای. ماچی کرد، لەسەر سەری خۆی دانا. هەڵی گرت قاقەزەکەی وەرگرت نارد بۆ دایکی: «دایە!

حەوت سـاڵە لە ژێرخانێدام. وێسـتاش دنیای ڕوونم لێ قەدەغـە کراوە». دایکی گوتی: «ڕۆڵە! دەبێ بە قسەی بکەی. حەوت مانگی قەرار بۆ داناوی؛ سێ مانگان بۆ خاتری من، چوار مانگان بۆ خاتری بابت دانیشـە». کاکە مەم دانیشـت هەتا حەوت مانگان. براهیم پادشـا ناردی میعماری هێنا. وەسـتای هێنا؛ فەعلەی گرت؛ خانووبەرەی بۆ دروس کرد. خشـتێکی ئاوەزێڕ، خشـتێکی زێو؛ بە حەوت مانگان خەلاسی کرد. جا ناردیە کن کوڕی خۆی: «ڕۆڵە! تەدارەکم بۆ گرتووی. ڕۆڵە! ڕۆژی جومعەی دەبێ وارید ببی بە کۆشـک و باڵەخانەی خۆت». ڕۆژی جومعەی وەدەرکەوت. چوە خانووبەرەکەی. هەڵی گرت، ناردیە کن بابی: «بابە نێوی کۆشـکی من چییە؟» پادشـا فەرمووی: «بورجی بەڵەک». تێدا ڕۆنیشت کاکەمەم، هەتا ساڵە وەختێکی هیچ خەبەر نەبوو.

خالەق! هەر ئەتووی لە سەر هەمووانە
دێنە ڕووی زەمینێ سێ پەریی دە تەڕلانە
لەسەر کۆشکی کاکەمەمی، کوڕی براهیم پادشای یەمەنێ دەیاندا سەیرانە
خالەق؛ هەر ئەتووی بەتەنێ
سێ پەری دێنە ڕووی وەتەنێ
سەیرانان دەدەن لەسەر کۆشکی کاکەمەمی، کوڕی براهیم پادشای یەمەنێ
خالەق! هەر ئەتۆی لەسەرە
سێ پەری لە ئاسمانی حەوتەمین بەستوویانە لەنگەرە
لەسەر کۆشکی کاکەمەمی هەڵدەنیشتن ئەوبەر ئەوبەرە
خوشکی گەورە دەڵێ بە خوشکی چکۆڵە
خوڵاکەی، خوشکێ، ڕوومەتی کاکەمەمی زەریفە یان چرا و فەنەرە؟
خوشکی گەورە لە خوشکان پرسییە
خوشکی نێونجی وای گوتییە
هەر لە عەرشی تا کورسییە
هەر لە گای هەتا ماسییە
هەموو دنیام پشکنییە
هیچ کەسم نەدیوە، لە گوێن جوانیی کاکەمەمییە
خوشکی گەورە دووبارە گوتی بە خوشکانە
خوشکێ ئەزت ببم بە قوربانە

ئەمن جارێکی دەگەڵ پەریان چوومە ڕاوی چل شەو و چل ڕۆژانە

لە پەریان هەڵدەبڕام لە منی کردەوە کرێوە و بۆرانە

ڕێم سەرەودەر نەدەکرد، کەوتمە شاری جزیریێ بۆتانە

لەسەر کۆشکی یایەزینیێ دەبووم میوانە

دەبووم بە کوترێکی شین، دە کونی پەنجەراندا هەڵدەنیشتم لەسەر دەلاقانە

ئەگەر چاوی خۆم بە یایەزینیێ هەڵدەینانە

ئەو خاتوونەم دیو ئافتای کاکەمەمی جوانە

خوشکی چکۆڵە گوتی بە خوشکانە

خوشکی! ئەزو ببم بە قوربانە

بەڵا ئەمە کاکەمەمی هەڵگرین بیبەینە جزیر و بۆتانە

بزانین کاکەمەم زەریفترە یا یایەزین زێدە جوانە

خوشکی نێونجی گوتی بە خوشکانە

خوشکیێ! بەقانوون و قاعیدانە

کەس نەیدیوە مێرد بچیێ لە دووی ژنانە

هەر ژن هاتوونەوە لە بۆ مێردانە

ئەمە ئەوە کاکەمەممان هەڵگرت و بردمانەوە جزیر و بۆتانە،

تەقا خوڵا ڕازیی لیێ نەبوو، ئەمە کاکەمەممان نەگەیاندەوە ئێرەکانە

کاکەمەم دەبێتەوە بیێ حورمەت و قەدر نەزانە

دەڵێن: ئەوە شوانە یا گاوانە

کاکەمەم چونکە لە سێوی بەهەشتیێ ئیجادبووە، دەبیێ براهیم پادشا لە شانی ڕاستە و چەپەی خۆی بیانبینیێ هەوەڵی سبحەینانە.

چونکە لە سـێوی بەهەشتی ئیجاد بووە، هەرکەسێک لە سەلامی نوێژیێ بیانبینیێ مەم و بەنگینانە

ئەگەر کافریش بیێ ئینشاڵڵا ساحب ئیمانە

ئەگەر کاکەمەممان نەگەیاندەوە یەمەنی گەورە و گرانە

ئەگەر بابی دەگەڵ سەلامیێ نوێژی نەبینیێ هەموو سبحەینانە

لەکن دایکی سۆراخ نەکا، لە بورجی بەڵەکیێ نەکا بەیانە




لایەکی یەمەنێ نوغرۆ دەکا، تەرەفی دیکەی لە دوو دەکا وێرانە
هەڵدەدڕێ زگی حەوسەد وەزیر و وەکیلی کەوڵ بەشانە
دەکوژێتەوە چەن نۆکەر و قەننەداری بەردەستانە
خولا هەڵناگری ببینە باعیسی قەتلی ئەو موسڵمانانە
دەبلا، ئەمە بچین یایەزینێ بێنینە ئێرەکانە
بزانین جا کاکەمەم زەریفتر یا یایەزین زێدە جوانە
خوشکی نێونجی زۆر موحتەبەرە
دەڵێ: خوشکی بەبالان بفڕە، لە من بگرەوە باڵەخانە و پەنجەرەی سەر بە خێزەرە
بزانە ڕوومەتی کاک مەمی زەریفە یان چرا و فەنەرە
ئەوە کێ بوو؟ لە پەری دەتەڕلانە
شەقژنیان لە باڵی خۆیان دەداوە، دەیانگرتەوە حەوتەبەقەی ئاسمانانە
لە هیچ کوێیان وەچان نەدەدا، هەتا دەچوونە شاری جزیرێ، لەسەر کۆشکی یایەزینێ دەبوونەوە میوانە
دەبوون بە کۆتری شـــین بە کونی پەنجەراندا دەچوونە ژوورێ هەڵدەنیشـــتن لەســـەر دەلاقانە
خوشکی گەورە دەڵێ
جەمینێ، سەفینێ، ئەمن و ببم بەقوربانە
ئینجا بزانن کاکەمەم زەریفە یا یایەزین زێدەجوانە
خوشکی نێوەنجی دەڵێ:
خولا هەڵناگرێ پێم بدۆڕێنیەوە ئیمانێ
ڕوحی کاکە مەمی لەوێ ڕاهاتووە ئەوا ڕاوەستاوە دەکا سەیرانێ
ئەگەر بڵێین: یایەزین زەریفە، ڕوحی کاکەمەمی زیز دەبێ، دەچێ، شکایەتمان لێ دەکا لە کن ساحیبی عەرز و ئاسمانێ
ئەگـــەر بڵێین: کاکە مەم زەریفە ڕوحی یایەزیـــن زیز دەبێ. لێمان دەبێتە عەرزچی لە خزمەت پێغەمبەری ئاخرزەمانێ
خوشکی چکۆلە گوتی بە خوشکانە:
ئەمنو ببم بەقوربانە

ئەمە با پایەزینێ هەڵگرین بیبەینە یەمەنی گەورە و گرانە
بزانین کاکەمەم زەریفە یان پایەزین زێدەجوانە
خوشکی چکۆڵە ڕێی خەوێی لە پایەزینێ گرت
خوشکی نێونجی هەڵی ئەستان، بەرگی سەفایەی دەبەر کرد
ڕوومەتی ویی نەخشین کرد
بسکی ویی جوان کرد
وەسبەی برۆی ویی کێشا، زۆر تەمیز و مەحبووب کرد
توندیان دە لێفە و سەرینانەوە پێچا، ڕووحی ڕەوانیان گرت
هەڵیان گرت، لە پەنجەرانیان هێنادەرێ، لەسەر باڵی خۆیان دانا
لە خـــولای دەپاڕانەوە، هەرەکەتیان لە خۆیان دا، چوونە حەوت تەبەقەی ئاســمانە، لـــە هیچ کوێیان، وچان نەدەدا هەتا دەهاتنە شـــاری یەمەنێ، لەبورجی بەڵەک دەبوونەوە میوانە

دە کونی پەنجەراندا دەچوونە ژوورێ پایەزینیان وێڕای میرمەمی درێژ دەکرد شانبەشانە
بۆ زۆیان، دەفڕێ، دەچوونە سەر دەلاقانە
خوشکی گەورە گوتی بە خوشکانە:
خوشکێ، وەزو ببم بە قوربانە
بزانن پایەزین زەریفە یا میر مەم زێدەجوانە
خوشکێ نێوەنجی دەڵێ:
لە خۆم بابان وێرانێ
ئەنگۆ تەماعتانە بە من بدۆڕێنن ئیمانێ
دەبێ لە خەوێیان هەڵبستێنن، بزانین کیهەیان جوانە، کیهەیان قسان چاک دەزانێ
کێ بوو لە خوشکی نەوجوانە
دەبەر پایەزینێی کردەوە ڕووحی ڕەوانە
خوشکی گەورە گوتی: بۆچ کاکەمەمت هەڵنەستاند؟
گوتی: ئەوە ئافرەت و غەریبە؛ لەپێشدا هەڵی بستێنن، نەک لەدوایە خەجاڵەت ببێ وەخەبەر هات، تەماشـــای کرد، زەلامێکی لە تەنیشـــتێ درێژبووە. ئەگەر چاوی خۆی هەڵێنا. گوتی: «خولایە! خۆ من ژوانم دەگەڵ کەس نەکردووە، قاســیدی کەسم نەهاتۆتە




کنــێ؛ ئەوە دەبــێ پوولّی دابێ بەکوێخادەرکان، هاتبێتــە ژوورێ» . کاکەمەم جلی خۆی داکەندبوو. ئاگای لە هیچ نەبوو. خەوی لێ کەوتبوو لەسەر تەختی پشتێ. یایەزین گوتی: خولّایە! ئەوە ئەبلەیە، یا شێتە؟ قەت پیاو وا دێتە ژوانێ؟» .

یایەزین بانگ دێڵێ:

لاوە، وەرە، لاوە!

ئەبلەی، شێتی، ئاقڵ ناتەواوە؟

ئەگەر دەهاتیە سەر جێی من بۆچی لە منت نەگێڕاوە؟

کاکە مەم دەڵێ:

خاتوونێ، چاوبەنگییە!

بەهەقی ئەو خولّایەی بێ شەریکە هیچ شەریکی لەبۆ نییە

ئەمن نەهاتوومە سەر جێی توو بەدزییە

ئێرە ماڵە خۆمە، چ ئاگام لە توو نییە

ئەگەر یایەزین ئەو قسەی لە میرمەمی دەبیست تەواوە

لە پێشەوە مستێکی لە دەمی کاکەمەمی داوە

خوێن لە دەمی کاکەمەمی دەڕۆی وەک جۆگە و بەحر و ئاوە

کاکە مەم بانگ دێڵێ:

بەنگینە، هەرێ بەنگینە

تۆکەرەکەی دانا و گۆچان زێڕینە

سەر لە کەوڵ و سێقەڵاتان دەرینە

لە بۆم بێنە ئافتاوە و مەسینە

بەنگینە سەری لە کەوڵ و فەرەجی دەرهێناوە

ئافتاوە و لەگەنی لە بۆ ئاغای خۆی هێناوە

بەهەر دووک چەپۆکان بەسەری خۆیدا داوە

دەڵێ: ئەی ماڵی وێرانم! داخولّا، ئاغای من چی لێ قەوماوە

کاکەمەم دەڵێ:

ئافتاوە و مەسینان بگێڕەوە بچووە بە دواوە

چ نەبووە، چم لێ نەقەوماوە

چەنجوڕکێکم لە کەپۆی خۆم داوە
دڵۆپێک خوێن لەوی تکاوە
یایەزین دەڵێ:
لاوە، ئەو دیارییە لە توو قەبووڵ نینە
ئەوە، داخولا، چ قەرەکولایەکە دەگەڵە خۆت دەهێنا؟
کاکە مەم دەڵێ:
خاتوونێ نەوجوانە
بەهەقی ئەو خولای لایەزانە
ئەگەر قبووڵ بکەی ئەوەم چاوەش و پێشخزمەتی، بەردەستانە
خاتوونێ! چاوی تۆم گەلێک زەریفترن لە چاوی سەقران
ددانی توو گەلیک زەریفتر لە دانان دە گەوهەران
ئەگەر ئەتوو لە من قەبووڵ ناکەی پێشخزمەتان دەگەڵ گەورە نۆکەران
بۆخۆت بانگ یەڵە قەرەواشان، کەنیزەکان، کارەکەران
یایەزین بانگ دێلێ:
قەرەواش، ناو مەلکڕیحانە
لەبۆ من بێنە ڕووبەندێ، چرایە، دەگەڵ فەنەرانە
ئەو شـــەو زێدە لە شـــەوان تەعجوبێکی گەلێک تەعجووبـــی، دەخۆمدا دی، زینی مل بەکوێنی بابان وێرانە
یایەزین بانگ دێلێ:
قەرەواش، ئەو قەرەواشەی نێو ئەسمەرە
لەبۆ من بێنە، فەنەرێ ڕووبەندی یەکسەرە
ئەوشـــەو تەعجوبێکی زۆر تەعجوبم دەخۆم دی، زینی مل بەکوێن، قەلەندەرە یایەزین بانگ دێلێ:
قەرەواش، قەرەواشی نێو گوڵەندامە
لە بۆ من بێنە فەنەرێ، فانۆسێ، ڕووبەندێکی تەمامە
ئەو شەو زێدە لە شەوان تەعجوبێکی گەلێک تەعجوبی لە منی مل بەکوێن ڕوودامە
کێ بوو؟ لە یایەزینێ بەڵەک چاوە

هەرچەندی گازی دەکرد ئەو قەرەواش و کەنیزی دە نەولاوە

هیچ کەس نەبوو، کەس جوابی نەداوە

یایەزین دەڵێ:

لاوە! لاومەتی جندییە

بەشقی ئەو خولای لە ژووری سەرییە؛

ئەگەر ئەتوو پێم نەڵێی بابەت کێیە، بۆخۆت نێوت چییە

کاکە مەم دەڵێ:

خاتوونێ کێل گەردنێ!

ئەمن بۆخۆم میرمەمم، تاقە کوڕەی براهیم پادشای یەمەنێ

ڕۆژی دەعوایە لە دووی بابم ســوار دەبێ دوازدە پادشــا، هەموو ساحبی تیپ و سوپا و قۆشەنێ

کاکەمەم دەڵێ:

خاتوونێ چاوبەنگییە!

بەشقی ئەو خولایەی لە ژووری سەرییە

ئەگەر ئەتوو پێم نەڵێی بابت کێیە، بۆخۆت نێوت چییە

یایەزین دەڵێ:

میرمەم، گیان گیان!

ئەمن یایەزینێک بووم بەزولفانە

خوشکی میرزێندینم، کچی میرئاودەڵانە

لەکنم خولاوەندی ئەمنی بۆ توو بە دیاری ناردووە بە نیشانە

یایەزین دەڵێ:

کاکە مەمی چاوبەنگییە!

بەشقی ئەو خولایەی لە ژووری سەرییە،

ئەگەر پێم نەڵێی نێو و نیشانەی کۆشک و پەنجەرەی توو لە شاری یەمەنێدا نیشانەی چییە،

کاکەمەم دەڵێ:

«خاتوونێ، کۆشکی من بڵندە سەر لە حەو تەبەقەی ئاسمانێ

خشتێکی زێڕە یەکێکی زێوە، وەستا دایناوە لە کارخانێ
دەنگی مەلایەکەتان دەیگاتێ لە حەوت تەبەقەی هاسمانێ
کۆشکی من کۆشکێکی گەلێک گەورە و گرانە
دیوانی براهیم پادشای یەمەنێ گەلێک بەحوکمە، ساحب دیوانە
لە دیوانی براهیم پادشای ڕۆنیشتوون سەد وەکیل و وەزیری کەوڵ بەشانە
شـــام و نەهاران چل مەجوعمە[1] بە زەرفەوە دێتە دیوانی براهیم پادشای لە پێشخانان
نۆکەر و میرئاخوڕ و مەیتەران بەدزی دەڵێن: کوێرنانە.
ئەوا کاتیب ڕۆنیشتووە حوکمان دەنووسێ، حاکم دەڕۆن بۆ سەر شارانە
لە لایەکی خەڵاتان دەبەخشێ لە لایە دیکەی زێڕوەشانە
لە لایە دیکەی تەنافی ڕاکێشاوە، جەڵەبی لەوێ ڕادەوەستانە
لە تەرەفی دیکەی سەرباز دەڕوا، لە تەرەفی دیکەی سواران دەداوە لە سانە
لە لایەکی تەویلەیە، لای دیکە یەختەخانە
لەلای دیکە هەڵاوەسراون چەک و سیلاحی دەمەردانە
میرمەم دەڵێ:
یایەزین، عەمرەکەم! چی دیکەی لێ نازانم، پێی ناکەم بوختانە
میرمەم دەڵێ: خاتوونێ چاو بەنگییە!
بەشقی ئەو خولایەی لە ژوور سەرییە
ئەگەر ئەتوو پێم نەڵێی نێو و نیشـــانەی کۆشـــک و پەنجەرەی توو دە شاری جزیرێدا چییە
یایەزین دەڵێ:
میرمەم، کۆشکی من بڵندە سەر لە شاخی
ئاوی ســـپی لە حەوزی کەوســـەرێ دێ هەڵدەڕژێتە ســـەر بـــەردی مەڕمەڕ پەخش و پەرێشان دەبێ لەنێو چوارباغی
شەهێن و شالوور و شمقاڕ لەوێدا بوون یاغی
یایەزین دەڵێ:
میرمەم، کۆشکی من بڵندە سەر لە حەوت تەبەقەی ئاسمانێ

---

١ـ مەجمەعە.




وەستای بۆ هاتوون لە هیندێ، میعماری لە بوخارایە، گێچی بۆ هاتووە لە تاریکستانێ
کۆشکی من خشتێکی زێڕە، یەکی گەوهەری کارخانێ
هەرچەندی بەردی وەقیمەتە، غەواسان دەریان هێناوە لە دەریای نیل و عومانێ
هەرچەنــدی پارچەی هیندییانە، ئەوە لەوێــم داناوە پیاوی تاجر، ئەگەر کلووری نەبێ بەقیمەتی نازانێ
میرمەم، عەزیزم! بلا بەڵەدی پێکەوە بکەین، ببژێرین شوکرانێ
کێ بوو لە جووتە ئاشقانە نەوجوانە
هەڵدەگرن، فەنەرێ، فانوسێ، دەگەڵ چرانە
هەرچەندی کۆشکان پەنجەران دەگەڕانە
کۆشکی کاکەمەم بوو؛ خاتوونێ نەیبوو چ نیشانە
خاتوون سەری لە کاری خولای تاجوب ما لە قسەی خۆی بوو پەشیمانە
کاکەمەم دەڵێ:
یایەزین، عومرەکەم! بۆچت بەمن دەکرد ئەو گەورە بوختانە؟
یەیەزین دەڵێ:
لە من مەگرە مانێ دەگەڵ ئەوێ گەورەمانێ
ئەمن هەورێک بووم لە هەورەکانی دە ئاسمانێ
ئەمن لە بۆ توو هاتوومە خوار دەگەڵ دڵۆپەی دە بارانێ
هەتا پێکەوە بکەین سەفایە دەگەڵ سەیرانێ
یایەزین دەڵێ:
توخولا! میرمەم لێم مەگرە مانێ لێم هەڵمەکە پشتێ
ئەمن هەورێک بووم لە هەورەکانی دە بەهەشتێ
خولاوەندی عالەمیان ئەمنی لە بۆ توو هاویشتە پێدەشتێ
کێ بوو لەو جووتە ئەشقەی دەتەڕلانە،
دەسرە و ئەنگوستیلەیان پێک دەگۆڕیەوە بەنیشانە
دەستیان دەستۆی یەک دەکرد، دەهاتنەوە، لەسەر فەرشان، جانمازان، قالیچانە
جا پێکەوە ڕۆنیشتن، دەیانبژاردەوە شوکرانە
یایەزین دەڵێ:

خوڵاکەی میرمەم، ئەگەر سبحەینێ هەڵدەستی ئەو خەونەت وەبیر بێ

ئەگەر هەڵنەستی نەبی بە ئێلچی لە دووری من، نەیەیە شاری وێرانە جزیرێ

یا ڕەببی، پێناودارم بی، ئەگەر ئەوێ ڕۆژی خوڵا دەکا دیوانێ، ئەگەر دیوان دەگیرێ

کاکەمەم دەڵێ:

یایەزین، گیان گیانە!

ئەگەر سبحەینێ هەڵســتم، خوڵا نەخواستە ئەتوو نەمێنی لێرەکانە، ئەگەر هەڵنەگرم کەشکۆڵێکی دەروێشان، دار عەسایەکی نەوجوانە

ئەگەر بە سواڵکەری وەدووت نەکەوم، پەیدا بکەم نان نانە

یاڕەبی بەکافری بمرم، لەسەر کۆچک و دەسماڵی دە ژنانە

یایەزین، عومرەکەم، هەرچەند ماینەی خوڵا دروســتی کردووە، جوولەکەیە، فەڕەنگە، داسنییە، ئورووسە، دیانە

حەڵاڵی دنیایە لێم حەرام بێ لە توو زیاتر هەموو وەکو دایک و خوشکانە

یایەزین دەڵێ:

لە خۆم مل بەکوێن و بێ سەڵایە

هەرچەندی نێرینەی خوڵاوەندی عالەمێ دروستی کردوون لە دنیایە

هەرچەندی جووە، هەرمەنییە، لە توو زیاتر حەڵاڵی دنیایەم لێ حەرام بێ هەمووم لەکن وەک باب و برای خۆم وایە

کێ بوو لەو ئاشقی دە تەڕلانە

دەستیان دەستۆی یەک دەکرد دمیان بەدمی یەکدی دەنانە

پەرییەکان گوتیان: ئەگەر نەیبەینەوە ڕووڕەشـــی خوڵای دەبیـــن، ئەگەر دەیبەینەوە خوڵاگیری ئەوی دەبین. خوشـــکی گەورە گوتی: پیاو بە خوڵای خەڵاســـی دەبێ بەڵا بە عەبدان خەڵاسی نابێ

کێ بوو خوشکی، چکۆڵە گەلێک نازداری

تەمەنای دەکرد لە خوڵای لە پێغەمبەری موختاری:

یاڕەبی خەو بۆو ئاشقانە لە بارەگای خوڵای بباری

ئەوانە کەوتن بێ هۆش بوون بەیەکجاری

ئەو کێ بوو؟ لەو پەریی دە تەڕلانە




تەگبیریان کرد بە هەر سێ خوشکانە:
ئەمە بلا ڕووڕەش نەبین لە بارەگای بینای چاوانە
بلام یایەزینێ پێچینەوە بە پەنجەی دەستانە
لێرەی هەڵگرین بەجێومەکانە
بیبەینەوە شاری جزیرێ، سبحەینێ خەجالەت نەبێ ئەو بەستەزمانە
جا لە کاکەمەمی چ بکەین، دەمێنێ بێ جێومەکانە؟
دەڵێ: عیلاجی دەکا بینای چاوانە
کێ بوو لەو پەریی دە گوڵباوە
یایەزینیان توندتوند بە دەستان دەپێچاوە
لەسەر باڵی خۆیان دادەناوە
هەتا هەڵیان گرت، بردیان لە حەوت تەبەقەی ئاسمانێ ڕاوەستاوە؛ وچانیان نەدا هەتا بردیان لە شار جزیرێ لە جێومەکانی خۆیان داناوە
ئەگەر سبحەینێ کاکەمەم لە خەوێ هەڵستاوە
بانگ دێڵێ: ئەو بەنگینەی بەڵەک چاوە
ئەو یایەزینەی لەکن ئەمن بوو بۆ چ دیار نییە لەکن ئەمن نەماوە
بەنگینە دەڵێ:
میرمەم، بە حەقی ئەو خولای لە ژووری سەرییە
ئەمن هیچ کەس نازانم و هیچ کەسم نەدییە
کاکەمەم بانگ دێڵێ:
بەنگینە خەمناکم، گەلێک دەرفکرم
ئافتاوە و لەگەن بێنە دەسنوێژێکی ممبارەک هەڵگرم
ئەوە کێ بوو لە بەنگینی گوڵباوە
ئافتاوە و لەگەنی بۆ ئاغای خۆی هێناوە
ئەگەر دەسنوێژی هەڵدەگرت دەسترەی دەستانی لەبەری خۆی دەرێناوە
ئەگەر تەماشای قامکی خۆی دەکرد مۆر و ئەنگوستیلەی یایەزینێ لەکنی بەجێ ماوە
دەسبەجێ بێ حاڵ دەبوو زمانی شکاوە
چاوی هەڵنەهات هۆشی تۆمەتێی نەماوە

بەنگین دەرمانی بێهۆشیی هێناوە
کاکەمەم جێبەجێ چاوی هەڵات، زمانی کراوە
کاکەمەم بانگ دێڵێ:
بەنگینە جێم بۆ ڕاخە کارم کڕاوە
کاکەمەم بانگ دێڵێ:
بەنگینە دەروونم گەلێک لە جۆشە
خەبەرێکی بەبابم بدە بڵێ کاکەمەم دەردی گرانە گەلێک نەخۆشە
کێ بوو لە بەنگینەی گوڵباوە
بانگ لەسەر بانگی لێ داوە
چووە دیوانێ براهیم پادشای ڕاوەستاوە
براهیم پادشا دەڵێ:
بەنگێنێ چاو بەنگینە
ئەدی ئاغای توو لە کوێیە دیار نییە؟
دەڵێ: قوربانت بم دڵم بەخەمە نابێ خامۆشە
کاکەمەم دەردی گرانە گەلێک نەخۆشە
کە براهیم پادشا وا دەزانێ
هەڵدەستێ شەقزن دەکەوێتە دیوانێ
کێ بوو؟ لە براهیم پادشای گوڵباوە
فرمێسکی چاوانی دەتکوت ڕووبار و ئاوە
کێ بوو لە براهیم پادشای موحتەبەرە
لە پلیکان و پەنجەران دەکەوتە سەرە
کێ بوو لە براهیم پادشای گوڵباوە
دەرکی کردەوە، پەردەی هەڵداوە
کێ بوو؟ لە براهیم پادشای جندییە
سەری کاکەمەمی دەگرت، داینا لەسەر ڕانییە
دەڵێ: ڕۆڵە، بەقوربانت بم کوێت دێشێ ئازارت چییە؟
ڕۆڵە، چاکە بابت ئازارت بزانی




تا بنێرم لە دووی ئارستۆی، لوقمانی
دەشقەم کەسێک بێ شەفای دەردی تووم بۆ بزانی
هەرچەند بابی دەیگوت و دەپاڕاوە
کاکەمەم نە قسەی دەکرد نە جوابی دەداوە
براهیم پادشا دەڵێ:
ڕۆڵە! ئازارت لە کوێیە لە خۆم ماڵ وێرانێ
ڕۆڵە! ڕۆحت دەسەر دەگێڕم دەگەڵ سەرتاپای ئیمانێ
ڕۆڵە! دڵم سووتاوە؛ میرمەم ئاورم بەربووە لە بەدەنێ
ڕۆڵە! چاوی خۆمت دەسەر دەگێڕم دەگەڵ شارەکەی یەمەنێ
ڕۆڵە! وەکازی دەستم، ڕووناکاییی هەردووک چاوانم
ڕۆڵە! هێزی جەرگم، ویردی زبانم
ڕۆڵە! ئەتوو چت بەسەر بێ، ئەمن خۆم بەساحبی یەمەنێ نازانم
ڕۆڵە! فرزەندی خۆم، دیدەی شیرینم
ڕۆڵە! توو چاوان هەڵێنە، تا من جارێکی بتبینم
میرمەم دەڵێ:
بابە منداڵ بووم، بووم بە فەقێ
لە فەقێیەتی ڕابردم بووم بە مەلا
لە مەلایەتی ڕابردم بووم بە قازی
بابە گیان ئەلعان و بیلفەرس دەبێ ژنم بۆ بخوازی
براهیم پادشا دەڵێ:
ڕۆڵە! لە ڕۆحی بابت کەوێ دەگەڵ ئەوێ غەمێ، دەگەڵ ئەوێ فکرێ
ڕۆڵە! لەبۆت داوێمە سەر بەحرێ کەڵەکێ دەگەڵ جیسرێ
ڕۆڵە! تەشریفی موبارەکت بێ، دەچم لەبۆت دەخوازم کچی پادشای میسرێ
ڕۆڵە! لەمنت کەوێ دەگەڵ ئەوان خەمان ئەوان گلەییاَن
ڕۆڵە! لەبۆت دێنمە سەر بەحران کەڵەکان دەگەڵ گەمیان
ڕۆڵە! تەشریفی موبارەکت بێ دەچم لەبۆت دەخوازم کچی پادشای هیندییان
ڕۆڵە! لەمنت کەوێ دەگەڵ ئەوێ خەمێ دەگەڵ ئەوێ غەباتێ

ڕۆڵە! تەشریفی موبارەکت بێ، دەچم لەبۆت دێنم کچی پادشای لە ڕۆژهەڵاتێ

دەڵێ: بابە گیان نە میسرم دەوێ نە شامە

بە کابەتوڵڵایە کەم ماڵە خوڵایە بەیتوڵڵامە

دڵی من وای لە یایەزینێ گرتووە مەقامە

لەپاش یایەزینێ حەڵاڵی دنیایە لە من حەرامە

بابە ئەگەر ڕاستە بۆم دێنی چ ژنانە

یایەزینم دەوێ وای بە زوڵفانە

خوشکی میرزێندینە و کچی میرئاودەڵانە

ئەگەر دەپرسی مەملەکەتی وان شاری جزیرێ بۆتانە

براهیم پادشا گوتی: جزیر دە موڵکی خوڵایدا نییە

وەکیل و وەزیران گوتیان: «قوربان نییە». گوتی: «بەڵا، بۆ من عەیبە؛ ئەمن پادشا بم، کچی نۆکەری خۆم بۆ کوڕی خۆم بێنم». گوتیان: «کۆنە وەزیرێک هەیە، بچن ئەوی بێنـــن، بزانن، جزیر هەیە یان نییە». وەزیریان هێنا؛ دە قەفەزێدا بوو. هێنایان لە دیوانی براهیم پادشـــای دایان نا. براهیم پادشـــا گوتی: «وەزیر شاری جزیرێ دە موڵکی خوڵایدا ئەمـــن دەڵێم نییە؛ هەیە یـــان نییە؟» وەزیر گوتی: «قوربان! شـــاری جزیرێ ئەوا لێرە لە ڕۆژاوایە؛ حەوت ســـاڵان پادشـــای بابی توو لەجیاتی مواجبـــی دایمێ موخاریجی منی دەرنەهێنا». براهیم پادشـــا کە وای زانی ڕقی هەڵســـتا؛ زیز بوو ڕۆی. کاکەمەم لە جێی خۆی هەڵستا؛ ڕونیشت. وەزیر هەموو ڕێوشوێنی جزیرێی بەوی گوت؛ هەزار لیرەی ئەنعام دا بە وەزیری. براهیم پادشـــا ناردی جەللابی لەسەر ڕێی وەزیری دانا: «ئەگەر لە وەتاغی کاکەمەمی هاتە خوار، سەری ببڕن لەبۆ منی بێنن». ئەگەر هێنایانە خوارێ تەماشای کرد جەللاب ڕاوەســـتابوون دە کووچەیدا. وەزیر ئەوانی ناســـی؛ گوتی: «بانگی ئەو جەللابانە بکەن». ئەنعامی دانێ؛ گوتی: «مەرەخەســـتم دەکەن بچمە دیوانێ یا ســـەرم دەبڕن؟» گوتیـــان: «بەڵێ قوربان! مەرەخەســـتی بۆ دیوانێ». هەڵیان گـــرت و بردیان بۆ دیوانی براهیم پادشـــای. عەرزی پادشـــای کرد: «پادشا، هەڵبەت مردن بۆ من چاکە بە جیهەتی چی فەرمووتە ســـەری ببڕن؟» گوتی: «ئەمن ئەو تاقە کوڕەم هەیە؛ ئەمن دەڵێم: جزیر نییە ئەتوو بۆ دەڵێی هەیە؟»

گوتی: «قوربان ئەمن نەمزانی، ئەوە خەونی پێوە دیوە. دە سەر کاکەمەمی بکە بچێتە ڕاوێ. یەمـــەن چـــل دەروازەی هەیە. چل محەلەیە. هەر محەلەی چل کچ و ژنی جوانی لێ




هەڵبژێرە؛ بێنە داوەتی بۆ بگرە. ئەوی لە ڕاوێ دێتەوە لۆتی و ڕەقاسـی بۆ دانێ، شـێر و مەیموونی لەسـەر ڕێ دانێ. چاوەش و سـازندەی لەسـەر ڕێ دانێ. ئەگەر بەخێر لە ڕاوێ هاتەوە، ئەوێ شـەوێ لە خەوێی دیوە لەو ژنانە و لەو کچانە یەکیان وەوی دەچێ. کاکەمـەم کەیفی دەیگرێ. ئەگەر کچ بوو، بێ منەتە. بابی ئەو کچەی حەزی دەکا، کوڕی براهیـم پادشـای کاکەمەم ئەوی بخوازێ. ئەگەر ژن بوو، مێـردی بانگ بکە بیکە وەزیر؛ زێڕی زۆر بدەیە؛ ژنەکەی پێ تەڵاق بدە، جا بەخێر لە کاکەمەمی مارە بکە؛ ئینشاڵڵا ئاوە دادەمـەزرێ». گوتی: «ئافەریم وەزیر! ئەنعامی بدەن بـە وەزیری». ئەنعامێکی زۆر بە وەزیری گەیی. کاکەمەم هەتا نیوەڕۆیە ڕاو و شـکاری کرد. براهیم پادشا هێنای، داوەتی بۆ وی دروس کرد، تەدارەکی بۆ گرت. جا هەرچی کچی بوو دەڵێ: «ئینشاڵڵا کچی منی دەوێ». هەرچی ژنی بوو دەگریا؛ دەیگوت: «پادشـا ژنەکەم لێ دەستینێ؛ جا من قوڕی کوێ وەسـەری خۆم کەم. ژنەکەم دەچێ». بەنگینە گوتی: «کاکە مەم ئەوە چ غوڵۆێکە لە دەورەی شاری یەمەنێ». کاکەمەم گوتی: «شاری یەمەنێ هەزار فێڵی هەیە». بەنگینە گوتـی: «میرمەم بڵا بچینـەوە بۆ ماڵێ» ڕاویان بەتاڵ کرد، ڕوویـان دە ماڵێ کردەوە. ئەگەر هاتن گەینە قەراخی شـاری تەماشایان کرد؛ داوەت بوو. لۆتی و ڕەقاس بوو، شێر و ورچ بـوو. بەنگینە گوتی: «میرمرم! بزانە بابی تـوو ئەتۆی چەند خۆش دەوێ؛ بزانە چەندی سـوحبەت بۆ توو دروس کردووە». جحێڵی ناردنە سەر ڕێی کاکەمەمی. لە پاش وەی کەیخودای پێشوازیی ویی نارد. لەپاش ئەوەی سەید و مەلای لەسەر ڕێی وی ڕاگرت. گەییە جحێلان مەرحەبای لێ کردن. گەییە کەیخودایان، سـڵاوی لێ کردن. گەییە سەید و مەلایان لە نیویان دابەزی، ئەنعامی بۆ سـەید و مەلایان قەرار کرد. لەوێ سـوار بۆوە. لۆتی و ڕەقاس بەپیریەوە هاتن؛ خەڵاتی کردن. گەییە داوەتێ سـەری لەسەر قەڵپووزی زینی دانا، تەماشـای کەسـی نەکرد، چۆوە دەرکی دیوانی خـۆی؛ لەوێ دابەزی. داوەت بەتاڵ بوو. هەرچی کچی بوو دەیگوت: «یاڕەبی زۆر شـوکرا! ژنەکەم نەچوو». خەبەر بە براهیم پادشا درا: «قوربان! کاکەمەم هاتەوە، هیچکەسی نەویست». براهیم پادشا گوتی: «بچن، وەزیری بێنن، هەر دەیخنکێنم». لە پاشـان پیاوی نارد گوتی: «سـەری ببڕن؛ چاوم پێی نەکەوێ». گوتیان: «قوربان! سـەری مەبڕە؛ بـڵا بێتە ئێرە بزانین تەگبیری چییـە». ناردیان وەزیریان هەڵگـرت؛ هێنایان. وەزیر گەییە دیوانی پادشـای یەمەنێ؛ گوتی: «قوربان، سـەری من بۆ بڕینێ چاکە». گوتی: «ئەتوو بۆ شـایەدی جزیرێتدا؛ ئەمـن تاقە کوڕێکم هەیە». گوتی: «قوربان، کارێکی گران نییە؛ لەشـکرێکی بۆ دروس بکـە، دوازدە مەنزڵ بڕوا هەر مەنزڵێ هەزار کەس لێی بگەڕێتەوە؛ جا بەتەنێ دەمێنێ؛ بۆ




کــوێ دەچی؟ ئەویش دێتەوە ئێرە؛ هەر کچە پادشــایەکی کەیفت بێنی، جا بۆی بێنە».
کاکەمەم دەسەر بابی کرد گوتی: «مەرخەس بفەرمووی دەڕۆم». براهیم پادشا فەرمووی:
حەوتوێکی سەبرم لێ بگرێ، تەدارەکی بۆ دەگرم».

بڵا بچینە ســەر بەحســی یایەزینێ. پەرییەکان یایەزینیان هەڵگرت، بردیانەوە شاری
جزیرێ. ســبحەینێ یایەزین لە خەو هەڵستا، جنێوی دا بە مەلەکرپحانێ؛ گوتی: «ئەمنت
بۆ هەڵنەســتان، نوێژم چوو». مەلەکرپحان گوتی: «ئەمن چ بکەم چوویە شــەوگەردییە،
درەنگ هەڵستاوی». گوتی: «دەنا ئاوێ بێنە چاوم بشۆم».

چاوی شووشــت دەستڕێی دەرهێنا چاوی خۆی پێ بســڕێ: دەستڕێی کاکەمەم بوو.
ئەگەر تەماشای کرد مۆری کاکەمەمی لە قامکی دابوو. گوتی: «چارشێوم بۆ بێنن، دەچمە
ماڵە قەرەتاژدینی، کن خاتوون ئەســتیی خوشکم». هەڵســتا چووە ماڵە قەرەتاژدینی.
خاتوون ئەســتی بەپیریەوە هات. قۆڵی گرت؛ وەسەری خست، پێکەوە ڕۆنیشتن. خاتوون
ئەســتی خوشــکی گەورەی وی بوو؛ ژنی قەرەتاژدینییە. گوتی: «خوشکێ بۆ وا زەرد و
زەعیف بووی؟» گوتی: «خوشــکێ هانێ ئەوانە!» دەســتڕێ و ئەنگوســتیلەی لە پێش
خاتوون ئەســتی دانا. خاتوون ئەستی تەماشــای کرد مۆری کاکەمەمی بوو، تاقە کوڕی
براهیم پادشــای یەمەنێ. گوتی: «خوشکێ ئەتوو ئەوانەت لە کوێ بوو؟» گوتی وەڵڵاهـ
نەمزانیوە ئەوشەو ئەمنیان بردە یەمەنێ:

چم نەزانی ئەمنی مل بەکوێن و بابان وێرانێ
لە وێیان ئەمن سوێن دا بە سێ جزووی قورعانێ
جا لەوەی بەدەرەوە؛ خاتوون ئەستی گەورەیە بۆخۆی دەزانێ
خاتوون ئەستی دەڵێ:
وای، ملم بەکوێنە بابانم وێرانێ
ئەو میرمەمی لە یەمەنێ دەبەر تۆی ناوە سی جزووی قورعانێ
ئاخر دەست هەڵناگرێ، دێتە ئێرە، نادۆڕێنێ ئیمانێ
خاتوون ئەستی دەڵێ:
یایەزین، گیانە!
ئەو میرمەمی دەگەڵ ئەتۆی خواردووە قورعانە
چاری براوە؛ دەست هەڵناگرێ تەشریفی موبارەکی دێتە ئێرەکانە
جا یایەزین دەڵێ:

چ بکەم ئەمن سەر بەتاڵ و بابان وێرانێ

جا ئەمن ڕووڕەشی خۆمە، چلۆن بکەم گوزەرانێ؟

خاتوون ئەستی گوتی: «دەبێ سەکۆیەکت لەسەر شەتی جزیرێ بۆ دروس بکەم. بنێرم دوو سەد تۆپ جاوت بۆ بکڕم. چل قەرەواشت هەیە؛ دەگەڵ ئەو قەرەواشانە هێندێک گازری بکەن. هێندێکیان ئارەخچنان بدروون، خەمی توو لە دمی ئاوێ بڵاو دەبێ. ئینشاڵڵا تەعالا جا ئەمن دەنێرمە کن کاکم، دوو جووتانم بداتێ، پیاوانم بداتێ. بۆخۆم جووتی ڕادەبەستم، موخاریجم زۆرە. بە دەستندە بەڕێ ناچم». ئەوانە دەنێرمە سەر ڕێ؛ ئەگەر کاکەمەم و بەنگینە هاتن، جووتێر مزگێنی بێنێ». مەلەک ڕێحانیان دەرکردبوو؛ بانگیان کردەوە. بازیبەندی لە قۆڵی خۆی کردەوە، لە پێش یایەزینی دانا؛ گوتی: «ئەمن چی دی قەرەواشی ناکەم». یایەزین گوتی: «لەبەر چی؟» گوتی: «یایەزین ئەتوو دەچییە شەوگەردییە، ئەمن نابەی». خاتوون زین گوتی: «ئەمن چوومە کوێ؟» گوتی: «ئەمشەو، هەموو شەوێ چوویە شەوگەردییە ئەمنت نەبرد دەگەڵ خۆت؟» گوتی: «جا بۆ زیز دەبی؟ ئەگەر هاتن قەرارمان بێ. ئاغا بۆ من نۆکەر بۆ توو». ئەو قەرارەیان پێکەوە کرد؛ هەڵستان چوونەوە ماڵە خۆیان. جا ناردیان جاویان کڕی. تەدارەکیان گرت. چوونە سەر شەتی جزیرێ.

ئەوجار دوو قسان لە کاکەمەمی بکەین، بەنادری

ئەوە فەرمانی ڕەحمان بەکری

هەم کرمانج و دێبۆکری

بۆ خاتری دوکتۆر مانی نەمری

نە باس هەبوو نە خەبەرە

تەدارەکی کاکەمەمی گیرا فوقەرە بەفوقەرە

لە شارەکەی یەمەنێ وەدەرکەوت دوازدە هەزار سواری بە دەفتەرە

کاکەمەم دەڵێ:

بەنگینە!

ئەو لەشکرەی بابی من بۆ منی دروس کردووە، بچۆ بینینە

کێ بوو؟ لە بەنگینە گوڵباوە

چوو ئەسپی خۆی لە یەختەخانێی دەرهێناوە

کە سوار دەبوو نێوی خوڵای هێناوە

لەو سەرێی بە لەشکریدا چوو لەو سەری گەڕاوە
بانگ لەسەر بانگی لێ داوە
هەتا دەهاتە دەرکی یەختەخانێی دەبوو پیاوە
کێ بوو لە بەنگینەی موحتەبەرە
لێی خڕدەبوونەوە میرئاخوڕ و مەیتەرە
دەڵێ: سەفەرێکی دوور و درێژمان لەبەرە
کێ بوو لە بەنگینەی گوڵباوە
لە پلەکان وەسەر کەوت دەرکی پەردەی هەڵداوە
هەتاوەکو دەهات، لە ئاغای میرمەمی دەکرد سەلام و سەڵاوە.
دەیگوت: بەنگینە، ئەو لەشکرەی بابی مە بۆ مەی دروس کردووە داخوڵا چلۆنە، تەواوە؟
بەنگینە دەڵێ:
ئاغای من لە زۆرییان چی تاریفیان نینە
ئەی ئاغای! دەغیلت بم من لە سوارچاکییان هیچ قسوور، نییە
ئەو لەشکرەی بابی توو بۆ مەی دروس کردووە لە کنم هیچ بەرەودوای بۆ من و توو نینە
کاکەمەم گوتی: برۆ، شێتی ماڵوێران دەنا بابی من گەپی بەمن دەدا؟
ئەو کێ دەبوو لە کاکەمەمی موحتەبەرە
حوکمی دەکرد، دەیگوت: ئەسپی بۆرەم بۆ بێنەدەرە
ئەوە کێ بوو؟ لە مەیتەر و میرئاخوڕی دە گوڵباوە
ئەسپی بۆرەیان زین دەکرد بە دوو سەریان ڕاکێشاوە
دەگەڵ بەنگینەی بانگ لەسەر بانگیان لێ داوە
ئەسپی بۆرە هاتە دەرێ، لە دەرکی دیوانێ ڕاوەستاوە
هەرچەند عالەمی یەمەنێیە، سەریان لە کۆشک و پەنجەران دەرهێناوە
میرمەم بێغیرەتی کرد لە دایک و بابی خۆی نەگێڕاوە.
کێ دەبوو لە میرمەمی موحتەبەرە
لە پلەکان دەهاتە خوار قۆڵیان دەگرت ئەوبەر ئەوبەرە




پیی دەرکێفی ئەسپی بۆرە دەنا، لە زینی مورەسەعی خۆی دەکەوتە سەرە

ماشـــەڵڵا! هێندێک دەیانگوت: «ئەوە شەمســـە» هێندێک دەیانگوت: ئەوە قەمبەرە

ڕەبی، ئەزەرپیس لێی نەکەنەوە نەزەرە

بەقەد دوو هەزار کەسی ڕادەوەستان ئەوبەر ئەوبەرە

نۆکەر و وەکیل دەڵێن:

بڕۆن دامەمێنن،

خەبەرێکی وەبراهیم پادشای ڕابگەیەنن

کێ بوو لە وەکیل و وەزیری دە بێوەفایە:

خەبەرێکی بدەن بە دایکی میرمەمی دەگەڵ دایکی بەنگینەی، بلا حەســـرەتێ نەکێشن

لە دووی کوڕی خۆیان، دەشقەمی بێن گەردنی خۆیان بکەن ئازایە

کێ بوو لە وەزیری دە تەواوە

خەبەرێکیان بە دایکی بەنگینەی داوە

دایکی بەنگینەی ئەگەر وا دەزانێ

دەڵێ: سەرم دانا سەر کووپەڵە خمخانێ

ســـەلای گەورەم لێ ڕابوو شاری یەمەنێ چۆڵ دەبێ، گۆڕ و گۆڕخانە دەچێتەوە جزیرە

وێرانێ

دایکی بەنگینەی دەهات بەشین و گریان و تەواوە

بانگ لەسەر بانگی لێ داوە

خەبەرێکی لە بۆ دایکی میرمەمی هێناوە

دەڵێ: دایە میرمەمی ئەتوو نازانی چ قەوماوە؟

دەڵێن بورجی بەڵەک بەبێ ئاغایێ لە شاری یەمەنێ بەجێ ماوە

دایکی میرمەمی ئەگەر وای دەزانی

فرمێسک دەهاتە خوارێ لە هەرتک چاوانی

دایکی میرمەمی ئەگەر وا دەزانێ

خۆی هەڵدەدێری لە تالارێ هەتا دەگەیە باڵەخانێ

بە سەری ڕووتی بەپێی پێخاوسی دەهاتە کۆلانێ

بە کووچەیدا دێ دەس دەکا بە گریانێ

هەتا دەگاتە بورجی بەڵەکم دەڵێ: وەکیل زیرینە ئەدی تاقە کوڕەکەی من کوانێ؟

وەکیل و وەزیر دەڵێن:

لە خۆمان یەخسیرێ

ئەتوو تازەکە دەبێ کوڕی خۆت وەبیرێ

بورجی بەڵەک چۆڵ و ئەحدەل قەندەهار بوو[1] بە سەفەر ڕۆی بۆ شاری جزیرێ

دایکی مەمی ئەگەر وا دەزانێ

دەڵێ: ئەهلی یەمەنێ، وەرن وەسەرم بکەن قوڕ و خۆڵی ئی کۆلانێ!

جا بانگ دێڵی:

ڕۆڵە! میرمەم، گیانی گیانە!

ئازابی خۆمت لێ حەلاڵ بێ دەگەڵ شیری هۆردک مەمکانە

مەچۆ شاری جزیرێ، شارێکی بەدقەدەمە، ویستراعەتی گەلێک گرانە

دایکی بەنگینە دەڵێ:

ڕۆڵە، لە خۆم فەقیرێ

ئەتوو ئەمەگی دایکی فەقیرت وەبیرێ

سەلام لێ ڕابوو لە بۆ مەم و بەنگینان، گۆڕ و گۆڕخانە دەکەوێتەوە شاری جزیرێ

دایکی میرمەمی دەڵێ:

لە خۆم مل بەکوێن و بابان وێرانێ

ڕۆڵە میرمەم! نۆ مانگان، نۆ ڕۆژان، نۆ سەعاتان، نۆ دەقیقان، بە بەر و پشت هەڵم دەگرتی بەغەیرەز برک و ژانێ

لە خەزینەی ڕزگاربووی، کەوتیە چەنگ مامانێ

لە مانانێ خەلاس بووی کەوتیە چەنگ دایانێ

ڕۆڵە میرمەم! لە دایانێ خەلاس بووی، کەوتیە چەنگ لەلەی، دەیانبردیە دیوانێ

ڕۆڵە دەبەر کوتاییان نای؛ حەوت ساڵان دنیای ڕوونت نەدی لە ژێرخانێ.

ئەهلی یەمەنێ وەرن کوێنێکم دەبەرکەن لەبۆ جوانێکی وەک میر مەمی؛ شاری یەمەنێ لێم چۆڵ دەبێ، ئاوەدانی دەکەوێتە جزیری وێرانێ

دایکی بەنگینەی دەڵێ:

---

١ ـ ئەحدەل قەندەهار، واحیدەلقەهارە، چوونکە بەهەردووکیان تۆمارکراوە.




ڕۆڵە! بۆچ وا کوڕێکی بێ فکری
ڕۆڵە! سەفەر لەبەرە بەنادری.
ڕۆڵە! لە شیری دایکی خۆت گەردنت ئازابێ دەس لە ئاغایە خۆت هەڵنەگری
دایکی میرمەمی دەڵێ:
های یەمەنی، هاوارە، ئامانە!
ڕۆڵە، میرمەم! لەسەر دایکت ڕاوەستە، دەگەڵم بکە دوو قسانە
ئەمن لە شاری یەمەنێ بۆت هەڵدەگرم خەزنە و دەبۆتخانە
ڕۆڵە بۆت دەبم بە ئێلچی بۆخۆم، دەچمە شاری جزیرێ بۆتانە
یایەزینت بۆ دێنم. شاری جزیرێش بە خاک و بادەوە دەکرم؛
بابی دایکێ، بە جێومەکانەوە بۆت دێنمە ئێرەکانە
کاکە مەم دەڵێ:
لە خۆم فەقیرێ
ئەمن بۆخۆم سوێندخۆرم، دەبێ لە دووی بچمە جزیرێ
کاکە مەم دەڵێ:
هاوار وەبەر ئەو خولایەی تاق و تەنیایە
ئاورێکم تێ بەربووە، هیچ چارم نایە،
شاری یەمەنێ چۆڵ و واحیدەلقەهارە چ بکەم بەبێ ئاغایە
دایکی بەنگینەی دەڵێ:
چ بکەم لەخۆم بێ فکری
ڕۆڵە نابێ دەس لە میرمەم کوڕی براهیم پادشای هەڵبگری
دایکی بەنگینەی دەڵێ:
هاوار و واوەیلایە
ئازابم بەهیچێ چوو لە دنیایە
تاقە کوڕێک خولای دایمێ لێ بۆم هەڵنشتە، هەڵوەدایە
دایکی مەمی دەڵێ:
ڕۆڵە، میرمەم! خولا نەیدامێ ڕۆنیشم بە دەنگ دلێری
ڕۆڵە! ئێستا بەپیری تووشی ئەستۆم بوو وەجاغ کوێری

دایکی میرمەمی دەڵێ:

ئەهلی یەمەنێ سەید و مەلای دە نەوجوانە!

ئەزو ببم بە قوربانی هەردووک چاوانە

دەرکی دەروازەی یەمەنێم بۆ بگرن تا دوو قسانە بکەم دەگەڵ کوڕی تاقانە

دایکی مەمی دەڵێ:

سەید و مەلا خۆشەویستی ئەو خوڵایە

هەموو دەسینگو دایە سی جوزوی کەلامولڵلایە

وەرن دەگـــەڵ ئەمن، بچینـــە خزمەت میرمەمی، تکاییێم بۆ بکەن، دەشـــقەمێ دەگەڵم بگەڕێتەوە دوایە

دایکی بەنگینەی دەڵێ:

ئاورم تێ بەربوو، لێم خەرابوو جگەرە

ئاغا و نۆکەران، سەفەری کاولە جزیرێ لەبەرە

دایکی بەنگینەی دەڵێ:

چ بکەم لەخۆم بێ سەڵایە

چ بکەم؛ بۆ براهیم پادشا لە هاواری مەم و بەنگینان نایە؟

دایکی مەمی دەڵێ:

چ بکەم لە خۆم ئێخسیرێ

هیچ کەسم نییە بۆم بکا ڕا دەگەڵ تەگبیرێ

هەرچەندە دەکەم دەستم پێ لە کوڕی خۆم هەڵناگیرێ

دەبێ، کەشـــکۆڵێکی هەڵگرم دەگەڵ دارعەســـایەکی، ببم بە دەروێش وەدوو میرمەمی کەوم، هەتا دەچمە شاری جزیرێ

دایکی بەنگینەی دەڵێ:

چ بکەم، ڕۆڵە، گیانە؛

حاشا لە یەمەنێ، ئەگەر گەورە و گرانە؛

دەبم بە ئێڵچی لە هەموو دەرکان پەیدا دەکەم نان نانە

هەموو شاران لێک دەدەم هەتا دێمە شاری جزیرێ بۆتانە

خەڵقی جزیرێ دەڵێن: قەرەواشیان دەگەڵە، ئەو جووتە نەوجوانە

کاکەمەم دەڵێ:

لەخۆم غەریب، بێ سەلایە

بە دایکم عەرز بکەن: بەخوڵا ناگەڕێمەوە دوایە

چونکە سوێندم خواردووە بە کەلامولڵایە

دایکی مەمی دەڵێ:

ڕۆڵە، دیدەی شیرینم!

ڕاوەستە دەستت دەستۆی بکەم تێرت ببینم

کاکەمەم دەڵێ:

مەکە فکرێ،

دەست دەستۆکردنی من هیچ کەڵک ناگرێ

ناگەڕێمەوە دوایە، کەڵک ناگرێ.

سەفەرم لەبەرە دەبێ بچمە جزیرێ بۆتانە

دەستم لێ هەڵگرن، ئەی بەندەی موسڵمانە!

دایکی بەنگینەی دەڵێ:

ڕۆڵە! لە من مل بەکوێن و بابان وێرانێ

خوڵاکەی مەم و بەنگین ئیزن بدەن، بڕۆن بۆ جزیرێ بۆتانێ

وەرن، بە خوڵایان بە زامن بدەن؛ بە ئەمانەت بە پێغەمبەری ئاخر زەمانێ

دایکی میرمەمی دەڵێ:

ڕۆڵە، لە خۆم بێ سەلایە

ئاورێکم بەربۆتێ، لەدڵم کوژراوە چرایە

شاری جزیرێ ئاوەدان دەبێ شاری یەمەنم بێ کوڕی ئاغایە

کاکەمەم دەڵێ:

چ بکەم، ڕۆژم لێ وەرگەڕاوە

خەڵقی یەمەنێ سەید و مەلای تەواوە

سەفەرم لەبەرە دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا

خەڵقی یەمەنێ، سەید و مەلا دەڵێن: کوێرین

هەڕۆ، بڕۆ، بە خوڵات بە زامن دەدەین بە پێغەمبەرت دەسپێرین

جا کێ بوو لە بەنگینی گوڵباوە
جارێ ڕاکێشا دەنگی قۆشەنی داوە
قۆشەنیان بار دەکرد، ئاڵا هەڵدراوە
بەجوملەی سەعاتێکی تەدارەکَ دەگیرێ
ئاڵایان هەڵگرت پشتی خۆیان دە یەمەنێ کرد، ڕوویان کرد دە شاری وێرانە جزیرێ
جا خەبەرێکیان لە براهیم پادشای یەمەنێ گێڕاوە
ئاورێک لە یەمەنێ بەربووە بەهیچ کەسێ نەدەکوژاوە
براهیم پادشا دەنێرێتە بورجی بەڵەک، بزانێ کاکەمەم بۆ لەوەێ نەماوە؟
براهیم پادشا دەڵێ:
خەڵقێکی نادانە!
بچن کاکەمەم بۆ بێننە ئێرەکانە
وەکیل و وەزیر دەڵێن:
براهیم پادشا، لەخۆت فەقیرێ
ئەتوو نەتزانێ، کاکەمەم لەشکری هەڵگرت، ڕۆی بۆ شاری جزیرێ؟
ئەگەر براهیم پادشا وا دەزانێ، دەست دەکا بە شین و گریانێ
دەڵێ: جا ئەمن بەبێ کوڕی چ بکەم لە یەمەنێ وێرانێ
براهیم پادشا دەڵێ:
وەکیل وەزیری موحتەبەرن
دەغیلو بم وەرن گەنج و خەزێنەی بۆ کوڕی من بەرن
وەکیل و وەزیر لە وێندەرێ ڕاوەستاوە
دەڵێن: قوربانت بم براهیم پادشای تەواوە
کاکەمەم پیاوێکی ئاقڵە موخاریجی خۆی هەموو لەوێ داناوە
براهیم پادشا دەڵێ:
چ بکەم ئاورم گرت، دڵم ناسرەوێ
ڕۆڵە! شاری یەمەنت بە قوربان دەکەم، مەرگی من ڕەپێشت کەوێ
جا ئەو کێ دەبوو لە کاکەمەمی نادری،
هەتا ئێوارێ دیئاژوا، ئێوارێ مەنزڵی دەگری

دەڵێ: بەنگینە! دەبێ بچی بۆم دە قۆشەن و تیپ و سوپایە بفکری
ئینجا وەرەوە، دەبێ تەدارەکی شامم بۆ بگری
ئەوێ شەوێ مەنزڵیان لەوێ تەواوە
سەرکردێک بەخۆی و بە هەزار کەسی گەڕاوە
کە سبحەینێ بەیانی داوە
شەیپووریان کێشا، ئاڵا هەڵکراوە
جا لەوێیان بارکرد بۆ شاری جزیریان ئاژواوە
هەتا ئێوارە بەسەر داهات مەنزڵیان تەواوە
کاکەمەم دەڵێ:
بەنگینەی، بەڵەک چاوە!
دە قوشەنێ بگەڕێ بزانە کێهە ئاجزیی[1] کێشاوە
بەنگینە دە قۆشەنێ گەڕا، خەبەری بۆ میرمەمی هێناوە،
دەڵێ: ئاغا گیان! کەس ئاجز نییە، هیچ کەس نارەحەتیی نەکێشاوە
ئەما ئەو شەو سەرکردێک بەخۆی و هەزار کەسی گەڕاوەتەوە بەدواوە
میرمەم دەڵێ:
بەنگینەی نەوجوانە!
بەڕەحمەتی خولای شوکرانە
هەڵبەتە براهیم پادشای بابم دەگەڵم غەیانە
بەنگینێ بۆ وا دەرفکری؟
ئاغایێ خۆت دەبەر هەردووک چاوان بمری
ئەوشەو سووک تەدارەکی بۆ ئەو شەو بگری
بەخولایێ ناگەڕێمەوە، مەگەر کاکەمەم بمری
ئەوێ شەوێ ویستراحەت کرا تەواوە
سبحەینێ کە بایانی داوە
جاڕیان ڕاکێشا، بەیداغ ڕاکێشاوە
بۆ شاری جزیرێ دەڕۆن، یەمەن بەجێ ماوە

---

١ ـ ئاجز، (عاجز)هـ.

هه‌تا ئێوارێ ئاژواوه

دیسان مه‌نزڵیان گرت، قۆشه‌ن هه‌ڵی داوه

میرمه‌م ده‌ڵێ:

به‌نگینێ ده قۆشه‌نێ بگه‌ڕێ، بزانه قۆشه‌نێکی ته‌واوه

به‌نگینه فرمێسکی چاوانی ده‌هاته خوارێ، ده‌تگوت: به‌حر و ئاوه

میرمه‌م ده‌ڵێ:

به‌نگینێ! چ بووه، چ قه‌وماوه؟

ئه‌گه‌ر دڵت به دایک و بابته‌وه هه‌یه، ئه‌تۆش بگه‌ڕێوه دواوه

به‌نگینه ده‌ڵێ:

له خۆم غه‌ریب و خانه‌وێرانێ

به زاتی خوڵایێ، به‌حه‌قی پێغه‌مبه‌ری ئاخری زه‌مانێ

ده‌ستت لێ هه‌ڵناگرم، هه‌تا میوانی خوڵام دێنه‌سه‌رێ بۆ گیان کێشانێ

جا کێ بوو له کاکه به‌نگینی گوڵباوه

ده‌گه‌ڵ میرمه‌می ڕۆیشتن دڵخۆشیی یه‌کتریان داوه

هه‌تا سبحه‌ینێ ڕۆژ له مه‌شریقێ سه‌ری ده‌رهێناوه

جا ئاڵای ڕاکێشاوه

قۆشه‌ن پێی ڕاهێناوه

سه‌برکه سه‌برکه له‌بۆ شاری جزیرێیان ئاژواوه

ده محه‌لی نوێژی نیوه‌ڕۆیه خه‌به‌ر به میرمه‌می دراوه

«سه‌لامه‌ت بێ ئاغایێ به‌ڵه‌ک چاوه

ئه‌تو ده‌زانی، سێ سه‌رکرده به‌خۆی و قۆشه‌نی نه‌ماوه؟

کاکه‌مه‌م ده‌ڵێ:

چ بکه‌م به ڕه‌زای خوڵای شوکرانه

ئه‌من چ بکه‌م بابی خۆم ده‌گه‌ل غه‌یانه

کاکه‌مه‌م ده‌ڵێ:

به‌نگینه! له خۆم بێ سه‌ڵایه

چاک نییه مه‌خلووقی ئازار بده‌ین، پێی خۆش نییه ئه‌و خوڵایه




وەرە، بۆ خاتری من ببە سەرکردە؛ ئەو لەشکرەم بۆ بەرەو دوایە

بەنگینە دەڵێ:

میرمەم لە من وایە، لەکن ئەتوو زۆر موحتەبەرم

ئەمن نەهاتووم ماڵی وەرگرم، گەنج و خەزێنێی بەرم

ئاغا بە قوربانت بم، لە غەریبەکانی دە قەلەندەرم

هەتا ئەمن دەمرم، بۆ ئەسپی بۆرە مەیتەرم

میرمەم دەڵێ:

بەنگین! چ بکەم؛ لە خۆم بێ کەماڵ و نادانێ

بۆخۆم بە قوربانت بم دەسەرت دەگێڕم یەمەنێ وێرانێ

چاوی خۆمت بە قوربان دەکەم دەگەڵ سەرتاپای ئیمانێ

وەرە، بۆ خاتری من ئەو لەشــکرەی بەرەو یەمەنێ، دەگــەڵ ئەو مەخلووقەیێ ناکەم گوزەرانێ

دەشقەمێ خولا و پێغەمبەر بە غەریبی و بێ کەسیی من بزانێ

ئینشەڵڵا سەفەرم لەبەرە، ناگەڕێمەوە، هەتا دەچمە جزیرێ وێرانێ

ئینجــا بابم دەڵێ: ئەمن تاقە کوڕێکم بوو نێوی میرمەم بوو، ســاحبی بورجی بەڵەک کوانێ؟

ئینجا دایکم دەڵێ: ڕۆڵە نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ بە بەر و پشــتان هەڵم گرتی، ئەدی تاقە کوڕەکەم کوانێ؟

ئینجا بەنگینە دەڵێ:

میرمەم؛ ئەمە هەردووکمان بێ فکرین

ئەو ئێوارە داهات، بلا مەنزڵێکی بۆ خۆمان بگرین

خەڵق چاوی لەمەیە، چونکە گەورە و سەرکردەی لەشکرین

ئەگەر ئەو قسەیان لەوێ دوو بە دوو دەکرد تەواوە

دەنگی لەشکریان دەدا بەیداغیان دە عەرزێ دەداوە

میرمەم دەڵێ:

بەنگین بگەڕێ، بزانە کێهەی بێ خەرجە، کێهەی خەرجی پێ ماوە

بەنگین دەڵێ:

میرمەم ئەتوو دەگەڵ من وەرە پای حیسابێ
هەتا سەری براهیم پادشای خۆش بێ، قۆشەن خەرجی کەم نابێ
میرمەم دەڵێ:
توخولا بەنگینە، بەو قسەت کردم سەرەوێرانە
ڕێگام دوورە، ڕێیەکی گەورە و گرانە
قۆشەنی بابم زۆرە، بلا بێ متمانە
بابم وەدەکا نەچمە جزیرێ، بگەڕێمەوە لێرەکانە
بەنگین دەڵێ:
میرمەم چەند دەکەم تەگبیری توو، بە من ناکرێ.
بەخولا، قسەیە پیاو دەگرێوی بنێ نابێ دەست هەڵگرێ
دەنا خولاوەندی، میری مەزن غەزەبی لێ دەگرێ
میرمەم دەڵێ:
بەنگین، ئەتوو وا ناکەی لە دڵم ببێ سەفایە
ئەمن دەس لە یایەزینێ هەڵناگرم لە بۆ دنیایە
ئەگەر سەرم، بە خولای چووبێ دەس هەڵناگرم بۆ دنیایە
بەنگین دەڵێ:
«میرمەم! ئێستا یایەزین چاوەنۆڕی تۆیە، لە هەموو کەسی دەکا حاشایە
میرمەم دەڵێ:
بەنگین چی دیم لێ مەدە، مەمخە فکرێ
دەس لە یایەزین هەڵناگرم، هەتا حەق و ناحەقم لە بارەگای خولای دەکرێ
جارێ بلا ویستراحەتێ بکەین هەتا لەشکر و قۆشەنەکەن دادەمەزرێ
کێ دەبوو لە بەنگینێ گوڵباوە
دەڵێ: سبحەی ئەو مەسڵەحەتەی دەکەین تەواوە
هێشتا بۆ شاری جزیرێ خوا دەزانێ، چەند مەنزڵمان ماوە
جا سبحەینێ شەیپووریان کێشا، ئالایان ڕاکێشاوە
ئەوێ شـــەوێ چوار سەرکردان، هەر ســـەرکردەی بە هەزار کەسەوە لێی گەڕانەوە بە دواوە




میرمرم دەڵێ:

بەنگینێ! چ بکەم، هیچ قاقەز و قەڵەم و مۆری مامۆستام لەکن نەماوە

بەنگین چ بکەم لە حەسرەتی یایەزینێ هەموو دەرسیشم لێ گۆڕاوە

بەنگین دەڵێ:

جارێ لێ گەڕە، جارێ لەشکر و قۆشەنمان لەو چۆڵەی لێ بوو بڵاوە

کاکەمەم دەڵێ:

«لەخۆت دڵخەمگین و فەقیرێ

هیچ بلا لەشکری براهیم پادشام دەگەڵ نەبێ، بۆ من ناکەن ڕا و تەگبیرێ

بەخولای، هیچ تەنەفیسم دەگەڵ نەبێ ناگەڕێمەوە، هاتە دەچمە شاری جزیرێ

بەنگین دەڵێ:

بۆ من هەر خزمەت و تەدارەک بێ

سەفەری لەبەر ئەتۆیە ڕەببی لێت موبارەک بێ

بۆچ بە دڵپڕی دەڵێی: جەرگم سووتاوە

سەفەرێکی دوور و درێژە، گەرم کۆڵاوە

بە حەقی خولای بێ شەریک، تا ڕۆحم دەبەر بەدەنێدا مەیتەرم، ناگەڕیمەوە بە دواوە!

میرمەم دەڵی:

بەنگینە چ بکەم چارەم چییە؟

بەخولای دەزانم سەفەری جزیرێم بە یەکجارەکییە

بەنگینە دەڵێ:

چ بکەم دەستت بێدەسەڵاتە، چارەت نایە

چونکە سوێندیان دوای بە قورعانێ و کەلامولڵایە

برۆ غەلەل لە دڵت پەیدا نەبێ، هەموو کەس هومێدی هەر خولایە

ئـــەوێ ڕۆژێ دوو بــــە دوو دەیانئاژوا هەتـــا مەحەلی ڕۆژاوایە، جا قۆشـــەن نەگەییە ئاوەدانیان، کەوت لە چۆڵ و لە ســـەحرایە، ئەوێ شـــەوێ سێ سەرکردە، سەرکردەی بە هەزار کەسەوە لێی گەڕانەوە بە دوایە

سبحەینێ کە لە خەوێ هەڵستان، هیچ کەس نەماوە

ئینجا بەنگینە هات، لە پشت سەری میرمەمی ڕۆنیشت، گەلێک گەلێک گریاوە

ئەگەر میرمەم چاوی هەڵدێناوە، تەماشا دەکا بەنگینە دەگریێ
فرمێسکی چاوانی دەتگوت: بەحرە، ڕووبارە، ئاوە
میرمەم دەڵێ:
بەنگین بۆچی دەگری چت لێ قەوماوە؟
بەنگین دەڵێ:
ئەی میرمەمی بەڵەک چاوە!
ئەو لەشکری بابی مەی بۆ مەی دروس کردووە، قەد کەرسوارێکمان لەکن نەماوە
کاکەمەم بانگ دێڵێ:
بەنگینێ موحتەبەرە!
ئەسپی بۆرە بۆم بێنە، سەری بگرە بە دووسەرە
دەبێ ئەتووش حوکمە بگەڕێیەوە؛ بۆخۆم دەچمە شاری جزیرێ ئەو سەفەرە
بەنگینە دەڵێ:
چ بکەم کوێرم بوون هەرتک چاوە
ئەمن هەر لەوێم عەرزی تۆ کرد، لەشکرێکی ناتەواوە
ئێستا ئەگەر سەرم لە پاشڕا ببڕی ناگەڕێمەوە بەدواوە».
میرمەم ڕقی هەڵستا بەو گۆچانی زێڕین لەسەر و بناگوێی بەنگینێی داوە
دەڵێ: بەتەنێ دەڕۆم، دەبێ هەر بگەڕێیەوە بە دواوە
ئینجا بەنگین دەڵێ:
بە خولایی! بە لێدانی توو ئەمن لە نۆکەری ناکەوم
هەتا دەچمە شاری جزیرێ بەسەری ڕووت، بەپێی پێخاوس وەدووت دەکەوم
ئینجا میرمەم دەڵێ:
نۆکەرەکەی دانا، بەجێ ماین لە سەحرایە
وەرە لە نۆکەری و ئاغایەتی بکەین حاشایە
وەرە پێکەوە ببینە برای دایکی و بابی هەتا لێمان خرا دەبێ ئەو دنیایە
ئینجا پێکەوە مەم و بەنگین دەگرنەوە قەرارێ
ئەو جووتە سوارەکەی غەریب لە یەمەنێڕا دەهاتنە خوارێ
ڕێی جزیرێ نازانن، هیچ کەسێک نییە لێی بکەن پرسیارێ




لە سبحەینێیان داژوا هەتا محەلی ئێوارێ
دەگەینە مەنزلێ، ئینجا لەوێ دەگرین قەرارێ
ئەوێ شەوێ دوو بە دوو دەکەن تەگبیر و ڕایە:
هیچ دایک و بابمان نییە، هیچ کەس نایە دە هانایە،
بە خولای، ئەمە ڕدێن سپیمان نییە هومێدمان هەر خولایە، حەزرەتی ڕەسوڵڵایە
ئینجا ئەگەر سبحەینێ سوار دەبن ئەو جووتە سوارە
وەدەر دەکەوتن ڕێی شاری جزیرێیان دەکرد پرسیارە
ئینجا دەڕۆینە خوارێ، هاواریان دەکرد: یا جەببارە!
ئەوێ ڕۆژێ دەڕۆیین ئەو جووتە سوارەکەی غەریب، حاشایان دەکرد لە دنیایە:
خولایە! لە دووی مەخسوود و مرادان دەچین کێن دێ دە هانایە؟
هیچ کەسی دیکەمان نییە بەغەیرەز خولا و غەوسی بەغدایە
ئەوێ شەوێ نەگەینە چ ئاوەدانیان، بەجێ مان لە چۆڵ و سەحرایە
قنیاتیان دەکرد هیچ کەس نەبوو دوو قسەیان دەگەڵ بکا لە بۆ سەفایە
ئینجا ئەوان شوکرانەیان دەبژارد، سەڵاواتیان دەدا لە حەزرەتی ڕەسوڵڵایە
ئەوێ شەوێ ئەوان دەنووستن دە هیمدادیان دەهات غەوسەلئەعزەم لە بەغدایە
ئەگەر ئەوێ شـــەوێ سبحەینێ وەخەبەر هاتن، پیاوێکی ڕیش سفیدیان لەکن بوو لەبۆ سەفای دنیایە
لێیان پرسی:
بۆ کوێ دەچی، لە کوێ دێی، بەڵەدیت هەیە بە شاری جزیرێ، لە کوێیە ڕێگایە؟
پیاوی ڕدێن سپی دەڵێ:
ئەنگۆ میوانن، بەخێربێن، سەرچاوەکانم
بەخولای! بۆخۆم بەڵەدم، بەشاری جزیرێ دەزانم
ئینجا ئەگەر سبحەینێ وەدەرکەوتن ئەو جووتە سوارە
وەیسەلقەرەنی ماهیدەشتێ دەیکردن قوتارە
بۆ شاری جزیرێ دەچوونە خوارە
ئەوە کێ بوو لە مەم و بەنگینی نەوجوانە
عەرزیان بۆ وێک دەهات بە ڕەزای بینای چاوانە

هەتا دەگەینە جووتێری یایەزینێ لەوێ دەبوون میوانە
ئینجا ئەو سوارە بانگ دێڵن:
ئەی جووتێر، ئەوە جووتی کوێیە؟
جوتێر دەڵێ: ئەی جووتە سوار، ئەوە جووتی شاری جزیرێیە
ئەنگۆ لە من بپرسن: ئەوە جووتی کێیە؟
ئەگەر نازانن ئەوە پیاوی یایەزینێیە
ئای بەخێرێن، سواری غەریب هاتنە ئێرەکانە
وەرن پیاو بن، لەکن من بخۆن پارویێک نانە
دا من مزگێنی بەرم بۆ یایەزینێ نەوجوانە
تەسەدوقی سەری ئەنگۆ دەیکا بە خەڵات بەخشانە
ئینجا مەم و بەنگین دەڵێن:
یا ڕەبی خولایە هەزار بار شوکرانە!
کێ بوو لە مەم و بەنگینی بەڵەک چاوە
لە سەرینچاوەی کانیە بوون پیاوە
کێ بوو لە جووتێری جندییە
جووتی بەرەڵدا کرد، بۆ یایەزینێ بردی مزگێنییە
کێ بوو لە کوڕی جووتێری نەوجوانە
هەر ڕای دەکرد بۆ مەم و بەنگینان دەهێنا نانە
ئەوانن نانەکەیان دەخوارد، دەیانبژارد شوکرانە
ئینجا بۆ جووتێریان دەکرد بە خەڵات بەخشانە
کێ بوو لە مەم و بەنگینی چاوبەنگینە
دوو دوو دەچوونە سەرینچاوەی کانییە
ئەلحەمەدولیللا ئەو کانییە کانی گەنجییە!
کێ بوو؟ لە مەم و بەنگینی نازدارە
هاواریان دەکرد: ئەی خولای جەبارە!
ئەوە داغیل بە شاری جزیرێ بووین؛ خولا بێ ئەزێت بمانکەی ڕزگارە
کێ بوو لە میرمەمی نازەنینە، دەســتی دەدا جامی، لەســەرینچاوەی کانیەڕا پڕ پڕی

دەهانیە

وەسەر بەنگینێی دەگێڕا؛ بەنگینێی کرد نەخشینە
کێ بوو لە بەنگینی تەواوە
ماشاڵڵا دەڵێی گوڵی بەهارێیە تاو لێی داوە
لەو ئاغا و نۆکەرەی موحتەبەرە
ماشاڵڵا یەکیان دەڵێی شەمسە، یەکیان دەڵێی قەمبەرە
ئینجا لەسەر ڕازی کانیە دادەنیشتن ئەبەر ئەوبەرە
هەتا لە خزمەت یایەزینێ دێتەوە جواب و خەبەرە
جووتێر دەچوو بە هاوار، بە لینگدان دەگەڕاوە
مۆژدەی لە بۆ مەم و بەنگینان هێناوە
چەند دەستیان دە گیرفانی خۆیان نا، چەندیان زێڕ بەو جووتێرەی داوە
کاکەمەم دەڵێ:
جووتێر ئەمە لە کوێ ببین پیاوە؟
جووتێر دەڵێ:
ئەزو ببم بە قوربانە،
قاسیدو لەسەر ڕێیەیە دەگەڵو بیکا قسانە
لەوێ ڕۆدەنیشتن شان بە شانە
چوار ڕەکەعەتیان نوێژ دەکرد، دەپاڕانەوە لە بینای چاوانە:
خولایە! ئەمە غەریبین لەوانی دە بێگانە
کێ دەبێ بەخانەخوێمان، لێی ببین میوانە؟
یارەببی خولایە! مەخسوودمان عاسڵ ببێ، سەرمان خەلاس ببێ لێرەکانە!
کێ بوو لە جووتە لاوەکەی نازدارە
پێیان دە ڕکێفی خۆیان دەنا دەبوون سوارە
ئەی بینای چاوان! جا بۆ شاری جزیرێ دەچووینە خوارە
ئەوە دەهاتنە خوارێ جووتە سوارەکەی فەقیرێ
دەهاتن و دەگەیشتنەوە سەر چۆمەکەی کاولە جزیرێ
ئەگەر زەینێکی خۆیان بەرەژوور داوە

تەماشا دەکەن هەموو گازرکارە ڕاوەستاوە
ئینجا میرمەم دەڵێ:
بەنگینەی بەڵەک چاوە!
هۆوەی دیوتە لەوێ ڕاوەستاوە
ئەوە یایەزینە ئەگەر ئەمنی بۆ ئێرەکە هێناوە
کاکەمەم بەنگین دەڵێ:
کاکەمەم! وانییە
ئەوە هەڵبەتە قەرەواشی بەردەستی وییە
کاکەمەم دەڵێ:
بەنگینە چ دەڵێی قسەیەکی لێ بزانم؟
کاکەمەم دەڵێ:
ئەی گازرکارێ، گازری دەکەی بە دەستانە
ئەمە غەریبین لەوانی بێگانە،
بە قسەی توو لە یەمەنێڕا هاتینە جزیرێ بۆتانە
مەلەکریحان دەڵێ:
ئەی جووتە سوارەکەی دوور مەکانە
هەر لەوێڕا بەخێرێن؛ پێڵاوو سەرچاوی من هەتا ئێرەکانە
ئەو یایەزینی ئەنگۆی هێناوە، چل قەرەواشی وەکو من ئەوا لەبەر دەستانە
کاکەمەم دەڵێ:
ئای؛ لەبەر ژنان؛ ئەوە لێم دەکا حاشایە
چ دەڵێی لە ترسی خولای لەبەر کەلامولڵایە
یەمەنت تەخت و تاراج بە من بەجێ هێشت، ئێستا لێم دەکەی حاشایە؟
مەلەک ریحان دەڵێ:
جووتە سوارەکەی غەریب، گیانە گیانە!
ئەمن قەت یەمەنم نەدیوە بە خولای بێ شەریک و لایەزانە
ئەو خاتوونی ئەنگۆی هێنا ئێرەکانە
لە خولای بترسێن، بە من بکەن متمانە




«چل قەرەواشی وەکو من دایمولمودام لەبەردەستانە
کاکەمەم دەڵێ:
بەنگینێ چاوبەنگییە!
ئەوە حاشایە دەکا، جیهەتی چییە؟
بەنگینە دەڵێ:
ئەوە حاشایە ناکا، بە خولای ئەو نییە
ئەو کراسی هێنابوویە یەمەنێ
ئەوە دەبەر ویدایە، ئەوە خەلاتی وییە
ئەو کوڵێجەی دە قۆڵی ئەویدا، ئەوەی یایەزینێیە بەوهەی داوە بە یەکجارەکییە
بەنگینە دەڵێ:
ئەوی سوێند دەگەڵ ئەتوو خوارد، ئاغایە من، بە سەری توو، ئەوە هەو نییە
کاکەمەم دەڵێ:
بەنگینـــە، چونکە تووشـــی ئەوەی بووین، بلا لێی بپرســـین، بزانین لە ماڵە کێ ببین میوانە.
کاکەمەم بانگ دێڵێ:
خاتوونێ! خاتوونێ گیانە!
کێ سەغی و لۆتییە، ئەمە بچین لێی ببین میوانە؟
خاتوونێ بەشقی خولای، غەریبین دەگەڵمان مەبە غەیانە
مەلەک ڕیحان دەڵێ:
لە من مل بەکوێن و بابان وێرانێ!
هەر کەسێک دەگەڵو غەیان بێ، ڕەببی کوێر ببێ لە چاوان، زەبوون بێ لە ئیمانێ
لاوە هەر کەسێک دەگەڵو غەیان بێ، خولا لێی بکا بە کفری
لاوە ئەگەر بۆ مەخسوود و مرادان هاتوون، قسەی ساغ لە من وەرگری
لاوە پێناوداری توو بم! مەچۆ ماڵە کەس، بچۆ مەنزڵی کابەکری
ئەوە پیاوێکی سەغی و پیاوچاکە قەدری میوان چاک دەگری
لاوە ئازیزم. گەلێک لاوێکی بێ نسرینی
هەر کەسێک دەگەڵت غەیان بێ کوێر ببێ لە چاوان، زەبوون بێ لە دینی

ئەگەر بۆ نان پەیداکردن هاتووی - وەباڵت بەستۆی من - بچۆ ماڵە میرزێندینی.
لاوە گەلێک لاوێکی شیرینی
هەرکەسێک دەگەڵت غەیان بێ، یارەببی، خێرێ لە جوانی خۆی نەبینی
ئەگەر بۆ پیاوەتی هاتووی - وەباڵت بەستۆم - بچۆ ماڵە قەرەتاژدینی
کاکەمەم دەڵێ: کەس ناتوانێ دارت بە سەر بارێ ڕاکا قسەی خراپت پێ بنوێنی
بەنگینە ئەتوو پیاوێکی زۆرزانی
ئەمن پادشایەتیی یەمەنێم بەجێ هێشتووە، تازە بچم نۆکەری خەڵقی بکەم بۆ نانی
کاکەمەم دەڵێ:
بەنگینە، گەلێک بەنگینێکی نادری
میرمەم لە شاری یەمەنێڕا نەهاتووە بچی فینجانێ قاوەی بە سەدەقەسەری وەرگری
ئەمن بۆ مەخسوود و مرادان هاتووم چاک وەیە، بچمە ماڵە کابەکری.
کاکەمەم دەڵێ:
بەنگین، گیانە! وەی گیان گیانە!
ڕێی دوازدە مانگ و بیست و چوار ڕۆژان ئەمن هاتوومە ئێرەکانە
شاری یەمەنێم بەجێ هێشتووە، چەند شارێکی گەورە و گرانە
ناچمە ماڵە قەرەتاژدینی، بە سەدەقە سەری بمدەنێ پاروو پارووی نانە
دڵت غایلەی نەکا، مەڵێ مەسلەحەتی ژنانە
هەر دەچم لە ماڵە کابەکری دەبم میوانە
ئینجا بایەزین هاوارێ دەکاتە خولای:
خولایە! ئەتوو خولایەکی بەفکری
هەم کەریم و هەم قادری
ئەو جووتە سـوارەکەی لە یەمەنێڕا هاتوون ڕێی دوازدە مانگ و بیسـت و چوار ڕۆژان وەبەر خۆی دەگری
ڕەببی بە ڕەببینی خۆت کەی بچنە ماڵە قەرەتاژدینی نەچنە ماڵە کابەکری
بایەزین دەڵێ:
هاوارم وەبەر ئەو خولایە!
ئەگەر بێ شەریکە تاق و تەنهایە




بۆخۆی لایەزانە

ئەو جووتە سوارەکەی بە قسەی من مل بەکوێنێ، هاتوونە ئێرەکانە،

ڕەبێ لە ماڵە میری، کاکی من نەبن میوانە

ئەی خولایە! ئەتوو بێ شەریکی چەند بێ نسرینی

ئەو جووتە سوارەکەی هاتوون بە قسەی من مل بە کوێنی

پادشایەتی شاری یەمەنێ لێیان بەجێ دەمێنی

یاخولا! نەچنە ماڵە کابەکری؛ بچنە ماڵە خوشکی خۆم، قەرەتاژدین پیاوێکی ڕەشیدە، سەخییە، نان بدەیە. ئەو زۆر چاکیان بەخێردێنی

کێ بوو لە کاکەمەم و بەنگینی موحتەبەرە

خەڵقی جزیرێیان لێ ڕاوەستابوو ئەوبەر ئەوبەرە

کێ بوو لە کاکەمەم و بەنگینی گوڵباوە

بەهەرتک دەستانیان لە عالەمێ دەکرد سەلاوە

جزیری ئەوبەر ئەوبەر جوابیان دەداوە

ئینجا مەلەکڕیحان خێڵەکی بە سەر خۆی کێشاوە

لە دوای مەم و بەنگینان دەهات بە هەڵەداوە

مەم و بەنگین ئەسپی خۆیان ئاژواوە

کێ بوو لە مەم و بەنگینی نادری

لە هیچ کوێ ڕانەوەستان هەتا گەینە دەرکی کابەکری

خەڵقی جزیرێ ئەوبەر ئەوبەر دەوان دەفکری

هیچ کەسێک نییە لە دەرکی کابەکری

ئەگەر بێ جڵەوی ئەو جووتە سوارەی بگری

کێ بوو لە کاکەمەمی گوڵباوە

بانگی دەکرد: بەنگینەی بەڵەک چاوە!

تەخسیری من نییە، تەگبیری هەردووکیانی لێ کراوە

پیاوی غەریب وەک بازی چاو بەستراوە

گەلێک کەس بە قسەی ژنان تێ شکاوە

لەکنم ماڵە بەکرئاغای چ میوانی ڕانەگرتووە نانی بە کەس نەداوە

کاکەمەم دەڵێ:
بەنگینە بەنگینێکی شیرینی!
مەسڵەحەت ئەوەیە بچینە ماڵە قارەتاژدینی
ئەو پیاوێکی لۆتییە، لەسەر نانی دانامێنی.
کێ بوو لە میرمەمی نازدارە،
دەیگوت: ئەهلی جزیری، کەیخودا، ڕدێندارە
کووچەی ماڵە قەرەتاژدینی کیهەیە، بۆ ماڵە وی بچینە خوارە؟
کێ بوو لە پیاوی تەواوە
هەموو پاشەوپاش دەکشاوە بەدواوە
ماڵە قەرەتاژدینی بە مەم و بەنگینیان نیشان داوە
کێ بوو لە خەڵقی ساحبی ئیمانە
مۆژدەیان دەبرد بۆ خاتوون ئەستی نەوجوانە:
جووتێک سواری غەریب و نەوجوان ئەوە هاتن بۆ ئێرەکانە.
خاتوون ئەستی ئەگەر وا دەزانێ
بۆخۆی هەڵدەستا لە دیوانێ:
بڵان، بەخێریان بێنم ئەو میوانانە.
خاتوون ئەستی دەکا هەرایە:
«دەبڵا بێن جحێڵ و مەلا و سەید و کەیخودایە
یەک بە یەک هەمووی دەناردنە ڕێگایە
کێ بوو لە خاتوون ئەستی چاو شەهێنە
دەینارد قەرەواش و سەرسپی دەهێنا
شووشەی گوڵاویان دەگرت، وەتاغ و باڵەخانەیان پێ دەکرد ئاوپرژێنە.
کێ بوو لە خاتوون ئەستیی گەرم کۆڵاوە،
دەینارد قوربانیی دەهێناوە،
گاوگەردوونی لەپێش مەم و بەنگینان کراوە.
کە مەم و بەنگین گەینە کۆڵانێ
جحێڵ بەپیریانەوە چوون؛ دەستیان کرد بە خەڵات بەخشانێ




لەوێ ڕەدبوون بە سەفایە

لە سەر ڕێیە هەبوون ڕیش سپی و کەیخودایە

کە لەوێ ڕەدبوون لێ ڕاوەستا بوون سەید و مەلایە

کێ بوو لە میرمەمی بەڵەک چاوە

سەلامی لەوان دەکرد لە نێویان بوو پیاوە

ئینجا بەنگینە گەلێک نادری

چەک و ئەسپابان لە میرمەمی وەردەگری.

کاکەمەم لەوێ ڕاوەستا؛ بەنگینە لە بۆ مەحرەمێ ڕادەبری

خاتوون ئەستی ئەگەر دەیزانی ئەو گوفتارە،

لە پەنجەرانڕا دێتە خوارە.

خاتوون ئەستی دەڵێ:

«براله، گیانە!

بۆ تەشریفت وا درەنگ هاتە ئێرەکانە؟

وەرە، ڕۆنیشە؛ پێکەوە بکەین دوو قسانە».

بەنگینە دەڵێ:

خاتوونێ، بەڵەک چاوە!

ئەمن ناتوانم ڕۆنیشم؛ ئاغام لە دەرێ ڕاوەستاوە.

ئینجا خاتوون ئەستی ناردییە کن سەید و مەلای موختاری:

کاکەمەم بۆ مەرەخەس بکەن بەیەکجاری.

کە قاسید هاتووە لەولاوە،

عەرزی سەید و مەلایان کراوە،

کاکەمەیان مەرەخەس کرد، دەیگوت: دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا.

کاکەمەم کە مەرەخەس کرا هەموو کەس دەزانێ

ڕووی لە حەرەمی قەرەتاژدینی کرد، خاتوون ئەستی پێ دەزانێ.

خاتوون ئەستی بەپیریەوە هات، دەستی دەستۆی کرد دەڵێ:

براله بۆچ وا درەنگ هاتیە جزیرێ وێرانێ؟

دنیای ڕوونم لێ تاریک بوو، لە سوێ توو لێم بڕا ڕێی گوزەرانێ،

براله! هه‌ڵسته بچینه وه‌تاغێ باڵه‌خانێ.
کی بوو له میرمه‌می موحته‌به‌ره
له پلیکانیان ده‌که‌وته سه‌ره
په‌نجه‌ره‌یان بۆ ده‌کردنه‌وه ئه‌وبه‌ر ئه‌وبه‌ره،
ده‌گه‌ڵ خاتوون ئه‌ستی ڕۆده‌نیشتن، خوشک و برای ده موحته‌به‌ره
به‌نگینه ده پێش ئه‌وان ڕاوه‌ستا بوو ده‌سته‌ونه‌زه‌ره
کێ بوو له خاتوون ئه‌ستیی به‌ڵه‌ک چاوه
ده‌گه‌ڵ میرمه‌می گوفتاریان بۆ یه‌کدری گێڕاوه
به‌نگینه بۆ ڕۆنیشتنێ مه‌ره‌خه‌ست کراوه
مه‌م و به‌نگین و خاتوون ئه‌ستی ڕۆنیشتن شان به شانێ
خاتوون ئه‌ستی ده‌ڵێ:
له خۆم مل به‌کوێن و بێ وه‌ته‌نێ
چ بکه‌م میوانی منه تاقه کوڕه‌ی براهیم پادشای یه‌مه‌نێ.
خاتوون ئه‌ستی ده‌ڵێ:
چ بکه‌م! له من بابان وێرانێ،
قه‌ره‌تاژدین له دیوانی میرزێندینییه به هاتنی ئه‌و میوانانه نازانێ.
خاتوون ئه‌ستی ده‌ڵێ:
کوێخا ده‌رک! وه‌ره به‌ر په‌نجه‌ره و باڵه‌خانێ؛
به ئه‌مینی بچۆ خه‌به‌رێکی به قه‌ره‌تاژدینی بده، بلا کاکم نه‌زانێ.
کێ بوو له کوێخا ده‌رکی به‌ڵه‌ک چاوه،
ده‌گه‌ییه ده‌رکی دیوانی میری، په‌رده‌ی هه‌ڵداوه،
که‌وشی هه‌ڵگرت و به‌قه‌ره‌تاژدینی نیشان داوه.
میرزێندین ئاوڕی ده‌داوه.
میرزێندین ده‌ڵێ:
«کوێخا ده‌رک بۆچی له دووی قه‌ره‌تاژدینی هاتووی، بۆ نه‌هارێ چ دروس کراوه؟»
کوێخا ده‌رک ده‌ڵێ:
«میر بتبم به قوربانه!





هەرچی ئەتوو بخۆی هەیە، ئەما تازە هاتوون دوو میوانە».
کە قەرەتاژدین لە دیوانێ هەڵستاوە،
لە پلەکانان دەهاتە خوارێ ئاوڕێکی وە کوێخا دەرکی دەداوە،
دەیگوت: «چ خەبەرە، چی قەوماوە؟»
دەیگوت: «ئەلحەمدوللا هیچ نییە؛
«دوو میوانمان هاتوون لە نێوەڕاستی شارییە،
زۆر میوانی دە نەجیبن، خاتوون ئەستی لە دووی تووی ناردووە بە تەعجیلییە».
قەرەتاژدین دەڵێ:
«ئەمن بۆخۆم غەواسم،
ئەو میوانانە بەخێرێن، زۆر چاکیان دەناسم».
کی بوو لە قەرەتاژدینی گەرم کۆڵاوە
ئەگەر گەییبە دەرکی خۆی لە هیچ کوێ ڕانەوەستاوە
هەتا لە پلیکانان دەکەوتە سەرە، پەردەی هەڵدەگرن، لە هیچ کوێ ڕانەوەستاوە
هەتا دەچوو، لە میر مەمی دەکرد سەلام و سەڵاوە.
دەیگوت: «عەلەیکومئەسەلام و ڕەحمەتوڵڵاهی سەر چاوی من شۆڕە لاوە».
کێ بوو لە مەلەک ڕیحانی بەڵاک چاوە
چارشێوی بە سەر خۆی هەڵکێشاوە
بە کووچەیدا دەهات بەهەنگاوە
ئەگەر گەییبە دەرکی کابەکری، ئەگەر تەماشای کرد ئەو میوانەکەی هاتبوو لە دەرکی ماڵە بابی نەماوە.
مەلەک ڕیحان دەڵێ:
«لە خۆم سەر بەتاڵ و بابان وێرانێ!
دیت چلۆن لە دەرکی ماڵە بابم برا ڕێی گوزەرانێ؟»
مەلەک ڕیحان دەڵێ:
«بابە ئەتوو گەلێک کافری!
ڕۆژێ هەشتا کەس جیرە و مواجبی لە ماڵە توو وەردەگری
خەبەر لە هەر چوار دەوڵەتان دەگەڕێ، دەڵێن: بەکرئاغا میوانان ڕاناگری».

بەکرئاغا، ئەتوو بۆ من پەرژینی.
قەت بوو، میوان لە ماڵە توو جێی نەبێ، بچێتە ماڵە قەرەتاژدینی؟»
بەکرئاغا دەڵێ:
«بە حەقی ئەوەی ساحب سەفایە!
ئەوی ئەوانە بۆی هاتوون لە ڕووی دنیایە،
نایەڵم هیچ مەخسوود و مرادیان حاسڵ بێ؛ بە حەقی ئەو خولایە!».
مەلەک ڕیحان دەڵێ:
هەیڕۆ، سەد جاران ڕۆ!
دیت چلۆن ماڵە بابەکەم لێ بوو نوغرۆ!
دژمن دەڵێن:
ماڵە بەکرئاغای لە بۆ میوانان نەیبوو کا و جۆ.
میرزێندین ناردییە کن قەرەتاژدینی: «کێ مواجبی لێ بڕیوە؟
کێ قسەی پێ گوتووە؟ بۆچی نایەتە دیوانێ؟» قەرەتاژدین دەڵێ:
«لە سایەی نێوچاوانی ویوە کەس ناتوانێ چ بەمن بڵێ؛ ئەما چەند ساڵان بوو برایەکم بوو ڕۆیی بوو بە سـایەی نێوچاوانی وی هاتۆتەوە؛ نێوی وی کاکەمەمە، جا لەبەر ئەوەی بە خزمەت ناگەم».
میرحوکمی لەوی کرد: «هەڵستێ؛ کاکەمەمی بێنێ و بێتە ئێرە».
گوتی: «قوربان! ئەوڕۆ مەرەخەس بفەرموو؛ سبحەینێ بە خزمەت میری دەگەم دەگەڵ کاکەمەمی».

کوڕی پادشـایەکی دی بوو، نێوی (عرفۆ) بوو. ئەویش هاتبوو بۆ ماڵە قەرەتاژدینی؛ ئەویش بۆ بایەزینێ. کوڕی پادشایەکی دی بوو نێوی (چەکۆ) بوو. ئەویش هاتبوو بۆ ماڵە قەرەتاژدینی؛ ئەویش بۆ بایەزینێ. کاکەمەمیش کوڕی براهیم پادشای یەمەنێ بوو، ئەویش هاتبـوو ماڵە قەرەتاژدینی؛ ئەویش بۆ بایەزینـێ. قەرەتاژدین نێوی بابی عرفۆ و چەکۆی نەدەزانی؛ ئەمما دەیزانی کاکەمەم کوڕی براهیم پادشای شاری یەمەنێیە. شاری جزیرێش هەر دەبەر حوکمی یەمەنێدایە.

ئینجا ئەگەر سـبحەینێ ڕۆژ بۆوە، قەرەتاژدین، عرفۆ، چەکۆ، کاکەمەم و بەنگین، هەر پێنجیان هەڵستان بۆ دیوانی میری چوون. بەکر قاسیدی لەسەر ڕێی ئەوان دانابوو. ئەگەر ئـەوان چوون بۆ دیوانێ، بەکریش لە ماڵە خۆی هەڵسـتا هـات؛ ئەویش گەییە دیوانی

میری.

ئینجا دەڵێ لەو کوڕی پادشای تەواوە

گەییبە دیوانی میری لێیان دەکرد سەلام و سەڵاوە

میرزێندین دەیگوت:

«عەلێکومئەسەلام و ڕەحمەتوڵڵاهی، سەر هەردووک چاوە!»

جێیان بە کاکەمەمی نیشان داوە.

عرفۆ دەپێشـــدا هاتبوو؛ برای گەورە بوو. چەکۆ لە دوای وی هات؛ برای نێونجی بوو. کاکەمـــەم لە دوای وان هاتبوو؛ برای چکۆڵە بوو. ئەگەر چوونە دیوانی میر زێندینی، میر حوکمی کرد ڕەســـەر هەمووانی خست؛ بەرامبەر خۆی دانا. قەرەتاژدین لەپاش موخاریجی هەموو شەوی جومعان یەکی پەنجا تومەنی لە پشت سەری وان دادەنا؛ دەیگوت: «نەکوو خەرجییان پێ نەبێ ئابڕووم دەچێ. نان منەتی نییە بۆ من، نانی حیز عەیبە ئەمن باسی نانی بکەم». شـــەو و ڕۆژێکی لەوێ دانیشتن، میر مەرەخەستی نەکردن. خاتوون ئەستی هەڵـــی گـــرت، پیاوێکی نارد: «بە کاکم بڵێـــن، کاکەمەمی بۆ ئێزن نـــادا بێتەوە؟» میر فەرمووی: «مەرەخەســـتی دەکەم؛ بلا بۆ شامێ بێتەوە کن ئەمن. خوشکم بۆچی شتی بە قەرەتاژدینی دەدا، بە من نادا هیچ؟ ئەوە کاکەمەم مەرەخســـتم کرد، هاتەوە؛ بۆ شـــامی دەبێ بێتەوە کن ئەمن». کاکە مەم هەڵســـتا ڕۆی؛ عرفۆ، چەکۆ و قەرەتاژدین، هەموویان چوونـــەوە. میر ما دەگەڵ بەکرئاغای. گوتی: «بەکرئاغا، وەرە تەگبیرێ بکەین؛ کاکەمەم هێند نەجیمە هەرچەن دەکەم، شاری جزیرێ قابیلی نییە بیدەمێ». بەکر گوتی: «ئەوە کێیە شـــاری جزیرێ قابیلی نییە، ئەتوو بیدەییێ». میر فەرمووی: «بەخولاّ، نازانم کوڕی کێیە؛ ئەما زۆر نەجیمە». بەکرئاغا گوتی: «قوربان! بەخۆت دەزانی؛ کەیفی خۆتە». میر فەرمووی: «هیچی دی شک نابم، مەگەر یایەزینێی بە کۆشک و تالارەوە بدەمێ». بەکرئاغا گوتـــی: «زۆر موبارەکە». نۆکەران مزگێنییان برد بۆ یایەزینێ: «ئەوشـــەو کاکت ئەتوو پێشکێشی کاکەمەمی دەکا». یایەزین بەقەســـتی دەڵێ: «ئەو کاکەمەمە کوێندەرییە؟» یایەزین مزگێنیی پێ درا. ئەوێ شـــەوێ خۆشی وە دڵی یایەزینێ کەوت. ئەویش مزگێنیی نارد بۆ خاتوون ئەســـتی: «ئەوا قســـێکی وا پەیدابوو لە مەنزڵی کاکم». خاتوون ئەستی دەڵێ:

«ڕەبی خولایە، زۆر شوکرانە!

بە مەخسوود بگەن ئەو نەوجوانە».

ئینجا بەکرئاغا و میر دەکەن تەگبیرانە:

میر دەڵێ: «بەکرئاغا! بڵا بیدەینێ ئەوشەو». گوتی: «قوربان! ئاغای من! ئەوشۆی مەدە. بچۆ ماڵێ، پرسێکی بکە، بە یایەزینیش بڵێ: خوشکێ، ئەمن ئەتۆم بەخشی بە کاکەمەمی؛ مەڵێ پێی نەگوتم؛ ئەگەر ڕەزا نەبی ناتدەم». گوتی: «براله! حەزێ دەکەی بمسووتێنە؛ ئەمن لە قسەی توو دەرناچم». بەکر گوتی: «قوربان ئەوشەو پەکی کەوت، بمێنێ بۆ سبحەی شەوێ ئینشاڵڵا». بەکر هەڵستا، چۆوە ماڵە خۆی. چوو لەو کووچەی لە ماڵە قەرەتاژدینڕا دەهات بۆ ماڵە میر زێندینی. بەکر زێڕی دە باغەڵی خۆی نا؛ بە کووچەیدا هاتە خوارێ. هەر ژنێکی حیزبوو، قەحبە بوو دراوی دایە. هێندێکیان کولیجەی بۆ کردن، هێندێکیان قەندی دانێ. ئەو کووچەی سەرانسەر بۆ کرد. بەوانی گوت: «ئەگەر سبحەینێ خەبەرم دانێ:

«هەر کەس لە ماڵە خۆی بێتەدەرێ،
قوڕێ بەسەری خۆی کا، یەخەی بپچڕێ
بگیرێی بڵێ: هەیڕۆ! یایەزین گول بوو، دەریان کرد لە شاری جزیرێ.
کاکەمەم پی بزانێ ئەوا یایەزین گول بوو لە شاری جزیرێ دەریان کرد».
سبحەینێ ژنەکان هاتنە سەری کووچەی،

دەستیان بە گریانێ کرد. کاکەمەم لەولای هات، گوتی: «ئەوە چییە؟». ژنەکان دەڵێن:

«لە خۆمان مل بوکوێن و هەژاری،
ڕێی گوزەرانمان برا بەیەکجاری.
ئەوڕۆ سێ ڕۆژە یایەزین گول بووە؛ کەر و تێڕیان داوەتێ. دەریان کردووە لە شاری».

کاکەمەم دەڵێ: «جا چ بکەم، ئەمن کەلامولڵام خواردووە دەگەڵ ئەوی ڕێی دوازدە مانگ و بیست و چوار ڕۆژان هاتوومە ئێرە؛ ئینجا ئەمن چ بکەم دەگەڵ گولی»

دەڵێ: «لە خۆم خەمگین و خانەوێرانێ!»
بە دڵشکستی هەڵستا چووە دیوانێ؛
جێیان بە کاکەمەمی نیشان دا؛ ئەوەی بە ئیلتفات دەزانێ.

میر ڕووی دەبەکری کرد، گوتی: «بڵا یایەزینێ بدەین بە کاکەمەمی. گوتی: «قوربان! بڵا شامێ بکەین، ئینجا قسانی لێ دەکەین». شامیان هێنا، نانیان خوارد، خەلاس بوون. میر گوتی: «قەرەتاژدین! بۆچ قسان ناکەی؟» گوتی: قوربان! فەرمایشی تۆیە؛




هەرچــی ئەتوو دەفەرمووی ئیتاعەتی دەکەم». گوتــی: «قەرەتاژدین! یایەزین بەجێ و مەکانــەوە ئەوا پێشکێشــی کاکەمەمم کرد». کاکەمەم گوتــی: «خولایە! ئەگەر قبووڵی دەکــەم دەڵێــن: ناچیزەیە؛ گولی قبووڵ کرد؛ ئەگەر نامەوێ، ئەمن ســوێندخۆرم دەگەڵ ئەوی». میر فەرمووی: «قەرەتاژدین! ئەوە یایەزینم بەجێ و مەکان و تالارەوە پێشکێشی کاکەمەمی کرد». کاکەمەمی گوتی: «میر، ئەوە قبووڵم کرد؛ دامەوە بە توو». میر گوتی: «قەرەتاژدین! هەر ئەوجار بە کاکەمەمی دەڵێم: کاکەمەم! ئەوا یایەزین بەجێی و تالارەوە پێشکێش بە تۆم کرد». کاکەمەم دەڵێ: «ئەوە قبووڵم کرد؛ دامەوە بە توو» میر گوتی: «ئەوە ســەررا وی لێــم قبووڵ کردی». عرفۆ، چەکۆ کەیفیان خــۆش بوو؛ چونکە کاکە مەم یایەزینی نەویســت. قەرەتاژدین خەمناک ما. هەڵستا بڕوا لە رقی کاکەمەمی چونکە یایەزینی نەویســتووە. میر فەرمووی: قەرەتاژدین، دانیشــەوە؛ ئــەوە کاکەمەم یایەزینی قبووڵ نەکرد لە من، ئەمن شتێکی لەوی دەخوازم، کاکەمەم بەمنی بدا».

کاکەمــەم گوتی: بەڵێ قوربان چ دەفەرمووی بەچاوان». گوتی «ئەتوو ئەو تۆکەرەی خۆت بە من بدە، ئەگە[1] بەنگینەیە». گوتی: «قوربان! پێشکێشت بێ».

کێ بوو، لە بەنگینی گوڵباوە،
بانگ لەسەر بانگی لێ دەداوە.
کەوڵ و گۆچانی میرمەمی ڕۆی دەناوە،
بانگ لەسەر بانگی لێ دەداوە.
دەڵی: «ئەی خولایە، لە وەلایەتی غوربەت چم لێ قەوماوە!»
بەنگینە دەڵێ: «میرمەم ئەمنی بۆ بەراتێ هێناوە».
چوو کەوڵ و گۆچانی هەڵگرت لە پێش میرزێندینی ڕاوەستاوە.
کاکەمەم هەڵستا بەتاقی تەنێ بۆ ماڵە قەرەتاژدینی گەڕاوە.
ئەگەر گوێ هەڵدەخا، خاتوون ئەستی دەڵێ: «خولایە! چ بکەم چم لێ قەوماوە؛
«ئەگەر کاکەمەم خوشکی منی نەدەویستم بۆ کەلامولڵای دەبەر خوشکی من ناوە؟»
میرمەم ئەگەر دەچوو، ئەگەر تەماشای کرد عرفۆ و چەکۆ ساز و چەقەنەیان ڕۆناوە.
قەرەتاژدین غەمناک ماوە.
ئەگەر بەکر ئەو قسەی دەبیستن تەواوە،
بەزەریفی لە دیوانی میری هەڵستاوە،

---

[1] ـ ئەگە: ئەگەر

بۆ خزمەت یایەزینێ دەچوو زۆر خۆشی بوون هەنگاوە.
بەعاستا پەردەی یایەزینێی هەڵداوە،
بەئانقەستی دەگەڕاوە بەدواوە،
یایەزین دەڵێ:
«کابەکرا بفەرموو وەرە پێشێ، بزانم ئەوشەو لە دیوانێ چ قەوماوە».
ئەگەر بەکر وا دەزانێ، چووە کن یایەزینێ دانیشت لە دیوانێ،
یایەزین دەڵێ:
«کابەکرا بۆم بگێڕەوە بزانم، چ بووە چ سوحبەتێک کراوە».
بەکر دەڵێ:
«چ بکەم، برای توو شێت و ناتەواوە؛
ئەمن نازانم، چ بکەم برای توو نازانێ ڕێی گوزەرانێ.
حیزبابێکی خوێڕی هاتووە کەس بە مەنزڵی نازانێ،
ئەوشەو کاکی توو سێ جاری ئەتوو پێشکێش کرد، قبووڵی نەکرد لە دیوانێ».
یایازین دەڵێ:
«پێم بڵێ، ئەو قسە چییە؛
بەکرئاغا ئەوەی قبووڵ ناکەم، ئەوە کارێکی خۆڕاییە.
ئەوەی ئەمنیان داوەتێ نێوی چییە؟»
دەڵێ «نازانم؛ کاکەمەمی پێ دەڵێن یەکی زەردەڵەی خوێڕییە!»
یایەزین دەڵێ:
«سەری بەتاڵم، ملی بەکوێنم.
بەکر، ئەوە خەتای تۆیە، سی و دوو ددانت بە گازی دەرێنم!»
بەکر دەڵێ:
«ئەمن چ بکەم، تەخسیرم چییە؟
ئەو میرمەمە پیاوێکی زۆر ناچیزەیە خوێڕییە.
برای توو پیاوان ناناسێ ئەتووی لەکن گران نییە».
ئەگەر بەکر ئەو قسەی دەکرد تەواوە،
بەزەریفی هەڵدەستا پەردەی هەڵدەگرت، دەگەڕاوە بە دواوە.
یایەزین بۆ خۆی دەگری خەمناک ماوە؛




دەڵێ: «خوڵایە! ئەگەر ئەو پیاوە ئەمنی نەدەویست، بۆ لە یەمەنێ کەلاموڵلای دەپێش ئەمن ناوە؟

لە من مل بەکوێن و بابان وێرانێ!

سبحەینێ دەبێ ئەو کاکەمەمەی ببینم، بزانم ئەگەر ئەمنی نەدەویست بۆ چ پادشایەتیی یەمەنێــی بەجێ دەیەشــت، ڕێی دوازدە مانگ و بیســت و چــوار ڕۆژان دەهاتە جزیرێ وێرانێ».

ڕۆژێکی سەر لە سبحەینانە،

چوار شێران لە سەربانی قەرەتاژدینی گرتووە دیوانە.

یایەزین گوتی: «بۆچی مەجمیعەی ئەو قاپان هەموو ڕۆژێ ناشــۆن؛ بە پیسی دەچنە دیوانــێ. کاکم هەر شــەڕپەتی». بە قەرەواشــانی گوت: «هەڵی گــرن دەیبەمە حەوزی ماڵە کاکم؛ ئەمن دەیانشــۆم ئەوڕۆ با هەموو شــام و نەهاران وا بچێتە دیوانێ». خێڵەکی بەسەرخۆی کێشا ڕەپێش کەوت.

ئەویش قاپ و مەجمیعەی هەڵگرتم وەدووی کەوت.

چەکۆ دەڵێ:

«عوفۆ! قەرەتاژدین، میرمەم گیانە گیانە!

«ئەو بڵندەی بەڵەک چاو کێیە، دێتە خوارێ بۆ ڕازی کانیانە».

عرفۆ دەڵێ:

«چەکۆ! میرمەم، قەرەتاژدین، ئەزو ببم بە قوربانە!

ئەو خاتوونە ئەو خاتوونەیە، ئەگەر ئەو سێ شێرەی بەتەمانە».

یایەزین ژنخوشکی قەرەتاژدینە. ئەوان لەبەر قەرەتاژدینی شەرمیان کرد دەنگێ بکەن. قەرەتاژدیــن گوتی: «کەلاموڵلایان بۆم بێنــن». قەرەتاژدین کەلاموڵلای خوارد بۆ عرفۆ، چەکۆ، کاکەمەمی گوتی: «هەتا ئەمن زیندووم یایەزین ئێنگۆ هەرســێکانە؛ ئینجا هەرچی خــوڵا داینێ ئی وی بێ». قەرەتاژدین گوتی: «بــڵا کاکەمەم بچێ ڕێی لێ بگرێ، نەکوو بڵێ: برا چکۆڵەم، بە پیاوم نازانن». چەکۆ گوتی: «هەر کەسێک یایەزینی پێ قایل بێ، ئەو برا گەورەمان بێ».

«ئەمە سێ برا هەبوون ئەسپ بۆزە،

هەرسێک ساحبی گورز و کەمەند و ئەسپابی قۆزە.

هەڵستە برۆ یاخوڵا یاری خۆت موبارەک بێ، دوامین پیرۆزە».




عرفۆ دەڵێ:

«ئەمە سێ برا هەبوون ئەسپ ئاڵە،

هەرسێک ساحبی گورز و کەمەند و شیر و مەتاڵە.

لاوە! میرمەم هەڵستە برۆ یاری خۆت موبارەک بێ، دوامین حەلاڵە!»

کاکەمەم هەر ڕاوەستا پووشکەی دە عەرزی دەژنی، دەنگی نەکرد.

قەرەتاژدین دەڵێ:

«میرمەم لە منت کەوێ دەگەڵ ئەوێ سەخوونێ دەگەڵ ئەوێ تانێ!

ڕەبی خولا! ئەو برایانەت لێ نەستێنێ، هەتا خولا دەکا دیوانێ.

هەڵستە، برۆ دەشقەمی پیاو قسێکی لە ماشووقەی خۆی بزانێ».

بە کاکەمەمیان گوت: «هەڵستە برۆ». گوتی: «کوڕە ماڵ خەرانەبوو! نوێژی نیوەڕۆیە بێ، نێوەڕاستی شاری جزیرێ بێ، سێ شێری وەک ئەنگۆ ڕاوەستێ لێرە، ئەمن چلۆن پشتم دەنگۆ دەکەم، دەچم بۆ نوێژی نیوەڕۆیێ، ڕێ چلۆن لە خوشکی میری دەگرم؟ وەڵلاهی! دڵم بتۆقێ ناتوانم بچم». عرفۆ هەڵستا دەگەڵ چەکۆی، قەرەتاژدینی، لە سەربانی چوونە خوارێ؛ ئەسپی خۆیان هێنادەرێ؛ سوێندیان خوارد بە قورعانێ: «ئەگەر یایەزین قسەی دەگەڵ کاکەمەمی یەک بێ، هەرچی لە کووچان، لە سوقاقان قسێکی بکا، فزوولی بکا، سەری دەبڕین».

کێ بوو لە کاکەمەمی گوڵباوە،

کەوڵی قاقمی بە ملی خۆیدا داوە،

گەلێکی خۆش بوون هەنگاوە.

عرفۆ دوعا و ئایەتەلکورسیی دەخوێند دەیکردن تەواوە،

هەتا دەچوو لە ڕازی کانیە لە یایەزینێ دەیکرد سەلام و سەلاوە.

یایەزین عەلێکی وە میرمەمی قەلەندەر نەداوە،

یایەزین دەڵێ:

«لاوە! لاو مەبە و ترۆ

خەڵقی جزیرێ ئەوا لە سەربانان بوون کۆ بە کۆ

ئەگەر حاجەتی ئاوێت هەیە، دەسنوێژی خۆت هەڵگرە برۆ».

میرمەم دەڵێ:

«خولایە چلۆن خانەم بووە وێرانە




هەزار نەحلەت لە بابی خۆم دوامین لە بابی هەموو پیاوانە

ڕێی دوازدە مانگ و بیست و چوار ڕۆژان پادشایەتی یەمەنێ بەجێ بێڵە بە قسەی ژنان هەڵستە وەرە ئێرەکانە؛

ئێســتا دەڵێ: «لاوە! ئەگەر حاجەتی ئاوێت هەیە، دەســنوێژی خۆت هەڵگرە و بڕۆ خەڵق شمر و شەیتانە».

کێ بوو لە میرمەمی گوڵباوە،

کەوڵی بە ســەر شــانی خۆیــدا دەدا، بەعاجزی دەگەڕاوە بــە دواوە. یایەزین گوتی: «خوڵایــە! ئەوە ئەوا هات، قســەی خۆی کرد، ئەمن دڵم شــکاند؛ کەلامی خوڵای ئەوی ناگــرێ، ئەمن دەگــرێ، بەجوانی دەمرم، بە کافری دەمرم. بــڵا بانگی کەم، بگەڕێتەوە، دەشقەم دوو قسانی دەگەڵ بکەم». یایەزین بانگ دێڵێ:

لاوە! هەی لاوە!

ئەگەر حەزرەتی جبرایلی خۆشەویستە، نیدای بۆ خۆشەویستی وی هێناوە،

لاوە ئەتــوو ئەو خوڵایە کە حەزرەتی مووســای لە نووری خلقــەت کردووە، هەوەڵی سبحەینان هەزار و یەک کەلامی لە بارەگای خوڵای دەکا تەواوە؛

لاوە؛ بەشــقی ئەو خوڵایەی، ئەگەر عەزرەتی عیســای ڕوحوڵڵای لــە نووری خلقەت کردووە، مردووی لە قەبرستانان پێ دەژیاوە؛

لاوە هەرچەند مۆمن و مەلایکەتن دەتێنمە تکایە

بۆ خاتری من، ئەو جارەکە بگەڕێوە دواوە!

ئەوجار کاکەمەم بە شانی ڕاستەیدا گەڕاوە،

تەمەنای لە خوڵای دەکرد، لە پێغەمبەری دەپاڕاوە،

هەتا دەچوو لە ڕازی کانیە لە یایەزینێ دەیکرد سەلام و سەڵاوە.

یایەزین دەڵێ:

«ئەلەیکوموسەلام و ڕەحمەتوڵڵاهی، سەر هەرتک چاوی من، میرمەم شۆڕەلاوە،

شــەوێ دی، ئەگــەر ئەو کێچەڵە لە دیوانــێ دەقەوڕی بۆچی لە منــی مل بەکوێنت نەگێڕاوە،

ئەلەیکوموسەلام و ڕەحمەتوڵڵاهی، سەرچاوی منی بابان وێرانێ

ئەتوو شەوێ دی بۆچی ئەمنت لە کاکم قبووڵ نەکرد لە لای دیوانێ؟

ئەگەر خۆت بە پیاو نەدەزانی بۆچی دەبەر ئەمنت دەناسی جزووی قورعانێ؟»




کاکه‌مه‌م ده‌ڵێ:

«یایه‌زین، ئه‌توو گه‌لێک ساحب خاتری

کاکه‌مه‌م نه‌هاتووه فینجانی قاوه‌ی به سه‌ده‌قه‌سه‌ر وه‌رگری

خولا غه‌زه‌بی حه‌وته‌به‌قه‌ی ئاسمانێ ببارێنێ له شانی کابه‌کری

یایه‌زین! ڕۆژم لێ هه‌ڵات گه‌ییه محه‌لی چێشته‌نگاوێ

ڕوومه‌تی یایه‌زینێ گه‌لێک به‌من زه‌ریفترن له شووشه‌ی گوڵاوێ

بریا ئه‌و ده‌ست و جام بام، ئه‌گه‌ر یایه‌زینێ ده‌یاوێتمه‌وه سه‌ر ڕووی ئاوێ

ڕۆژم لێ هه‌ڵات، گه‌یوه‌ته نیوه‌ڕۆیه،

ڕوومه‌تی یایه‌زینێ گه‌لێک زه‌ریفترن له گوڵێ لیمۆیه

بریا ده‌ست و جام بام، ئه‌گه‌ر یایه‌زین به ده‌ستی موباره‌کی ده‌یاوێتمه سه‌ر ڕووی جۆیه

ڕۆژم لێ هه‌ڵات، فه‌سڵی ئێوارێ

ڕوومه‌تی یایه‌زینێ گه‌لێک زه‌ریفترن له ده‌نکی ده‌هه‌نارێ

بریا ئه‌و تاس و ته‌به‌ق بام، ئه‌گه‌ر یایه‌زین به په‌نجه‌ی موباره‌کی ده‌یاویتمه سه‌ر تاته‌شوارێ

ڕۆژم لێ هه‌ڵات گه‌ییه مه‌حه‌لی نوێژی شێوان

ڕوومه‌تی یایه‌زینێ گه‌لێک زه‌ریفترن له گوڵی ده مێوان

بریا ئه‌و ده‌ست و جام بام و ئه‌گه‌ر یایه‌زینێ به‌په‌نجه‌ی موباره‌کی ده‌یاویتمه‌وه سه‌ر قه‌مبه‌ڵی ده لێوان

ڕه‌ببی خولایه! ئه‌توو ڕه‌حمبه‌ری، ده‌گه‌ڵ یایه‌زینێ چیدی نه‌بنێ نێوان

ڕۆژم لێ هه‌ڵات گه‌یوه‌ته‌وه نوێژی خه‌وتنێ

ڕوومه‌تی یایه‌زینێ گه‌لێک زه‌ریفترن که گوڵێ ده سوێسنێ

ڕه‌ببی خولاگیرم بی، ئه‌وێ ڕۆژێ ده‌کا دیوانێ ده‌گه‌ڵ دیوان کردنێ

یایه‌زین! به خولای، ئه‌من ده‌ست له توو هه‌ڵناگرم هه‌تا ڕۆژی مردنێ

یایه‌زین! ئاورم تێ به‌ربوو، جگه‌رم سووتاوه

غه‌ریبی شارانم به‌نگینه‌شم لێ هه‌ڵبڕاوه

شاری یه‌مه‌نێم له چه‌نگان چوو، ئه‌ویشم ده پێناوی توو ناوه

یایه‌زین! ئه‌گه‌ر ئاگات لێم نه‌بێ، زۆر خراپم لێ قه‌وماوه

ئەمن و توو وا لێک نابینین مراد و کاوێ
گەردنی توو گەلێک زەریفترە لە شووشەی گولاوێ
ئەگەر دەتوانی بە دەستی موبارەکت، زمانم شکا بمدەیە چۆڕێک ئاوێ!»
یایەزین دەڵێ:
«ملم بەکوێنەم دڵم بە تازی
«گورگ ئاوڕی میرزیندێنی گەلێک بێ ڕەزاترن لە مووی بەرازی
ئەتوو چلۆن دەتوانی بە نوێژی نیوەڕۆیە لە نێوەڕاســـتی شاری جزیرێ جامی ئاوێ لە من بخوازی؟»
کاکەمەم دەڵێ:
«یایەزین، هێزی جگەرم، چرای چاوانم!
ئێستا ئەمن غەریبی هەموو شارانم
لەوەش بێ تیپ و سپاتر بم، هێشتا میری برای خۆت بە مەیتەر و نۆکەری خۆم نازانم
غەریبەی شاران، لەبەر خاتری توو زۆر بێ مەکانم
هیچ کەس نازانێ یایەزین چەند جوانە
بۆم بەجێ هێشتووە تەخت و مەکانە
هەرچێکی ژنە، پێشکاریان شەیتانە
ئێستا چۆڕێکم ئاو نادانێ؛ دەڵێ خەڵق شەیتانە»
کێ بوو لە یایەزینێ بەڵەک چاوە
دەســـتی دەدا جامی ئاوێ، بازنەی لە دەستی خۆی دەرهێنا، ئەنگوستیلەی لە قامکی خۆی ڕاکێشاوە
گوارەی لە گوێی خۆی دەرهێنا، دەرزی لە بەرۆکی هەڵکێشاوە، دە جامی ئاوێی ناوە
جامی لە سەرینچاوەی کانیە، هەڵدێنجا، بە دەس کاکەمەمی داوە
کاکـــە مەم ئاوەکەی خواردەوە، بازن و ئەنگوســـتیلە و کرمەک و هەمووی دە باغەڵی خۆی ناوە
جامی بەدەس یایەزینێدا. یایەزین دەڵێ: «ئێنجا میرمەم دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا»
کاکەمەم دەڵێ:
«لەخۆم غەریب و خانەوێرانێ
ئێستا غەریبی شارانم کەس قەدرم نازانێ

یایەزین! بە زاتی خولاّی بە حەقی قورعانێ
ئەمن لێرە ناڕۆم هەتا دەگەڵم دانەنێی جێ ژوانێ».
یایەزین دەڵێ:
«سەری بەتاڵم، بابانی وێرانم!
چل قەرەواشم هەیە هیچ کەسێکیان بە هۆمێد نازانم
ج جێیان شک نابەم، نییە متمانم
بۆیە وا خەجاڵەت و سەرەوێرانم».
میرمەم دەڵێ:
«ئەمن غەریبم بەجێیەکی چاک دەزانم.
ئاورم تێ بەربوو، چۆقەم دەکەوتێ:
مەحەلی چێشتانی سوڵتانی ژوانمان میعراجی مزگەوتێ».
یایەزین دەڵێ:
«خولاّیە! چلۆن ڕووم ڕەشە، بابانم وێرانە!
مزگەوتی کاکی من لە لایەکی دیوان گیراوە؛ لێی ڕۆنیشـــتوون وەکیل و وەزیری کەوڵ بەشانە.
لە تەرەفی دیکەی لێی ڕۆنیشتوون سۆفیی بەرماڵ لە ملانە.
ئەوا لە میعراجی مزگەوتێ مەلا مەسەلەی دەخوێنێ لە بەحسی دنیا و قیامەتانە
لە پێشخانان نۆکەر و قەننەداری بەردەستانە
ئەگــەر مزگەوتی کاکی من چــۆڵ و ئەحەدولقەندەهار دەبێ، بــە کوڵێنچکانی بەجێ دەمێنن دوازدە کوێری حافزولقورعانە.
لەلایەکی تەکیەیە، لە تەرەفی دیکەیان خانەقاڕۆنانە
ئەوەە بۆ موسڵمانان چاکە، تێدا بێنن شادەوئیمانە
یاڕەبی بە کاری توو سەد جار شوکرانە»
کێ بوو لە کاکەمەم و یایەزینی گوڵباوە
قەول و قەراریان دەبوو تەواوە
ئەوا ڕۆژ لە نیوەڕۆیە وەرگەراوە
میرمەم دەڵێ:
«توخولاّ! مەڕۆ لەکن ئەمنی هەژاری




بەنگینە لەکنت نەماوە بە خەمخواری

چ بکەم، کێی دەڵێی بنێرمە کنت بە خزمەتکاری؟»

کاکەمەم دەڵێ:

«یایەزینێ چاو جوانێ!

ڕۆحی خۆمت قوربان دەکەم دەگەڵ سەرتاپای ئێمانێ.

ئەو قسانە پێکەوە دەکەین ئینشاڵڵا سبحەیانێ».

کێ بوو لە میرمەمی گوڵباوە،

دەیگوت: «یایەزین، عەمرم! دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا»

یایەزین دەڵێ:

«چ بکەم ئەمنی قەلەندەری

میرمەم، هەڕۆ بڕۆ، بەخولات بەئامان دەدەم، بەزامن بەپێغەمبەری».

کێ بوو لە میرمەمی گوڵباوە،

بۆ خزمەت عرفۆ و چەکۆ و قەرەتاژدینی گەڕاوە

دەچوو لە هەرسێک برایان دەیکرد سەلام و سەلاوە.

چەکۆ دەڵێ:

«ئەتوو بزانە لە کاری خولای ئاسمانێ

میرمەم بەخێرێیەوە لە سەفا و لە سەیرانێ

ئەو یایەزینی ئەمن تێ بەڵەدم، ساحب ئیعلایە؛ هیچ کەس مەتڵەبێی لێ نازانێ».

میرمەم دەڵی:

«قەرەتاژدین! لێم مەدە بە شیران، مەمکوژە بە توانجان

مەرد ئەو مەردە نییە بچێتە ڕێی کچی دە کرمانجان

مەرد ئەو مەردەیە لە کێژی دە میران وەرگێڕی بازن و باجان».

عرفۆ دەڵێ:

«یارەبی، بەخێرێیەوە، لاوە

ئەو یایەزینی بەڵەک چاوە

لەکنم قسەی دەگەڵ هیچ کەسی نابێ تەواوە».

کاکەمەم دەڵێ:

«عرفۆ! مەمکوژە بە شیران

مەرد ئەو مەردە نییە بچێتە ڕێگای کچی دە وان فەقیران
مەرد ئەو مەردەیە بازن و گواران بستێنێ لە کیژی دە میران».
کێ بوو لە میرمەمی بەڵەک چاوە
لە عرفۆ و چەکۆ و قەرەتاژدینێ دەیکرد سەڵاوە
بازن و گوارەی لە باغەڵی خۆی دەرهێنا، لە پێش ئەوانی ڕۆناوە.
دەیگوت: هەر کەسێکی ئەوەی هەڵگری، کاکەمەم نۆکەرە لە پێش دەستی ڕاوەستاوە.
قەرەتاژدین دەڵێ:
«یاخوڵا میرمەم نەمری!
خوڵاوەندی میری مەزن دەستت لە عەمری بگری!
ئەوە هەر قابیل بە تۆیە هەڵی بگری
ئەتوو گەورەی هەموانی؛ دەبێ هەرکەسە کەوشی توو لەسەر چاوی خۆی ڕابگری»
عرفۆ دەڵێ:
میرمەم، گیانە! ئەمنت دەبمە نۆکەر لەبەردەستانە».
چەکۆ دەڵێ:
«میرمەم! بە برا گەورەییی توو سەد جار شوکرانە»
ئینجا میرزێندین بە نۆکەرانی گوت: «بڕۆن کاکەمەمی بێننە ئێرەکانە».
نۆکەری میری دەهاتن بە لینگدانە
دەڵێ: «سەلاموعەلەیکوم میرمەم؛ میر فەرمووی تەشریفی موبارەکت بێتە ئێرەکانە».
ئەگەر میرمەم وا دەزانێ
عرفۆ و چەکۆ و قەرەتاژدین هەڵدەگرێ، دەچێ بۆ دیوانێ.
کێ بوو لە میرمەمی گوڵباوە
دەگەییە دیوانێ، لە میری دەکرد سەلام و سەڵاوە
دەڵێ: « عەلەیکوم ئەسەلام و ڕەحمەتوڵڵاهی بەخێرێی، شۆڕە لاوە!»
میر دەڵێ:
«کاکەمەم نەکەین گوفتارێ،
بڵا تەختە نەردینێ بێنین ڕۆبنیشین لە قومارێ».
ڕۆدەنیشتن دوو بە دوو میرمەمی نەوجوانە
بۆ وەعدەی پێنج سەعاتی لێکیان دەدا شان بە شانە




کاکەمەم زۆری لە میری بردەوە، کردی سەری وێرانە.

گوتــی: «بڵا جێیان بگۆڕینەوە». گوتی: «بەڵێ، قوربــان». بەکر تەگبیری کردبوو جێیــان بگۆڕنەوە؛ کاکەمەمیان لەوێ هەڵســتان، چووە جێی میــری. میریان هێنا جێی کاکەمەمی. دیســان قوماریان کرد. میر باشاری کاکەمەمی نەکرد. میرگوتی: «بڵا قاوێکی بخۆینــەوە». بەکــر بەدزی بە میری گوت: « بڵا یایەزین بــێ، قاوەی بگێڕێ». یایەزین قــاوەی هێنا، گوتی: «هانێ بەنگینە بیاندەیە». میر گوتــی: «یایەزین! بۆخۆت قاوەی بدە». بەکر بە میری بەدزی گوتی: «بەندێکی بانگی کاکەمەمی کە». میر دەڵێ:

«کاکەمەم، بەو خوڵایەی کەم بێ نسرینە،

پادشایەکی بێ شەریکە، هیچ سەریکی لە بۆ نینە

لەکن ئەمن وایە ئەوەتی لە دایک و بابی خۆت بووی هیچ دۆستی بەدڵت نینە».

میرمەم دەڵێ:

«میرمەم دەغیلت بم، ئەمن دەبژێرم شوکرانێ

دۆستی من یەکێکە وەک عۆرییەکانی لە ئاسمانێ

میر دەڵێ:

«یاری تۆم گوێ قوتن وەک گوێ دە مشکان؛

«ئای دۆستی توو سەری هەڵنایە لەبەر ئەسپێ و ڕشکان».

میرمەم دەڵێ:

«میران! بەقوربانت بم، لێم مەگرە بەهانێ

دۆستی من یەکێکە وەک عۆرییەکانی لە ئاسمانێ

دۆستی من ئەوەیە، بووە بە ساقی قاوەی دەگێڕێ لە دیوانێ».

میر دەڵێ:

«میرمەم بەقام بە قسەی توو هیچ نییە

ئەوەتی لە بابت بووی، هیچ دۆستت نییە».

میرمەم دەڵێ:

لە خۆم غەریب و بێکەس و خانەوێرانێ

چونکە میوانم، پێم دەکەن بوختانێ

ئەمن دەڵێم: دۆستم هەیە؛ چونکە غەریبم کەس پێم ناکا متمانێ

ئــەوا قەرەتاژدین و عرفۆ و چەکۆ دەزانن، دۆســتی من ئەوەیــە، قاوەی دەگێڕێ لە

دیوانیٚ».

قەرەتاژدین بە میری گوت: «ئەتوو ئەو قەحبە هێناوتە کردووتە ســاقی لە دیوانی؟»
پیلی کاکەمەمی گرت، بردیەوە بۆ ماڵیٚ.

یایەزین قاقەزێکی بۆ کاکەمەمیٚ نووسی:

وەرە، تەمەنایە بکەین لە خولاّی، لە ساحبی عەرز و ئاسمانیٚ، «کاکی من ئاشقەڕاوە، هەڵکاتە شەماڵی، لێی دا لە گۆپاڵ بارانیٚ.

سبحەینیٚ کاکم دەچێتە ڕاوی ئاهوویێ لە دەشتی گەرمیانیٚ.

کاکە مەم نەخۆشێک بیٚ هیچ کەس بە دەردی نەزانیٚ.

سبحەینیٚ چێشتانی، سوڵتانی ژوان و پەیمانمان بکەیتە لای دیوانیٚ.

ئینجا تەمەنایان دەکرد لە خولاّی. حەدی ماڵ نووســتنان هەڵی دەکردە بە شــەماڵی، لێــی دەدا لە گۆپاڵ بارانیٚ. میر دەنێرێتە کن کاکەمەمی، دەڵیٚ: «هیچ پادشــایان ڕاوی ئاهوویان نییە سبحەینیٚ».

کاکەمەم دەڵیٚ: «عەرزی میری بکەن بەبیٚ فکری،

«نەخۆشێکی هێن گرانم، بەخولاّی، زین وەخۆم ناگری».

ئەگەر خەبەریان بۆ میری دەبردەوە تەواوە

دەیانگوت: «میر، قوربان! کاکەمەم، نەخۆشە؛ نەخۆشێکی ناتەواوە».

بەنگینە دەڵیٚ:

«خانەم خرابوو، بزانە ئاغای من بەبیٚ کەسی چیی لیٚ قەوماوە»

میردەڵیٚ:

بەنگین مەگریە، بەبیٚ کاکەمەمی لێم حەرام بیٚ ئەو ڕاوە

بەنگین، هەڵستە، برۆ، ڕامەمێنە

دەغیڵت بم، ڕاوی سبحەینیٚ خۆشە، خەبەرێکی میرمرمم لە بۆ بێنە

ئەگەر دەچییە ئەویٚ، خەبەرێکی لەویٚ وەردەگری

دەبیٚ بە خاتوون ئەستی خوشکم، بڵێی، تەدارکێکی لە بۆ میرمەمی بگری

ئینشاڵڵا ئەرەسوو و لوقمان دێنمە سەریٚ، نایەڵم میرمەم بە چ دەردان بمری».

کیٚ بوو لە بەنگینی گوڵباوە

دەهات بە گریان و بە هەشتاوە

هەتا دەگەییە میرمەمی، دەیگوت: «قوربانت بم کوێت ئیشاوە؟»

دەیگوت: «بەنگینە! مەترسە؛ ژوانم دەگەڵ یایەزینێ ڕۆناوە».
دڵم دەڵێی کوورەی وەستایانە، گەلێک لە جۆشە.
ئەگەر دەچییە کن میرزێندینی بڵێ: میرمەم دەردی گرانە، گەلێک نەخۆشە».
ئەگەر بەنگین وەدەردەکەوت، ئەو خەبەرەی بۆ ئاغای خۆی دەبردەوە لە دیوانێ
دەڵێ: «میرمەم نەخۆشە، کەس بە دەوا و دەردی نازانێ».
میرزێندین دەڵێ:
«چ بکەم، لێم تێک چوو، بەبێ میرمەمی ناچمە ئەو ڕاوەی سبحەینێ».
میر دەڵێ:
«بەنگینە ئازیزم، بەنگینێکی شیرینێ!
«ئەسپان بێنەدەرێ، سوارین، بچینە کن کاکەمەمی ماڵە قەرەتاژدینێ».
بەکر ئاغا دەڵێ:
«ئەتوو بۆ وا میرێکی بەستەزمانی؟
جارێ بەو شەوەی لە ماڵە قەرەتاژدینی هەڵمەستێنە ماڵ و خێزانی
دەمێکی دی سوار دەبین، سەعاتێکی ماوە لە بۆ بەری بەیانی».
میر دەڵێ:
«هۆی بەنگینە؛
دە بڵا تەدارەکی بگرن، ئەسپی من بکەنەوە زینە
ئینشاڵڵا بە سەلامەتی کاکەمەمی بۆ ماڵە قەرەتاژدینی بچینە».
کێ بوو لە بەنگینی موحتەبەرە،
ئەسپی میرزێندینی زینی لێ دەکرد، دەیکێشا تەنگ و بەرە،
تاجی و تووڵەیان بانگ دەکرد ئەوبەر ئەوبەرە،
میردەهات؛ پێی دە ڕکێفێ دەنا. لە زینی مورەسەعی دەکەوتە سەرە؛ دەیگوت:
بەنگینە! بەسەری من، دەپێشدا برۆ خەبەرێکی من بۆ کاکەمەمی بەرە».
کێ بوو لە میری گوڵباوە،
دەی ئاژوا بە پەلە و بە هەنگاوە،
دەهات، لە ماڵە قەرەتاژدینی دەبوو پیاوە،
دەیگوت: «کاکە! هیچ خۆت نەخۆش مەکە، وەگیر هیچ پادشایان ناکەوێ ئەو ڕەشەڕاوە»

میران ئەتوو گەلێک بێ فکری.
هەرچەن دەکەم، میرمەم خۆی لەسەر ئەسپی ڕاناگری.
میرا! پەکی خۆت مەخە؛ خراپم لێ قەوماوە.
ئەمن گەلێکم پێ لە توو خۆشترە ئەو ڕاوە،
ئەمما نەخۆشیێکی بێ ئیختیارم، جگەرم بڕاوە».
میر دەڵێ:
«کاکەمەم، لە خۆم نەبینم مراد و کاوێ
حوکمە دەبێ دەگەڵ خۆم بتبەمە ڕاوێ؟»
کێ بوو لە میری موحتەبەرە،
دەیگوت: «بەنگینە بڕۆ ئەسپی کاکەمەمی بێنەدەرە؛
عرفۆ و چەکۆیانم بۆ بکە خەبەرە».
بەنگین دەچوو، ئەسپی کاکەمەمی دەهێنا دەرە
خاتوون ئەستی دەڵێ:
«بەنگینە! تەنگانی شل بکێشە ئەوبەر ئەوبەرە»
ئەگەر بەنگین ئەسپی میرمەمی دەهێنا، پێی دەرکێفێ دەنا، بکەوێتە سەرە
هەرچی کردی، هێزی نەبوو قەلەندەرە
خاتوون ئەستی دەڵێ:
«براله! بە کاکەمەمی ناکرێ ئەو سەفەرە».
میرزێندین دەڵێ:
«خوشکێ لێم مەگۆڕە، لێی نابینم کاوێ؛
ئەگەر بە کۆڵێم بردبێ، کاکەمەمی دەبەمە ڕاوێ».
کاکەمەم دەلەرزی، ئەگەر لە باڵەخانەی وەدەرکەوت،
پێی دەرکێفێ نا نەچووە سەرێ، زینی ئەسپەکەی دەبەر زگی کەوت.
میر گوتی:
«تەنگەی ئەو ئەســـپەی بۆ وا شلە؟ تەنگەیان توند کێشا کاکەمەمیان سوارکرد.چەند کردی؛ خۆی ڕانەگرت.
میرگوتی: «دایبەزێننەوە؛ زۆر نەخۆشـــە. ڕاوی ئەوڕۆ حەیفە کاکەمەم دەگەڵ نەبوو؛ بچۆ، بەکر ئاغا پێی بڵێن سواربێ».

بەکر گوتی: «ئەسپەکەم شەلە؛ میر تەشریفی بروا؛ وڵاخێکی پەیدا دەکەم و دەیگەمێ».
بەکر نەچوو بۆ ڕاوێ، قاســیدێکی ناردە سەر کاکەمەمی. کاکەمەم هەتا چێشتانێ دانیشت لە پاشــان سەبر ســەبر ڕۆی بۆ دیوانی میری. گەیییە دیوانێ، دانیشت. یایەزین هەڵستا، هاتە خزمەت کاکەمەمی

کێ بوو لە مەم و زینی بەڵەک چاوە

یایەزین دەهات، لە کاکەمەمی دەکرد سەلام و سەڵاوە

دەیگوت: «عەلەیکوم ئەســەلام و ڕەحمەتوڵڵاهی، ســەرچاوی مــن، خاتوونێ، کێل گەردنێی بەڵەک چاوە»

دەستیا دەستۆی یەک دەکرد، دەمیان بە دمی[1] یەکەوە ناوە.

بەکر ئاگای لێ بوو کاکەمەم هاتە دیوانێ

قاسیدی لەسەر دادەنا لە بۆ کێشک کێشانێ

کێشکی چاکیان لێ کێشاوە

هەردووک خەویان لێ دەکەوت، ئەو جووتە لاوە

میر ڕاوی دەکرد هەتا ڕۆژ وەرگەڕاوە

بانگی دەکرد:

«حەیفە، چەکۆ، کاکەمەم دەگەڵ نەبوو، پێم خۆش نەبوو ئەو ڕاوە».

ڕوویــان دە ماڵێ کردەوە. قەرەتاژدین گوتی: «ئەمن دەزانم کاکەمەم دەگەڵ یایەزینێ دە دیوانــێ خەوی لێ کەوتووە؛ ئەگەر هەڵی نەســتێنێ، وەخەبــەر نایە». بانگی کرد: «بەنگینە! وەرە تا پێت بڵێم. وەرە، ئەتوو هەڵێ؛ ئەمن ڕێت دەکەوم؛ دوور دارێکت پێدا دەدەم، مەگەڕێوە ســەر دارەکەی، هەر برۆ هەتا ماڵــێ. دابەزە، مەم و زینیان لە خەوێ هەڵستێنە». ئەگەر میر گوتی: «ئەوە لە داری ترسا، وا نەگەڕاوە بۆ دوایە». قەرەتاژدین دەڵێ: «ئەمن دەڵێم، میر، ئەوە نەترســا؛ ئەوە دەچێ، دادەبەزێ، دێ لە دەرکی دیوانێ بۆخۆی جڵــەوی ئاغای خۆی دەگــرێ». میر گوتی: «ئەوە شــوێنێکی چاکە». ئەگەر بەنگینە هاتەوە، تەماشــای کرد مەم و زین خەویــان لێ کەوتووە، هیچ ئاگایان لە دنیایە نەبوو. گوتی: «ئەگەر هەڵیان دەســتێنم، گوناهم دەگاتێ؛ ئەگەر هەڵیان ناستێنم ئێستا میر دەگاتە جێ، پێ دەزانێ، سەرمان دەبڕن».

بەنگین ڕوانی: ئەوا میر هات. بەنگین دەڵێ:

---

١ ـ دم: دەم.

«های میرمەم! لە خۆم غەریب و هەژاری
ئاورێکم دە بەدەنێ بەربوو دایگرتم بەیەکجاری
کاکەمەم، لەو خەوەی هەڵســتە، کەڵێکی وەک میری هات و گەییە قەراخ شاری وای،
لە خۆم غەریبێ و یەخسیرێ
میرمەم، لەو خەوەی هەڵستە غەریبی خۆت وەبیرێ؛
کەڵێکی وەکو میرزێندینی هات و گەییە دەروازەی جزیرێ».
کاکەمەم لە خەوێ هەڵستا گوتی: «بەنگینە ئەوە چییە؟»
گوتی ماڵ خەرانەبوو! ئەوە میر گەییە جێ؛ ئەتوو بۆ هەڵناستی، لە دیوانێ بڕۆیەوە؟»
گوتی: «بەنگینە! تەماشاکە، بزانە دوورە یا نیزیکە». بەنگینە چووە سەربانی، تەماشای دەکرد، کەمی مابوو، بگاتە قەراخی شــاری. ئەگەر هات تەماشای کرد، مەم و زین دیسان خەویان لێ کەوتبۆوە.
بەنگین دەڵێ:
«لە خۆم غەریبێ، جگەرسووتاوێ
ئەی ئاغاکەی من لە خۆی نابینێ چ مراد و کاوێ
های لاوە، میرمەم! لەو شیرن خەوەی؛ هەڵستە کەڵێکی وەکو میری هاتەوە لە ڕاوێ
کوێنی سیامالآنم دەبەرکەن بەیەکجاری
میرمەم لەو خەوەی هەڵستە؛ کەڵێکی وەکو میری هات و گەییە دەروازەی شاری
میرمەم لەخۆم غەریب و ماڵ وێرانێ
کەڵێکی وەکو میری هات گەییە دەرکی دیوانێ».
میر جڵەوی هەڵەنگاوت. ڕاوەستا؛ گوتی: «بەنگینە. داخوڵا کاکەمەم چلۆنە؟» گوتی: «نازانم هاتوومەوە، لێرە ڕاوەستام». دەو دەمیدا بەکرئاغا هات و گەییە خزمەت میری.
بەکر ئاغای گوتــی: «ئاغا! بەخێرێیەوە؛ ڕاوت موبارەک بێ». میرگوتی: «بڵا، بچین سەرێکی کاکەمەمی بدەین». بەکر دەیزانێ دەگەڵ یایەزینێ دە وەتاغێ دان. بەکر گوتی: «قوربــان! دابەزە. پیــاوی دەنێرم، بزانێ کاکەمەم چلۆنە». میر دابەزی. ئەســپیان لێ وەرگرت، چووە ماڵێ. بەنگینە هاتەوە، بانگی کاکەمەمی دەکا دەڵێ:
«دووان ئاشق هەبوون لەمێژە
هەردووک لەبەر خۆی خەوێ ببوون هۆڕ و گێژە
هەی ئاغا! بە قوربانت بم. لەو شیرین خەوەی هەڵستە، دۆڕاندووتن هەموو نوێژە».




میــر ئەگەر هاتەوە، چووە دیوانێ. کاکەمەم چــاری نەبوو، پایەزینی دەبن کەوڵێ نا. پاڵی وە کوڵینچکی وەتاغێدا. عرفۆ، چەکۆ، قەرەتاژدین، بەکرئاغا هەموو هات دانیشــت. میــر گوتی: «ها کاکەمەم چلۆنی؟» گوتی: «قوربان! خولا بکا، ڕاوی توو موبارەک بێ! ئەمن چاکم». گوتی: «کاکەمەم! ڕاوی ئەوڕۆ چ پادشــایان نەیانبوو؛ حەیفە ئەتوو دەگەڵ نەبووی». پایەزین دە گوێ کەوڵیدا کەزی خۆی بە قەرەتاژدینی نیشــان دا. قەرەتاژدین ئەگــەر وایزانی، نۆکەری بانگ کــرد، گوتی: «بڕۆ، حەوت دەرکم هەیە؛ پووشــی تێنێ، ئاوەری بدە؛ بلا ماڵە من بسووتێ».

ئاوڕێک هەڵستا لە سەری دنێ
یەکی دی هەڵستا لەو سەری دنێ
های ماڵە قەرەتاژدینی هەمووی سووتا بە سووتنێ
بەنگین دەڵێ:
«میر، ئاورێک دە ماڵە قەرەتاژدینی بەربوو. چ ئاورێکی بێ ئامانە!
ئەگەر هەڵنەستی، ئێستا شاری جزیرێ دەسووتێ
دەبێ وێرانە
میر ئەتوو میرێکی بێ فکری
ئەوە شەماڵ هات، ئاوری دێنێ بە سەر خانووبەرەی تودا، ڕادەبری
ئەگەر هەڵنەستی، ئێستا کۆشک و تالاری تۆش ئاوری دەگری».
میرزێندین دەڵێ:
«مەخلووقی جزیرێ، وەکیل و وەزیر، بڕۆن، دامەمێنن
هەڕاکەن، ئەو ئاورەی لە ماڵە قەرەتاژدینی وەکوژێنن»
بەنگینە دەڵێ:
«وای لە خۆم بێ سەلایە!
میرا ئەگەر بۆخۆت هەڵنەستی، ئەوە ئاورە هێن بە حوکمە، چارەی نایە».
ئەگەر میر وا دەزانێ
شەقڕن کەوتە دیوانێ
میر وەدەرکەوت بە یەقینێ
ڕووی کردە ماڵە قەرەتاژدینێ
ئەگەر میر ڕۆی بە هەنگاوە

دەرک و پەنجەرەی بۆ کراوە
بەکرئاغا خۆی دەگێڕاوە
کاکەمەم لەوێ هەڵستاوە
دەگەڵ یایەزینێی بەڵەک چاوە
گوتی: «یایەزین! لەبەر بەکرشەیتانی لێکمان نەدی مراد و کاوە»
مەم و زین هاتنە پێشخانێ
دەستیان کرد بە گریانێ
کاری بەکریە، خولا دەزانێ!
میرمەم دەڵێ:
یایەزین! چلۆن چاوان بە قەرەتاژدینی هەڵێنم،
مەگەر ئێلچییان بنێرم،
گەنج و خەزێنەی یەمەنێی بۆ بێنم».
ئەگەر لەوێ ئەو قسە بوو تەواوە.
یایەزین دەڵێ:
«کاکەمەم کارێکی زۆر گەورە لەمە قەوماوە».
دەیگوت: «یایەزین! دەست دەستۆی کەم، دوو ماچان لە کوڵمان بکەم تەواوە».
ئەگەر دەمی ڕە کوڵمەی یایەزینێ کەوت،
دەسترەی دەستانی بەربۆوە؛ ئەوی لەوێ کەوت.
بەکر هەڕا دەکا، رانامێنێ،
دەسترەی یایەزینێ پڕ دەداتێ دەیرفێنێ.
کاکەمەم دەڵێ:
«چ بکەم لە جەباری
بلا، بەکرە مەرگەوەری بکوژم بەیەکجاری؟»
یایەزین دەڵێ:
«لە خۆم بێ سەلایە
چ بکەم، ئەورۆ کارەکە بەدە، کوشتنی بەکری بۆم پێک نایە».
میرمەم بۆ ماڵە قەرەتاژدینی چوو؛ یایەزینیش بۆ ماڵێ گەڕاوە.
کاکەمەم دەچوو لە میری و قەرەتاژدینی دەکرد سەلاوە.




ماڵە قەرەتاژدینی ئاوری گرت، مەخلووقی جزیرێی هەموو بەسەردا ڕژاوە.
قەرەتاژدینی لوڕی
بە زمانی ئارەبان دە ژنێی خوڕی:
دور، گوێترا! لانکی کوڕی[1].
خاتوون ئەستی دەڵێ:
«نە ئەو ماڵەم دەوێ نە ئەو حاڵە
نە ئەو منداڵەم دەوێ نە ئەو تفاڵە
بەو شەرتی لە دنیایە سەلامەت بێ گەردنی زەرد و ڕووی پڕ لە خاڵە».
ئینجـا میر دانیشــت؛ ئاورەکە کوژاوە؛ ماڵە قەرەتاژدینی هەموو ســووتا. میر گوتی: «وەرن، باربووی ماڵە قەرەتاژدینی بکەین».

میر گوتی: «وەتاغێکم بە هەموو شتێکەوە دایە بە قەرەتاژدینی. بەکر ئاغا؛ ئەتوو چی دەدەیــێ؟» بەکر ئاغا گوتــی: «قوربان! ئەمن چ نادەم». گوتی: «بەکر ئاغا! بۆچی؟» گوتی: «قوربان کەســێک ماڵە خۆی بە دەستی خۆی بسووتێنێ، ئەمن ماڵە خۆم بۆچی بدەمێ؟» میرگوتی: «ئەمن تێ ناگەم؛ ئەو قســە چییە؟» دەستی دا دەسترەی، گوتی: «قوربــان! ئەوە لە دیوانێ بوون، ئەگەر ئەتوو لــە ڕاوێ هاتیەوە، کاکەمەم یایەزینی وە بــن کەوڵی دابوو، قەرەتاژدیــن پێی زانی، ناردی ماڵە خۆی ئاور تێ بەردا؛ ســووتاندی هەتا یایەزین و کاکەمەم خەلاس بێ. ئەگەر بەقام پێ ناکەی، ئەوە دەســترەی یایەزین و کاکەمەمییە، لە دیوانێ لێم ئەســتاندن، نەکو بڵێ: «بەکر شەیتانە، ئابڕووی خوشکی من دەبــا»، جــا ئەمن بۆ ماڵە خۆم دەدەم بە پیاوی وا؛ قەت بــووە، نۆکەر بە ئاغای خۆی غەیان ببێ. میر گوتی: «بەکر ئاغا! ئەتوو ڕاست دەکەی، مەسڵەحەت چییە؟ کاکەمەمی چلۆن ببەتلێنین، قەرەتاژدین، عرفۆ، چەکۆ پێ نەزانن؟ گوتی: «قوربان کارێکی وا بکەین، بەنگین نەزانێ». هەڵســتان چوونەوە ماڵێ. بەکر گوتــی: «قوربان وڵاتێکمان هەیە قەد خەرجمان ناداتێ؛ بڵا زیندانێکی هەڵکەنین بۆ کاکەمەمی، هیچ کەس نەزانێ». بە مانگێکی زیندانیــان تەمام کرد. بەکــر گوتی: «بنێرە، عرفۆ و چەکــۆ و قەرەتاژدین و بەنگینە و میرمەم بێنە ئێرە؛ مەسڵەحەتێ بکەین». ناردیان هەموو هاتن.

میــر گوتی: « کوڕینــە! ئەمە چ بکەیــن؛ وڵاتێکم هەیە ئیتاعەتێــم ناکەن، خەرجم نادەنــێ». گوتیان: «قوربــان! چ دەفەرمووی وا دەکەین». میر گوتی: «مەســڵەحەتە

---

١ ـ ئەو دێڕە لە پەراوێزی پێشەکی ئەم کتێبەدا ڕوون کراوەتەوە.

ئەنگــۆ بچن، کاکەمەمی بۆ من بەجێ بێڵن. بەتەنێ ئەمن عاجز دەبم». گوتیان: «بەڵێ؛ تەدارەکمان بۆ بگرە؛ لەشکرمان بۆ وەدەرخە. یان سەری خۆمان دادەنێین یان بەجارێکی ماڵ و تالانت بۆ دێنین».

دەنگی لەشکریان دا لە شاری جزیرێ
سوار سوار دەبن، قۆشەن ڕاستەی لێ دەگیرێ
میر هات و ڕۆنیشت لە دیوانێ
دەڵێ: «بێنن، قەتارێ بار کەن لە گەنج خانێ
بچن ئەو وڵاتەم بۆ بەرحەق بکەن، جا دێنم شادوئیمانێ».
دەستی دەکرد لە عرفۆ و چەکۆ و بەنگینەی بە خەڵات بەخشانێ
دووبارە هەموو ئەنعامی دانێ
قەرەتاژدین، بانگیان کردە دیوانێ
خەڵاتێکی زۆر گەورەیان کرد، هەموو کەس بزانێ
ئینجا مەرەخەست کران دەبێ بڕۆن سبحەینێ.
هەڵستان بەبێ فکری،
هەرکەس دەچێتەوە مەنزڵی خۆی دەگری
ئەگەر ئەوێ شەوێ بوو تەواوە
سبحەینێ بەیانی داوە
شەیپووریان کێشا، ئالا هەڵکراوە
میر بۆخۆی هەڵستا بۆخۆی هاتە ئەو ناوە
لەشکریان بەڕێ کرد، لەشکرێکی عەزیمە، تەواوە.
عرفۆ و چەکۆ و قەرەتاژدین و بەنگینە ئەمانەتی میرمەمی زۆریان دەداوە؛
میرمەم و کاکەمەم و بەکرئاغا گەڕانەوە بە دواوە.
میر بەدزی بە بەکری دەگوت:
«ئەگەر یایەزین بزانێ، کارمان ناتەواوە
دەبێ بڵێین، کاکەمەم سەرکردەی لەشکری بوو، ڕۆی بەو لاوە».
لە پاشان میرزێندین و بەکر کاکەمەمیان خستە زیندانێ
بەکر و میر پێکەوە چوونە دیوانێ.
تاژییەکی کاکەمەمی بوو؛ ئەگەر زانی کاکەمەمیان دە زیندانێ هاویشـــت، چووە دەرکی




یایەزینێ. یایەزین دەڵێ:

«قەرەواش و کەنیزی من، ئەنگۆ گەلێک دلێرن

کاکەمەم چۆتە لەشکری، ئەو تووتکە تاژییەی گەڕاوەتەوە زۆر چاکی نیگا بدێرن».

هەمـــوو ڕۆژێ نانیـــان دەدا بە تووتکە تاژییەکەی، قەپی پێـــدا دەکرد هەڵی دەگرت، دەیبرد بۆ کاکەمەمی دە زیندانێی داویشت. هەتا چل شەوی هەر وابوو. ڕۆژێکی مزگێنیان هێنا، لەشکر هاتەوە. یایەزین گوتی: «ئەو لەشکر هاتەوە، ئەو تووتکە تاژییە بۆ وا لاواز بـــووە؛ جا ئەمن چ بکەم لە خەجاڵەتی کاکەمەمی» گوتی: بێنن، لەکن ئەمن نانی بدەبێ، بزانـــن ئەو تووتکە تێرو نەکـــردووە، وا لاوازە. نانیان ئاوێتە بەرێ، قەپی پێدا کرد، هەڵی گرت و بردی. یایەزین بۆخۆی وەدووی کەوت. گوتی: «کچێ، بۆ کوێی دەبا ئەو نانەی؟» گوتیان: «قوربان! هەموو ڕۆژێ نانی دەدینێ، دەیبا، دەڕوا». تووتک گەیییە سەر زیندانێ بـــۆی بەرداوە. ئەگەر یایەزین چوو، تەماشـــای کرد، پێی زانی، ئـــەوە زیندانە، کاکەمەم دەوێدایە. یایەزین دەگری؛ دەڵێ:

«ڕووسیا بووم، بابانم وێرانە

ئەمن لەکنم وابوو، ئەتوو سەرکردەی لەشکری، چووی بەرحەق بکەی ئەو عێلانە».

میر مەم دەڵێ:

«یایەزین، گیانە!

چل شەوە، بە قسەی بەکری جێگام زیندانە،

شام و نەهارم بووە بە جەمی سەگانە».

یایەزین دەڵێ:

«هەی لە خۆم ڕووڕەش و بابان وێرانێ

تاقە کوڕەی براهیم پادشـــای یەمەنێ بێتە شاری جزیرێ بە قسەی منی سەر بەتاڵ و بێ خودانێ».

میرمەم دەڵێ:

«ئەی خوڵا، بە ڕەحمەتی تۆم شوکرانە

ئەمن نەمزانی لە شاری جزیرێ بەکر وا شەیتانە

لە خۆم خانەخەراپ و ماڵ وێرانێ،

هیچ جوابی دیم نییە بەغەیرەز شوکرانێ

زوڵفی خۆت بکە تەناف، بزانە دەرم نایەنی لە زیندانێ.

سەری من ئەگەر دەرتهێنام، لەسەر کۆشی خۆتی دانێ
جا ئەودەمێ شوکرانەبژێرم، ئەگەر پێمەردی خولام بێنەسەرێ بۆ گیان کێشانێ».
یایەزین دەڵی:
«ئەگەر براهیم پادشای یەمەنێ بزانێ
دێ، شـــاری جزیرێ وێران دەکا، لەســـەر کوڕی خۆی لە حەولاد و تایفەی من دەبڕێ ڕێ گوزەرانێ».
ئینجا مەلەک ڕیحان هاتووە لەولاوە،
سەرتاپا خوار خۆی دە قوڕێ هەڵکێشاوە،
دەڵێ: یایەزین، بەقوربانت بم، ئەوە چ بووە، چ قەوماوە؟»
یایەزین دەڵێ:
«مەلەک ڕیحان، ئەتوو هاتووی، بە قوماربازی دەگری.
ئەتوو نازانێ، چاک نابی، چوونکە لە ئەولادی بەکری؟»
مەلەک ڕیحان دەڵێ:
«قوربانت بم، ئەمن کوێرم بوو چاوە
لەمن وایە میرمەم سەرکردەی لەشکرییە چووە، ماڵ و تالانی هێناوە.
ئێستا سەلام لێ ڕابوو، دەڵێن: لە زینداندا زەلیل و مەحتەل ماوە».
ئینجا مزگێنی هات، لەشـــکر و قۆشەن لە شاری جزیرێ بوو بڵاوە ئینجا خەبەریان بە یایەزینێ داوە.
یایەزین ئەگەر وا دەزانێ،
سەرتاپا خوار خۆی هەڵدەکێشا دە قوڕ و خمخانێ
بە کووچەی شاری جزیرێدا دێ، دەست دەکا بە گریانێ.
عرفۆ و چەکۆ و قەرەتاژدین ئەســـپێکیان بە پێشـــکەش بۆ کاکەمـــەی هێنابوو؛ ئەوا دەیگێڕن لە کاروانسەرایە و لە کۆڵانێ.
یایەزین دەڵێ:
«قەرەتاژدین ئاغاکەتان کوانێ»
ئەنگـــۆ بۆ ئاغایەتی و بەجێ هێشـــت، چل شـــەوە جەمی دەگەڵ جەمی ســـەگانە لە زیندانێ».
بەنگینە دەڵێ:




«ئەگەر نەمرم، بژیم، بمێنم،
دەبێ لەشکر و قۆشەنی شاری یەمەنی بێنم،
دەبێ پیشەی حەولادی میر و بەکری دەرێنم».
عرفۆ دەڵێ:
«ئەمن عرفۆمە،
بەرانێکی بە ئەسرۆمە،
میری برات لە شانانڕا دەگرۆمە»
قەرەتاژدین دەڵێ:
ئەمن قەرەتاژدینم،
لە پڵینگەکانی چەنگ بەخوینم
ئەگەر نەمرم، میری برات لە شانانڕا دەردینم».
چەکۆش دەڵێ:
«ئەمن چەکۆیەکم بەناوە
لەسوێ میرمەمی کوێرم دەبووە هەرتک چاوە.
خوشکی یایەزین، گلەییانم لێ مەکە، کوێرم بووە هەرتک چاوە
ئێستا دەبێ شاری جزیرێ تەخت و تاراج بکەم، بیکەم بڵاوە.
خوشکێ، پێم بڵێ، بزانم میرمەم مردووە یانە ماوە».
یایەزین دەڵێ:
«چ بکەم ئەمنی قەلەندەر و ماڵ وێرانێ
نەمردووە و نەماوە؛ ئەوە زەلیلە لەنێو زیندانێ».
ئینجا ئەو چوار شێرە بە گریان دەهاتنە خوارێ لە کۆڵانێ،
هەموویان دەهاتن، دەگەینە سەر زیندانێ.
دەیانگوت: «یایەزین! میری بکوژین یا کاکەمەمی دەرێنن لە زیندانێ؟»
یایەزین دەڵێ:
«بە قوربانو بم، دامەمێنن،
جارێ کارێکی وا بکەن کاکەمەم بۆ دەرێنن»
ئینجا یایەزین کەزیی خۆی بەعاڵقە بەعاڵقە کرد ئاوێتیە زیندانێ
کاکەمەم ئاوێتیە ئەستۆ و بنەنگڵی خۆی؛ دەستیان کرد بە هەڵکێشانێ.

یایەزین دەڵێ:

«بیدەن بەمن». سەری خۆی هەڵگرت، لەسەری کۆشی خۆی دانێ

کاکەمەم دەڵێ:

«یارەبی، بە ڕەحمەتی خولای دەبژێرم شوکرانێ

یایەزین! ئەمن چاوم نابینێ! عرفۆ و چەکۆ و قەرەتاژدین و بەنگینە کوانێ؟»

یایەزین دەڵێ:

«جەرگم بڕا، کەسم نەماوە

ئەتوو نازانی، ئەوانە لە لەشکری گەڕانەوە، پاکت لە دەورێی ڕاوەستاوە؟»

کاکەمەم دەڵێ:

«پێیان بڵێ گەردنم ئازاد بکەن؛ دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا

لە تو دیدار ئاخرەت بووم، لە ئاهی دایک و بابم مەخسوودم نەبوو تەواوە».

یایەزین، ئەگەر وا دەزانێ،

دەست دەکا بە چەمبەر و گریانێ.

بە ڕەحمەتی خولای میوان دەهاتنە سەر کاکەمەمی بۆ گیان کێشانێ.

کێ بوو لە کاکەمەمی بەڵەک چاوە،

چاوی خۆی لە ڕووی یایەزینێ کرد بڵاوە.

عرفۆ و چەکۆ و قەرەتاژدین و بەنگینە دەست دەکەن بە گریانێ،

میرزێندین هەڵدەستا دەهاتە کن ئەوان لە دیوانێ

ئەویش وەک ئەوان دەس دەکا بە گریانێ،

دەڵێ: «خوشکێ، یایەزین! بڵا کاکەمەمی هەڵگرین بیبەینەوە دیوانێ».

بەنگین دەڵێ:

«ئەی میر، بە قوربانت بم، چ دەستانی مەکەنێ

«ئەمن ئەمانەتی براهیم پادشایە دەبێ بیبەمەوە یەمەنێ».

میر دەڵێ:

«بەنگینە، گیانە!

«ئەمن نەمزانیوە کوڕی براهیم پادشایە هاتۆتە ئێرەکانە

ئەمن دەزانم شاری یەمەنێ لەسەر ئەوی دەبێ وێرانە،

مەسڵەحەت ئەوەیە دەبێ، هەر لەکنە خۆم بێ گۆڕ و گۆڕخانە».





قەرەتاژدین دەڵێ:

«دەبێ هەر لێرە بێ، چونکە لە یایەزینێ میوانە».

عرفۆ و چەکۆ دەڵێن:

«بە دەستی خۆن دەیبەینە گۆڕخانە.

چونکە میرمەم ماشوقێی یایەزینێیە، هەتا مردنێ یایەزین خوشکی هەمووانمانە».

بەنگین دەڵێ:

«بێ ئاغا و بێ وەتەنین

چونکە میرمەم غەریبەیە، بلا بچین بۆخۆمان قەبری بۆ هەڵکەنین».

میرزێندین دەڵێ:

«خولاکەی! بەنگین چت لەو قسەی داوە

نەمزانی کوڕی براهیم پادشایە؛ کوێرم بێ هەرتک چاوە

لەمێژە ناردوومە قەبری بۆ هەڵکەناوە».

کاکەمەمیان بردە سەر تاتەشوارێ و شۆراوە،

هەڵیان گرت بۆ گۆڕخانان، لەوێ تەسلیم بەخاکێ کراوە،

بانگێکی خۆشیان لێ دا، گەڕانەوە بە دواوە.

ئینجا ئەگەر شەو بەسەردا هات هەڵی کردە رێژنەی بارانێ،

یایەزین ئێستا بۆ کاکەمەمی دەس دەکا بە گریانێ:

«تاقە کوڕی براهیم پادشای یەمەنی جوانەمەرگ بوو لە سەری من بابان وێرانێ

حەڵاڵی دنیایەم لێ حەرام بێ هەتا خولا دەکا دیوانێ؛

چ بکەم لە خۆم ڕووسیایێ، قەلەندەرێ

بۆ دایک و بابی میرمەمی دەگەینە یەمەنێ خەبەرێ

داخولای، شاری جزیرێ دەگەڵ تۆپ و تۆپخانەی یەمەنێ چی بە سەرێ

چ بکەم، لە چەنگم دەرچوو، ئەمن مل بەکوێنێ

شاری جزیرێم لێ خرا دەکەن کەسم لە ئەولادێ نامێنێ».

کێ بوو لە بەنگینەی دڵسووتاوە،

دەهاتە خزمەت یایەزینێ دەیگوت: «یایەزین! چاوم کوێر بوو، ئاغام نەماوە».

یایەزین دەڵێ:

«بەنگینە! ئەمن بابانم خەرابوو تیرم لە جگەری دراوە».

بەنگینە دەڵێ:

دەبێ بەبێ کەسی بڕۆم، بۆ شاری یەمەنێ، دەوڵەت زیاد و ماڵێ ئاوا».

یایەزین دەڵێ:

«هەیرۆ! چ بکەم، ئەمنی قەلەندەری

هەڕۆ، بڕۆ بە خوڵات بە زامن دەدەم، بە ئەمانەت بە پێغەمبەری».

کێ بوو لە بەنگینی گوڵباوە،

ئەسپ و تاژی دە خمی دەنا بۆ یەمەنێ گەڕاوە.

دوازدە مانگ و بیست و چوار ڕۆژان بە شین و گریانی ئاژواوە، هەتا دەگەییە دەرکی براهیم پادشای یەمەنێ بانگ لەسەر بانگی لێ داوە».

براهیم پادشا وەدەرکەوت، دەڵێ: «بەنگین! کاکەمەم چی لێ هات و چی لێ قەوماوە؟»

دەڵێ: «براهیم پادشا، بەقوربانت بم! دەردێکی گەییە، عەمری حەقی بەجێ هێناوە».

براهیم پادشا دەڵێ:

«بەنگینە، چ دەکەی لەمنی بێ کوڕ و فەقیرێ

چ بکەم لە یەمەنێڕا چلۆن بگەمە شاری جزیری؟»

دایکی مەمی، ئەگەر وا دەزانێ، لەشکر و قۆشەنی دەنگ داوە

هەر بەو شەوەی ئاڵای هەڵکرد، بەیداغی ڕاکێشاوە

بەنگین بانگ لەسەر بانگی لێ دەدا، بۆ شاری جزیرێ گەڕاوە.

بەنگین دەڵێ:

«دەڕۆم بۆ شاری جزیرێ بۆ کن ئاغاکەی نەوجوانە».

دەهاتە خوارێ دوازدە مانگ و بیست و چوار ڕۆژانە

دەهاتە دەورەی جزیرێ، داورت [؟] دایبەست تۆپ و تۆپخانە

یایەزین ناردیە کن میرزێندینی: «مەرەخەس بفەرمووێ، دەچمە سەر قەبری کاکەمەمی».

میر تەگبیری بە بەکری کرد، گوتی: «مەرخەستی بکەم، یا نەیکەم؟» گوتی: قوربان! مەرەخەستی بکە، دەزانم، بە هاواریەوە دێن؛ دەشسقەم بۆ خاتری یایەزینێ خەراپەمان نەکەن». میر فەرمووی: «بلا بچێتە سەر قەبران، مەرەخەستە». یایەزین بەگریانێ چووە سەر قەبران. ئەوە یایەزین گەییە سەر قەبری کاکەمەمی. بانگی کاکەمەمی دەکا.




دەڵی: «خولاّیە، نە بەکەبرێنی، نە بەسەربرێنی
بۆخۆت گیانان دەدەی، گیانان دەستێنی
کاکەمەم، عەمرەکەم، ئەتوو نابێ جارێکی سەرهەڵێنی؟»
کاکەمەم دەڵێ:
«خاتوونێ! بۆ وا شیت و کەم ئەقڵی؟
ڕوومەتی تۆ گەلێک جوانترن لە دەسرۆکەی گوڵ گوڵی.
هەتا دنیا خەرا دەبێ، پیاو سەر هەڵنایەنێ لە ماڵە گڵی».
یایەزین دەڵێ:
«خولاّیە، بەغەیرەز ئەتوو کەس نییە بمێنی
ئەمن چیدیکەم بۆ مەجووزاتان ئەژێنی
ئەمن بە کێلی کاکەمەمیەوە بمرێنی.
خولاّیە، ئەتوو کەریمی، قادری»
میوانی خولاّی دێ، ڕۆحی لە یایەزینێ وەردەگرێ.
خەبەریان دا بە میرزێندینی: «یایەزین مرد». میر بە بەکری فەرموو: «برۆ، قەبری بۆ هەڵکەنن». گوتیان: «قەبری هۆ لەوێ هەڵکەنن». هەرجێکی پاچیان لی دا بوو بەروو لە هیچ کوێ هەڵنەکەنرا؛ لەکن کاکەمەمی نەبێ. قەبریان تەواو کرد. یایەزینیان تەسلیم کرد. دایانپۆشی گوتیان: «یاڵلا بڕۆینەوە». شەقڕن لە قەبری کاکەمەم و یایەزینێ هات. بەکر گوتی: «ئاحا! دەست هەڵناگرن ئەوا لە قەبریش چوونە باڵی یەک»:
بەکر ئاغا دەڵێ:
«میر ئەتوو میرێکی ساحب خاتری
لە هەموو کاران عەیب و عاران لە من دەگری
خوشکی قەعبەی توو لە قیامەتێش دەس لە خەڵقی هەڵناگری».
میر گوتی: «هەموو کارێکی پێ کردم، دەنجا بیکوژن»
بەکر خۆی ئاوێتە نێوانی قەبری کاکەمەم و یایەزینێ ِ خوێنی بەکری لە نێوانی قەبری کاکەمەم و یایەزینێ کەوت، ئێستا بوو بە زی لەوێ شین بوو.
کاری وان بوو تەواوە
عرفۆ سەرتاپا خوار خۆی دە قوڕێ ناوە
چەکۆش خۆی لە خمی داوە

بانگێکی خۆشیان لە بۆ مەم و زینیان لێ داوە
بە خەمناکی هەر کەسە بۆ ماڵە خۆی ڕۆیەوە و گەڕاوە
خەبەریان بە براهیم پادشای دا، بایەزینیش مرد، لەکن کاکە مەمیان ناشت.
کێ بوو لە براهیم پادشای زەنوێرە
گوتی: «ئیدی کەس پێم نەڵێ لە پاش مەم و زینان شاری جزیری نیگابدێرە
سبحەینێ پاکی نوغرۆ دەکەم دەچۆمی جزیری دەکەم سەر بەرەو ژێرە».
ئینجا کە سبحەینێ بەیانی داوە
براهیم پادشا لە خەوێ هەڵستاوە
دەڵێ: «چ بکەم؟ لە عەیبەت میرمەمی کوێرم بوون هەرتک چاوە».
ڕووی تۆپ و سەربازی دە شاری جزیرێ کراوە.
بەنگینە ئاغای چووە بۆخۆی سەرکردەیە و زگی سووتاوە.
ڕووی دە ماڵە بەکری کرد؛ هەرچی گەییە سەری بڕی، سینگی هەڵێناوە.
ڕووی دە ماڵـــە میرزێندینی کرد، قەتی یەک خەلا نەبوو، یەکی ناماوە هەتا بەجارێکی ئاساریان بڕاوە.
جا خاتوون ئەستی کوێنی دەبەر خۆی کرد، چوو لە پێش براهیم پادشای ڕاوەستاوە،
دەڵێ: «پادشا، مەم و زین چوون، ئاساری ماڵە بابم بڕاوە».
براهیم پادشا دەستی دەستۆی خاتوون ئەستێ کرد، گوتی: «ئەتوو کچی منی ئەتووم لە جێی کاکەمەمی ڕۆناوە».
دەســـتی دەستۆی خاتوون ئەستی کرد، چووە سەر قەبری مەم و زینان بە بیانییەکی تەواوە.
گەینە سەرقەبران، دەگەڵ لەشکر و قۆشەنی بانگێکی خۆشیان لێ دەداوە.
کێ بوو لە براهیم پادشای نەوجوانە،
کوێرایی گەییە هەرتک چاوەکانە،
دەڵێ: «بە سەرینی پیری بەشم بێ کوڕی و زگ سووتانە.
ڕۆڵە! خاتوون ئەســـتی نایەمەوە شـــاری جزیرێ؛ شـــارێکی بەدقەدەمە، ویستراحەت گرانە.
ڕۆڵە! شارەکەی یەمەنێ، بێ کوڕی ئاغای و سەرەوێرانە».
خاتوون ئەستی دەڵێ:

«لە سۆی مەم و زینان وەختە وەرگەڕێم لە دینی،

ئیچ باب و برام نەماون، لەکنیان ڕۆنیشم بە پەرژینی».

براهیم پادشا دەڵێ:

«ڕۆڵە! شارەکەی جزیرێم بە بەرات دا هەتا مردنی بە قەرەتاژدینی»

«ئینجا ئەمن کاکەمەمم چوو، هۆم کەوتۆتە بەنگینی».

قەرەتاژدین دەڵێ:

«چ بکەم براهیم پادشا؟ ئاغایەتیم پێ ناکرێ، جگەرم براوە،

«خزمەتی میرمەم گەلێک نەکرد، ئەمەگم بەهیچێ دراوە.

«خولاّ دەزانێ کوڕی تۆیە؛ بلاّ ئەمن هیچ کەسم لە شوێنەوارێ نەماوە».

سبەحەینێ تەدارەکی دەگرت هەتا حەوت ڕۆژان هەر خێر و قوربانی بۆ مەم و زینان کراوە، لە پاشان ئالاّیان هەڵکرد و بەیداغیان ڕاکێشاوە.

جزیر بە قەرەتاژدینی تەسلیم کرا. گەڕانەوە بە دواوە.

براهیم پادشا لە حەسرەتان کوێری بوون هەرتک چاوە.

دوازدە مانگ و بیست و چوار ڕۆژان لەشکریان هێناوە بە دواوە

داخل بە شاری یەمەنێ دەبوو، هەموو کەس خۆی دە قوڕێ ناوە

بەنگینی کرد بە کوڕی خۆی و بەسەر شاری یەمەنێی داناوە.

یا ڕەببی! (ڕەحمان بەکر نەمری) بەچوار ڕۆژان ئەو بەندەی بۆ ساحبی ئاڵمانی کرد تەواوە،

ئیسای ڕوحوڵلاّ لەسەر ساحبی ئاڵمانی ڕاوەستاوە

ئاغای ساحب بە ساق و سەلامەتی لە هەموو دەریایان پەڕیوە لە دایک و خوشکی خۆت بکە سەلاّوە.

***

## لاس و خەزاڵ

ئەحمەد ئاغای باڵەکی چ کوڕی نەبوو. مەحموود ئاغای برای وی بوو؛ ئەویش چی نەبوو. هەردووک ژنیان عامیلەدار بوو. خولا لاسی دا بە ئەحمەد ئاغای، خانزادیشی دا بە مەحموود ئاغای. لێکیان مارەکردن؛ لاوس و خانزاد. دایکی لاسی نێوی شەمێ بوو. دە ساڵان ئەحمەدئاغا وێی کەوت، مێردی پێ نەکرد. شێرێک یاغی بوو. پیاوی دەشکاند، دەیخوارد؛ ئەحمەدئاغا گوتی: «یان دەبێ ئەمنیش بخوا، یان ئەو شێرەی دەکوژم». چوار ساڵ بوو شەمێی هێنابوو، ئیلاقەی نەدەکرد. گوتی: «بۆچی ئیلاقەی من ناکەی؟» گوتی: «هەتا بە دەستی خۆت دۆخینم نەکەیەوە، ئەمن ئەتوو...».

ئەحمەد ئاغا سەر و بەرگی پۆشی، چووە زگ شێری. شێر دەستی بە دەعوایە کرد دەگەڵی. خولا فرسەتی ئەحمەد ئاغای دا، شێری خست. هەڵاتە سەری، سەری بڕی. ماندووبوو، لەسەر پشتی شێرەکەی نووست، خەوی لێ کەوت. لە خەڵقی بوو بە شین و گریان؛ گوتیان: «شێر ئەحمەدئاغای کوشت». ژنەکەی گوتی: «ئەمن دەچم. یان دەبێ ئەمنیش بکوژێ، یان تۆڵەی ئەحمەدئاغای دەکەمەوە». ژن دەستی دا خەنجەرێ. چووە زگ شێری. ئەگەر چوو تەماشای کرد شێر کەوتبوو؛ ئەحمەدئاغا لەسەری درێژ ببوو. گوتی: وەڵڵاهی! ئەوە شێر شکاندوویەتی، لەسەر پشتی خۆی داناوە». تەماشای کرد سەری شێری بڕیوە؛ ئەحمەدئاغا خەوی لێ کەوتبوو. گوتی: «خولاکەی، ئیلاقەی من

نەکا؛ بزانم پیاوە یان پیاو نییە». دۆخینی دەکردەوە[1]. ئینجا هەڵاتە سەری لەسەر پشتی شێری...، ئینجا لاس لەسەر پشتی شێری گووراوە. هەڵستان هاتنەوە ماڵێ.

خانزاد خان و لاس لێک مارە کرابوون؛ هەتا دوازدە ساڵان. دە پاشان ئەحمەد ئاغا مرد. مەحموود ئاغاش مرد. شەش ساڵان تازیەی ئەحمەد ئاغا و مەحموود ئاغای بوو. پاشی شەش ساڵان پیاوێک چووبوو بۆ جەڵەبی؛ چوو بۆ نێو عێلی ماموودینان. لەوێ چاوی بە خەزاڵێ مەلا نەبییان کەوتبوو. هاتەوە، گوتی: «لاسەشۆڕ عەمرت بە هیچی چووە». گوتی: «بۆچی وا دەڵێی؟» گوتی: «ماڵ خرانەبوو! ئەوڕۆ خەزاڵێ مەلا نەبییانم دیوە؛ دەگەڵ ڕۆژێ دەعوایە دەکا؛ ئیدی هەر بۆ توو چاکە». لاس هەڵستا وڵاتی باڵەکیانی بەجێ یەشت. چووە نێو عێلی ماموودینان، چاوی بە خەزاڵێ بکەوێ. ئەگەر چوو لەوێ دابەزی، جڵەویان گرت و وڵاغەکەیان بەستەوە. بۆ خۆی چووە خزمەت مەلا نەبێ؛ گوتی: «ها بابم کوێندەری؟» گوتی: «قوربان! هاتوومە نۆکەرییێ». گوتی: «خەڵقی کوێی، کوڕی کێی؟» گوتی «قوربان! لە گەرمێنێ هاتووم». مەلا نەبی گوتی: «ئەحمەد ئاغا و مەحموود ئاغای باڵەکی دەناسی؟ گوتی: «قوربان خێر؛ خەڵکی عێلی وان نیم». گوتی: «قەننەداری دەتوانی بکەی؟» گوتی: «بەڵێ قوربانم دەتوانم». کیسە و قەننەیان دایە. لاس بووە قەننەداری مەلا نەبی دە شەوانی قەننە تێ کرد. ڕۆژێکی خەزاڵ هات بەپێش چاوی دا. لاس گوتی: «ئەوەە کێیە؟» گوتیان: «ئەوەە خەزاڵێ مەلا نەبییانە». لاس دەڵێ:

«یای خەزاڵ، نە قەولت قەولە، نە شەرتت شەرتە، نە دینت دینە
هەزار باری دە نەحلەتانت بێ لە پیرە دایکێ، لە برا گچکەلە، لە بابی ڕدێن شینە
ئەمن بۆ توو دەچوومە کوێستانی عەزیم و بوزرگینە
دەسکێکی سۆسن و هەڵاڵەم دەچنینە
دەسک بەدەسکم کردن بە ئاوریشمی دوکانێکم بەستینە
کاروانێک دەهاتەوە لە دەغڵ کڕینە
ئەمن بەو کاروانەی دا ئەو گوڵەم بۆ توو ناردینە
نازانم ئەو گوڵەت پێ گەیوە یا نەگەیینە»
خەزاڵ دەڵێ: «لاس، ئەمن ئەوانەم لە توو قبووڵ نینە.
نە سەری سەهەندی، نە قووچی قەزەنی، نە ڕەندۆڵی زەرزان، نە سەری تەشوێلەی،

---

١ ـ ئەحمەدئاغا چاوی هەڵێنا؛ تەماشای کرد، ژنەکەی دۆخین دەکردەوە.

نە مۆڵی بەرانی، نە کانیە خوڵای شتاقیان دەگەڵ نینە».

لاس دەڵێ: «یای خەزاڵ، چۆمم لێ هاتن، پردم لێ هەڵوەشینە.

ئەمن مەلەوانێک نەبووم لە گۆمی دە شینە،

کیژ و کوڕی هەمزاغایان، لە من و توو دڵ بەدنیاتر بوون، بە پێشــی من و توو سەری ئەو گوڵانەیان هەموو دەچنینە.

خوڵا ماڵی خێڵاتی خراکا! دەگەڵ بەرگەل و مێگەلان ئەو گوڵانەیان هەموو پچڕینە،

دەستی لاسی باڵەکەی قوڵە بوو، بۆ هەموو کوێستانان نەگەیینە».

خەزاڵ دەڵێ: «لاس، دڵت کردووم هیلاکە

لەو گوڵانە هێندێکیان دەبەری خۆت ڕاکە

وەرە لەبەر ماڵی مەدا هەڕاکە

هێندێک دەڵێن: یا خوڵا پیرۆزت بێ! هێندێک دەڵێن:

موبارەکی بێ لاسی باڵەکی جوانێکی چاکە».

لاسی دەڵێ: لە ماڵە مەلایان هەتا ماڵی سۆفییان

لە ماڵی سۆفییان هەتا ماڵی مەلا نەبییان

ئەمن دەڵێم: ببمە سەیاح؛ ڕۆمێ بگەڕێم دەگەڵ هیندییان

بریا دارێک بوومایە لە داری دە قەیسییان

بیاندامایە چەنگ وەستایان، شەقیان کێشابامەیە بە مشاریان، بیاندامایە بەردەمی ڕەند و کوشتەرییان

هەڵیان هێنابامایە بە پەڕێکی تێلتاوســـی، خاسەڕەنگیان کردبام بە پوشت باڵی سپی سییان

بیاندابمایە بەر ماڵی کەوانێکی هیندییان

هەڵیان داشتبام بەرەو قووچی قەزەنێ قەندیلی مامە کوییان

لەوێ پێیان کوشتبامایە، دە کاران، دایکی دە نێرییان

گوپەڕکم کەوتبا لە بڵندان، شــاباڵم کەوتبا لە نەوییان، لە ســەری ڕێی شوان و گاوان و ناسکە بێرییان

هەڵیان گرتبام بیانبردمایە سەر ڕازی کانییان

لە خۆشییا منیان مەڕ سەرچڵ کردبایە، هاتبانایە سەر بەردی دە کانییان.

ســـەرێکیان نابام دە بنی تووری؛ نێوەڕاســـتم کەوتبا ســـەر زاری شیرمەشکێ لە ملی




خۆیان قایم کردبام. لای دیکەم کەوتبا نێوانی هەرتک شـانان؛ بەسـەرمدا هاتبایە هیزار دەگەڵ قمبەڵێکی کەزییان

جا حەوتوویێکم لەسەر بوایە مەڕەکە دەگەڵ خەڵق و خوڵای خێڵەکییان.

بێرێکی زۆر موسڵمان ئەمنی لەو عێلاتەی دزیبا؛ بەدیاری و سەوقاتی بردبامی بۆ یای خەزاڵێ مەلا نەبییان.

یای خەزاڵ بە دەسـتی مبارەکی وەری گرتبـام، بیناردمایە کن زێڕینگەری، زێڕینگەر سەرێکی زێرکفت کردبام، نێوەڕاستم ئەشەرەفیبەند، لای دیکەم دە دوڕ و ئەشرەفییان.

زێڕینگەر لەسەر هۆردک دەستانی ڕۆنابام، بەدیاری و ئەندام هێنابامەوە بۆ یای خەزاڵێ مەلا نەبییان.

یای خەزاڵ سـەرێکی بە قوڵکی گەردنیەوە نابام، سـەری دیکەم لە نێوان سـینگ و مەمییان.

ئارەقە شـێت و شەیدای کردبام، باوەشـێنی کردبام بە پەرچەمان، فەرامۆش بوومایە بە کەزییان.

وەختێ لەوێم لێ وەڕەز دەبوو، بینابام لەنێو سـندووقێکی خاسەڕەنگ، ڕۆژێ بە نوغل و نەباتی پەروەردە کردبام. شەوێ قاسید بام لە مابەینی سینگ و مەمییان.

وەختێک لەوێم لێ وەڕەز دەبوو، بیناردمایە سەر وەستایەکی گەوێڵ، دروستیان کردبام بۆ نێرتکی تەشییان. حەوت ساڵان پێی ڕستبامایە ڕانک و چۆغەڵەی مێردووتییان.

وەختێ لەوێم وەڕەز دەبوو، قەرەواش و کەنیزان، ئەمنیان لە خەزاڵێ بخواستایە،

دەیگوت: ناسکە تیرێکی عەجیبە، بە کەسی ڕەوا نابینم، نەکو زەحمەت و کوێرەوەریی بدەنێ، ڕۆژی قیامەتێ خەلاس نابم لە خەجاڵەتییان.

وەختێکی لەوێم لێ وەڕەز دەبوو، بیدابامە بەر ناڵچەی کەوشـی زێوان کەرت و پاری کردبام، فڕێی دابامە دەم کەوی و کانییان.

لەوێ بۆ خۆم شین بووبام بە گوڕانکێکی شەنگەبییان. بە بنم داهاتبا گێلان و گێدان، خێڵی سوورچی و زرارییان،

هەمـوو هەوەڵی پایـزان، ئاخری بوهاران لە بن سـێبەرم ڕۆنیشـتبا یـای خەزاڵێ مەلانەبییان».

خەزاڵ دەڵێ:

«دڵم ڕاناوەستێ لەبەر ئەوێ غەمێ، لەبەر ئەوێ ژانێ.




ئاورێکم بەربوو دەروونێ، ئیدی کەم بەربوو دەروونخانێ،
نە بەبای دەکوژاوە نە بە بارانێ.
هاوارێکم وەبەر خولای، ئی دیکەم وەبەر پێغەمبەری ئاخرزەمانێ.
لاسە! ئەو پەرچەمانەم بۆ توو پەروەردە کردوون هەر وەک ئاوریشمی دووکانێ
ئەمن ئەو هەنیەم بۆ توو نیگاداشتی کردووە، هەزار و حەوسەد مەلایکەتی جلەوکێشە،
وەک مانگی مونەوەر وایە، شەوقی داوەتە عەرز و ئاسمانێ.
ئــەو برۆیانەم بۆ توو پەروەردە کردوون، دەبێ شــاری هیندی بــۆ بدەن بە دەرمان؛ دەستی بکەی بە وەسمە کێشانێ.
ئــەو چاوانەم بۆ توو پەروەردە کردوون، دەڵێی ئەســتێرەی گەلاوێژە، لە هەوشــار و عەجەمان هەڵدێ، هەر ئاشقێکی ببینێ گوناهی نامێنێ ڕۆژی ئاخرزەمانێ.
ئــەو کوڵمانەم بۆ تــوو پەروەردە کــردوون، دەڵێی فانۆســـە لە دیوانی ســـوڵتانی ئەســـتەمبووڵێ؛ میرزای قابیل لەبەر شەبەقی وی قەڵەمی باوێتە سەر قاقەزی بۆ هەرچوار دەوڵەتان بنێرێ پۆستە و فەرمانێ.
ئەو کەپۆیەم بۆ توو پەروەردە کردووە. مەگەر هەر هەیاسی دانا مەعنای بزانێ.
ئــەو لێوانەم بۆ توو پەروەردە کردوون، پیاوی تاجر مەگەر کلووری ببێ دەنا قیمەتی نازانێ.
ئــەو ددانانەم بۆ تــوو پەروەردە کردوون. هەر ددانێکــم گەوهەرێکە، هەر گەوهەرێکم قیمەتی تەواو نابێ بە شاری کشمیرد و ئێرانی.
ئەو چەنەی ڕەنگ شــاخی زێرینی بۆ تۆم پەروەردە کرد. دڵم نایە دە مســـت وستای ناشیی نێم، وەستایەکی باش وەستا ببێ، سەبرسەبر، نەرم نەرم، زەحمەتی نەدا لە مسقاڵ کێشانێ.
ئەو گەردنەم بۆ توو پەروەردە کردووە، دەڵێی شووشـــەی گوڵاوییە چەند خۆشە لاس و خەزاڵ لێکدی بپڕژێنن، لاس بڵێ: یای خەزاڵ، ئەو شووشـــە گوڵاوێم بۆ لەســـەر دەلاقە دانێ.
ئەو کەشـــەفەم بۆ توو پەروەردە کردووە، جووتێک لیمۆی کاڵی لەســـەرن خاوڕیسی دارای لێ بووە بە پەردە کلیلی بۆتە دەرزیی هەشتەرخانێ.
هێندێـــک خـــاڵ لە نێو ســـینگ و مەمکانم ئەو خاڵانە بەبێ مامۆســـتا و موســـتەعید دەخوێنمەوە: ئەلفن، میمن، خەتی قورعانێ.

ئـــەو بەژنەم بۆ توو پـــەروەردە کردووە. دەڵێی ڕیحانەی یەکســـاڵەیە، بەنی ئادەمان شـــەواویان لێ نـــاوە خوناوەکی پەڕیوەتە ســـەر پەلکان دەگـــەڵ زەردەی ڕۆژی هەوەڵی سبحەیانێ.

ئەو شلکەی ڕانانم بۆ توو پەروەردە کردووە، خۆی بۆ شۆڕ بکەوە، سەری خۆتی لەسەر ڕۆنێ لە ماچکردن و گەوزلێدانێ.

لاسەشۆڕ! عەمرم! وەرە. ماچانت دەمێ هیچ کەس نەزانێ.

گوێزینگی پێیانم سێوی سەر لکانە، بەئەمانەتی بەباغەوانی داون لە ئێوارەوە کێشکی لێ بکێشێ هەتاوەکو هەوەڵی سبحەیانێ.

لە سبحەینێوە کێشکی لێ بکێشێ تا عەسرێکی درەنگ مەلا دەڵێ: «ئەڵڵاهو ئەکبەر»؛ سۆفی دێننەوە شادەت و ئیمانێ.

لاس وەرە دوو ماچانت بدەمێ، یەک لەباتی زەکاتێ، ئی دیکە لەباتی کەلیمەی شادەت و ئیمانێ».

لاس دەڵێ:

یای خەزاڵ چ بکەم ئەتوو لە متبەقێ ئەمن لەلای مێردانە.

دڵم بەخەمە دەروونم سەرەوێرانە.

ئەتوو خانەخوێی ئەمن بێگانە؛

ئەگەر ڕاستە و دەمدەیەی ئەو ماچانە

شیشی لە چیغی ڕاکێشە تەشریفی موبارەکت بێتە ئیرەکانە.

خەزاڵ هات دەستی دە ستۆی لاسی کرد. نووستن پێکەوە خەویان لێ کەوت. میربداغ و میرحەمەدخانێ شـــوورچی و زراران هاتن تاڵان و ماڵی عێلـــی ماموودینیان؛ هەموویان برد. پیرێژنێک مانگای بەگوانەوە چووبوو، گەیشـــتە لاسی و خەزاڵێ. جنێوی دایە گوتی: «ســـەگباب ئەتوو دێی دەگەڵ خەزاڵێ وردە... دەکەی، ماڵی من بە تاڵان بەرن». لاسی خەوی لێ کەوتبوو، خەزاڵ بەخەبەر بوو. خەزاڵ بەپیر پیرێژنێوە چووە؛ گوتی: «دایەپیرە مەگری، لەجیاتی مانگایەکی بیســـتت دەدەمێ، لەجیاتی گوێلکێکی بیستت دەدەمێ. لاس خەوی لێ کەوتووە بلا وەخەبەر نەیە». پیرێژن گەڕاوە دیســـان لەولاوە هاتەوە زگ لاسی گوتـــی: «حیزباب! لە ولاتی باڵەکیان ئەتوو... دەدا؟ ئەتـــوو هاتووی ماڵی من بە تاڵان دەدەی».

یـــای خەزاڵ بەپیریەوە چوو گوتی: «پیرێژن! دەنگی مەکە، بلا لاس وەخەبەر نەیە».




پیرێژن گوتی: «وەڵڵاهی دەگۆڕی بابی لاسی دەڕیم، بۆچ مانگای من بە تاڵان بچێ» دوو قەرەواشـــان باوەشێنی لاسیان دەکرد، مێشی لێ نەنیشـــێ. ئەو قەرەواشانە دەگریان بۆ ماڵـــی بابیان. هەر یەکی حەزیان لە کوڕێکی دەکرد. دەیگوت: «ماڵەکەیان چوو، ئەمەیان پێ ناخوازرێ».

لاس سەری هەڵێنا گوتی: «ئەوە چییە بۆچی دەگریێن؟» گوتیان: «قوربان! میربداغ و میرحەمەدخـــان هاتن تاڵان و ماڵـــی ئێرە هەموویان برد.» گوتی: «دەنا خەزاڵ دەگەڵ من غەیان بووە».

لاس هەستا بە پەلەپەل دەیکردە لینگدانە

لاس دەڵێ: «ماڵی وێرانم وڵاتی باڵەکیانم بەجێ یەشت هاتمە ئێرەکانە.

ئێستا هەزار و چوارسەد ماڵی خۆم و مامم سەرەوێرانە

خانزادخانی حەریرێ بێ ساحێبە و بێ خودانە

داخولا قاسیدی کێیە؟ هاتۆتە (؟) خەزاڵی چاو جوانە

نەمزانی ژن دەغەڵن پێشکاریان شەیتانە

هەڵبەت بەدزی من ناردوویانە، میربداغ و میرحەمەدخان هاتوونە ئێرەکانە.

تاڵانی عێلی مەلانەبییان دەبەن، دەڵێن: لاس منداڵ و نادانە.

دەنجا قەرەواش بڕۆن و دامەمێنن.

ماینێ شێ خزم بۆ لە بەهاربەندێ دەرێنن.

زرێی داودی، ڕمبی نەزەریم بۆ بێنن.

خەبەرێکی بە میربداغ و میرحەمەدخانی سوورچی و زراران ڕابگەیەنن.

ئەگەر هاتوون ماڵ و تاڵانی مەلانەبی دەبەن، وریابن، مەڕی خەزاڵێ لە ســـەرینچاوەی کانیە ئاو بدەن لە بژوێنی بلەوەڕێنن.

هەڕاکەن ماینێ شێ خەزم لە بەهار بەندێ بۆ دەرێنن؛

زینێکی مورسەتی[1] لێ بشەتێنن

جووتێک زەرگانم لەبۆ باڵاتەنگێ بۆ بێنن».

ئەگەر ماینێ شێ خزیان لە بەهاربەندێ دەهێنادەرە،

پێی دە ڕکێفێ دەنا، دەکەوتە سەرە

---

١ ـ ڕەنگە مورەسەع بێ!؟

عێلی مەلانەبییان ڕادەوەستان ئەوبەر ئەوبەرە،
لە ژنانیان گریان و چەمبەرە.
لاس دەڵێ: «یای خەزاڵ! خوڵاکەی چەند ماچی منت لەسەرە؟»
خەزاڵ دەڵێ:
«ئاورێکم گرتووە، نییە قەرارم.
هەرچەندی دەفەرمووی، ئەمن قەرزدارم.
تاڵانی عێلم چوو خەجاڵەت بارم
تەخسیری من دەگرن وا گوناهکارم».
لاس دەڵێ:
«پیاوێکی نادرم،
ئەمن ماڵی ئەو عێلەی بە زامن هەڵدەگرم
دەبێ لەسەر گیسکێکی ئەو عێلەی ئەمن بمرم.
ئێستا بە ئیزنی خوڵای، سوورچی و زرارانیشت لە بۆ دەگرم.
بەشاهید بن کەیخودا و ڕدێنداره:
بزانن یای خەزاڵ چەند ماچ بە من قەرزدارە
ئێستا بزانە چلۆن دەیکەمە کوشتن و هاوارە،
ئێستا تاڵانی سوورچی و زراران دەگرم بەیەکجارە،
ئێستا مەڕی یای خەزاڵێ دێنمەخوارە.
لاس ئەگەر ڕکێفی لە ماینێ شێ خز داوە،
لەنێو عێلی وەدەرکەوت، چوو، لەوێ ڕاوەستاوە.
لاس بەنگ دەکا دەڵێ: «داخوا، لە چ تەرەفان ماڵ نەماوە».
ئەگەر بڕێکی دی لە زینوێی چوو بەولاوە،
ئەگەر تەماشا دەکا، لەشکری میربداغ و میرحەمەخانی ڕاوەستاوە.
لاس گوتی: «یای خەزاڵ! کەس دەگەڵم نەیەتە دەعوایە،
ئەمـــا هەرچی ژنە ســـەر و بەرگی ڕەش بێ، ئەتوو بۆخۆت بەرگی ســـپی دەبەر بکە؛ ئەگەر ئاوڕم داوە، بزانم لە کوێی». ئینجا ئەگەر لاس دەستی بە جڵەوی دادەهێنا، چووە خوارێ بۆ مەیدانێ.

لەشکری سوورچی و زراران دەڵێ: «قاسیدی عێلی مامودینان ئەوەتانێ».

هێندێک دەڵێن: خولا ماڵێو بکا وێرانە،
ئەنگۆ بۆ نایناسن کەڵەگایە، ئەوە لاسی باڵەکیانە.
لاس بانگ دێڵێ:
«هۆی میربداغ، میرحەمەخان گیانە!
تالانی خەزالو بردووە، لە بژوێنی نەلەوەڕێ، یای خەزاڵ لێم دەکا گلەییانە،
بۆخۆو تالان دەکەم، لێو دەکەمە ئێخسیر مال و خێزانە».
میرحەمەدخان دەڵێ:
«لاسی باڵەکی! نەمرم، بژیم، بمێنم.
بەگۆڕی ئەحمەد ئاغای باڵەکیدا دەڕێنم.
ئەگەر نەمرم، دەچم ولاتی باڵەکیان تالان دەکەم. خانزاد خانێ بە ئێخسیر دێنم».
لاس دەڵێ:
میربداغ، بەلاسی بزانە،
شەڕی کاوڕان نییە شەڕی بەرانە.
ژنانو دەکەمە ئێخسیر، جێ ماڵو دەکەمە سەبزیخانە.
ئەنگۆ چ هونەرێکو کردووە، هاتوونە نێو ماموودینان، دەبەن ئەو ماڵ و تالانە؟
مەڕی خەزاڵێ، ئەگەر لە بژوێنێ نەلەوەڕێ لێم دەکا گلەییانە،
دەبێ لە سەرینچاوەی کانیان ئاو بدرێ، حاجز نەبن بێرێ و شوانە،
ئەوە هاتمە مەیدانێ، جا حاڵی خۆت بزانە».
ئەگەر میربداغ وادەزانێ،
دەستی دەدا ڕمبی خۆی، ڕای دەکێشا مەیدانێ.
لاس دەڵێ:
«ئەمن لە مەیدانی خۆم دەبینم کاوێ؛
ئەتۆ وەرە، دەستی ماینێ شێ خز بگرە، لێم بکە سەلاوێ،
بڵێ لاسەشۆڕ، میوانی خەزاڵێم، لە دڵم دەرماوێ».
حەمەدخان دەڵێ:
«نازانی وەک پڵینگی چەنگ بەخوێنم؟
باڵدار بە ئاسمانێدا بڕوا، بالانی دەوەرێنم؛
نازانی خەزاڵێ دەکەم بەئێخسیر، ئەتۆش بە گۆڕی ئەحمەد ئاغای باڵەکیدا دەڕێنم».

لاس دەڵێ:

«های دادوبێداد، زەمانێکی ڕاگوزارە،

ئەتوو خۆت باوێ کن خەزاڵێ، حیز باب دەشقەمێ بۆت ببێ بە تکاکارە.

ئەی میرحەمەدخان، چی دیم لێ ڕامەمێنە،

ڕۆژ ئەوە وەرگەڕا، درەنگە، زەبری خۆت بوەشێنە».

ئەگەر میربداغ دەستی دەدا زەرگی خۆی، لە تەنیشتی خۆی هەڵکێشاوە، زەرگێکی حەواڵەی لاسی دەکرد، لاس خۆی لەبەر لاداوە

ئەگەر لە قەڵبووزی پێشەوەی داوە، لە پاشەوەی قەڵتاغ شکاوە.

لاس دەستی دا ڕمبی خۆی، ڕمبێکی لە میربداغی دا، لەسەر ئەسپی فڕێ داوە؛

ڕمبی لاسی دەسەر دڵی میربداغی ماوە.

لاس بانگ دێڵێ:

«یای خەزاڵ، بووی بە دەزبێنم.

لە میربداغ و میرحەمەدخانی دەگەڵ کێهەیان سوێندخۆری تا بە دەستی بەستەت بۆ بێنم؟

هەر کێ قسەی دەگەڵ ئەتوو یەک بێ، حەمرێکەم، بەخولای! نایرەنجێنم.

ئەوی ئەتووی دەگەڵ یەک نەبێ، بەخولای! سەرت بە پێشکێش بۆ دێنم».

یای خەزاڵ بانگ دێڵێ:

«هۆی لاسەشۆڕی باڵەکیانە،

ئەزت بم بە قوربان قمبەڵی دە پەڕانە،

هەرچی ئەتوو کەیفت دێنێ، وەکیلی منی بۆ من خۆشگوزەرانە».

ئەگەر لاس ئەو قسەی لە خەزاڵێ دەبیستەوە تەواوە.

ڕکێفی لە ماینی شێ خز دەدا، ڕمبی لە سینگی میربداغی هەڵدەکێشاوە.

ئەگەر میرحەمەدخان وا دەزانێ،

ڕکێفی لێ دەدا دەهاتە گۆشەی مەیدانێ.

میرحەمەدخان دەڵێ: «نەمرم، بژیم، بمێنم،

«ئەگەر نەمرم، ئینشاڵڵا، وڵاتی باڵەکیان و مامودینانت ڕاست و چەپ بۆ تێک دەپەڕێنم،

یای خەزاڵ دەکەم بە جاریە، خانزادیش بەئێخسیری دێنم».




لاس دەڵێ:

«میرحەمەدخان، گیانە!

ئەگەر نەمرم سەرت لە مەیدانێ دەبڕم، ژنانیشو دەکەم بەقابەخانە.

ڕمبی خۆت باوێ، زەبری خۆت لێ دە؛ شەڕی بەرانی بەسەر چوو، شەڕی کەڵانە،

ئەگەر مەڕی خەزاڵێ چاک نەلەوەڕێ، کەم شیر دەبێ، بێری شکایەتم لێ دەکەن، یای خەزاڵ لێم دەکا گلەییيانە:

درەنگە زەبری خۆت باوێ ئەورۆ مەیدانە!»

میرحەمەدخان ڕقی هەڵستاوە،

ئەگەر ڕمبی هەڵدەکێشا، حەواڵەی لاسی باڵەکیی داوە.

لاس سەرەزەرگێکی لە ڕمبی میرحەمەدخانی دا، لە خۆی لاداوە.

ئەگەر لاس ڕمبێکی لێ دەدا، لەو شانی چەپەی داوە.

لاس بانگ دێڵێ:

«هۆی خەزاڵێ، کێل گەردنێ بەڵەک چاوە!

ئەگەر سوێندخۆری میرحەمەدخانی، بەخوڵای لە جێی خەتەرێم نەداوە.

بنێرم ئەرەسوو و لوقمانی بێنمە سەرێ بۆت بگێڕمەوە بەدواوە.

هۆی خەزاڵی بنێرە کن میربداغ و میرحەمەدخانی، بزانە ئەو عێلە بۆچی تاڵان کراوە».

هەر جارێک ئاوڕی وەخەزاڵێ دەداوە،

یای خەزاڵ دەتگوت سپیاسییە ڕاوەستاوە.

هەرچەند عێلی سوورچی و زراری بوو، هەمووی لە بانگەی دەدا، دەگەڕاوە بەدواوە.

ئەوجار کێ بوو لاسەشۆڕی باڵەکییە.

هەڵی دەگرت میربداغ و حەمەدخانی سوورچی و زرارییە،

بەدیاری و پێشکێش دەیبردن بۆ یای خەزاڵێ مەلانەبییە.

ئەگەر لاس دەهاتە خزمەتی یای خەزاڵێ دووبارە،

سەلامی لە خەزاڵێ دەکرد ئەوجارە،

دەیگوت: «یای خەزاڵ! عەمرم، کێ لەسەر وڵاتی سوورچی و زراران دەکەیە سووریاش و ئیختیاردارە،

ئەی ئەهلی ئەو شارەی، بزانن یای خەزاڵ، چەند ماچ بەمن قەرزدارە!»

لاس دەڵێ: «بڵا بچم، ماڵ و تاڵانی خەزاڵێ بگێڕمەوە».

لاس ڕکێفی لێ دەدا، گەیییە لەشکری سوورچی و زراران. گوتی:

«ئەی خەڵقی سوورچی و زرارانە!

بۆ خاتری بینای چاوانە

شوان و مەڕی یای خەزاڵێ کیهەیە لەوانە لە هەمووانە؟»

پێیان نیشان دەدان ئەو فەقیر و بەستەزمانە.

لاس لینگی دەدا نێو ئەوانە،

پێی شاد و شوکر دەبوونەوە ئەو شوانانە.

جا بەپیر لاسی دەهاتن ئەو خانم و خاتوونانە.

خاتوونان هەردووکیان دەڵێن: «لاسەشۆڕ؛ بتبین بەقوربانە

برا، بمانکە قەرەواشی یای خەزاڵێ مەلانەبییانە.

بلا دژمن پێمان نەکەن بێ حورمەتییانە،

پیاوێکی بنێرە سوورچی و زراران بلا ڕۆنیشێ لەسەر جێی میربداغ و میرحەمەد خانە».

لاس دەڵێ:

«خاتوونێ، خاتوونێ نەوجوانە!

جارێ مەڕی خەزاڵێ لە کوێیە؟ نەلەوەڕاوە، نەکو لێمان بکا گلەییانە».

لاس بانگی کرد: «ئەی شوانی یای خەزاڵێ مەڕی خۆت هەڵاوێرە».

مەڕی خەزاڵێیان هەڵاوارد؛ هەرچەندی خەڵقی سوورچی و زراران بوو، ڕەگەڵ مەڕی خەزاڵێ کەوت. باوەشێنیان دەکرد، هەتا تۆزێ لێ نەکەوێ، هەتا هاتنەوە نێو عێلی ماموودینان. ئەگەر هاتنەوە میرحەمەدخان ڕمبی لە شانی درابوو. ناردیان حەکیمیان هێنا سەرێ.

حەکیم حەکیمێکی تەواوە،

میرحەمەدخانی دەرمان کرد، تا برینەکەی ساغ کراوە.

میربداغ مرد، وڵاتی سوورچی و زراران بێ ئاغا ماوە.

سێ ساڵان میرحەمەدخان لە خزمەتی لاسی ڕاوەستاوە،

یای خەزاڵ دەڵێ: لاسەشۆڕ ئەتوو نەتزانی ئەوە بەباب و برای من لە قەڵەم دراوە؟

«مەسڵەحەت ئەوەیە، میرحەمەدخانی بگێڕینەوە بەدواوە،

وڵاتی سوورچی و زراران بێ سووورباش و ئاغا ماوە».




میرحەمەدخان دەڵێ:

«لاسەشۆر، لاسەشۆڕی باڵەکییە!

ئەمن ولایەتی سوورچی و زراریانم بۆ چییە؟

لێرە ڕۆدەنیشم لە خزمەت تۆ و یای خەزاڵێ بەخوشک و برایەتییە،

قەت ناچمە ولایەتی سوورچی و زراران بە ئاغایەتییە».

ڕۆژێکی لاس گوتی: «ماینێ شێ خزم بۆ دەرێنن، دەچمە ڕاوێ،

خەزاڵ دەگەڵ ئەمن غەیانە، بلا لێی زیزبم، بزانم حەزێ لە کێ دەکا.

دڵم لە جۆشە، دەروونم گەلێک بیابانە،

ماینێ شێ خزم بۆ بێنن، زینی مورسەتی باوێنە سەرێ، بۆ بکێشن هەردووک تەنگانە،

ڕمبی نەزەریم بۆ بێنن، بیگرم بە هەموو پەنجانە،

زرێی ئاڵقەوردم بۆ بێنن، قۆڵی خۆمی تێ هەڵکێشم، ئاڵقەی بکەوێتە سەری هەردووک ملانە.

مەتاڵی حەوت قوببەییم بۆ بێنن، تا ڕشـــتەی باوێمە هەرتک شـــانە، تاژی و تولانم بۆ بانگ کەن، قەڵادەم بۆ بێنن، دەســـتۆی هەڵکێشـــم، بەند و ڕســـتەی ئاوریشمینم بۆ بێنن سەرێکی لە قۆڵی خۆم ببەستم، سەری دیکەی بکەم شان بەشانە،

پێ دە ڕکێفێ نێم، بکەومە سەری خوانی زینی، بە ئیزنی خولا و ڕەسوولانە،

ڕاوی خۆم باوێمە پانکە پانکەی خان تاوسی، وە نێو عێلی ماموودینانە،

کەروێشکێکی گەرمەلانێ ببینمەوە، بیدەمە شەقەی ڕکێفان، ناسکەی توولە و تاژییان، بیگرم بە هەموو دەستانە،

دەعبایەکی بەدقەدەمە، جانەوەرێکی ناســـک و نەرم و جوانە؛ بێنمەوە بۆ خەزاڵی کێڵ گەردن، خەمی خۆی پێ بکا گوزەرانە».

یای خەزاڵ دەڵێ:

«دیوتە، چەند سەرم بە قورە، بابانم وێرانە

دیوتە چلۆن ئابڕووم چوو لەنێو عێلانە

نایەڵم بۆت بێنن دگدگ و دەمەرقۆپانە

نایەڵم بۆت دانێن جووتێک کەوشی میرزایانە

نایەڵم زرێی ئاڵقەوردت بۆ بێنن، قۆڵی خۆتی تێ هەڵکێشـــی، ئاڵقەی بکەویتە ســـەر ملانە




نایەڵم مەتاڵی حەوت قوببەت بۆ بێنن، ڕشتەی دە ستۆت کەی قوببەی بکەوێتە نێوانی هۆرتک شانانە

نایەڵم ڕەمبی نەزەریت بۆ بێنن، بیگری بە دەستانە،

نایەڵم تاژی کەللەزەردت بۆ بێنن، قەلێدەی ئاوریشـــمت بۆ بێنن، دەئەســـتۆی تاژیەی هەڵکێشن، پێ ببێ جوانە.

نایەڵم بەن ڕستەی ئاوریشمینت بۆ بێنن سەری ڕستەی دەئاڵقەی قەلێدەی هەڵێنن لە قۆڵی خۆی ببەستی، بیگری بە هەموو پەنجانە،

نایەڵم پێ دە ڕکێفێ نێی، بکەویە سەر خوانی زینی، بەئیزنی خولا و ڕەسولانە،

نایەڵم ڕاوی خۆت باوێیە بەڕیە و بیابانی لە دووی کەروێشکی گەرمەلانە،

دەعبایەکی ترسەنۆکە، خۆشبەزە، گەلێک بێ ئیمانە،

پشـــتی خۆی دە ئاوەدانییـــان دەکا، بەری خۆی دەکاتە چڕی ســـەخت و بڵند و بێ سامانە

سواری ڕاوێ ئەگەر کەروێشکی چاو پێ کەوت، بەری دەداتێ توولە و تاژییانە،

خولا و پێغەمبەری لە فکر دەچێ هەر چاوی لە توولە و تاژییانە،

هەر جڵەوێ شل دەکا، ڕکێفێ دەکوشێ، نە هەورازی دەپارێزێ نە بەردانە،

دەترسم دەودەمیدا بگلێ، زەرەرێ بێنێ، بابانی خەزاڵی وێرانە.

دەودەمیدا ئەرەسوو وا دەس ناکەوێ دەگەڵ حەکیمێکی وەکی لوقمانە،

بێنمە سەر لاسی باڵەکی، دەشقەمی چا بکاتەوە ئەو برینانە،

لاسەشۆڕ! وەرە دەس باوێ گەردنی زەرد، ڕاو هەر ڕاوی ماچانە».

یای خەزاڵ لاسی گێڕاوە لەو سەفەری گەورە و گرانە،

لەکنە خۆی ڕۆدەنا شان بەشانە،

باسکی خۆی دەکردە سەرین، پێکەوە دەبوون دەستەملانە.

یای خەزاڵ دەڵێ:

«لاسە شۆڕ! لاسێکی نەوجوانە،

ئەزت ببم بە قوربانە،

ڕاوی کەروێشکێ خۆشترە یانە ئەو ماچانە؟

ئینجا شەو بنوو هەتاوەکو سبحەیانێ، مەلا دەڵێ ئەڵڵاهوئەکبەر، سۆفی دێنیوە شادەت و ئیمانە».




جا سبحەیانێ کاکە لاس دەڵێ:
«یای خەزاڵێ نەوجوانە،
جا دەبێ مەرەخەس بفەرمووی، جارێکی بچمەوە نێو عێلی باڵەکیانە».
یای خەزاڵ دەڵێ:
«بەسەر ئەو هۆرتوک چاوانە!»
کێ بوو لەو خەزاڵی نەوجوانە،
تەدارەکی دەگرت بۆ لاسی باڵەکیانە،
دەیگوت: «دەینێرمەوە نێو عێلی خۆی بە وادەی چوار ڕۆژانە.
بنێرم بۆی بێنن حدوودێکی بێ نیشانە،
تەدارەکی بۆ بگرم بەدڵ و بەجانە،
بۆی خەڵات بکەم ئەو نۆکەرانە،
نەبا خانزادخان لێم بکا گلەییانە».
لاس دەڵێ:
«یای خەزاڵ لەمن مەدە ئەوان تانانە،
خانزادخان لە توو ناکا ئەوان گلەییانە،
یای خەزاڵ گیانە!
ئەتوو دڵت نەترسێ بەو قسانە.
هەمووم هەروەکو دایک و خوشکانە».
یای خەزاڵ وەکو کەللەی شەکری،
تەدارەکێکی لە بۆ لاسی باڵەکی دەگری،
ئەگەر لاس دە ئەسپابی خۆی دەفکری،
دەڵێ: «یارەبی، یای خەزاڵ لە چاوی منت کەوێ و نەمری!»
کێ بوو لە لاسی نەوجوانە،
تەدارەکی بۆ گرت بڕوا بۆ نێو عێلی باڵەکیانە،
خانزادخان دەڵێ: «ئەلحەمدولیلا شوکرانە،
لاسی باڵەکیم دێ میوانە.
ئامۆزای خۆمە سەرکردەی هەموو عێلانە
ئینجا تەدارەکی بۆ لاسی بگرن، دەیکەم بە زێڕەوشانە.

چل شەکم بۆ بێننەوە ئەویشی بۆ دەکەم بەخێر و قوربانە.
بەس نییە دژمن دەڵێ: لاسی باڵەکی هاتەوە ئێرەکانە.
دەبێنن سوارە و تفەنگچییان، بدەن لە سانە
ئەلحەمدولیللا لاس هاتەوە لەنێو عێلەکەی ماموودینانە.
خەبەری یای خەزاڵم بۆ بێنن، دەگەڵم وەکو خوشکانە.
لاسی ناردۆتەوە ئێرەکانە،
پێڵاوی لەسەر چاوانە
بۆم بەتاڵ بکەن مدبەق و چادر و باڵەخانە،
لاس تەشریفی هاتۆتەوە هەموو دێنە کنی ئەو عێلانە».
ئینجا ئەگەر ئەو تەدارەکی بۆ لاسی دەگیرێ خانزادخانی حەریرێ؛ لاس ناگاتە ماڵێ خانزادێ، لەوسەری هۆبەی جلەوی دەگیرێ.
خانزادخان دەڵێ: «لاسەشۆڕی باڵەکی! پێناودارم بی، ئەوێ ڕۆژێ دیوانی خوڵای دەگیرێ.
وای لە خۆم بێ باب و ئێخسیرێ،
لاسەشۆڕ! نابێ ئەتوو ئەمەگی دایکە قەلەندەرەکەی منت وەبیرێ،
یارەبی ئەتوو وەک کاکەمەمی جوانەمەرگ بی، ئەگەر بەجێ ما لە شاری جزیرێ».
لاس سێ شەو و ڕۆژان لەنێو عێلی باڵەکیان بوو پیاوە،
قەول و قەراری دەگەڵ عێل و کەیخوادی خۆی ڕۆناوە.
لاس دەڵێ: «ئەو قەراری دەگەڵ خەزاڵم کرد، جا بووە تەواوە،
کەیخوادی عێلی باڵەکیان ئەوا دەڕۆم دەوڵەت زیاد و ماڵ ئاوا».
پیاوێک دەڵێ: «لاسەشۆڕ! ئاخر تەدارەکت بۆ لەکن خانزادخانی گیراوە؛
ئاخر وەرە بچینە کن ئەوی لێ بکە سڵاوە؛
ئاخر دایک و بابی نین لە توو زیاتر کەسی نەماوە،
هەزار و حەوسەد ماڵی هەیە، لە سوێی توو لێی شێواوە».
لاس دەڵێ: «کەیخواد، ڕدێنسپیانە!
سوێندم بەسەری خەزاڵێ خواردووە، چی دی گیر نابم لێرانە.
ئەگەر درەنگ بچمەوە، خەزاڵ لێم دەکا گلەییانە»
کێ بوو لە لاسی گەرم کۆڵاوە،




ماینێ شێ خزیان بۆ هێنا، پێی دە ڕکێفی ناوە؛
ئەگەر وەنێو زینی کەوت، ئاغایەکی تەواوە،
دەیگوت: «عێلی باڵەکیان! دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا»
خەبەر بە خانزادخانی حەریرێ دراوە.
خانزاد دەڵێ: «هاوار وەبەر ئەو خولایەی دونیا و قیامەتی کردووە ڕاوەستاوە
بانگم وەبەر ئەو خولایەی حەزرەتی مووسای لە نووریَ خلقەت کردووە و ڕۆژێ هەزار و یەک کەلیمەی لە بارەگای وی دەکرد تەواوە.
یاڕەبی لاسەشۆڕ، هەڕۆ، بڕۆ، سەر نەیەنیەوە دواوە
بزانە دەگەڵ ئەو عێل و مەخلووقەی چم لێ قەوماوە:
هەزار و حەوسەد ماڵی باڵەکان بەسەر ئەمندا بەجێ ماوە».
لاس دەنێو عێلی باڵەکیان بۆ نێو ماموودینان گەڕاوە،
ئێلچی و چەپەر مزگێنییان بۆ یای خەزاڵێ هێناوە.
قاسـید دەیگوت: «یای خەزاڵ! بەســەری توو، لاس دەهاتــەوە، خانزادخانی نەدی بەچاوە؛
ئەگەر خەیاڵی بکەی لەبزی لە لەبزی نەگەڕاوە».
خەزاڵ دەڵێ:
«یا خولا! بەخێرێتەوە تەدارکێکی چاکی بۆ گیراوە».
لاس لە زینوێ و بانووانی دەکرد ڕەشەڕاوە.
کەرویشکێکی گەرمەلانێی دەگرت بەدیاری و سەوقاتی بۆ یای خەزاڵێ هێناوە.
لاس گەییە جێ، لە دەرکی چادرێ دەبوو پیاوە،
دەچوو لە یای خەزاڵی دەکرد سەلام و سەڵاوە.
یای خەزاڵ دەڵێ:
«عەلەیکوموسەلام و ڕەحمەتوڵڵاهی، سەرچاوی من شۆڕەلاوە،
وەرە دانیشە، بزانم لە وڵاتی باڵەکیان چت داوە، چت لێ قەوماوە؟»
دەڵێ: «یای خەزاڵ بەسەری توو لەبزم دە لەبزی خانزادخانێ نەگەڕاوە؛
گەلێک گەلێکم دڵخۆشی عێلەکەی داوە.
یای خەزاڵ، زۆرت لە خەجاڵەتم، پێشکێش و ئەنعامم بۆ توو نەهێناوە.
لە عەیبەت خانزادەخانێ هەر وەدەرکەوتم، هاتمەوە بەدواوە».

یای خەزاڵ دەڵێ:

«هیچم پێ ناوێ لاسەشۆڕ وەکازی دەستانم.

ئەمن خانەخوێ، بووی میوانم.

ئینجا تەرخان بە لە مەمکانم».

لاس لەوێ دەبێ هەتا سبحەیانێ،

ئەوێ شەوێ خۆش ڕادەبرێ دەگەڵ گوزەرانێ.

ســبحەینێ خەزاڵ زویر و زگار داما. لاس لێی پرسی: «یای خەزاڵ ئەو حاجزییەت بۆ چییە؟»

یای خەزاڵ دەڵێ:

«لاسەشۆڕ! خۆ من لەبەر ئەتووم نییە،

ئەوە لە لایەکی دییە، کارێکی دییە».

گوتی: «بەسەری من، پێم بڵێ، بزانە ئەوە چییە».

یای خەزاڵ دەڵێ:

«بەسەری خۆت سوێنت داوم، چ بکەم، چارەم چییە؟

ئەگەر بێتو پێت نەڵێم، دەبێ بە غەیانەتییە،

ئەگەر درۆشت دەگەڵ بکەم، ئەوەش دەبێ بە ڕووڕەشییە،

ئەگەر لەو قسەی بگەڕێی، دەنگکردنی چاک نییە».

لاس دەڵێ:

«یای خەزاڵ! بەسەری توو هەر دەبێ پێم بڵێی چارە نییە».

یای خەزاڵ دەڵێ:

«چ بکەم ئەوەیش بۆ من دەبێتە خەم، ئەمن بابان وێرانێ

پێیان گوتم: گوڵی شۆڕانێ هەن لە چل پلەی عومانێ

چرا و لالەت ناوێ سەریەخۆ، دایسێ هەتا سبحەیانێ».

لاس دەڵێ:

«یای خەزاڵ! بزانە چۆن کارانت بۆ پێک دێنم.

یای سەری خۆم نایەنمەوە، یان گوڵی شۆڕانێت بۆ دێنم».

لاس دەڵێ:

«ماینی شێ خزم بۆ دەرێنن بەیەکجاری،




ڕمبی ئەزەریم بۆ بێنن دەگەڵ جووتە زەرگی خوندکاری،

خۆم دەسپێرم بە خولاّ و بە جەباری.

یا سەری خۆم دادەنێم یا گوڵی شۆڕانێ دێنم بە دیاری».

یای خەزاڵ دەڵێ:

«چ بکەم ئەمنی سەر بەتاڵ و مل بەکوێنە»

ماینی شێخزیان بۆ لە بەهاربەندێ دەرهێنا،

دە پشتیان دەکردەوە زینە،

هەگبەیان بۆ دەهێنا،

پڕیان کرد لە نانی شەکرینە.

لاس دەڵێ:

«یای خەزاڵ! ئەتوو ئەو هەگبەت بۆ چییە؟

ئەنگۆ بۆم بێنن ڕەمبێکی ئەزەری، کەوایەکی دوولاییە.

زەواد ناچێتە سەر زاری هەتا گوڵی شۆڕانێت بۆ نەهێنم بە دیارییە».

لاس ماڵئاوایی کرد، ڕۆی. خانزادخان پێی زانی هەزار و حەوسەد ماڵێ عێل بوو، بردی لەسەر ڕێی لاسی چادریان هەڵدا.

خانزادخان گوتی: «دەیگێڕمەوە ئەوە دینێرن بەکوشتی بدەن».

لاس ئاژوای هەتا گەیشتە عێلی خۆی، بەکن چادری خانزادخانێدا ڕۆیی گوتی: «ماڵە! چۆڕێکم ئاو بدەنێ». خانزادخان گوتی: «ســوار پیاو بە». لاس گوتی: «ناتوانم، دەبێ بڕۆم، سوێنددراوم». لاس خانزادخانی نەناسییەوە؛ جا خانزاد دەڵێ:

«ئەتوو، عەمرم، بۆچی نابی پیاوە؟

ئاخر نازانی ئەوە عێلی تۆیە بەبێ ئاغای بەجێ ماوە؟

بەقسەی ئەو قاعبەی دەتنێرنە چل پلەی عومانێ هەتا سەر نەیەنیەوە دواوە».

لاس دەڵێ:

«قاعبە! بۆ جنێوت بە خەزاڵێ دا، وات نە کرد پیاویم، نە نانت بخۆم نە ئاوە نازانی، ســوێندخۆری خەزاڵێم هەتا گوڵی چل پلەی عومانێ نەیێنم لە هیچ کوێ نابم پیاوە».

لە چادران دەردەچوو جا ڕکێفی لێ داوە.

خانزاد دەڵێ: «جا قوڕی کوێ وەسەری خۆ بکەم؛ ئەوجار نایەتەوە بەدواوە».

لاس ڕکێفی لێ دا تا چووە چل پلەی عومانێ.
تەماشا دەکا چوار پاڵەوان دەگەڕێن دەکەن سەیرانێ.
ئەگەر لاسەشۆڕیان دی لە زەمانی،
هەریەکە گورزێکی گەورەیان دانا لەسەر شانی
لاس دەستی دا ڕمبی نەزەری، گوتی: «بڵێن ئەوانە بکوژم بلا سەرکردە پێ بزانێ
سێیانی سەر بڕی، ئەوی دی گوێ پچڕی: «خەبەرێ بۆ سەرکردە بەرە بلا پێ بزانێ
ئەگەر لێی پرسی، ئەوە کێ بوو، بڵێ: ئەوە لاسەشۆڕی باڵەکییە؛
بە قسەی خەزاڵێ هاتووە بۆ گوڵی عومانێ،
خەبەرێ بدە بە سەرکردەکانی دی، بلا هەموو پێ بزانێ».
جا ئەگەر پاڵەوان خەبەری بە سەرکردەی داوە،
سەرکردە دەڵێ: «ئەی پاڵەوانی من، ئەوە چ بووە؟ چوو لێ قەوماوە؟»
دەڵێ: پاڵەوانێکە هاتووە لەولاوە،
دەڵێ: ئەمن لاسی باڵەکیم، موژدەی بدە بە پاڵەوانان تەواوە،
ئەمن لاسی باڵەکیم بۆ گوڵی شۆڕانی هاتووم تەواوە.
ئەگەر خەبەر بە هەموو سەرکردان دراوە،
هەمووی خڕبۆوە، هاتەوە لەولاوە،
هەمووی ئیکلامی لاسەشۆڕی باڵەکیان کێشاوە،
هەمووی لەبەر دەستی ڕاوەستان دەتگوت ئێخسیرن، لێیان قەوماوە.
دەیگوت: یان دەبێ شەڕێم دەگەڵ بکەن، یا دەبێ چل پلەی عومانێ بکەن بڵاوە.
دەیگوت: هەموو پاڵەوان و بەناوین،
دەیگوت: ئەتوو دەفەرمووی نۆکەرین ڕاوەستاوین.
دەیگوت: دەنا دە بڕۆن، ڕامەمێنن،
حوکمە دەبێ چل گوڵی شۆڕانێ بۆ بێنن.
گوڵی جسن بن خەزاڵێ نەڕەنجێنن!
بنێرن حاجی و مەلای شاری عومانێ بێنن،
حوکمە دەبێ ئەو چل پلانە هەموو برووخێنن».
کێ بوو لەو پاڵەوانانە تەواوە،
بەو شەوەی چل گوڵیان گوڵی شۆڕانی هێناوە،




دەسک بەدەسکیان کرد، دە هەگبەی لاسیان ناوە،
بە ئاوریشمی دووکانێ پێچراوە،
فەعلەیان هێنا چل پلە هەمووی ڕووخاوە،
خەڵکی شاری عومانێ هەموو دەستەودوعا بۆ لاسی باڵەکی ڕاوەستاوە.
لاس دەڵێ:
«خزمینە! دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا»
گوڵی شۆڕانی هێنا و گەڕاوە بەدواوە،
هەتا گەییە چادری خانزادخانێ، جا لەوێندەرێ، لە چادرێی لاداوە،
خانزادخان دەڵێ:
«ئامۆزا بەقوربانت بم وەرە، ببە پیاوە
وەرە، لەکن ئەمن بخۆ پاروێک نان و چۆڕێک ئاوە.
چەند ڕۆژە، دە زەحمەت دای، گەلێکت کوێرەوەری کێشاوە».
لاس دەڵێ:
«خانزادە! ناتەواوە
وات نەکرد؛ نە نانت نخۆم نە ئاوە،
«ئەتوو بۆچی جنێوت بە خەزاڵێ بەڵەک چاو داوە؟
سوێندم بە سەری خەزاڵێ خواردووە، لە هیچ کوێ نابم پیاوە».
خانزادخان دەڵی:
«لاسی بەڵەک چاوە!
بە قسەی ئەو قاعبەی جارێکی سەر نایەنیەوە دواوە.
هەڕۆ، بڕۆ، بە خوڵام بە زامن نەدای تەواوە
ڕەبی، لەو مەخسوودەی نەبینی مراد و کاوە»
خانزاد دەڵێ:
«لاس ئەتوو بۆ وا بێ فکری؟
نازانی، عێلاتی خۆت ئەوا بە دووت دەگری؟
هەڕۆ، بڕۆ، ڕەبی تیری چڵکنان بتگری
جەدی پێغەمبەری نەفەسی پیرخدری
یای خەزاڵ ئەو گوڵانەت بەساغ و سەلامەتی لی وەرنەگری».
ئەگــەر لە خزمەت خانزادەخانێ بەڕێ بوو، تووشـــی دوو ڕێیـــان بوو یەکی ڕێی چوار

ڕۆژان بوو یەکیان ڕێی شـــەو و ڕۆژێک بوو. ئەو ڕێی یەک ڕۆژەکەی زۆر بەترس بوو، ڕێی چـــوار ڕۆژەکـــە زۆر ئەمین بوو. لاس لە ڕێی یەک ڕۆژەی ڕۆیی، ئەو ڕێیەش وڵاتی چڵکنان بـــوو، کەس نەیدەوێرا بەو ڕێیەیدا بڕوا. لاس هەر ئەوەندەی زانی تیرێکیان ئاوێتێ. ئەگەر ئاوڕی داوە لە بڵندی بوو. لاس لە ژێرڵا زەرگێکی پێدادا کوشـــتی. لەسەرڕا هاتە خوارێ. یەکی دی تیرێکی ئاویت، لە ڕانی لاســـی دا، زینی دەگەڵ بڕی. گوتی: «وەڵڵاهی! دەری نایەنمەوە، هەتا بەدەستی خەزاڵێ دەرنەیە».

ئاژوای و هاتە خوارە.
هەتا دەگەییەوە عێلی ماموودینان ئەوجارە.
بەپیریەوە دەهات مەخلووق و یای خەزاڵێ نازدارە.
یای خەزاڵ دەڵێ:
«بەخێرێیەوە، سەر چاوی من، شۆڕەسوارە»
لاس دەڵێ:
«سەلامونعەلەیکوم دووبارە».
خەزاڵ دەڵێ:
«ئەتوو پێم بڵێ جارێ شۆڕانێت بەبێ کوێرەوەری هێناوە؟»
گوتی: «بەبێ کوێرەوەری هاتم، ئەمما تیرێکتان لە ڕانی من داوە:
سوێندم خوارد، گوتم: دەری نایەنم، هەتا نەیبینێ خەزاڵێ بەڵەک چاوە».
خەزاڵ دەستی دا تیرەکە؛ هەرچەندی کرد بۆی هەڵنەکشاوە.
خەزاڵ دەڵێ:
«چ بکەم، چاوم کوێر بوو، سەرم دە قوڕێ نراوە».
خەزاڵ حوکمی کرد، تیرەکەی هەڵکێشاوە،
لاس بێ هۆش بوو، زمانی شکاوە.
ناردی، حەکیم و عەتاری بۆ وی هێناوە؛
حەکیمی لەسەر برینی وی داناوە؛
خەبەری بە خانزادخانی حەرێری داوە.
گوتی: «وەڵڵاهی! نایەمە سەری، بەقسەی ئەو قەعبەی وای لێ قەوماوە.
جەهەندەم! با لەوێش بڕوا بەولاوە».
کێ بوو لە لاسی بەناز و ئەرجوو،
ئەلحەمدولیللا! برینەکانی پێکەوە خۆش بوو،




لاس لەو دەردەش ڕزگار ئەوا بوو.
لاس هەڵستا بەپێی خۆی دەگەڕاوە.
ڕۆژێکی سواربوو، دەیکرد ڕەشەڕاوە،
برینەکانی چاک نەبوونەوە، سەرلەنوێ دەکولاوە.
هەرچەند حەکیمی هاتە سەرێ عیلاجی نەکراوە،
بێ هۆش بوو، زمانی شکاوە.
خەزاڵ دەنگی خەڵقی دەدا، دووبارە لە خانزادخانێ گێڕاوە؛
خانزادەخان بە عێلەوە خۆی دە قوڕێ ناوە،
گەییبە ولاتی مامودینان، دەیگوت: «ئەوە چ لە لاسی قەوماوە؟»
دەیانگوت: «نەخۆشێکی گەلێک تەواوە».
خەزاڵ و خانزاد دەچوونە سەر لاسی ڕۆدەنیشتن تەواوە.
خانزاد دەڵێ:
«مەلایان بانگ بکەن، نخوێنن یاسینێ
کورە کوڕەی باڵەکیان بانگ بکەن؛ بکەنەوە گەرمەشینێ؛
فەقێ و سۆفییان بانگ بکەن، لە خولای بپاڕێنەوە، بکەنەوە ئامین ئامینێ،
دەشقەم لاسی باڵەکی ئەوجار نەمرێ بەوێ برینێ».
خولایە! کەرەمدار و قادری!
میوانی خولای دێ، ڕووحێ لە لاسی وەردەگری،
ئەوجار بەجارێکی لاس دەمری و ڕادەبری
خانزاد و خەزاڵ قوڕێ لە خۆی دەگری.
لاسیان هەڵگرت و بردیان لە بۆ قەبری.
دە قەبریان نا، لەوێ بەجێ ماوە،
خانزادەخان بەدڵشکستی بۆ نێو عێلی باڵەکیان گەڕاوە؟
خەزاڵ لەوێندەرێ بەجێ ماوە.
خولایە! ئەتوو گەورە و نادری
بڕوانە ئەقلێ (ڕەحمان بەکری)
قەدری (ساحێبی ئاڵمانی) چۆن ڕادەگری،
ڕەببی، (ساحیبی ئاڵمانی) بۆ خاتری دایک و خوشکی خۆت نەمری

***



## ناسر و ماڵ ماڵ

مەزن و میرزاغا، ئاغای وڵاتی کوێستانێ بوون. کوێستانەکەش گاگاش باوۆمەر بوو. لە بەغدایە دەگەڵ کیای، برادەر بوون. سێ و دوو ساڵان مەزنایەتیی کوێستانیان کرد. جا مەزن باوۆمەر لەوان پەیدابوو؛ مەزنایەتیی لێ بڕینەوە، حەوت ساڵان مەزن بوو. ناسر و ماڵ ماڵ کوڕی مەزن و میرئاغا بوون. گەورە بوون. مەزن باوۆمەر سێ کچی بوون، یەکێکیان نێوی خاتوون تەورێزی بوو، ئەویدی خاتوون ئەسمەر، سێیەمین خاتوون پەروەر. حەزیان لە ناسر و ماڵ ماڵان کرد. خاتوون تەورێزی بۆ ماڵ ماڵی، خاتوون ئەسمەر بۆ ناسری. ناردیانە کن مەزن باوۆمەری، کچێمان بداتێ بۆ ناسر و ماڵ ماڵان؛ مەزن باوۆمەر نەیدانێ. کچەکان سبحەینێ چوونە سەر کانییە، شیو و کولێ بکەن. ناسر و ماڵ ماڵ هاتنە کن کچەکان؛ گوتیان: «ئەوە بابو ناودا؛ وەرن دەگەڵمان، هەڵوگرین». خاتوون تەورێزی گوتی: «ئەنگۆ پیاو نین، دەوەرن سوێندی بۆ یەک بخۆین نە ئەمە مێردی دەکەین، نە ئەنگۆ ژنێ بێنن. هەستن؛ بڕۆنە بەغدایە کن ئاغای خۆتان؛ یان بمرن، یان مەنسەبی بستێنن». ماڵ ماڵ گوتی: «کاکە ناسرا بەخوڵای، چاک دەڵێن. ئەوان لەمە بەغیرەتترن».

بازیبەندیان لە قۆڵی خۆیان دەرهێنا؛ هەر چوار سوێندیان خوارد. بازن و مۆرییان پێکەوە گۆڕینەوە، دەوڵەت زیادیان خواست؛ سوار بوون.

کاکە ناسر دەڵێتەوە کاکە ماڵ ماڵییە:

«خوڵاکەی چییە ئەو دنیا فانییە،
دەبڵا برۆینە خزمەت وەزیری بەغدایە بە نۆکەرییە».
کاکە ماڵ ماڵ دەڵێتەوە کاکە ناسرییە:
«ئەمە لە خاتوون تەورێزی و خاتوون ئەسمەرێ وە چەنگن کەوت خاترجەمییە؛
جا دنیای ڕوون چ فایدەی هەیە، چی دی قبوول ناکەم ئەو حیزییە،
دەچمە کن وەزیری بەغدایە بۆ نۆکەرییە،
یان سەرم دەچێ بە یەکجارەکییە،
یان دێمەوە بەئیزنی خوڵای بەئاغایەتییە».
ناسر دەڵێ: «ماڵ ماڵ دڵم لە کاوە،
تیرێکیان لە بەدەنێ دام، جگەرم سووتاوە،
دایک و بابمان لە وڵاتی غوربەت بەجێ ماوە،
دەنا ئەو سەفەرە هەر بۆ من چاکە، سەفەرێکی تەواوە.
خاتوون تەورێزی؛ خوشکێ دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا»
خاتوون تەورێزی دەڵێ:
«چ بکەم، براڵە، لێم مەدە تانێ
هەڕۆ، بڕۆ بە خوڵات بەزامن دەدەم، بەئەمانەت بەپێغەمبەری ئاخر زەمانێ.
ئەگەر بەبێ مەنسەب بێیەوە، براڵە، لەو وڵاتەی ناکەی گوزەرانێ».
خاتوون ئەسمەر دەڵی:
«ماڵ ماڵ ! ئەگەر دەڕۆی، کوێرم دەبێ چاوە.
دەبێ بچنە کن دایک و بابانو، بڵێن دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا
ئەگەر ئەو گەردنو ئازا بکەن، مەخسوود و حاسڵ دەبێ، لە خزمەت میری بەغدایە
کارو دەبێ تەواوە».
دەڵێ: «خوشکێ! دەترسم، بابم نەیەڵێ بچم، بڵێ: بگەڕێیەوە دواوە».
جا جووتە سوارە، سوار بوون و لەوێ گەڕانەوە بەدواوە،
هەتا دەهاتنە دەرکی دایک و بابی خۆیان لەوێ دەبوونەوە پیاوە،
ناسر و ماڵ مال دەڵێن:
«دایک و بابی مە سەفەری بەغدایەمان وەبەرکەوتووە گەلێک سەفەرێکی تەواوە.
چ حەیشێک لێرە بەکوێستانێ بۆ مە ماوە؟




ئینشالڵلا دەچینە بەغدایە، نایەینەوە هەتا کارن دەبێ تەواوە».
ناسر و ماڵ ماڵ گەلێک دەرفکری،
ئەوێ شەوێ لەکن دایک و بابانی دەگری.
دایکی ناسر و ماڵ ماڵان دەڵێن:
«ڕۆڵە! بڕۆن بە خولاو بەزامن دەدەم و دوومین بەحەزرەتی خدری،
ڕۆڵە! گەردنو ئازابێ، دەشقەمێ خولا دەستو بگرێ»
ئەگەر سوار بوون ئەو جووتە لاوە،
بانگێکی خۆشیان لێ داوە،
دەڵێن: «وڵاتی کوێستانمان بەدەستەوە نەماوە.
خەڵقی خێلاتی، دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا»
ڕێی بەغدایان پێ نیشان دەدەن سەبرسەبریان داژواوە.
چەند مەنزڵیان لێ خوری تا بیست و چواریان دەکرد تەواوە.
وەسبحەینێڕا داخیل بەبەغدایە دەبوون ئەو جووتە لاوە؛
بەکووچە و کۆلانی بەغدایەدا دەیانئاژواوە،
هەتا دەچنە دەرکی کیای دەبوون پیاوە.
ولاغیان لێ وەرگرتن بردیاننە یەختەخانێ، وەتاغیان بەوان نیشان داوە،
هەتا سێ ڕۆژان ڕۆنیشتن پرسیاریان لێ نەکراوە.
ڕۆژێکی کیای گوتی:
«ئەو میوانە کوێندەرین، لە خزمەت میری بێژراوە».
نۆکەر گوتی:
«نازانم؛ ئەوە کوێندەرین. نایانناسم، ئەمن چم لە میوانی توو داوە
لێی پرسم بلێم خەڵقی کوێی هاتووی لەولاوە؟»
کیای فەرمووی:
«نۆکەرەکەی بێ قەیدییە؛
بچۆ بزانە ئەو میوانانە کوێندەرین، حاجەتیان چییە.
ئەوە سێ شەوە لێرەن، بۆ هیچ سوال و جەوابیان دەگەڵ ئەمن نییە؟»
کێ بوو، لە نۆکەرەی جندییە،
دەچووە کن ناسر و ماڵ ماڵی بەیەکجارەکییە،

دەڵێ: «میوانینە! میر ئەمنی ناردۆتە کن ئەنگۆ بە ئێلچیگەرییە،
بزانم، ئەوە کوێندەرین و کاریان بەمن چییە».
ماڵ ماڵ دەڵێتەوە بەناسرییە:
«قاقەزێکی بۆ بنووسە بەدزییە؛
«بڵێ: ئەمە کوڕی مەزن و میرزاغای هاتووین، دەبینە نۆکەری وی بەیەکجارەکییە،
وڵاتێ کوێســـتانیان لێ بڕیوین، جا لە خۆڵای بەرەژێر، ئەگەر چارە نەکا، هیچ هومێدی دی نییە».
دەزبەجێ ناسر قاقەزی دەنووسیە.
مۆری لە ماڵ ماڵی وەرگرت، مۆری کرد بەیەکجارەکییە.
گوتی: عەرزی بکە، خەتم ڕەوان نەبوو، ئەگەر عەیبێکی ببێ لێم نەکا بەگلەیییە.
قاقەزەکەی دا بە نۆکەری، گەڕاوە بەیەکجارەکییە،
چووە خزمەت کیای، قاقەزی لە پێش دانا گوتی: «ئەوهە چییە؟
نۆکەر گوتی:
«ئاغا، خولا بتکا ڕاوەستاوە
ئەمن چووزانم، قاقەزە بۆ توو نووسراوە».
میر قاقەزەکەی مولاعەزە کرد، داینا لەسەر چاوە،
گوتی: «ئەوە برازای منن لێیان قەوماوە».
جا کە سبحەینێ بەیانی داوە،
تەدارەکی ناسر و ماڵ ماڵان لە ماڵی کیای گیراوە.
کیای فەرمووی:
«ئەوە مەحرەمی ماڵە منن؛ بۆچی ئەو وەتاغە و بەوان داوە؟»
کیا وای گوت بەو نۆکەرانە:
«خەڵاتی بۆ ناسر و ماڵ ماڵی بەرن، بیانئێننە ئێرەکانە».
خەڵاتیان بۆ بردن، ئاویتیانە سەرشانانە،
ڕێی خەڵاتی کردن بەزێڕەوشانە،
لە پلیکانان دەهاتنە خوارێ ئەو نەوجوانانە،
دەچوونە خزمەت کیای بەئیکلام کێشانە،
کیا ماچی کردن، دەستی ئاویتنە ئەستۆیانە،





دەڵێ: «ڕۆڵە! بەخێرێن. ئەگەر تەنگانەو بوو، بۆچی وا درەنگ هاتنە ئێرەکانە؟
تا مەعموورم بناردایە کوێستانێ گاگەش باوۆمەری ماڵی مەزنم بکردایە تاڵانە؛
ئێخسیری مەزن باوۆمەرم، دەهێنا بەغدای گەورە و گرانە.
ئێستا ئەوا بۆخۆم لێرە ڕاوەستاوم؛ هەرچی ئەنگۆ دەڵێن بەسەر ئەو چاوانە.
دەبێ سبحەینێ هەڵگرن زێڕ و ماڵی من، بچنە بەغدایە، سەودایە بکەن، دەگەڵ ئەو تاجرانە،
هەتا عەرزی وەزیرەلئەعزەمی دەکەم، چلۆن دەبێ ئەو کارانە.
دەڵێم: وەزیر بتبم بەقوربانە.
جووتە برازاکەی من ئاغای کوێستانێ بوون بەعەمباڵ لەو شارانە؛
خولا لێت هەڵناگرێ لە پیاوی نەجیم تێک بدەی تەخت و مەکانە».
ناسر و ماڵ ماڵ دەڵێن:
«یارەبی، زۆر شوکر لە دنیایە!
وڵاتی کویستانێمان لێ بەجێ ما لە بۆ سەفایە؛
ئێستا هومێدی وەک کیامان هەیە لە بەغدایە.
جا سبحەینێ دەچینە بازارێ، دەس دەکەین بەساد و سەودایە؛»
کە سبحەینێ بەیانی بەردا ڕۆژ سەری دەرهێناوە،
کەوڵی خۆیان بەسەر شانی خۆیاندا دەدواە،
دە هەموو شاری بەغدایە گەڕان، قێمەت و نرخی شتیان ڕۆناوە هاتنەوە ماڵی کیای، مەنزڵیان بۆ گێڕاوە
کیاش لە دیوانێ خەبەری بەوەزیری بەغدایە داوە.
ئەوێ شەوێ قەناعەتیان کرد؛ قاقەزی خاتوون تەورێزی و خاتوون ئەسمەرێ هاتووە لەولاوە:
«چ بکەین؛ ئەمە سوێندخۆری قورعانێین، خراپمان لێ قەوماوە!
کوردێکی کەڵاش درێژی شارەزووری بەسەر خاتوون تەورێزییێ هەڵوەستاوە».
ئەو قاقەزەیان برد لە پێش کیایان داناوە.
کیا دەڵێ:
«ڕۆڵە ماڵ ماڵ! ئەو ناحەقییە لە من کراوە.
سەبرو ببێ هەتا لەکن وەزیری هەموو کارێکی دەکەم تەواوە»

هەڵستان، بۆ مەنزڵی خۆیان گەڕانەوە بەدواوە.
جا کە سبحەینێ ڕۆژ سەری دەرهێناوە،
ناسر و ماڵ ماڵ چوون لە بۆ بازاڕێ تەواوە،
سەودایان دەکرد، بازاڕیان وەسەر خۆیان دەگێڕاوە.
ئەوێ ڕۆژێ خێرێکی زۆریان کرد؛ پێنسەد تومانیان هێناوە.
کێ بوو، لە کیای موختاری،
دەچوو لە ناسر و ماڵ ماڵانی دەکرد پرسیارە،
دەڵێ: «ڕۆڵە! ئەوڕۆ چلۆنو ڕابوارد ڕۆژگارە؟»
دەڵێن: قوربان بەسایەی ئیلتیفاتی توو هاتین بەکارە.
سەودامان دەکرد هەزار بە هەزارە،
پاش موخاریجی خۆن هێناومانەتەوە ئەوجارە».
کیا دەڵێ:
«ئەمن قەت شوکرانە نابژێرم بەو کارە».
کێ بوو، لە ناسر و ماڵ ماڵی گوڵباوە،
سبحەینێ ئەگەر بەیانی دەدا، ڕۆژ سەری دەرهێناوە،
دیسان چوون لە بازاڕی بەغدایە، ساد و سەودایان بنیادناوە.
ئەگەر ڕۆژیان لێ بوو ئاوا، دووکانی هەموو کەس داخراوە،
نەیانزانی شێخی عەرەبان بۆ سەر بەغدایە هەڵستاوە،
شێخی عەرەبان دەورەی بەغدایەی گرت، چادری لێ هەڵداوە.
سبحەینێ ڕۆژ بۆوە خەبەر بۆ وەزیرەلئەعزەمی دراوە.
دەڵێن: «لەشکرێکی گەورە هاتووە، دەورەی بەغدازەمینێ گیراوە».
وەزیری بەغدایە گوتی بەئێلچییە:
«دەبڕۆ بەچەپەرییە،
بچۆ، بزانە سەرکردەی ئەو لەشکرەی کێیە، لە چی شەقییە.
ئەگەر میوانە، بۆچی نەهاتۆتە ئێرە، بەئەستۆی داهێناوم خەجاڵەتییە»
ئێلچی هەرای دەکرد بەهەنگاوە،
هەتا دەگەیییە چادری شێخی عەرەبان، ئیکلامی دەکێشاوە،
عەرزی دەکرد: «وەزیرەلئەعزەم ئەمنی ناردۆتە کن ئەتوو تەواوە،

بۆچ هاتووه لەوێی خستووه تەواوە، ئەو خەجاڵەتییەی بەمن داوە.
ئاخر ئێرە ماڵی وییە بۆ شام و نەهارم پێ نەدەبوو تەواوە؟»
شێخی عەرەبان دەڵێ:
«بەخێرێی سەر چاوانم،
عەرزی وەزیری بکە، ئەمن شێخی عەرەبانم،
ئەمن دۆست نیم، وەزیرەلئەعزەمی بەدژمن دەزانم،
ئەمن چلۆن ئەو ئێلچییە بدوێنم،
خەبەری بە وەزیرەلئەعزەمی ڕادەگەیەنم؟
یا دەبێ بەغدایە بەجێ بێڵێ، یانە هەستەی حەوت ساڵانی لێ دەستێنم».
ئەگەر ئێلچی ئەو قسەی دەبیست تەواوە،
دەموودەست لەکن شێخی عەرەبان گەڕاوە،
گەییە خزمەت وەزیری، ئەو خەبەرە خۆشەی بەوی داوە.
وەزیر گوتی:
«کیا بێنن، بزانین ئەو تەگبیرە چلۆن دەکرێ تەواوە».
ئەگەر خەبەر بە کیای دراوە،
ناردی لە ناسر و ماڵ ماڵی گێڕاوە؛
دەهاتە دیوانی وەزیرەلئەعزەمی، ئیکلامی کێشاوە.
کیا ڕۆدەنیشت بەعزێکیان قسە دەکرد تەواوە.
کە وەزیر سەری هەڵێنا، جووتێک غەریبە لێرە ڕاوەستاوە،
وەزیر دەڵێ:
«کیا ئەو نۆکەرانەت کەنگێ گیراوە؟»
دەڵێ: «ئەوە نۆکەری من نین، ئی توون، لێیان قەوماوە.
«مەزن باوۆمەر لە کوێستانێ دەری کردوون، هەمووی کردوون بڵاوە.
«ئێستا قەت نانی شەوێکیان بەمستەوە نەماوە».
وەزیرەلئەعزەم دەڵێ:
«جارێ چ بکەین، دەگەڵ شێخی عەرەبانمان لێ قەوماوە».
کیا دەڵێ:
«بنێرە خزمەت شێخی عەرەبان: مۆڵەتم لێ بگرێ، هێشتا کاروبارم نەبووە تەواوە».

ئەگەر کیا وای گوتییە،
وەزیرەلئەعزەم دەینارده کن شێخی عەرەبان قاقەز و ئێلچییە،
شێخی عەرەبان فەرمووی:
«ئەمن لە هەستەی حەوت ساڵان زیاتر چی دیم تەڵەب نییە».
ئەگەر شێخی عەرەبان وای جواب داوە،
قاسیدی وەزیرەلئەعزەم بە پەلەپەل گەڕاوە،
موژدەی بۆ وەزیرەلئەعزەم هێنا دەڵێ:
«قوربان! خەرجی حەوت ساڵانم دەوێ تەواوە».
وەزیرەلئەعزەم بەوەی زۆر مەشغووڵ ماوە:
«خولایە! ئەمن هەر خەرجم لە خەڵقی نەستاندووە چم بەکەس نەداوە.
دەنگی لەشکری بەغدایە بدەن، ئینشاڵلا سبحەینێ دەیکەم بلاوە»
قاقەزێکی شـــێخی عەرەبان بۆ وەزیرەلئەعزەمی هات: «هەتا مانگێکی خەرجی من بدا موخاریجم بکێشێ؛ ئەوا مۆڵەتم داوە».
وەزیرەلئەعزەمی دەکا فکرێ:
«سبحەینێ دەعوایە، موخاریجی وی بە من نادرێ».
کێ بوو لە کیای ڕدێن سپیە؟
بانگی کردە ناسر و ماڵ ماڵییە:
«بۆچ ئەنگۆ سەرباز و قۆشەنو لە وڵاتی کوێستانێ نییە؟»
کاکە ماڵ ماڵ و ناسر عەرزیان کرد بە کیای:
ئەتوو شێتی ئەقڵت نییە؟
بۆچ ئەتوو ئاگات لە دەردی مە نییە؟
بۆ نازانی، لە کوێستانێ کاگەش باوۆمەری هیچمان بەچەنگ نییە؟
بۆیە خۆمان ئەویتۆتە بەغدایە کن مامان بەنۆکەرییە،
ئەمە نابێ بچینەوە هەتا حەوت ساڵی دییە،
مەسڵەحەت ئەوەیە مەرەخەس بفەرمووی، بچنەوە سەودای بازاڕییە؛
جارێ وەزیرەلئەعزەم شلووقە، هیچ ئاگای لە خۆی نییە.
هەتا وەکو کیا و ناسر و ماڵ ماڵ ئەو قسەیان دەکرد تەواوە،
وەزیری بەغدایە دەنگی لەشکری خۆی داوە، دەڵێ:




«سبحەینێ شەڕە، نازانم دەگەڵ کێم لێ قەوماوە.
بابە ئەمن لە ماڵە خۆم دانیشتووم خولاگیربی، چت لەمن داوە».
سبحەینێ ئەگەر ئافتاو دەرپەڕییە،
ماڵ ماڵ ئەوێ ڕۆژێ دەهاتە بازاڕییە،
دەیدی لە هەموو دووکانە وەستا ڕۆنیشتبوو، سەرە ڕمب چاکردنە چەخماخ دروستکردنە، سیوانکارییە.
ماڵ ماڵ دەڵی:
«مامۆستا بازاڕ شلووغە، ئەوە چییە؟»
دەڵی: بڕۆ بەولاوە؛ ئەوڕۆ کارم هەیە، چت لەمن داوە؟
ماڵ ماڵ دەڵێ:
«بەخولای ئاسمانێ!
«ئەگەر پێم نەڵێی چەکوچت لێ وەردەگرم، سەرت دادەنێم لەسەر سندانێ».
کە وەستای شیرگەر سەری هەڵێناوە،
تەماشای کرد کاک ماڵ ماڵ ڕاوەستاوە.
مامۆستا دەڵی:
«بمبەخشە، کاک ماڵ ماڵ. بەخولای ئەتووم نەناسییە،
هەڵبەت ئەتوو بەو خەبەرەت نەزانییە،
دەڵێن: شێخی عەرەبان هاتووە دەگەڵ وەزیرەلئەعزەمی شەڕییە،
ئەمنیش کارم هەبوو، بۆیە ئاگام لە توو نییە
ماڵ ماڵ ئەگەر ئەو قسەی دەبیست تەواوە،
دە شوێنی خۆیڕا ڕاس گەڕاوە بەدواوە،
هەتا دەهات و لە ناسری دەکرد سەلام و سەلاوە.
ماڵ مال دەڵی:
«ناسر، نازانی چ قەوماوە؟»
کاک ناسر دەڵی:
«ماڵ ماڵ، ئاگام لێ نییە،
«پێم بفەرموو ئەوە چییە»
ماڵ ماڵ دەڵێ:

«براله! شێخی عەرەبان هاتووە دەگەڵ وەزیرەلئەعزەمی شەڕییە.
ئەگەر نەمرم، بژیم، بمێنم،
ماینێ شێ خزت بۆ لە خاوێ دەردێنم،
زینێکی مورسەتی لێ دەکەم، تەنگانی لێ دەچەسپێنم،
قۆڵی خۆمت بۆ دە زرێیەکی عالقە وردی داودی هەڵدێنم،
مەتاڵێکی حەیزەران و حەوت قوببەییت بۆ لە ملان دەشەتێنم،
دەستی خۆمت بۆ دە ڕمبێکی نەزەری وەردێنم.
جا براله! سبحەینێ یا لە مەیدانێ خۆم بەکوشت دەدەم، یانە نانت بۆ لە وەزیرەلئەعزەمی دەستێنم».
ناسر دەڵێتەوە ماڵ ماڵییە:
«براله! وا نییە، وەکی دییە»
ئەگەر نەمرم، بژیم، بمێنم،
ئەمن ماینی شی خز لە خاوێ دەردێنم،
ئەمن زینێکی مورسەتی لێ دەکەم، تەنگانی لێ دەشەتێنم،
ئەمن قۆڵی خۆم دە زرێیەکی ئاڵقە وردی داودی هەڵدێنم،
ئەمن مەتاڵێکی حەیزەران و حەوت قوببەیی لە ملان دەچەسپێنم،
ئەمن دەستی خۆم دە ڕمبێکی نەزەری هەڵدێنم،
سبحەینێ لە مەیدانێ، یا خۆم بە کوشت دەدەم، یان نانت بۆ لە وەزیری دەستێنم».
هەردووکیان تەدارەکی خۆیان دەگرت؛ خێوەتێکی دوو سەریان کڕی، ئەسپابی لەشکریان دروست کرد؛ بۆ سبحەینێ هاتنە خزمەت کیای: «قوربان! ئەمە سبحەینێ دێینە دەعوایە». کیا دەفەرمووی: «وەرن، هەڵدەن لە تەرەفێکەوە». سبحەینێ لە بەغدایە دەنگی لەشکری درا، وەدەرکەوت قۆشەن لە دەورەی بەغدایە ورت. وەزیرەلئەعزەم دەسەر شێخی عەرەبانی کرد:
«ئەمن جەنگی مەغلووبەی ناکەم، سبحەینێ مەیدانارییە».
شێخی عەرەبان فەرمووی:
بەچاوان! سبحەیانێ
ئەگەر ڕۆژهەلات، ئینشاڵلا دەگرین گۆشەی دە مەیدانێ.
ئەگەر خەبەریان بەیەک داوە،




وەزیر هێنای، ساز و چەقەنە و لۆتی و ڕەقاسی داناوە،
دەڵێ: کێیە بۆ سبحەینێ دەستی لە سینگی خۆی داوە؟
سوباتێ بکا وەزیر بۆ خەڵات و بەراتێی ڕاوەستاوە،
هەر کەسێ سوباتم بۆ بکا مووچە و مواجبێکی زیادی بۆ دەکەم تەواوە.
سبحەینێ هەر کەس بۆخۆی چووە مەیدانێ دەستی دا شیری خۆی ڕاوەستاوە.
پاڵەوانی شێخی عەرەبان هات لەولاوە،
دەستیان بە داوایە کرد؛ ئی شێخی عەرەبان سەری پاڵەوانی وەزیریان بڕی، بردیانەوە بەدواوە؛
وەزیرەلئەعزەم زۆری خەمناک ماوە،
دەڵێ: «کیا! بزانە ئەمە چمان لێ قەوماوە
شێخی عەرەبان چی بەسەر ئەمەوە داوە.
دیسان ئەگەر سبحەینێ بەیانی داوە،
پاڵەوانی وەزیرەلئەعزەمی چوو لە مەیدانێ، ڕاوەستا، نەعرەتەی لێ دراوە؛
دوێنێ کێ بوو هات لە مەیدانێ ئەو سوباتەی کرد، ئەوڕۆش بێ واوە»
جووتێک پاڵەوانی شێخی عەرەبان ڕکێفی لێ داوە،
هات و گەییە مەیدانێ، دە پاڵەوانی وەزیری خوڕی: «ئەسپابان دانێ، بگەڕێوە دواوە»
پاڵەوانی وەزیری دەڵێ:
«ئەگەر نەمرم، بژیم، بمێنم،
زگت دەدڕم، هەرتک چاوت دەردێنم
ئەگەر نەمرم، سەری شێخی عەرەبانیش لە بۆ وەزیری دێنم».
ئەو پاڵەوانانە داوایان دەکرد لە مەیدانێ،
هەتا ڕۆژە وەردەگەڕا، دەگەییە مەحەلی چێشتانێ،
شێخی عەرەبان دەنێرێتە خزمەت وەزیری:
«بلا، ئەوڕۆ پاڵەوان وچانیان بێ، هەتا سبحەیانێ».
وەزیر فەرمووی:
وچاندان نییە، دەبێ یەکیان یەکێ بکوژن لە مەیدانێ
«بێ سووچ و تاوان بۆچی هاتۆتە سەرم، لێم دەبڕێ ڕێی گوزەرانێ؟

ئه‌من هومێدم خولایه ده‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری ئاخرزه‌مانێ»
پاڵه‌وانی شێخی عه‌ره‌بان سه‌ری پاڵه‌وانی وه‌زیری بڕی بردیه‌وه به‌دواوه،
وه‌ختێک به‌سه‌ردا هات ڕۆژئاوا،
ته‌ماشایان کرد، ته‌دارەکی دووَ غه‌ریبان گیراوه.
وه‌زیر گوتی:
«ئه‌وه کێن، دێن ده‌هانایه؟
ئه‌وه غه‌ریبه‌ن بێنه کن ئه‌من زۆریان بده‌مێ گه‌نج و خه‌زێنه و ماڵی دونیایه».
نایبی وه‌زیری چووه کن ئه‌وانه:
«وه‌رن؛ بابم، وه‌زیر ته‌ڵه‌بو ده‌کا به‌دڵ و به‌جانه».
ده‌ڵێن: «قوربان! نایه‌ینه کن وه‌زیره‌لئه‌عزه‌می، وه‌زیری گه‌لێک گه‌وره و گرانه.
ئه‌گه‌ر شێخی عه‌ربان به‌ده‌ستی به‌سته و سه‌ری شکسته هێنامانه ئێره‌کانه،
ئه‌وده‌می به وه‌زیره‌لئه‌عزه‌می عه‌رز بکه، جا به نۆکه‌رمان بزانه».
نایب هاته‌وه خزمه‌ت وه‌زیرییه:
گوتی: «نایب، ئه‌وه‌ت نه‌ناسییه؟»
نایب ده‌ڵێ: غه‌ریبه‌ی شارانن: نازانم نێویان چییه؟
یانه هێند مه‌ردی چاکه‌ن قبووڵ ناکه‌ن که‌مییه؛
یانه ئاشقن، ئاگایان له خۆیان نییه،
یانه ئه‌وه ڕووتن، لات و لووت، په‌یدا ده‌که‌ن نانییه».
کێ بوو له ناسر و ماڵ ماڵی نازداره،
نوێژی شێوان سواره بوون ئه‌و جووته برا و سواره.
یه‌ک ده‌چووه ئه‌وسه‌ری، یه‌ک ده‌چووه ئه‌وسه‌ری؛ به‌قۆشه‌نی شێخی عه‌ره‌باندا ده‌هاتنه خواره.
حه‌دی ماڵ نوستنان بوو، ده‌بوو به چریکه‌چریک و هاواره.
باب ده‌گه‌ییه گوڕی، لێی ده‌دا، ده‌یگوت: «نه‌یکه‌م قوتاره».
ماڵ ماڵ ده‌پێشدا گه‌ییه چادری شێخی عه‌ره‌بان، ڕسته‌ی هه‌ڵبڕی ئه‌وجاره.
شێخی عه‌ره‌بان ده‌په‌ڕی ڕمبێکی لێ دا، کردیه ئێخسیر به‌یه‌کجاره،
سه‌ری شێخی خوێنی پێدا ده‌هاته‌خواره.
ده‌وده‌میدا گه‌ییه ناسری نازداره.





گوتی: «شێخی عەرەبان هەر دەکوژم یەکجارە».
ماڵ ماڵ دەڵێ:
«ئەو غەڵەتەی مەکە، ئەوە ئێخسیری منە، بۆ وەزیری گەلێک بەکارە».
ناسر و ماڵ ماڵ شێخی عەرەبانیان گرت، بۆ مەنزڵی خۆیان هێنا خوارە.
گەینە مەنزڵی لەوێ بوون بەرقەرارە.
لەشکری شێخی عەرەبان تێک نیشتووە، ئاساری بڕا بەیەکجارە.
ناسر و ماڵ ماڵ دێن لەپێش شێخی عەرەبان، ڕادەوەستان ئەستۆ خوارە
شێخ دەیفەرموو: «ڕۆنیشن» ئیکلامیان دەکێشا سێ جارە.
گوتی: «ئەنگۆ چ کەسن؟» ناسر گوتی:
«قوربان! ئەو ئاغایە، ئەمنیش نۆکەرێکم لەوی دە بێکارە».
حوکمی کرد، ماڵ ماڵی دانا ئەو جارە،
دەگەڵ شێخی عەرەبانی کرد گوفتارە،
ئافتاوە و لەگەنی هێنا بەیەکجارە.
گوتی: «بێنە سەری خۆت بشۆ، بڕۆ نێو لەشکری خۆت ئەوجارە».
گوتی: «سەرم ناشۆم، ناگرم قەرارە؛
سوباتی ئەنگۆ لە عەرزێ نادەم، بەحەقی پادشای جەبارە
خوڵاگیری وەزیرەلئەعزەمی بووم، سەرم نابێ قوتارە».
لەوێ ڕۆنیشت، هەتا سبحەینێ بوون بەرقەرارە.
ناسر و ماڵ ماڵ گوتیان:
«قوربان! ئازادمان کردی؛ سەری خۆت هەڵگرە بڕۆوە خوارە».
گوتی: «سەرم ببڕن دەبێ سوباتی ئەنگۆ ببێ بەرقەرارە».
سبحەینێ هەڵستان و بۆ خزمەت وەزیری چوونە خوارە.
وەزیر لەسەر بەرماڵێ بوو، دەیگوت: «یاخوڵای کەرەمدارە!
ئەوجار لە چەنگی شێخی عەرەبانم بکەی ڕزگارە».
ئەگەر تەماشای کرد، دوو کەسان ئێخسیرێکیان هێنا خوارە.
دەیگوت: «خوڵایە! ئەوشەو شەڕ لە چ تەرەفێکی کراوە لەو شارە؟»
تەماشای کرد، سێ کەسان ئیکلام و تەمەنایان دەکێشا ئەوجارە.
وەزیر ئاوڕی دەداوە، تەماشای دەکا، ئەوە شێخی عەرەبانە، وا بێ ئیختیارە.

ڕاس بۆوە، قۆڵی گرت، لەکنە خۆی دادەنا ئەوجارە،
وەزیر دەڵێ:
«شێخی عەرەبان! ئەتوو عەرەبستانت پێ کەم بوو پێشکێشت بێ ئەو شارە،
بلا لە چەنگی توو ببم ڕزگارە».
شێخ دەڵی:
«ڕووڕەش بووم و خەجاڵەتبارە؛
بفەرموو، جەللابت بێن لە ئەستۆم دەن ئەوجارە.
وەزیر! لەو جووتە نۆکەرەی خۆت بکە پرسیارە
قەت باب کوڕی خۆی وا لە تەنگانەی ناکا ڕزگارە
لە هیچ دەوڵەتان وەچەنگ ناکەون ئەو ئەمیندارە،
ئەوە نۆکەری تۆن خزمەتیان وا بەکارە
نۆکەری چاک بۆ ئاغای دایم وەک برای بەرقەرارە».
ناسر و ماڵ ماڵ جوابیان داوە:
«ئەمە نۆکەری وەزیری نین، نۆکەری شێخی عەرەبانین هاتووین لەولاوە».
وەزیر دەڵێ:
«ڕۆڵە! هەرچی دەفەرموون، بەسەر ئەو چاوە».
ناسر و ماڵ ماڵ لە وەزیریان کرد حاشایە،
دەڵێن: نۆکەرییەت ناکەین نامانەوێ ماڵێ دنیایە.
وەزیر دەڵێ:
«بۆچیو ناوێ ماڵی دنیایە؟»
دەڵێن: وەکیل و مامی مە کیایە.
نۆکەر تەعین کراوە،
چوون کیایان لەولارا هێناوە،
کیای گەیشتێ لە دیوانی وەزیری کرد سەڵاوە،
دەڵێ:
«وەزیرا ئەوە برازای منن، ئەو سوباتە بۆ توو کراوە.
لـــە عەوەزی ئەو خزمەتەی ئەوســـاڵ حەوت ســـاڵە لە کوێســـتانی گاگەش باوۆمەری دەرکراوە».




وەزیر فەرمووی: «تەلەب بکەن ماڵی دنیایە؛

هەرچی تەڵەب بکەن دەیاندەمێ بەغەیرەزی شاری بەغدایە».

ناسر و ماڵ ماڵ وەجواب هاتن بەیەکجاری:

«ئەمە هەر وڵاتی کوێستانمان دەوێ بەئیختیاری؛

دەبێ مەزن باوۆمەری بکوژین، قەت نەبێ پرسیاری،

خەرج و بێگاری نادەین بەبەغدا شاری،

ئەگەر نەماندەنێ وڵاتی کوێستانێ بەیەکجاری،

لێرە دەبینە نۆکەر ناڕۆینەوە لە شاری».

ئەگەر ناسر و ماڵ ماڵ ئەو قسەیان دەبوو تەواوە،

وەزیرەلئەعزەمی دەستی لەسەر سەری ڕۆناوە،

جێبەجێ حوکمیان بۆ سادیر کراوە،

بۆیان مۆرکردن، وەرگیراوە

خەرج و بێگاری وڵاتی کوێستانێ هەڵگیراوە

مەرەخەستیان کردن گوتیان: «دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا».

گوتیان: «قوربان ئەگەر ئەمە نۆکەرین عەرزێکی دیکەمان ماوە.

«قوربان سەری شێخی عەرەبان دەبڕی یا مەرەخەستی دەکەی تەواوە؟»

وەزیر فەرمووی:

«ئەوە برای منە، عەرەبستانیش هەر ئی وی بێ، بەغداشم بەوی داوە».

شێخی عەربانی دەڵی:

«وەزیرەلئەعزەم خولا بتکا ڕاوەستاوە!

سەرێکە هێناومە نایبەمەوە دواوە».

وەزیر دەڵی:

«وا پێک نایە،

شێخی عەرەبان دەگەڵ ئەمن برایە؛

ئەوە شاری بەغدایەم بەگەردن ئازایی دایە،

بزانم ئەمن ناخزمەتیم چ بوو؟ شێخی عەرەبان بەمنی نیشان دا ئەو جەفایە».

شێخی عەرەبان دەڵێ:

«بەخولا! خەجاڵەت بووم لە دنیایە،

هەتا بۆ خۆم زیندووم، وڵاتی عەرەبســـتانم پێشـــکێش کرد، هـــەر ممبارەک بەتوو بێ شاری بەغدایە

مەسڵەحەت ئەوەیە ئەو نۆکەرانە بکەی ئازایە».

وەزیر دەڵی:

«چ بکەم کوڕی منن، مامیان کیایە،

بڕۆن بچنەوە سەر وڵاتی کوێستانێ؛ هیچ کەس نەناسن لە دنیایە،

هەتا حەوت پشتیان دەبڕێ هیچ کەسیان نەیەتەوە شاری بەغدایە،

ئەگەر بەغدا دەعوای لێ بقەومێ، ناسر و ماڵماڵ نایەنن تیپ و سوپایە،

بڕۆن مەرەخەستیان بکە کیا گەردنیان ببێ خۆش و ئازایە»

جێبەجێ ئیکلامیان کێشا، گەڕانەوە بەیەکجارەکییە،

کاکە ماڵ ماڵ دەڵێتەوە کاک ناسرییە:

«ئەمن قەت شتاقە شەوی دی لێرە گیر نابم، هەتا نەچمەوە کوێستانی مەزن باوۆمەران خزمەت خاتوون تەورێزییە».

ناسر گوتی: بلاّ ئەوشەو لێرە گیر نەبین کارێکی واش بکەم خەتام نەبێ».

کاکە ناسر دەڵێتەوە کاکە ماڵ ماڵییە:

برالـــە ئەگەر بۆ گەورەیی دەڵێی لە وەزیری زیاتـــر دەبەغدایەدا کەس لە توو گەورەتر نییە،

ئەگـــەر بۆ رێز و زەمبەری دەڵێی، لە دەبووتخانەی تۆم هەڵدراوەتەوە هەزار بار زێڕ و ئەشرەفییە

ئەگەر بۆ مایینی دە چاک دەڵێی لە ئێختەخانەی بەســـتراوەتەوە دووسەد مایینی لەمەڕ وەزیرەلئەعزەمییە،

خولاّ ئەو جاوجەلالە بەتوو بدا ژن لە بۆ توو قات نییە.

وەبزانە گراوی مەزن باوۆمەری لە دایکی خۆی نەبووە بەکیژییە».

ماڵ ماڵ دەڵێتەوە کاکە ناسرییە:

«ئەگەر بۆ گەورەیی دەڵێی، لەکنم بەگەورەیی گاوانێکی نییە،

ئەگـــەر بۆ زێر و زەمبـــەری دەڵێی، بەهەمووی لەکنم بەقەد شـــاییەکی ئەو زەمانەی نییە،

ئەگەر بۆ مایینی دە چاک دەڵێی، بەهامانم لەکنم بە کوڵەبارگینێکی کورتانی سەوداگەران نییە،

قەت شتاقە شەوی دی لیرە گیر نابم، تا نەچمەوە کوێستانێ مەزن باوۆمەری خزمەت خاتوون تەورێزییە

ناسر دەڵێ:

«دڵم بریندارە، جەرگم سووتاوە،

ئەتوو براگەورەی منی ئیختیارم پێ نەماوە،

کەنگێ دەفەرمووی ماین زین بکەین، بڕۆین بەولاوە؟»

ماڵ ماڵ دەڵی:

«ئەمە دەرفکرین،

ئەگەر دەڵێی تا تەدارەکی بگرین،

ئەوشەو بڕۆین بەسەر خەندەقی بەغدایەدا ڕابرین».

کێ بوو لە ناسری بەئەرجووە،

تەدارکێکی زۆر چاکی لە بازاڕی گرتووە،

هات ماینی خۆی و کاک ماڵ ماڵی زینکردووە،

چوونە دەرکی کیا، دەوڵەت زیادیان خواستووە.

کیا دەڵێ:

«بەخێرێن، سەرچاوی من، جووتە مەردەکەی مەیدانێ؛

وەزیر زۆر و منەت لێ هەڵدەگرێ، بەغداو دەرهێناوە لە تەنگانێ.

بڕۆن ترسو نەبێ بۆخۆم ڕاوەستاوم لە دیوانێ،

وەزیری بەغدایە لەنگۆ زیاتر هیچ کەس بەبرای خۆی نازانێ،

هەڕۆن بڕۆن، بەخولاّم بەزامندان، بەئەمانەت بەپێغەمبەری ئاخرزەمانێ».

کێ بوو لە جووتە سوارێکی نەولاوە،

سەری جڵەوی خۆیان بادا،

گەڕانەوە بەدواوە.

سەبرسەبر، نەرم نەرم، لە بەغدایان ئاژوا، لە بۆ کوێستانێ گەڕانەوە بەدواوە.

نوێژی شێوانیان بەسەردا هات لەوێ ڕاوەستان تەواوە،

جڵەوی خۆیان گرت لەوێ بوون پیاوە.

بۆ شـــەوێ لەوێ نووســـتن ماڵ ماڵ خەونی دی دەخەوێیدا، خاتوون تەورێزییان دابوو بە کوردێکی کەلاش درێژی شـــارەزوورییە. ماڵ ماڵ هەڵدەستێ لەجێی خۆی دەگریا ناسر

گوتی: «براله ئەتوو بۆچی دەگری؟ پیاو دەچیتە ســەفەرێ، ئەســپ و زینی نایەنێتەوە؛ پیاو دەچێتە ســەفەرێ دەمرێ. پیاو قەرزدار دەبێ. ئەمە ئەلحەملای ســوباتمان کردووە، دەوڵەتمان هەیە، بەئیختیار دەچینەوە کوێستانێ، بۆچی وا دەگرییێ؟

کاکه ماڵ ماڵ دەڵێتەوە کاک ناسرییە؛

«ئەمن ئەوشەو خەونێکی گەلێک عەجیبم دەدەییە،

گراوی منیان داوە بەکوردێکی کەڵاش درێژی شارەزوورییە،

بابی بەخەنجەرێ لێی ڕادەسا براڵەی بەشیری ڕووتییە،

له ترسی شیر و خەنجەران سوێندیان لەبیر خاتوون تەورێزی بردییە،

ئێستا داویانە بەکوردی کەڵاش درێژ، لای لایە دەکا بۆ کوڕی کوردییە،

وا دەزانێ ناسر و ماڵ ماڵ لەسەر دنیایە نییە،

بەدەستی پێ دەکەن هاوێر هاوێری مەڕییە،

بەزولفان پێ دەڕێسن تەشییە،

بەلاقان پێ ڕادەژێنن لانکی کوڕی کوردییە.

ڕۆژی هەتا ئێوارێ دەگری لە بۆ ناسر و ماڵ ماڵان، لەبن زمانیەوە دەڵێ:

ئاخ بمرم لە بۆ جووتە سوارەکەی ڕۆمییە»

ناسر دەڵێتەوە ماڵ ماڵییە:

«براله خەونت ڕاستە، درۆی لە بۆ نییە،

وانییە وەکی دییە

ئەوە گراوی منە ئی توو نییە،

ماڵ ماڵ دەڵێتەوە ناسرەدینی:

«براله ئەوە شاری بەغدایە نییە لێم بشێوێنی،

هەر کەسێکی ئەوڕۆ بچێتە کوێستانێ مزگێنێکم بۆ بێنێ

خوشکۆڵێکم هەیە، دەیدەمێ، ساڵی دەرەئەق ڕۆژگارێ خەمی خۆی پێ برەوێنی؛

پیرەدایکێکم هەیە ئەویشی دەدەمێ با لانکەژێنێ؛

ئەگەر بەوەشم لێ قایل نەبی پیریابێکم هەیە دەیدەمێ ساڵێ بەسەری بەزمانی گەرمێن و کوێستانێی بۆ پێک بێنی،

ئەگەر بەوەشــم لێ قایل نی برایەکم هەیە، ســاڵێ جووتە کەڵێکی دە مس نێ حەوت زەویانی لە بوورە و بەیاری پێ دەڕێنی».

کاکە ناسر دەڵێتە کاک ماڵ ماڵییە:

«براله لەسەر کێت هەیە، ئەو ناز و گلەییییە،

خۆ ئەوەهە دەعوای هەموو دەوڵەتان نییە،

ئەمن بۆت دەچم بەدەستان نەکو بەسەرییە،

ڕێگای بیست و چوار ڕۆژان بەماینێ شێ خز لە مابەینی برایەتیدا چ نییە

ئەمن بچمەوە کوێستانێ بەچی ناس بکەم، گراوی ماڵ ماڵی خاتوون تەورێزییە؟»

ماڵ ماڵ دەڵێ:

«ناسر دڵم لە کاوە،

چەندی لە کاوە کاوە

تیرێکی لە ڕاستەی لێ دام لەلای چەپمی ناسۆر هێناوە.

ئەگەر بۆ خاتری من دەبی بە ئێڵچی بەولاوە».

ماڵــە مەزن باوۆمەری لە خڕێ بالینێ، پێشاوپێشــی قوچــێ قەزەنێ، قەرەچادرێکی گەورەی هەڵداوە، دەودەمیدا ڕشێنێ بارانێ پەڵەی هێناوە،

لەسەر قەرەچادرێ دەباری لە هەموو خڕان هەڵستا سێڵاوە.

خاتوون تەورێزی دەستی دا کوتکی دارخڕنوک سێ جاری دەورەی قەرەچادری گەورەی داوە

دەڵێ: دایە! چاوم کەم بینا بووە، خەمی ناسر و ماڵ ماڵانم هاتۆتە بەرێ؛ نازانم کامە سیگە هەڵکشاوە.

ماڵ ماڵ دەڵێ:

«براله! ئەگەر وای ناناسی، وای نابینی،

سبحەینان خۆی دەغەملێنێ بەسووری، نیوەڕۆیان بەزەردی،

ئێواران تازیەی ناسر و ماڵ ماڵانە بەشینی،

ئەگەر حەزێ دەکەی، نەبێ خەم و نسرینی،

ئەگەر حەزێ دەکەی، زوو خاتوون تەورێزی ببێنی،

ئەوە لە خڕێ بالینێ دەکێشێ ماینێ شێ خز لەبەرایی خێڵی، لە دووی دەڕۆنەوە دوو جوانتوڵەی قەڵەبژە، یەکساڵ و دوو ساڵێ، وەختێ بۆ خاتری ناسر و ماڵ ماڵان بێنەوە بەر عەقەی دە زینی».

ماڵ ماڵ دەڵێ: «کاک ناسرا دەبێ ئەوڕۆ بچی خەبەرم بۆ بێنیەوە».

ناســـر دەڵێ: «ماڵ خرانەبوو؛ ئەمن ڕێی بیســـت و چوار ڕۆژان چلۆن بچم بێمەوە؟»
گوتی: «دەنا سبحەینێ بۆ تاوهەڵاتێ قەرارمان بێ بێیەوە. ئەگەر نەهاتیەوە، یان ئاغایەتی خـۆت دیوە ئەمنت لە فکر چووە، یان دەتکوژن، خەبەرێ نایەنیەوە لە ڕێیە، یان خاتوون ئەسمەرت چاو پێ دەکەوێ، ئەمنت لە فکر دەچێ».

ناسر ڕقی هەڵستا ئەوجارە:

«دەبم بە ئێلچییەکی موختارە.

ئەگەر هێچ کەس لە کوێستانێ نەمێنێ لە خاتوون ئەسمەرێ ناکەم پرسیارە.

تیرێکی داوم لە جگەرێ؛

بەحەقـــی ئەم خولایێ، ئەگەر هیچ کەس نەمێنێ، ئەمن لە خاتوون ئەســـمەرێ ناکەم نەزەرێ».

کاکە ناسر بەحەرەمە ماینی شێ خزی هێناوە،

زینیان دەپشتێ کوتا و تەنگەیان کێشاوە.

ناسر دەڵێ:

«ماڵ ماڵ ڕێگاکەم دوورە قەرار و مەدارم بۆ بکە تەواوە».

ماڵ ماڵ دەڵێتەوە ناسری:

«دەبلا ڕۆژ بێتەدەر، بێ لێرە خەندەقی غەلیفەی بەغدایە بگری،

ئەگەر بەخێرهاتیەوە، لە کاکی خۆت دەفکری.

ئەگەر درەنگ بێیەوە ماڵ ماڵ بەدەشتی بەغدایەدا ڕادەبری،

چاوت پێ ناکەوێتەوە هەتا ئەوێ ڕۆژێ دەمری».

ناسر دەڵێ:

ماڵ ماڵ دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا!

گەلێکم زەحمەت دەگەڵ ئەتوو کێشاوە.

ئەگەر دنیایە درەنگ گەیمە جێ، ڕۆژێکم لەسەر ببە ڕاوەستاوە»

ماڵ ماڵ دەڵێ:

«ناسرا هەڕۆ بڕۆ، لەمنت کەوێ کەڵی مەیدانێ

لەتوو زیاتر هیچ کەس شک نابەم ڕۆژێ تەنگانێ

بەخولام بەزامن دای، بەئەمانەت بەپێغەمبەری ئاخر زەمانێ.

ناسر جڵەوی بادە، ڕکێفی لێ دە، بڕۆوە کوێستانێ».

ناســـر و ماڵ ماڵ ئەگەر لە کوێســـتانێ بۆ بەغدایە هاتن واوە، حەوت ساڵان کانی وان ئاوی لێ نەماوە.

ناسر.ئەگەر بۆ کوێستانێ ئاژواوە،

ئەوێ شەوێ ڕۆیی هەتا بەیانی بەرداوە،

ئەگەر وەسەر کوێستانێ دەکەوێ، تەماشا دەکا دوو مێگەل لە حەوشێکی بوون بڵاوە.

ئەوە مەڕی مەزن و میرزاغایانە، ئی بابی ناسر و ماڵ ماڵان، هەمووی دەڵێی نەخۆشە و هێزی نەماوە،

ئەوی دی مەڕی مەزن باوۆمەرییە، لە ســـەرینچاوەی کانییێ ئاو خواردووە، لە بژوێنی لەوەڕاوە،

هێندە قەڵەوە هەمووی دەڵێی ڕۆنیاساوی پێدا کراوە.

ئەگەر ناســـر تەماشـــا دەکا ئەو شوانە لەسەر گوێنێکی ڕۆنیشـــتووە دووکەڵی قەنەی لەسەر دەبێ بڵاوە؛

بەقوونەوە پڕی دەدا گوێنییە لە ڕەگوڕیشەی دەرهێناوە،

ئەگەر ئەو شوانە چاوی بەناسری کەوت، گوتی: «ئەوەیان ماڵ ماڵە، ناسر نەماوە،

یان ناسرە ماڵ ماڵ نەماوە».

کوردە بانگ دێڵێ:

«سوار ئەی سوارەکەی چەلەبییە!

دوو کوڕی ئامۆزا لە کوێستانێڕا هاتنە کن وەزیری بەنۆکەرییە.

تۆ خوڵاکەی پێم بڵێ بزانم، کامەیان ماوە کێهەیان مردییە».

ناسر دەڵێ:

«پەزەوان شێتن، ئاقڵیان نییە.

دەنێو ویلایەتی بەغدایەدا نێوی ناسر و ماڵ ماڵی نییە،

ڕێگای کوێستانێ بۆ ماڵە مەزنی بۆ هۆبەی بەکوێدا دەچییە؟»

کوردە دەڵێ:

«سوارە سوارەکەی چەلەبییە!

ئەتوو بەمن ناڵێی قسەی ڕاستییە؛

کاری ئەنگۆ لەکن ئاغای خۆتان هەموو غەیانەتییە.

ئەتوو نازانی، ئەمن کوردە شوانی مەزن باوۆمەرییە!

گراوێی ماڵ ماڵم مارە کردووە، بەکوێرایی چاوی ناسرییە:
ئی ناسریش مارە دەکەم. بەکوێرایی چاوی ماڵ ماڵییە.
ڕێگای کوێستانێ ئەوەی لەسەری دەڕوِی دەچێتە نێو خێڵییە».
ناسر گوتی:
«خوڵایە! ماڵ ماڵ شێخە قەت شێخی وا نییە،
ئەتوو تەماشای گووخواردنی کوردییە،
دەڵێ گراوی ماڵ ماڵم مارە کردووە، بەکوێرایی چاوی ناسرییە،
ئەگـــەر لێرە ئەو حیزبابەی دەکوژم، مەعرەکە پەیدا دەبێ، زووی ناگەمە کنێ، دەڕوا، بەڕەڵمی بەغدایەدا نایبینمەوە، لە ئامۆژن و مامم دەبێ خەجاڵەتییە؛
بلا، ئەوە ببێتەوە گوێلک بچێتەوە زگم لە نەبەدییە».
ئەوێ ڕۆژێ سێشـــەموو بوو، خاتوون تەورێزی و خاتوون ئەســـمەر و خاتوون پەروەر هەرسێکیان هاتنە شیو و کوڵێ. ئەگەر ناسر لەژێرلا هات خاتوون پەروەر چاوی پێ کەوت، گوتی:
«خوشکیلێ! ئەمنو ببم بەقوربانی سەرییە!
ئەمن حەوت ساڵان بووم، ئەگەر ناسر و ماڵ ماڵ، ڕۆییە،
ئەوە سوارێک دێ، یان ناسرە، یان ماڵ ماڵی جندییە.
خوڵاکەی، خوشکێ تەماشاکە، بزانەم ئەو سوارە کێیە.
سەر و بەرگی ڕۆمیانە بۆخۆشی ڕەنگی شارستانی گرتییە.
ئەمن نایناسم؛ بزانە ئەوە هەوە یان هەو نییە».
خاتوون ئەسمەر سەری هەڵێناوە،
دەڵێ: «چاوم کوێربێ نایناسم؛ ڕەنگی شارستانی لێ نراوە».
گوتی: «خوشـــکێ، وەرە، سەرو بەندی بانگ کەین؛ ئەگەر ناسر بێ، یا ماڵ ماڵ بێ، لەسەرمان ڕادەوەستێ؛ ئەگەر ئەویش نەبێ ئەوە نازانێ، ئەمە کچی مەزنین. دەڵێ: کیژی دەکوێستانییان بوون بەندوباویان دەگوت».
خاتوون ئەسمەر بانگ دێڵێ:
«لاوە، هەرێ لاوە!
بریا ئەمن سێوێک بام لە سێوی دە دوکانێ
کەوتبام لەسەر ڕێیان، لە نواڵەی دە کوێستانێ،

«ناسـر و ماڵ ماڵ لـه خزمەت وەزیری بەئیختیار بهاتنایـەوە، ئەمنیان هەڵگرتایەوە بەبێنیان کردبام، بیاننابام دە گیرفانێ».

خاتوون پەروەر دەڵێ:

«لاوە! بریا ئەمن کل و کتلوورێک بام، لە گیرفانی کوڕە لاوان

«ناسـر و ماڵ ماڵ دەخزمەت وەزیـری بهاتنایەوە یەکی جارێکیـان بدابامە قمبلەی دەچاوان».

خاتوون تەورێزی دەڵێ:

«ئەمن جوانوولێک بام لە حودوودان، لەوێ دە حەدالان،

لەوەڕابام لەسەر ڕێیان لە لانوالان،

ناسر و ماڵ ماڵ لە خزمەت وەزیری هاتبانەوە بیاندابامە بەر شەقەی ڕکێفان، بیانبردمایە هۆبەی مەزنە مالان.

یەکی جارێکیان دەست ئاویتبامە سەر بژ و یالان،

ئەمنیان لە بابم بستاندایە لە باتی خەرج و دراو و هەستەی حەوت سالان».

ناسر ئەگەر ئەو قسەی بیست تەواوە،

جڵەوی هەڵکێشا و راست ڕاوەستاوە،

ناسر جڵەوی بۆکن ئەوان باداوە،

ناسر دەڵێ: «بزانم خاتوون تەورێزی مێردی کردووە، یان درۆیە».

کاکە ناسر بانگ دێڵێ:

«خوشکی خاتوونێ، وای خاتوون تەورێزییە،

ئەمە دوو براڵە هەبووین، لەوانی دەکوێستانییە؛

ئەوساڵ حەوت ساڵە لەسەر ئەنگۆ بووینەوە گەرمیانییە؛

ئێستا دەڵێن مێردیت کردووە، بەکوردێکی کەڵاش درێژی شارەزوورییە،

ئێستا کوردە بووە بەشوان ئەتوو بووی بەناسکەبێرییە.

ئەتوو سوێندخۆری قورعانێی ڕۆژی قیامەتێ جوابت چییە؟

لای لایـی بۆ کوڕی کـوردی دەکەی وا دەزانی ناسـر و ماڵ ماڵ لـە دنیایە نەبوون بەیەکجارەکییە».

خاتوون تەورێزێ دەگریا، دەڵێ:

«بزانە سووچ و تاوانی من، مل بەکوێنێ، چییە؟

ئەمن بابم بەخەنجەرێ لێ ڕادەسا، براکەم بەشیری ڕووتییە،
«ئەمن کوشتن و مردنم لە خۆم قبووڵ دەکرد، نەمدەدا وەکیلییە؛
بۆیەکەم خۆم لە کوردی مارە کرد، ئەنگۆ ببینم، نەبێتەوە، دیداری ئاخرەتییە.
ناسرە وای ناسرەی جندییە!
بەخولاٚت سوێند دەدەم و بەزاتی ڕەببییە
ئەگەر حەزێ ناکەی بمرم، پێم بڵێ بەیەکجارەکییە،
توخولاٚ، ماڵ ماڵ ماوە یان مردییە؟»
ناسر دەڵێ:
«خوشکێ! خاتوونی! وای خاتوون تەورێزییە!
لە وەزیری زیاتر کەس لە ماڵ ماڵی ماقووڵتر نییە،
ئەما ڕقی هەڵستاوە دەڵی: «نایەمەوە کوێستانێ جارێکی دییە».
خاتوون تەورێزی دەڵێ:
«براکە ناسر بەقوربانت بم! هەرچەندی خشڵ و گوارەی منە بۆی بەرە بەدیارییە؛
بەرگی شایانم لە خۆم حەرام کردووە، خەنەم لەسەری خۆم نەدییە؛
نەچوومە ماڵە چ کافر و موسڵمانی بەبووکییە،
خولاٚکەی، براکە، چارەی من چییە؟
چلۆن ماڵ ماڵی دێنیەوە کوێستانێ بەیەکجارەکییە؟
ئەمن دەزانم ماڵ ماڵ تەمای بەمن نییە.
براکە بەسەدەقەی سەرت بم! بزانە لەوێ ئەو کارەی چلۆن پێک دێنییە».
ئەگەر ناسر ئەو قسانەی دەبیست تەواوە،
دەیگوت: «درەنگە ناگەمەوە بەدواوە».
خاتوون پەروەریان دەنارد تەدارەکی بۆ ناسری دەگرت، دەیهێناوە،
لە پێشـــی دادەنا، دەیگوت: «براکە! ئەوە خۆراکی ڕێیەت، ئەوەش کولێرەی بەشەکری دروس کراوە؛
خولاٚکەی ئەوانە بۆ کاک ماڵ ماڵی بەرە چونکە لە وڵاتی غوربەتە، هێندەی جەفا بەتوو داوە».
ناسر دەڵێ:
«خوشکێ! دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا».




سوار دەبوو ڕکێفی لێ دەدا، دەگەڕاوە بەدواوە،
هەتا هەندە هەندی بەیانی ئاژاوە،
لەبەر خەوێ ڕێی سەردەر نەکرد لەوێندەرێ بوو پیاوە.
خەوی بەسەردا باری سەعاتێکی لەوێ ماتەڵ ماوە.
هەموو! کە تەماشای کرد بەیانی بەردا، ڕۆژ هەڵکشاوە،
پێی دەڕکێفی دەنا: یا ئەڵڵاهی! دەیکرد تەواوە،
سەربەرەژێر دەهاتە خوارێ، بۆ خەندەقی خەلیفەی دەگەییە و بوو پیاوە.
تەماشا دەکا: «ماڵ ماڵ لەوێ نەماوە،
ماینێ شێ دەلەوەڕێ هەموو، ئەسپابی لێ بەستراوە.
دەڵێ: «قوڕم بەسەری کرا، ئەمەگی حەوت ساڵانم بەهیچێ دراوە».
ئەگەر وای زانی خۆی لە ماینێ شێ خزێدا تێر گریاوە؛
دەڵێ: «خولایە! بزانم چم لێ قەوماوە
لە خۆم هەژارێ
جا بەکوێدا بڕۆمە خوار، لە ماڵ ماڵی بکەم پرسیارێ؛
خۆی ڕووت دەکردەوە و بەڕەڵمی بەغدایەدا دەچووە خوارێ».
دوور تەماشای کرد، ئەوا کاکە ماڵ ماڵ دیارە؛
زۆر بەپەلە دەڕۆیی ئەو هەژارە،
هەتا دەگەییە ماڵ ماڵ دەیگوت: «براله قەت ئەوەش قەول و قەرارە؟
ئەمن دەنێری کوێستانێ، بۆ خۆت بەڕەڵمی بەغدایەدا دەچیە خوارە؟
ئەمن شکایەتت لێ دەکەم لە بارەگای جەبارە».
کاکە ماڵ ماڵ دەڵێتە ناسرییە:
«خاتوون تەورێزی مێردی کردووە بەکوردییە.
جا ئەم دونیام وەلاناوە؛ ئاغایەتیی کوێستانێم بۆ چییە».
ناسر دەڵێ:
«ماڵ ماڵ دڵم سووتاوە،
هێندەم خەم و خەفەتی تۆ کێشاوە؛
ئەمن دەکەیە چەپەر دەمنێری بەولاوە،
خاتوون تەورێزی فەقیر مێردی بەکوردی نەکردووە، بوختانە پێی کراوە،

هه‌رچه‌ند خشڵ و کرمه‌ک و گواره‌ی خاتوون ته‌وریزییه هه‌موویم بۆ توو هێناوه،
ئه‌وسال حه‌وت ساڵه چووینه به‌غدایه، خاتوون ته‌وریزی خه‌نه‌ی شارانی لێ حه‌رام کراوه؛
درۆیه ده‌که‌ن، مێردی به‌هیچ‌که‌س نه‌کردووه، ئه‌وه له‌وێنده‌رێ؛ له‌سه‌ر ئه‌توو مه‌حته‌ل ماوه،
براله مزگێنییه‌کی دیم بۆ هێناوی: هه‌موو کارێکمان ته‌واوه،
ئه‌لحه‌ملای، بابی خاتوون ته‌وریزی مردووه، مه‌زن باوۆمه‌ر نه‌ماوه.
ئه‌گه‌ر حه‌زێ ده‌که‌ی قه‌ت مه‌گه‌ڕێوه به‌دواوه».
کاکه ماڵ ماڵ ده‌ڵێ به‌ناسرییه:
«ناگه‌ڕێمه‌وه دوایه جارێکی دییه.
ئه‌گه‌ر ته‌وریزێم نه‌بێ دنیای ڕوونم بۆ چییه؟»
ناسر ده‌ڵێ:
«ماڵ ماڵ وات نه‌کرد، ده‌نگم ببێ دلێره،
وات نه‌کرد، کاو و مرادێ له خۆم ببینم، دژمنان بکه‌م کوێره.
کاک ماڵ ماڵ، حه‌وت ساڵان له توو زیاتر ده‌ڕۆم سه‌ربه‌ره‌ژێره،
هۆردک چاوی ناسری، ده‌بڵا له‌پاش ماڵ ماڵی ببنه‌وه کوێره».
ئینجا کاک ماڵ ماڵ ده‌گه‌ڵ کاک ناسری گه‌ڕانه‌وه به‌دواوه، سواربوون و ڕۆینه‌وه بۆ کوێستانێ.
کێ بوو له ناسر و ماڵ ماڵی به‌ڵه‌ک چاوه،
هه‌تاوه‌کو به‌یانیان داژواوه
وه‌سه‌ر وڵاتی کوێستانێ که‌وتن، ڕۆژ شه‌به‌قی کێشاوه؛
ته‌ماشایان ده‌کرد، جووته مێگه‌لێک له حه‌وشه‌ی له‌وه‌ڕاوه،
ناسر ده‌ڵێته‌وه ماڵ ماڵییه:
«براله! ئه‌وه مه‌ڕی مه‌یه، لاوازه؛ چونکه ئاغای نییه؛
ئه‌وه‌ش مه‌ڕی مه‌زن باوۆمه‌رییه، له بژوێنی له‌وه‌ڕاوه، ئاوی خواردۆته‌وه له سه‌رینچاوه‌ی کانییه.
براله چی دی به‌توو ناده‌م ئه‌و گه‌وره‌یییه،
شه‌و و ڕۆژێکی بۆخۆم گه‌وره ده‌بم، له پاش شه‌و و ڕۆژێکی بۆخۆم دێمه‌وه به‌نۆکه‌رییه؛

گوێلکی کوردیم کەوتۆتەوە زگییە».
ماڵ ماڵ دەڵێ:
«ئەمن نۆکەرم تا ئاخر زەمانێ
ئەما حەزێ دەکەم، نێوی ئاغایەتی لەسەری خۆت دانێ.
ناسر دەلی ماڵ ماڵ!
«نێوی خۆم ئەوا کرد بەئاغالەی ڕۆمییە.
ئەگەر لێیان پرســـی: بۆ کوێ دەچێ؟ بلێ: لە بەغدایەدا هاتووە بۆتە ئێڵچی دەڕوا بۆ نێو عرووس و ئینگلیسییە.
بزانە ئینشاڵڵا چت بۆ دەکەم لە کوردییە!»
سوار دەبوون ئەو جووتە سوارە،
سەبرسەبر، نەرم نەرم، لە بۆ کوێستانێ دەهاتنە خوارە.
کێ بوو لەو جووتە سوارەی تەواوە،
ڕوویان دە کانییەکەی خۆیان کرد، بوون پیاوە،
حەوت ساڵ بوو ئیشک ببوو؛ ئەگەر ناسر و ماڵ ماڵ گەینە سەری جێبەجێ کراوە.
شوانی ناسر و ماڵ ماڵان هاتن لەولاوە،
دەڵێن: «ڕەبی! میوان بەخێرێن سەی ئەو دوو چاوە
ئەو ساڵ حەوت ساڵە، دەرکی ئەو کانییەی بەستراوە،
دەســـتی منو دامێن بێ، ئەنگۆ خەبەری ناســـر و ماڵ ماڵان دەزانن. کێهەیان مردووە، کیهە ماوە؟»
ماڵ ماڵ دەلی:
«شوانەکەی، جندییە!
ئەو ناسر و ماڵ ماڵی ئەتوو لێیان دەپرسی لە بەغدایەم نەدییە.
ئەگەر لەوەی دەپرسی، ئەمن نۆکەرم، ئەوەش ئاغالەی ڕۆمییە؛
ئەوە دەچیتە نێو عرووس و ئنگلیسی بەئێڵچیگەرییە».
ئینجا دەستیان دەستۆی ئەو سوارانە دەکرد، دەیانکردەوە گرییە،
دەڵێ: «ئەوە ناســـر و ماڵ ماڵن؛ ئەدی بۆچ ئەو ساڵ حەوت ساڵە ئەو کانییەی ئاوی نییە؟»
یەکیان بەیەکیان گوت:

«بەخولآی! ئەوە بۆ مەزن و میرزاغایان دەبەمەوە مزگێنییە».
ماڵ ماڵ دەڵێ:
«حیزباب بۆ هێچ کوێ نەچی؛ ئەوە ناسر و ماڵ ماڵ نییە!»
ناسر و ماڵ ماڵی بەڵەک چاوە،
نێوی خولآیان دهێنا، پێیان دە ڕکێفی ناوە.
ناسر و ماڵ ماڵی نازدارە،
ناسر ئاغالەی ڕۆمییە، ماڵ ماڵ نۆکەرێکی بەرقەرارە،
بۆ سەر عێلی مەزن باوۆمەری دەهاتنەوەخوارە؛
هیچ کەسیان، نەدەناسی هەر لە ماڵە مەزن باوۆمەریان دەکرد پرسیارە.
ناسر و ماڵ ماڵ گەینە نێو عێلییە،
لێیان دەپرسی:
«ئەی ڕێبوار ئەوە کێیە؟»
ماڵ ماڵ دەڵێ:
ماڵ خرانەبوو ئەوە ئاغالەی ڕۆمییە،
بەئێڵچی گەری دەچێتە نێو عرووس و ئینگلیزییە،
«لە ماڵە مەزن باوۆمەری دەپرسێ، ولآغی چەپەرێ وەرگرییە».
بەنێو هۆبەیدا دەهات هەر سووڕنی سووڕنییە،
هەتا گەییە دەرکی مەزن باوۆمەرییە،
مەزن باوۆمەر بەپیریەوە دەهات و بەپێخاوسییە،
ئینجا وەرگەڕا مەزن باوۆمەری لێی دا بەقەمچییە،
مەزن باوۆمەر گوتی:
قوربان! سەبرێکت ببێ، بزانم، حاجەتت چییە».
گوتی: «وەلآغی چەپەرێم بۆ بێنەوە؛ ئەمن ئێڵچیم دەڕۆمە نێو عرووس و ئینگلیسییە».
گوتی: «ئاغالەی ڕۆمی، پیاوێکی بێ فکری؛
دەبێ تاوێکی دابەزی، سەبرێکی بگری،
هەتـــا بەخێر نەهـــارێ دەکەی، ئەمنیـــش دەنێرمە، نێو ڕەوەی ولآغـــی چەپەرێت بۆ دەگری».
ئەگەر مەزن باوۆمەر ئەو قسەی کرد تەواوە،




جڵەوی ئاغالەی ڕۆمیان گرت، کردیان پیاوە،
بردیان ڕۆیان نا، لەلامێردانێ پاڵی داوە؛
دیاربوو خەوی دەهات، سەرینیان بۆ داناوە،
مەزن باوۆمەر گوتی:
«تاوێکی ویستراعەتێ بکە، هەتاوەکو ولاغی چەپەرێ دێتەوە لەولاوە».
کەس نەیناسییەوە ئەوە ناسر و ماڵ ماڵە، هەر لەوان وایە ئاغالەی ڕۆمییە تەواوە.
مەزن باوۆمەر چووە نێو مەڕێ بەرەوانە،
ئەگەر پێشکێشی بۆ ئاغالەی ڕۆمی بێنێ چل شەکی جووت ددانە،
کوێخادەرکێکی ڕیش سپیدی بوو ئی پیر و زۆرهانە،
ئاغالەی ڕۆمی گوتی:
«خەوم دێ چۆڵ بکەن ئێرەکانە»
ئەو پیاوی ڕدێن سپی ناسی ناسر و ماڵ ماڵانە،
چووە پشت چادرێ؛ گوتی: «ئەوە خۆیان کردۆتە ئاغالەی ڕۆمی ئەو سەگبابانە».
جا کە چۆڵیان کرد چادر و لامێردانە،
ماڵ ماڵ دەڵێ:
«بڵا دەگەڵ خاتوون تەورێزی بکەم دوو قسانە».
ماڵ ماڵ دەڵێ:
«خاتوون وای خاتوون تەورێزییە!
ئەمە دوو براله هەبووین لەوانی دە کوێستانییە،
ئەوە حەوت ساڵە لەسەر ئەنگۆ بووین گەرمیانییە،
ناوەڵڵا، بەقای ژنان بۆ کەس نەبووە، بۆمەش نییە.
مێردیت کردووە بەکوردێکی کەڵاش درێژی شارەزوورییە،
کوردە بووە بەشوان ئەتوو بووی بەناسکەبێرییە،
بەدەستانت پێ دەرێسن تەشییە،
بەحوکمت پێ دەکەنەوە لایلایەی کوڕی کوردی شارەزوورییە،
وە دەزانی، ناسر و ماڵ ماڵ لەسەر دنیایێ نییە».
خاتوون تەورێزی دەڵێ:
«خوڵاکەی! بزانە سووچ و تاوانی من چییە؟

ئەمن بابم لێ ڕاوەستابوو بەخەنجەرێ، برام بەشیری ڕووتییە،
کوشتن و مردنم قبووڵ دەکردم نەمدەداوە وەکیلییە؛
بۆیەکەم وەکیلی داوە، تا دەگەڵ ناسر و ماڵ ماڵان نەبێتەوە دیدار ئاخرەتییە،
دەگەڵ ئەتوو نا، ماڵ ماڵ ئەما دەگەڵ ناسری ئی من و ناسری خوشک و برایەتییە،
چ بکەم ئەتوو ئەمنت ناوێ، کاری خولای ڕەببییە».
کە گوێی لێ بوو لە پشت چادرێ ئەو پیاوی ڕدێن سپییە،
دەرپەڕی هاواری کردە مەزن باوۆمەرییە،
مەزن باوۆمەر بەلینگدان هات گوتی: «ئەوە وەخەبەر هاتووە ئاغالەی ڕۆمییە؟
ئەوە تەماحم بوو چل شەکی جووت ددانی بۆ بێنم بەدیارییە».
پیاوی ڕدێن سپی دەڵێ:
«ماڵ خرا! ئەوە ئاغالەی ڕۆمی نییە،
ئەوە ناسر و ماڵ ماڵن، ئەوا دەگەڵ کچی دە توو قسان دەکەن بەدزییە؛
یەکیان لە مدبەقێ، یەکیان لەودیوی چیغییە.
ئەوە لێک دەکەنەوە ناز و ئەرجوو و گلەیییە».
بابی ناسر و ماڵ ماڵان سەریان دەسۆی ناوە، دەڵێ: «ئێستا دەعوا قەومییە».
بەدزی هەموو خەبەریان دا بەیەکدییە.
ئینجا مەزن باوۆمەر لەولاڕا هات؛ دەڵێ: «ماینێم بۆ بێنن، دەنگ بدەن لەشکرییە».
دەچریکێنی، دەڵێ:
«بۆ کەس دیار نییە،
حیزباب ئەمن لێرەم لە برســـان دەرکردن، ئێستا خۆت لێ گۆڕاوە خۆت لێ کردووم بە ئاغالەی ڕۆمییە؛
ئێستا، حیزباب واو لێ دەکەم پاکانو لە کوێستانێ دەردەکەم بەیەکجارەکییە»
ئاغالەی ڕۆمی دەڵێ:
«ماڵ ماڵ ماینی شێ خزم بۆ بێنە دەعوا قەومییە».
ئەگەر سوار دەبوون ئەو جووتە سوارەکەی ڕۆمییە،
مەزن و میرزاغای، بابی ناسر و ماڵ ماڵان دەهاتن بەدزییە،
مەزن ئاغا جڵەوی ماڵ ماڵی گرتییە،
دەڵێ:

«ئەگەر حوكمی وەزیرت پێیە، ئێستا مەزن باوۆمەری دەكوژم بەیەكجارەكییە».
ئەگەر ئەوجار ئاغالەی ڕۆمی ئاوڕی دەداوە، ڕادەمێنی،
مەزن ئاغا جڵەوی ماڵ ماڵی گرتووە دەیدوێنی...
ئاغالەی ڕۆمی ڕقی هەڵستا دەچریكێنی
دەڵێ:
«حیزباب، نابێ ڕمبێكم بۆ دە گولەكی مێردان بسرێوێنی».
ئەگەر ماڵ ماڵ ئەو قسەی ئاغالەی ڕۆمیی بیست تەواوە،
ڕمبێكی لێرەی بابی خۆی داوە،
جڵەوی بەردا ڕۆی هەڵات بەلاوە،
مەزن باوۆمەری بۆخۆی سواربوو، لەشكری لە دووی خۆی كێشاوە،
ماڵ ماڵ گەییە ئاغالەی ڕۆمی گوتی: سەیرێ ئەو لەشكرەی بڵا بگەڕێنەوە دواوە.
ناسر دەڵێ:
«ماڵ ماڵی ماڵ شێواوە!
ئەمن دەربەند بەمەزن باوۆمەری نیم، ئەگەر دەگەڵم لێ قەوماوە.
ئەمن لە كوردی كەڵاش درێژ ئاوسم، گوێلكی كوردی دەزگمدا ماوە».
دەســتیان بە جڵەوی دادەهێنا بەســەرڕەو هاتنەخوارێ لەولاوە، گەینە كوردی ســێ جاریان لێ كرد سەڵاوە،
دەڵێن: «كوردە ڕاستە دەڵێن: گراوی ماڵ ماڵی لە كوردی مارەكراوە؟»
كوردە دەڵی:
«ئەمنم مێردی خاتوون تەورێزییە.
مارەم كردووە بەكوێراییی چاوی ماڵ ماڵییە،
ئی ناسریش مارە دەكەم بەیەكجارەكییە،
سەگبابە! ئەتوو برۆ شاری بەغدایە پەیدا بكە نانییە،
حیزباب! بە درووغ هاتووی، خۆت كردۆتە ئاغالەی ڕۆمییە،
ئەمن كوردەم شوانی مەزن باوۆمەرییە.
بزانم ئاخر سوال و جوابت چییە»
ئەگەر پێی چەقاند كۆچانێكی كردە حەواڵەی ماڵ ماڵییە،
مــاڵ مــاڵ خۆی دەبەر زگی ماینی شــێ خزی ئاویــت، كوردە لــە قەڵپووزیدا زینی

شکاندییە،

ناسر ڕقی هەڵستا زەرگێکی دا لە زارییە،

لە پشتی سەری دەرچوو ڕووی کرد لە عەرزییە،

ماڵ ماڵ زەرگێکی دا لەسەر دڵی ئەویش دەرچوو لە پشتییە،

ئاغالەی ڕۆمی جنێوی بەماڵ ماڵ دا، ئەتوو حەقت بەسەر ئەوی چییە؟

ئەمن ناسۆرم گەلێک هەیە لە کوردییە.

قەت مەردی وەک ناسری نییە،

دابەزی دەستی دا خەنجەرێ دسک سپییە،

سەری کوردی بڕی وەک بەرخییە،

لێوی کوردی بڕی گوتی: «خاتوون تەورێزی پێ ماچ کردییە».

دەستی کوردی بڕی گوتی: «پێی گرتووە مەمکی خاتوون تەورێزییە».

سیرمەسیرمەی کرد وەک دۆمییە.

گوتی: براله ماڵ ماڵ! بلا بگەڕێینەوە خزمەت مەزن باوۆمەرییە.

ئەوە گەپمان پێ دەدەن دەڵێن ئەوە ئاغالەی ڕۆمی نییە».

حوکمی وەزیرەلئەعزەمی وەدەرخست بۆ عێلییە،

گوتی: «کوێستان ئی منە هەتا حەوت پشت ڕادەبرییە؛

مەزن باوۆمەر ئەگەر دەنگێ نەکا، ئەمن ئیلاقەی ناکەم بۆ خاتری خاتوون ئەسـمەر و خاتوون تەورێزییە».

ئەگەر مەزن باوۆمەر وای بیستییە،

دایەوە دەنگی لەشکرییە،

گوتی: «بیانکوژن لە وڵاتی کوێستانێ دەریان دەکەم بەیەکجارەکییە».

ئەگەر ناسر و ماڵ ماڵ ئەو قسەیان دەبیست تەواوە،

دەستیان دە مەتاڵان کێشا هەتا چێشتانی سوڵتانی خۆیان لە قۆشەنی نەداوە؛

لە پاشان ڕقیان هەڵستا بۆ مەزن باوۆمەری گەڕانەوە بەدواوە،

چوار تەرەفی مەزن باوۆمەریان دەگرت مۆڵەتیان لێ نەداوە.

ئەگەر ڕمبێکیان لە جگەری دا کاریگەر بوو هۆشی نەماوە،

لەسەر ماینیان فڕێ داوە،

وە ئەولادیان کەوتن ئاساریان بڕاوە،




ناسر و ماڵ ماڵ هاتن لە ماڵە مەزن باوۆمەری بوون پیاوە
حەوت شەو و حەوت ڕۆژانیان داوەت گرت نانیان بۆ خەڵقی داوە.
ماڵ ماڵ قەت هەڵی نەدەهێنا چاوە،
دەڵێ: «ئەوە کوڕەی دەبینم لەمن وایە کوردە ماوە».
ناسر گوتی:
«خوڵاکەی! خاتوون تەورێزی ئەو کوڕەم بۆ بێنە واوە»
سواربوو بڕێک ماینی شێ خزی گێراوە،
ڕمبێکی لەسەر دڵی کوڕی خاتوون تەورێزی داوە؛
ئەویشی کوشت بردیان لەکن بابیان دە خاکێ ناوە،
خاتوون تەورێزی زۆر گریا، دەڵێ بووم بۆسۆ و بەدناوە.
بابیشم چوو، ماڵی بڵاوبوو، زگم سووتاوە.
هەزار ڕەحمەت لە بابی (ڕەحمان بەکری) ئەو بەندەی ڕۆناوە.
خــوڵا دەوامی (ئیمپراتۆری) بدا ئەگەر (ســاحیبی ئاڵمانی) ناردۆتە ئەو وڵاتەی عیلمی کوردی بکا تەواوە.

***

# برایمۆک

برایمۆک کوڕی مەلا زێندینی بوو؛ بەنۆکەری هاتە کن میرشـــێخی. میرشێخ و میرحەج برا بوون. برایمۆک هات خزمەتی کردن هەتا حەوت ســاڵان. لە پاشـــێ میرشێخ گول بوو. برایمـــۆک حەزی لە خاتوون پەریخانێ کرد. خاتوون پەریخان خوشـــکی میرشـــێخ و میر حەجی بوو. خاتوون پەریخان گوتی: «برایم! ئەتوو دەس لە مێرشـــێخی هەڵنەگرە. بیبە فەرەنگستانی سەر حەکیمی، ئینشاڵڵا چاکی بکەوە؛ ئەمن هەر ئی تۆم». هێنای، کەرێک و تێرێکـــی دایە. هەرچەندی موخاریجی پێ هەڵگیرا، زێڕی دایە. چادرێکی دایە، لەســـەر کەرێ بۆی کردە سێبەر. هەڵی گرت ڕۆی. سێ ساڵان سواڵی پێ کرد. لە پاشێ بەقسەی خاتوون پەریخانی نەکرد. هەڵی گرت بردیە ئەســـتەمبووڵێ. ســـاڵێکی لە ئەســـتەمبووڵێ بوو. ڕۆژێکی ســـوڵتان تەشـــریفی چووە نوێژی جومعەی. نەخۆش زۆر هەبوون؛ سوڵتان ئەنعامی دانێ. میرشێخ گوتی: «برایم! ئەتوو هیچ وەرمەگرە». هیچی وەرنەگرت. عەرزی سوڵتانیان کرد:

«ئەوە نەخۆشە چی نەویست».

برایم دەڵێ:

«بەقوربانت بم سوڵتانی کارخانێ!

تەمانایەکەم بۆ بکە لە لای خولای، لە پێغەمبەری ئاخرزەمانێ؛

یانە بمرم، یانە خەلاس ببم لە تەنگانێ».

ماشەڵڵا سوڵتان ڕوحی وایە:
لە سەر بەرماڵێ بۆی دەکرد دوعایە،
بۆی لە خولای دەپاڕاوە؛ فاتیحای دەخوێند بۆ ڕوحی حەزرەتی ڕەسووڵڵایە،
نوێژی جومعەیان دەکرد، مەخلووق هەمووی دەیکرد دەور و دوعایە.
سوڵتان تەشریفی هەڵستا، دەگەڕاوە ماڵە بۆ دوایە.
دەگەییە ڕاس میرشێخی؛ میرشێخ هاواری دەکردێ.
برایمۆک دەڵێ: «ئامانە! ئەوە ئەمینی خولایە،
سوڵتانی ئەستەمبووڵییە، تەنگانەیە، شفاعەتێ دەکا، ڕۆژی قات و بەلایە».
میر دەڵێ: «برایموک! دامێنی سوڵتانم بۆ بگرە، دەشقەمێ بۆم بکا تکایە».
سوڵتان فەرمووی: «برایم! هەڵستە، وەرە دەرکێ، تا بۆ میرت بدەمێ دەوایە».
برایم هەڕای کرد دەرکێ ســـوڵتانی ئەســـتەمبووڵێ. ڕاوەستا لەوێ، سوڵتان ئیلتیفاتی کرد لە بۆ میرشێخی ناردە دەوایە.
میرشێخ فەرمووی: «برایم خزمەتی توو، بە من چارەی نایە؛
ئاغایەتیم بەچەنگ نەماوە دەگەڵ ماڵی دنیایە،
لەبەر میرحەجی برام، چم لە دەس نایە.
خاتوون پەریخان بنپشـــکی خۆمە ئەوە بە کۆشـــک و باڵەخانـــە و جێ و مەکانەوەم دایە».
برایم گوتی: «ئاغای من خولا خەلاست بکا دەگەڵ پێغەمبەری ئاخرەت زەمانێ؛
ئیلتیفاتت دەگەڵ ئەمن کرد، لە ڕێی گوزەرانێ.
ئەگەر ئەتوو ئەمنت خەلات کردووە، دەبێ سوڵتانی ئەستەمبووڵێ بەو کارەی بزانێ».
برایم لە خۆشیان دەفڕی دەیگوت:
«مەخسوودم حاسڵ بوو لە کارخانێ».
ئەگەر برایم ئەو قسەی لە میری دەبیست تەواوە،
جێبەجێ عەرزێکی نووسی، مۆری میرشێخی پێوە ناوە،
بردیە دەرکێ، بە ئەمینداریدا؛ بە خزمەت سوڵتانیان گەیاند تەواوە.
سوڵتان جێبەجێ جوابی ئەو عەریزەی داوە،
بۆی نووسییەوە دوو کەلیمە: «خولا داویەتێ لێی مارە کراوە».
سوڵتان فەرمووی: «دوعام بۆ میری کرد و لێم قەبووڵ کراوە».

برایمۆک موژده و مزگێنی بۆ میری هێناوه:

ئاغای من هەر کەسێکی بێته ئەو دەرکەی، ئیمانی هێناوه.

میر فەرمووی: «برایم ئەمن چاوم نابینێ، ئەتوو فەرمانی سوڵتانم بۆ بخوێنەوه، بزانم چ نووسراوه؟»

عەرزی کرد: له ڕووی تۆم قسه پێ ناکرێ تەواوه؛

فەرموویه دوعام بۆ میری کردووه؛ لێم قبووڵ کراوه.

ئەوی دی نازانم چییه. تەماشایان کرد ڕۆمییەک هات لەولاوه.

برایم گوتی: «قوربانت بم، ڕۆمی! ئەو قاقەزەی بۆ ئاغای من بخوێنەوه تەواوه».

ڕۆمی عەرزی کرد: «ئەوه خاتوون پەریخانه به برایمی دراوه».

میری وەری گرت، ماچی کرد، له سەر سەری خۆی ڕۆناوه،

دەڵێ: برایم ئەلحەمدولیللا مەخسوود و مرادی تووش بوو تەواوه.

سوڵتان ئیلتیفاتی دەگەڵ کردووی، چ کاریان لێره نەماوه.

تەدارەکی خۆیان لێ نا، گەڕانەوه بەدواوه.

ساڵەوەختێک دەیانناژوا، نەیاندی ڕووی زستانێ،

بەخێر و به سەڵامەت گەینەوه کوێستانێ.

ئەگەر گەینەوه وڵاتی تەواوه،

ڕۆژێکی له سەرینچاوەی کانیه چادری بۆ میرشێخی هەڵداوه.

چادریان هەڵدا؛ دەستی دا کەشکۆڵی چووه کن شوانی؛ گوتی: «بڕێکم شیر بدەیه بۆو نەخۆشەی، نانمان ئیشکه پێی ناخورێ».

هێنای بۆی تێ گوشی. کەڵەبەردێ لەوێ بوو، بردی لەوێ لەبەر تاوێ داینا. مارێک له بەردەکەی هاته دەرێ، شـــیرەکەی دەم پێوەنا، شیرەکەی خواردەوه. له پاشێ مارەکه ده شیرەکەی ڕشاوه؛ سەربەخۆ ئەو شیره دەستی به کوڵانی کرد. برایم چاوی لی بوو گوتی: «لێی گەڕێ ئەوهه دەمرێ، لەکوڵم دەبێتەوه؛ حەوت ساڵه ئەمن زەحمەتێ دەگەڵ ئەوەی دەکێشم. خۆ من خاتوون پەریخانم لێ ماره کراوه، هەر لێیان دەستێنم».

خواردنەکەی هێنا، ده پێش میری نا. میر خواردی، گوتی: «برایم، حەوت ساڵه، ئەمن نەخۆشم، قەت خواردنی وام نەخواردووه». گوتی: «میر نۆشی گیانت بێ!» هەڵستا، بۆ شـــوێ چووه ئاوەدانییه. حەوتوویێکی لەوێ ڕۆنیشت؛ ئەگەر سبحەینێ تەماشای کرد میر هەموو گۆشتی له بەدەنێ هاتبووه دەرێ. پیاوی نارده خزمەت میر حەجی گوتی: «هەموو

گۆشـــتی لە بەدەنێ بۆوە؛ ئەمن چی لێ بکەم؟» ناردی بیســـت باتمانی پەمبۆی بۆ کڕی. میرشـــێخیان دە نێونا، هەتا چل شـــەوی. پاشی چل شـــەوی هەموو بەدەنی چاک بۆوە. میرحەج تەماشـــای برای خۆی کرد؛ لە خۆشـــییان هێنای داوەتی بۆ کرد. حەوت ڕۆژان هەڵپەڕین، حەوت شـــەوانیش چراخان کرد. هێنای سەدقێکی زۆری کرد دە ڕێی خولای و تەسەدوقی سەری سوڵتانی ئەستەمبوولێ. بە گوشادی ڕۆنیشت؛ هەتا ساڵێکی. لە پاشان میرشـــێخ هەڵستا چووە کوێســـتانێ؛ برایم لەکن میرحەجی بەجێ ما، هەتا ساڵێکی دی؛ زستانیان بەسەردا هات.

ڕۆژێکی برایم، چلووی زستانێ بوو؛ ژووانی دەگەڵ خاتوون پەریخانێ کرد سەر بەردی کانییە. خاتوون پەریخان چووە سەر کانییە، برایمۆکیش کەوڵی بەخۆی دادا چوو. دەستی دەستۆی خاتوون پەریخانێ کرد. لایەکی کەوڵەکەی بۆ ڕاخست، لایەکی بەسەر هەڵکێشا. باسکی بۆ کردە سەرین. دەمی بەدەمیەوە نا. برایم و خاتوون پەریخان خەویان لێ کەوت. میرحـــەج هەرچەند بانگی کرد: «برایم لە کوێیە؟» گوتیـــان: «قوربان دیار نییە». میر چووە ســـەر کۆشک و تالاران تەماشای قووچی قەزەنی کرد، تەماشای ڕەندۆڵی زەرزایانی کرد، تەماشای سەری تەشوێلەی کرد؛ هیچی وەپێش چاوی نەهات گوتی:

«خولایە چ بکەم لەو زەمانە؟

برایم دیار نییە دەگەڵی بکەم دوو قسانە».

بانگی کردە ئەو هەموو نۆکەرانە:

سۆراخی برایمم بۆ بزانن، بۆچ دیار نییە لێرانە؟

هەڵبەتـــە زیز بووە بۆ کن میرشـــێخی ڕۆیوە جا ئەوا خۆ لەبـــەر بەفرێ دەرناچێ ئەو بەستەزمانە»

میر ئەگەر زێنی خۆی دەداوە دنیایەی ئەوجار ئەو بەستەزمانە، ئەگەر تەماشای ڕازی کانییەی دەکرد، ئەوا پێکەوە نووستوون برایمۆک و خاتوون پەریخانە.

میردەڵێ: «وەک بەسەری من هات، بەسەری قەت کەسی نەهاتی»

میر پیاوێکی تەعین کرد: «برایمم بۆ بێنە، بۆ وا شێت و هەرزە دەردەهاتی؟»

قاسید هاتووە، دوور بە دوور بانگ دێڵێ: «برایم وەرە میر گازت دەکاتی؛

ڕۆژی ڕووناکت بچن، شەوی تاریکت بین قاتی»

برایـــم دەڵێ: «قاســـید وای برادەرە، میر دەمکوژێ، دەمبڕێ، یان لە چاو دۆســـت و دوژمنان دەمداتێ خەڵاتی؟»





قاسید دەڵێ: «براله نازانم، نه دەتکوژێ، نه دەتبڕێ، نه دەتداتێ خەڵاتی، نه دەتداتێ بەراتی».

بەسەر شانانیدا دەدا کەوڵێکی قاقمی، بەسەر پێیانی دەکرد جووته کەوشێکی شامی، بەلێوانیەوه دەنا قەننێکی مارپێچ، سەبرسەبر نەرم نەرم بەقسه و گوفتوگۆ دەگەڵ قاسیدی بۆ لای دیوانی میری دەهاتی.

سەلامێکی دەکرد له دیوانی میران. هێندێکی لەبەر هەڵدەستان به کەوڵی، هێندێک به سێ قەڵاتی،

میر دەڵێ: عەلیکوموســەلام و ڕەحمەتوڵلاهی، برایم ســەر چاوەی بابی خۆت بەخێر نەهاتی».

دەڵێ: «میر قوربانت بم، دەمکوژی؛ دەمبڕی؛ یا دەمدەیەی خەڵاتی؟»

دەڵێ: «نه دەتکوژم، نه دەتبڕم، نه دەتدەمێ خەڵاتی.

هەتا ئێستا ئەمینی ماڵه من بووی، ئێستا به خوار و غەیان دەرهاتی».

دەڵێ: «بەقسەی شەیتانان دەگەڵ ئەمن لاجەل دەرهاتی».

میردەڵــێ: «بەو مانگی کانوونێ، بەو چلووی زســتانێ، دەبێ بڕۆی؛ دەرت بکەم له وڵاتی».

دەڵــێ: «هەڵوێشــکی خزمەتی بــاب و باپیری ئەنگۆ دەکەم، قەت شــایەکم نەبووه غەیانەتی».

دەڵێ: «برایم خۆ من بەقســەی شــەیتانانم دەگەڵ نەکردی؛ له ڕازی کانیەم بۆخۆم بەچاو ئەنگاوتی،

له بۆ خاتوونێت ڕاخستبوو لایەکی کەوڵی، بەسەر هەڵکێشابوو لای سێ قەڵاتی،

لەلایەکی ده ملێی شەکر و شەربەت و لەلای دیکه نوغل و نەباتی،

ســمێڵی برایمی لەســەر کولمەی خاتوون پەریخانێ بوو، دەتگوت ســۆنەی ســەری کەسکه،

هەوەڵی پایزێ فەسڵی شەختەی چووکەڵه، لەسەر شەت و گۆلی مرادانی دەبزواتی،

خشــڵی خاتوونێ دەیدا لــه کەمبەرەی برایمی، دەتگوت: داخــولا، ئەوه قافڵەیه، له هەوشار و هەشتەرخان و مەکاران دەهاتەوه، ئەوه خواجه حەسەنی بەسرییه دەنگی زەنگ و قۆڕی وی بوو، دایگرت مەملەکەتی وڵاتی.

برایم دەڵێ: «میر، بەقوربانت بم! ئەوه بەقسەی شەیتانانت له من گرت قینه،

ئەوە خاتوون پەریخان نەبوو، ئەوە کیژێکی حەریرییان بوو، بۆخۆم دەگەوزاندینە.
میر بەقوربانت بم، خۆ پەریخان نەبوو؛ کیژێکی دە بۆتیان بوو بەخوشـــک و برایەتیم دەست دەئەستۆی کردبوو، لە سوورەتی تۆم، دەدواندینە،
پڕ بەدەسترێکی دەستای دوعاَ و سەلام بوو، بەمندا بۆ تووی دەناردینە».
میردەڵێ: «برایم! حوکمە دەبێ بڕۆی لە وڵاتێ».
برایم دەڵێ: میرا لە خۆم بێ ئیختیارێ
لێم بگەڕە هەتا نەورۆزێ و بەهارێ
ئاغا ئیختیاریان بۆ نۆکەری نییە، ئینجا بۆخۆم سەربەخۆم دەکەم چارێ.
دژمنم زۆرن، بۆ وڵاتی بابی خۆم دەچمەوە خوارێ».
میر دەڵێ: «برایم حوکمە دەبێ بڕۆی لێرەکانە.
نۆکەرێکی ئەمین بووی ئێستا بووی غەیانە،
لەکن هیچ کەسی نەتماوە ممتمانە».
دەڵێ: «میر، بۆ خاتری خولای لێم گەڕە ئەو زستانە».
میر دەڵێ: «حوکمە دەرت دەکەم نابێ بمێنی لێرەکانە».
دەڵی: «میر بەقوربانت بم! دەتنێرمە تەکیەی سەید و مەلانە».
میردەڵی: «حوکمە دەرت دەکەم لە وڵاتێ؛
پیاوێکی بێ حقووق و بێ فەراساتی.
ئەگەر هاتیە کن ئەمن، لە ســـەرت بوو کڵاوێکی چوار گوێچک، دە پێتدابوو کەڵاشێکی دۆمان، دەملتدا بوو کەڕکێکی کورداتی،
ئێستا قایل نەبووی بەکەوڵی، حەوتوو بە حەوتوو دەبەخشی سێ قەڵاتی،
هێشتا بەوەی رازی نەبووی، بەخوار و غەیان دەرهاتی».
دەڵێ: «میر، بەقوربانت بم! خۆ نانی ئاغایان لە بۆ نۆکەران منەتیان نینە،
هەر نانی خۆت بەفکرە، ئەمەگی نۆکەری قەلەندەرت بەفکر نینە.
ئەتوو گولێک بووی لەوانی نفرینە،
حەوت ساڵانم سواڵ بۆ کردی، سێبەرم بۆ دەکردی لە گوێی کەری شینە؛
بەوەش قایل نەبووم، بردمیە ئەستەمبووڵێ خزمەت سوڵتانی ئەمینە،
دەچوومـــە کن شـــوان و گاوانان دە قاپێلکی کیســـەڵاندا، چۆڕەچۆڕە شـــیرم بۆ توو دەهێنا،

ئێستا دەڵێی: دەرت دەکەم بەدڵ و یەقینە.

میر، بەقوربانت بم، ئەگەر یەقین دەرم دەکەی لە وڵاتی، بسکی خاتوونێ بەمن بمێنی بەئاوریشمی دووکانان، کە لە ڕەواندزێ کوڕە بەزازان بەتەنافیان ڕادەنگاوتی.

میـــرا هەنیەی خاتوونێ بەمـــن بمێنێ، بە مانگی چاردە و پازدە؛ هەزار و حەوســـەد مەلایکەتی جڵەوکێشە، لە ڕووی پاک و ناپاکی دەردەهاتی.

میر چاوی خاتوونێ بەمن بمێنێ بەو ئەستێرەی گەلاویژی دە سێ پاری نیوەشەوێدا لە هەوشار و عەجەم و موغەدەمان هەڵدەهاتی.

دەمی خاتوونێ بەمن بمێنێ بەو فینجانی فەخفووری، کوڕە بەبان ســـەبرکە نەرم نەرم بەپەنجەی موبارەکان دەگرت لێویان لێ دەبزاوتی؛

گەردنی خاتوونێ بەمن بمێنێ بەو ماینی شێ کەحلان، کە سوارچاکان سووچی ڕکێفیان پێ نیشاندان لە ڕملی بەغدایە لەدووی پۆلی کارمامزانیان دەبزاوتی.

بەژنی خاتوونێ بەمن بمێنێ بە داری حودێ، کوڕە موفرەدی بە خەنجەری نێرگز دەبان بۆ دیرەگی خیوەتێ هەڵپەرتاوتی.

ســـینگی خاتوونێ بەمن بمێنێ بەو قاقەزی مەرجانی، ئەگەر مەلای گەورە لێی دەدەن خەتێ، کوڕە فەقێیان قەڵەمێ ئەنگاوتی.

میرا بەقوربانت بم، حەیفی ئەوم ناکوژێ، ئەگەر دەرم دەکەی لە وڵاتی،

بـــەو حەیفانەوە مردووم، ئەگەر چاوی خاتـــوون پەریخانێ لە برایمە ڕەبەنەی دەبنەوە قاتی».

میرگوتی: «تەدارەکی بۆ بگرین دەری بکەین». چوون کاڵە و گۆرییەکیان بۆ هێنا؛

میـــر گوتی: «چلـــۆن هاتووە، دەبێ واش بڕوا». چوون کەڕکێکی ســـپییان بۆ هێنا. کڵاوێکـــی چوار گوێچکیان بـــۆ هێنا، توورەکێکی نانیان بۆ هێنا. هەتا ئەو تەدارەکەیان لە ماڵێ میری گرت، خاتوون پەریخان پیاوێکی بانگ کردبوو؛ هەر تەدارەکێکی میر بۆ برایمی گوتبـــوو، خاتوون پەریخانیش لێرە بۆ پیاوەکەی ئەو تەدارەکەی گرت. میر گوتی: «برایم بفەرموو، بڕۆ». برایم دەگری، گوتی: «وای لە خۆم بێ سەڵایە!

ئەمەگی دنیایەم چوو بەزایە؛

بەفر هێن زۆرە، دەرناچم لە ڕێگایە،

میرا حەقی من و توو بمێنێ بۆ ئەوی ڕۆژێ، کە خوڵا دیوانێ دەگری لەســـەر بەردی سەخرەتوڵایە.

ئێستا ئەمن چلۆن وەدەربکەوم؟ بۆ هیچ شاران ناچیٚ ڕێگایە.
وەرە، میر بمکوژە؛ چاترە گەردنت ببیٚ خۆش و ئازایە
نەوەک گورگ و جانەوەر بمخۆن لە سەحرایە،
بەس نییە ئەگەر ئەتوو بمکوژی ئەمەکم ناچیٚ بەزایە؟
ئەگەر ئەمن وەچۆلییە کەوم، دەرناکەم هیچ ڕێگایە،
میر، ئەودەمی هەر ئەتوو پێی دەبی ڕووسیایە».

دەڵیٚ: «برایم! حوکمە نابیٚ بمێنی؛ بۆ کن میرشێخی برۆ، بەمنت چارە نایە».

برایم دەڵیٚ: «میر، شکایەتی خوڵات لیٚ دەکەم دەگەڵ ئی حەزرەتی ڕەسوڵڵایە».

خاتوون پەریخان پیاوێکی تەدارەک بۆ گرتبوو لە چەشنی برایمی. پیلی برایمیان گرت. برِوا. برایم گوتی: «ئاغا! بۆ خاتری خوڵای کەسم دەگەڵ نەیە؛ زۆرم خزمەت کردووە، خەڵقم پیٚ دەکەنیٚ»

پەردەیان بۆ هەڵگرت، پیلی برایمیان گرت، وەدەریان نا. خاتوون پەریخان لە پشت پەردەی ڕاوەستابوو، پیلی برایمی گرت، پیاوەکەی بەڕیٚ کرد. برایمی برد شاردیەوە جوانوو ئەسپێکی بۆ لەکن میرشێخی هاتبوو. هێنای، سیٚ ڕۆژان ئەو جوانوو ئەسپەی ئاو نەدا، هەر کا و جۆ و وێنجەی دایە؛ تەدارکێکی چاکی گرت بۆ سبحەینیٚ بۆ برایمی. سبحەینیٚ بەیانی جوانووەکەی زین کرد، لوولێنێکی ئاو گەرم هێنا. بە زینی داکرد، برایمی سوارکرد ئاوی بەڕکێفی داکرد.

خاتوون پەریخان دەڵیٚ:
«برایم، ئەگەر حەقە، ئەگەر ناحەقە،
ئەگەر دەمزانی کاکەم دەرت بکا بەموتلەقا،
دەچوومە یەختەخانی ماڵە بابم، بۆم دەردەهێنان جوانۆڵێکی نەوزین لەوانی سم بەتەبەقە،
هاوارم دەکردە ئەو خالەقە،
نەوەکو سەرمای زستانیٚ لەو ڕێگایە بتکا ڕەقە.
برایم! ئەگەر دەمزانی هەر میوانی،
نەمدەیەشت خزمەتی برای من بکەی بچیە ئەستەمبووڵیٚ خزمەت سوڵتانی،
دەچوومە ماڵە بابم بۆم هەڵدەگرتی بەرگێکی ڕۆمیانی،
دەچوومە یەختەخانەی ماڵە بابم، بۆم دەردەهێنای حدوودێکی بیٚ نیشانی،

لە کەحلەکانی عەرەبستانی،

سوارم دەکردی هیچ کەس نەزانی.

برایم! ئینجا برۆ، بەختی منی بابان وێرانی

دوازدە ئیمام ئاگایان لێ بێ، دەگەڵ غەوسی گێلانی،

برایم لەکنم زستانێ سەختە، بەساغ و سەلامەتی ناگەیە مەکانی.

مردن بۆ تۆیە، خەم بۆ منی ماڵ وێرانی.

ناچیە چ گۆڕخانان، کەس بە مەسکەنێت نازانی».

کێ بوو لە خاتوون پەریخانێ و برایمی کۆڵاوە،

بانگێکی خۆشیان لێ داوە،

برایم بۆ ماڵێ میرشێخی ڕۆیی، خاتوون بەخەمگینی گەڕاوە.

برایم دەڕۆیی، لە سەرمان زمانی شکاوە.

برایم دەڵێ: «ڕێیە سەردەر ناکەم، لە خۆم ماڵ وێرانێ!

ئەمن نازانم، نە بۆ گەرمێنێ دەچم، نە بۆ کوێستانێ.

خۆم دەسپێرم بەخولای و بەپیغەمبەری ئاخری زەمانێ».

جوانووی برایم بەڵەدە، بۆ ماڵی میرشێخی بڕوا بەولاوە،

سێ شەو و ڕۆژ هەر کا و جۆی خواردووە، ئاو نەدراوە،

لە تینووان هیلاکە، هەر خۆی بۆ کانیە کوتاوە،

هەتا نوێژی شـێوان داغڵ بە کانیە بوو، خۆی تێ ئاویت؛ هێندی ئاو خواردەوە، چوار چەنگۆڵە ڕاوەستاوە،

برایم بێ زمانە هەڵی نایەن شتاقە چاوە.

جوانوو دە کانیەدا لەوۆراوە.

ئەگەر جوانوو تەماشای کرد شەو کەمی ماوە.

میرشـێخ سێ ژنی بوو، شـەوێ خەونی دی، ئەگەر نوست. لە خەوێ راپەڕی؛ بە ژنی گەورەی گوت: «خەونم بە برایمەوە دیوە؛ برایم زۆر شـلووخە. داخولا میرحەج، دەگەڵێ خراپە؛ چ گێچەڵێکی بەسەربێنی».

میر خەوی لێ کەوتەوە، جوانووەکە سەرمای بوو دە ئاوێدا. جوانووکە ئەگەر تەماشای کرد، چوار تەرەفی کانییەکە بەفر بوو، خۆی فڕێ دا. برایم کەوت دە نێو ئاوێ، سـەری لەسەر بەفرێ بوو، جوانووکە چوو دە حەساری میریەوە. میر دیسان برایمی دەخەوێ هات.

ژنی گەورەی ڕاســـت کردەوە، گوتی: «هەر برایمم دە خەوێ دێ. برایم شــلووخە، بانگی کوێخادەرکی کە، تەماشای ڕێی کانییە بکا، بزانێ هیچ هەست و خوست نییە لەلای کانییە خومارۆیە». کوێخادەرک چوو، تەماشــای کرد. جوانووییێک دەحەســارێدایە؛ هەرچەندی دەوری دا بــۆی نەگیرا. هاواری هێنا بۆ میری، گوتی: «میرا قوربان، لە ڕێی کانییە هیچ دیار نییە. ئەما جوانووییێک بە زینەوە دەحەسارێدا ناگیرێ، نەشمناسییە».

خانم دەڵێ:

«وەڵڵاهی! پیاوی گەورە ئیختیاری بۆ کەس نییە

ئەوە جوانووی برایمی مەلا زێندینانە، میرحەجە گولە دەری کردییە.

ئەوە بۆ ئێرە هاتووە بەهومێدییە،

لە ڕێیە سەرمایێ بردوویە بەبێ کەسییە،

خولاکەی، میرا هەتا ڕازی کانییە بچین، بزانین، هیچ ڕێوشوێی دیار نییە؟»

کێ بوو لە خانم و میری تەواوە،

ملیان لە ڕێی کانیە ناوە،

دەچوونە کانیە تەماشــا دەکەن، ڕەشاییەک دە کانیەدا مەحتەل ماوە، نەیانوێرا بچنە سەری خانم و میری تەواوە.

هاواریان دەناردە نۆکەران، لە مەخلووقیان دەگێڕاوە.

مەخلووقیان بەسەر وەربوو، خانم ناردی چرا و فانۆسی هێناوە.

تەماشایان دەکرد، ئەوە برایمە لەوێ مەحتەل ماوە.

خانم دەڵێ: «دیوتە ئەوە عەوەزی ئەمەگی برایمت داوە؟

ئەوە خزمەتکارەکەی تۆیە، حەوت ساڵانی ئەتوو بەکەرێ گێڕاوە،

ئێستا بەقینی توو بەچلووی زستانێ لەکن میرحەجە گولەی دەرکراوە،

خولاکەی! بلا هەڵی گرین، بیبەینەوە بزانین مردووە یانە ماوە.

میر گوتی: «وەرن هەڵی گرن». خانم گوتی: «تەماشای میری چەند ناتەواوە!

وەرە، یا بەکۆڵی منی دادە یا بۆخۆت هەڵی گرە؛ ئەوهە گەلێکی ئەمەگی کێشاوە».

میر هەڵی گرت هەتا دەتوانێ،

گەلێک ماندووبوو خانم دەزانێ؛

دەڵێ: «برایم لەسەر ئەتووم لێ برا ڕێی گوزەرانێ،

خانم بەئامێزێ هەڵی گرت تا بردیە باڵەخانێ،




خانم دەڵێ: «ئێستا دەبێ حەمامی ژنانی بۆ بکەین». میر گوتی:
«نەچاوان، هەرچی بۆی چاکە وای بۆ بکە». هێنای، برایمیان ڕووت کردەوە،
لێرەیان دریژ کرد؛ هەرســێ ژنی میری هاتن، ڕووتیان کردووە ڕووت: یەکیان لەبەرەوە پێوەنا، یەکیش لە پشتەوەیان پێوەنا، ئەوی دیکەشیان لەسەر درێژ کرد. هەتا سەحات و نیوێکی. برایم دەنێو ژنەکاندا ئارەقەی کرد.
کە چاوی هەڵینا بەستەزمانە،
دەڵێ: «خولایە! ئەوە حەمامی ژنانە،
ئەمن دوێنێ لە گەرمێنێ بووم لەکن خاتوون پەریخانێ؛ ئێستا چ دەکەم لێرەکانە؟
ئەگەر میر پێی بزانێ ئەمن چ بکەم لە خەجاڵەتییانە؟»
ئەگەر ژنی گەورەی میری وا دەبینێ
بانگ دەکا: «میرا برایم چاکە؛ مەکێشە خەم و نسرینێ».
ئەگەر خانم وادەزانێ تەواوە،
ژنەکانی بردن بەولاوە،
برایم بەتاقی تەنێ دەجێدا ماوە.
دەڵێ: «خەجاڵەتم، خولایە! چم لێ قەوماوە!»
ژنەکانی دی هەڵستان، موژدەیان بۆ میری هێناوە:
سوحبەتیان دەگەڵ میری کرد: «میر حەمامی ژنان وایە، مردووی پێ زیندووکراوە».
خانمی گەورە هەڵستا، دەستێکی بەرگی میری بۆ برایمی هێناوە؛
دەبەر برایمۆکی کرد؛ برایم لە جێی خۆی هەڵستاوە
چۆوە لە میری کرد سەلاوە.
میر یەک پێ لەبەری بڵندبوو، دەستی دەستۆی کرد، ماچی کردن هەرتک چاوە،
برایمی لەکەن خۆی ڕۆنا،
دەڵی: «دەگەڵ میرحەجی چت لێ قەوماوە؟
میرحەج بۆچ ئەتووی کردۆتە خەم؛ خولا خاتوون پەریخانی بەتوو داوە».
هەرچەندی کرمەک و گوارە و مۆر و ئەنگوستیلەی خاتوون پەریخانێیە هەمووی دەگەڵ خۆی هێناوە.
خانم هەڵی گرت، نەیێشت، میر ئەوانەی بکەوێ بەچاوە.
چەند شەو و ڕۆژان برایمی لەکنە خۆی داناوە،

دەڵێ: «ڕێی کوێستانێ بێتەوە، دەنێرم خاتوون پەریخان بێننە ئێرە، دەتانکەم بە بووک و زاوا».

کە برایم ئەو قسەی میری بیست تەواوە،

شەوێ هەتا ڕۆژ، سەوەتێکی پەیداکردبوو، گڵ و پەینی بۆ قەندیلی مامەکۆییان کێشاوە.

ڕۆژێکی گوتی: «میرا بەقوربانت بم سەری کوێستانان ڕەشبەڵەک بوو بەفر لە هیچ کوێ نەماوە».

خانم پێکەنی، گوتی: «میر تەماشای برایمی کە، هێشتا نیوەی زستانێ نەبووە؛ شەوێ هەتا ڕۆژ ئەو فەقیرە گڵی بەکۆڵی کێشاوە.

ئەو زەحمەتەشی هەروەک خزمەتی تۆیە ئەگەر ئەتووی دە کووچە و کۆڵانان گێڕاوە.

میر نابێ چ کاران بکەی، هەتا کاری برایمۆکی دەکەی تەواوە».

میر هەڵی گرت قاقەزێکی نووسی بۆ میرحەجی: «براله! بەسەری من برایمی بێ کەیف نەکەی، زۆر ئەمانتت بێ پەکی نەخەی لەسەر ماڵی دنیایە، ئەمما کارێکی زۆر گەورە هاتووتە بەرێ. سوڵتانی ئەستەمبووڵێ دەسەری کردووم بۆ فەرشێکی؛ سەد کەسم هێناوە، کەس باشاری ناکا، بەکەس ناکرێ. ئەگەر خاتوون پەریخانێ نەنێری هەرتکمان دەخنکێنن؛ هەر وەزعێکی دەکەی خاتوون پەریخانێ بنێرە. ئەمما بەخاتری ئەمن زۆر نیگاداشتی برایمی بکە، ئەمانەتی منە لەکن ئەتووم داناوە».

ئەگەر ئێڵچی ئەو قاقەزەی برد بۆ میرحەجی خوێندراوە،

میرحەج گوشادی لێ پەیدابوو گوتی: «لێی گەڕە، برایم نەماوە».

دەسەری خاتوون پەریخانێی کرد: «تەدارەکی خۆی بکرە، سەفەری لەبەرە، کاکم خراپی لێ قەوماوە».

خاتوون پەریخان دەڵێ: «بەخولای ئەمن ناچم بەولاوە».

میرحەج دەڵێ: بیانووان نەبینێ، لێم نەگرێ مانێ؛

دەبێ بڕوا سبحەیانێ».

تەدارەکیان گرت تەواوە،

خاتوون پەریخانیان دە زەمبیلان ناوە، ئاوێتیانە شانی خۆیان، ڕێیان کێشاوە.

گوتی: میرحەج! براله! دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا»

هەتاوەکو ئێوارێیان کێشا، ئێوارێ داغیل بە کانیە خومارۆیە کراوە،

مزگێنی بە میرشێخی دراوە.
میرشێخ لەجێی خۆی هەڵستاوە
ناردی دەهۆڵ و زورنای هێناوە
لۆتی و ڕەقاس دروس کراوە
ساز و چەقەنەی لێ داوە
داوەتێکی خۆش گێڕاوە
حەوت ڕۆژان بوو تەواوە
مەلا و فەقێیان هێناوە
ئەوانیش پاک قۆڵیان کێشاوە
کاری هەرتکیان بوو تەواوە
موبارەک بێ بووک و زاوا
(ڕەحمان) بەکر ڕاوەستاوە
ئەو بەیتەی کردووە تەواوە
لەنێو کوردی زۆر بەناوە
لە سابڵاغێ دانراوە
حوکمی خاریجەگەری بەوی دراوە
ئەلحەملای کارمان تەواوە

***



## شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی

خاتوون ئەستی کچی مام غەڵێفەیە. فەرخ کوڕی مامادییە. هەرتکیان ئامۆزان، بابیان برایـــە. فەرخ دە زگی دایکیدا بوو، دایکی ژان و برکـــی هاتێ. ئەگەر بەخێر منداڵێ ببێ، ناردیان ژنە ســـەید و مەلا هاتن، ناردیان ژنی وەکیل و وەزیری هاتن. ســـێ خوشک بوون، نازێ و نازدار و خاتوون ئەستی. مامادی دوازدە کوڕی بوو؛ هەر دوازدەی مردبوو. گوتی: «خولایە! ئەوجار فرزەندێکم بدەیە، یا نێر بێ، یا مێ بێ». خولاوەندی عالەمی فەرخی دا بـــە مامادی. ئەگەر دەوریان گرت مامانچی، فەرخ دە زگی دایکیدا بوو. حەزی لە خاتوون ئەستێ کرد. خاتوون ئەستی بۆخۆی نەیدەزانی.

فەرخ دە زگی دایکیدا بانگ دەکا؛ دەڵێ:

ئیلاهی یا! فەرخم لێ دەبوو بەیەکە؛

شوکرانەم بەتوو، ئەی فەلەکە

خەلقەتی دەکردن دەست و چاو و پێ و بەلەکە.

مەخسوود و مرادم هەرتک چاوی بەڵەکە.

ئیلاهی! یا فەرخم لێ دەبوو بە دووە

خولایە شوکرانە وەبەر ئەتووە

خەڵقەتی دەکردن دەست و پی و بەلەک و ڕووە.

مەخسوود و مرادم هەرتک چاوی دە تووە.
ئیلاهی! فەرخم لێ دەبوو بە سێیە
شوکرم بەتوو ئەی خولێیە،
خەڵقەتی دەکرد دەست و زار و پێیە.
مەخسوود و مرادم لە هۆرتک چاوی خاتوون ئەستێیە.
ئیلاهی! فەرخ دەبوو بە چوارە؛
شوکرم بەتوو ئەی جەبارە!
خولای خەلقەت دەکرد هەموو ئاکارە.
مەخسوود و مرادم لە هەرتک چاوی دەبەخومارە.
ئیلاهی! فەرخ دەبوو بە پێنجە
خاتوون ئاویان لە کانیان هەڵدێنجا
گۆزە دەبوو بەزێڕ، کانی دەبوونەوە بەگەنجە.
ئیلاهی! فەرخ دەبوو بە شەشە؛
هاوارم وەبەر توو، ئەی عەرشە!
خولای دروس دەکردن هەموو ئاکار و لەشە.
مەخسوود و مرادم لە هەرتک چاوی دە ڕەشە.
ئیلاهی! فەرخ دەبوو بە حەوتە
مەلەکان لە ئاسمانی حەوتەمینیان ڕاو تێ دەکەوتە؛
خولای دەینارده سەر ئۆمەتێ مەلەکولمەوتە.
ئیلاهی فەرخ دەبوو بە هەشتە
مەلەکان لە ئاسمانێیان پەشتاوپەشتە،
خولای لە شەرافەتی پێغەمبەری دروستی دەکرد دۆزەق و بەهەشتە.
ئەگەر نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ تەواو دەبوو بەدڵ و بەجانە،
فەرخ دەهاتە ڕوو بەدەستەوە دەست لەسەر ڕووانە،
لە خەزێنەی خەلاس دەبوو دەیانگرت مامانە،
فەرخیان ڕادەگرت لەسەر هەردک دەستانە،
نێوکی فەرخیان بڕی بەکلیخی دەبانە،
توندیان دەپێچاوە بەدەستانە،

لەسەر بنی بێژنگیان دادەنا بۆیان دەکرد چراخانە.
ئەو ژنە وەزیر و وەکیلە بەدزی دەکەن قسانە،
دەڵێن: «ئەوە یا ڕمووزنە، یانە شەیتانە،
مزگێنی بەرن بۆ مام غەڵیفانە»
ئەوی پیرێژن و سەرسپییە،
تەگبیرێ دەکەن لە نەبەدییە،
بڵا بۆ شارەکەی داودییە بەرین مزگێنییە،
هێندێک لەکن دایکی فەرخۆڵەی بەجێ دەمان بەکێشکچییە،
دەڵێن: «خوشکێ چاومان نابینێ بەو شەوەی بڵا ئەمە ڕۆنیشتین لەکن ئەوییە».
فـــەرخ دەڵێ: «هەرچی پیرە لەکن دایکم بەجێ دەمێنـــێ، هەرچی جوانە، بەقەوەتە، دەچێتە شاری داودییەی دەستێنی مزگێنییە».
هیچ نادەن بەو فەقیرانەی کێشکچییە،
فەرخ دەڵێ: «ئەوی پیرێژن و مامانچی و سەرسپیە،
هێندێک کێشکچی بن، هێندێک بەرن مزگێنییە،
زۆرو دەدەنێ کەم نییە،
ئەگەر هێناتانەوە هەمووتان لێ بەش دەکەم بەبرایەتییە،
هەرکەس پوولێکی بدزێ بەحەقی ئەو خولایەی ڕەببییە،
سەری دەتاشم، سواری کەرێی دەکەم، بیروونی دەکەم لە شاری داودییە».
ئەوانە گوتیان: «نامانەوەێ ئەو شەیتان و ڕمووزنە ئابڕوومان دەبا».
هەموو گەڕانەوە لە پاشـــێ گوتیان: دەچین گەلێکی دەســـتێنین هیچ غەیانەتی ناکەین دەیبەینەوە». فەرخ بانگ دەکا:
«ئەی پیرێژن، ئەی مامانچی دەموحتەبەرن!
هەموو لە دەرەوەی من و ئی دایکم ڕاوەستان دەڵێی لەنگەرن.
مزگێنی بگەیەننە دیوانێ، بۆ مام غەڵیفەی و بۆ بابم بەرن»
مامانچی و قەرەواش لە کاری خولای تەعجوب دەمانە،
دەڵێن: «یا ڕەبی بەڕەحمەتی توو شوکرانە!
ئەوە مەعلوومە یان ڕمووزنە، یان شەیتانە،
دەنا قەت بووە منداڵی یەک ساحەتە دە زگی دایکیدا بکا قسانە

بلا مزگێنین بڕفێنی بۆ دیوانی گەورە و گرانە».
ئەوە قەرەواش و سەرسپییە
دەبوون بە تەتەر و ئێڵچییە
دەگەڕان دەکووچە و کۆلانی شاری داودییە
لە دیوانێ دەچوونە پێش دەیاندا مزگێنییە
ئەگەر مام غەڵیفە ئەو قسەی دەبیست تەواوە،
شوکرانەی دەبژارد سەلاواتی لێ دەداوە،
گوتی: «خەبەرێ بەرن بە مامادیی کاکم تەواوە،
بۆ وی تاقانەیە زگی سووتاوە».
مزگێنییان دا بە مامادی بەیەکجاری،
دەڵێ: «یا ڕەبی زۆر شوکر بەگەورەیی جەباری؛
بابە چو لەمن دەوێ هۆوەتا مام غەڵیفەی گەورەی شاری».
ئەگەر مام غەڵیفە تێ دەگەیەنن،
دەڵێ: «سەید و مەلا و میرزا و فەقێ بچن لەسەر کوڕی مامادی بخوێنن
جا سبحەیێ وەرنەوە جا سەرو خەلاتی گەورەم لێ بستێنن
شەیتان دەچووە کن مام غەڵیفەی بەیەکجارەکییە:
«قوربان کارێکی گەورە قەوماوە ئەتوو نەتزانییە
هاتوونە کن ئەمن قەرەواش و مامانچییە،
دەڵێن: کوڕی مامادی ڕمووزاتە قەت شەیتانی وا نییە
نێوی لە خۆی ناوە فەرخۆڵە، ئاغای شاری داودییە
دەڵی مەخسوود و مرادیشم خاتوون ئەستییە».
مام غەڵیفە بەو قسە جەرگی سووتاوە
دەڵێ: «سبحەینێ جواب دە گەرمێنێ بگەڕێ لە ئەستەمبوڵێ ببێ بلاوە،
سوڵتان پێ بزانێ پاکمان دەخنکێنێ تەخت و تاراجمان دەکا تەواوە،
دەڵێ: «ئەوە بنەچەکە فاسقن بۆیە ئەوەیان وەڕووی زەمینێ ناوە».
بانگی کردە سێ دزان گوتی:
ئەنگۆ ئەوەی بدزن لە سەید و مەلایان تەواوە.
فرێی دەنە تەویلەی کەڵ و گامێشان، ئێستران پێی لێ دەنێن دەیکەن بلاوە،




سبحەینێ دەگەڵ ڕیخێ دەیرێژن جواب دەخەلقی دەگەڕێ دەڵێن: «شەیتان و ڕمووزن بوو مەفح کراوە».

ئەو سێ دزانە دەهاتن خزمەتی مەلا و فەقێیانیان دەکرد، بۆیان دەهێنان قەننە و ئاوە،

هەتا نیوەشەوێ خزمەتیان کرد، نیوەشەوێ چرا کوژاوە،

ئەو فەقێ و مەلایە پاک بوون بڵاوە،

ئەو دزانە فەرخیان هەڵگرت بەدەستی یەکدییان داوە،

بۆ تەویلەی کەڵ و گامێشانیان فڕێ داوە،

مەلایکەتان فەرخیان هەڵگرت کێشکیان لە دەرەوەی کێشا لەسەر بەردێکی مەڕمەڕیان ڕۆناوە،

هەرچەند کەر و بارگینە سەریان بەسەردا گرتووە لە دەرەوەی ڕاوەستاوە،

فەرخ دەڵێ: دایکی بەهەویای کێشکچییان ئاگای لەمن بڕاوە،

فەرخ بانگ دەکا: «دایە گیان وای گیانە!

بەڕەحمەتی خوڵای دەبژێرم شوکرانە

چلۆنت بەرەڵدا کردم بەهیوای کێشکچییانە،

نۆ مانگ و نۆ ڕۆژان هەڵت گرتم بەبەر و پشتانە،

هیچ برازا نابێ بەمامی بکا متمانە».

دایە گیان هێزی جەرگم چرای چاوانم!

«ئەتوو نەتزانیوە بەفەرموودەی مامم؟ مەیتەری کەر و بارگین و ئیسترانم».

کە دایکی ئەو قسەی دەبیست تەواوە،

چەپۆکی بەسەر خۆیدا داوە،

دەڵێ: خانەم خرابووم کوڕەکەم نەماوە،

هەڵستا، چرا هەڵکراوە،

هەر چەندی پەنجەرە و دوودەرییان گەڕاوە،

سۆراخی کوڕی وەچەنگ نەکەوت؛ دەڵی: «خوڵایە! ئامان جەرگم بڕاوە»

ڕووی دە تەویلەی ئێستر و بارگینان کرد، هەموو ئاخوڕان گەرا، سۆراخی نەکراوە،

تەماشای کرد، هەرچەندی وڵاخە، یەک بە بەندیەوە نەماوە،

بەردێکی مەڕمەڕ لەوێیە کوڕی وی لەسەر دانراوە،

هەرچەندی حەولی دا ولاغێک لەبەر وی نەکشاوە،

لەسەر چەنگان ڕۆیی ئامێزی دە کوڕی خۆی وەرهێناوە،

ئەگەر گوتی: «هەس» هەموو ولاغی لەبەر کشاوە.

کوڕی خۆی هێنا لەسەر جێی خۆی بەرقەرار کراوە،

جا هەتا حەوتووێکی بۆخۆی کێشکی لە کوڕی خۆی کێشاوە.

هەتا حەوتووێکی چ باس و خەبەر نەبوو. پاش حەوتووێکی دایکی شـیوی کرد گوتی: «نیوەڕۆیە هەڵم بسـتێنن نوێژان دەکەم». تەدارەکی بۆ فەرخی گرتبوو، لانکی بۆ دروس کردبوو. دایکی گوتی: «ئینشـاڵلا بۆ شەوێ، کوڕی داوێمە سەر لانکێ، حەوتووی دەچێ. پیاوێک لە ولاتێکی هاتبوو خاتوون ئەسـتی ببینێ. سـوورەتی بگـرێ، بۆ ئاغای خۆی بەرێتەوە. فەرخ گوتی: «خاتوون ئەستی نازانێ ئەمن حەزی لێ دەکەم؛ مێردی بکا ئەمن ئاوارە دەبم. بەڵا دوعایە بکەم ئەو شـەو دایکم بمرێ. سـبحەینێ بابم بمرێ. کەس نەبێ بەخێوم بکا، ئیلا خاتوون ئەستی نەبێ، بۆخۆم داگیری دەکەم، نایەڵم کەس بیخوازێ.

خولایە گەورە و چەند نادری،

هەم کەریم و قادری،

ڕوحان دەدەی، وەریان دەگری

ئەوڕۆ لە حەوتووی دەرچم، دایکم بمری

سبحەینێ دەکەوینە چاوان، بابم بمری

بەهیچ کەسـێکی بەخێـو نەکرێم، خاتوون ئەسـتی بۆخۆی هەڵم گـری خولایە! نە بەکەبرێنی، نە بەسەبرێنی

ئەوڕۆ دایکم بمرێ، سبحەینێ بابم بمرێنی،

بەهیچ کەس بەخێو نەکرێم، دەبێ خاتوون ئەستی بۆخۆی بمعاملێنی.

ئەگەر فەرخ تەمەنای دەکرد لە خولای عالەمیانە،

لە بۆ دایکی فەرخی دەهاتن میوانە،

بەخۆی نەزانی، ڕوحیان کێشا ئەو بەستەزمانە،

لە ماڵێ بوو، بەشین و گریانە،

هاواریان برد بۆ مامادی و مام غەڵیفانە،

مامادی دەڵی:

«خولایە! بەڕەحمەتت شوکرانە!

خۆ دەوڵەتم زۆرە گەنج و دەبوتخانە،
کوڕی بێ دایک چلۆنی دەبێ گوزەرانە؟»
ئەوێ شەوێ ڕۆژ بوو ئاوە،
دایکی فەرخۆڵەی تەسلیم نەکراوە
هەتا سبحەینێ تەمیز شۆراوە،
خەڵاتیان دەبەر دەکرد، بۆ گۆڕخانان هەڵگیراوە،
تەسلیم بەخاکیان کرد، مەخلووق گەڕاوە،
هاتن لە مزگەوتێ ڕۆنیشـــتن کەیخـــواد و پیاوماقووڵ، سەرەخۆشـــی لە مام غەڵیفە، مامادی کراوە،
هەتا نیوەڕۆیە بانگێکی بەهەق لێ دراوە،
دەڵێن: «بلا بچی نوێژان بکەین تەواوە،
«ئەو مەخلووقە پاک لە برسان مرد، یەکێک هۆشی نەماوە».
خڕبوونەوە هەموو موسڵمانە،
هەموو لە ماڵی خۆیان دەیانهێنا سفرە و نانە،
عەرزی مام غەڵیفەیان کرد: «بلا مامادیش بێتە ئێرەکانە».
لە میحرابی مزگەوتێ ڕۆنیشتبووم کەس پێیان نەزانی ئەو خەڵقانە.
لە بارەگای خولای دەیهات میوانە،
ڕوحیان دەکێشا کردیان سەرەوێرانە،
ئەوەش دوعای فەرخی مامادییانە،
قبووڵ بوو لە دایک و بابانە،
مەلا گوتی: «مامادی، هەڵستە، تەشریفت بێتە ئێرەکانە».
مەلا هاتەوە گوتی: «بابە نانی خۆ بخۆن نە سەری هەیە نە ئەزمانە».
نانیان خوارد و بژاردیان شوکرانە،
مەلا گوتی: «مام غەڵێفە! بلا بچینە قەبرانە»
مام غەڵیفە گوتی: «مەلا! ئەمە تازە هاتووینەوە چ قەوماوە»
مەلا گوتی: «قوربان سەری تۆ سەلامەت بێ مامادی نەماوە».
مام غەڵیفە گوتی: «وای! قوڕم بەسەری بوو کەسم نەماوە
پشتم شکا جەرگم سووتاوە»

وەدەرکەوت، بانگێکی خۆشی لێ داوە.
فەرخ بۆ دایکی هیچ نەگریا، ئەگەر بابی مرد ئەویش گریاوە
ئەوڕۆ کەوتۆتە چلان بەهیچ کەس ژێر نەدەکراوە.
مام غەڵیفە دەڵی: «ڕۆڵە! خراپم لێ قەوماوە»
لێی خڕبوونەتەوە سەید و مەلای تەواوە،
هەڵیان گرت، بۆ گۆڕخانەی بردیان بەولاوە،
ئەوی لەکن دایکی فەرخی تەسلیم کراوە.
فەرخ بانگ لەسەر بانگی لێ دا بەکەس ژێر نەکراوە.
پوورێکی فەرخی هات لەولاوە،
دەڵێ: «برام چوو، ئەو کۆرپەی ماوە.
دەیبەم بەخێوی دەکەم هەموو ماڵی خۆمی دەنێم دەپێناوە».
هەڵی گرت، بردیە ماڵی خۆی دایناوە،
فەرخ ئەگەر لەوێ زیڕاندی، هەر گریا و ژێر نەکراوە،
پووری دەڵێ: «چ بکەم خەڵق دەڵێن: شەیتان و ڕموزنە؛ بۆیە دایک و بابی نەماوە».
پووری هەڵی گرت هێنایەوە بەولاوە.
لە ماڵێ داینا گوتی: «چی لێ بکەم، چارەم بڕاوە،
هەر کەسێک بۆم بەخێو بکا هەموو مانگان سێ لیرەی دەدەمێ تەواوە».
مروەتی مەولوود سوراحی هات لەولاوە.
دەڵێ: «ڕۆڵە بەقوربانت بم! دایک و بابی نەماوە»
فەرخی هەڵگرت دراوەکەی دەباغەڵێ ناوە،
فەرخ دەتگوت دووپشکی ڕەش پێوەی داوە،
هەرچەندی کووچە و کۆلان بوو، پێوە خولاوە؛
چارەی نەدەکرا، هەر چاتر گریاوە.
برێکی لە زێڕەکان هەڵگرت، هێنای، لەوێی ڕۆناوە؛
گوتی: «بابە! ئەوە عیلاجی بەمن ناکرێ، شەیتانە وەسەرێ عەرزێ نراوە،
بۆیەکی وا بەهەتیوی بەجێ ماوە».
ناردیان لە مام غەڵیفەی لە دیوانێ گێڕاوە.
مام غەڵیفە هاتە ماڵێ، گەلێک گەلێک گریاوە؛

دەڵێ: «دیوانم چۆڵ بوو، مزگەوتم نەماوە،
ئاورم تێ بەربوو، جەرگم سووتاوە،
جواب دە دژمنان دەگەڕێ، دەڵێن: مام غەڵیفەی برای نەماوە؛
ئەمن چ بکەم لە فەرخۆڵەی و لەو تولفی ساوە».
بانگی دەکرد: :نازێ، نازدار! خاتوو ئەستی! وەرن لەولاوە»
دەیگوت: «ڕۆڵە! نازانن، ئەنگۆ مامو مردووە، بابو پشتی شکاوە؟
وەرن تەگبیــرێ بکەن لە بــۆ فەرخۆڵەی دایک و بابی نیــن؛ چلۆنی گوزەرانی بدەین تەواوە؟»
نازدار دەڵێ «بابە! چ بکەین، منداڵێکە بەنادری.
هەرچەند دەکەی، مەمکی چ کافر و موسڵمانێ ناگری».
مام غەڵیفە دەڵێ: «فرزەندی من، گیانە!
وەرن تەگبیرێ بکەین بەهەمووانە،
بەخێو بکەین فەرخۆڵەی بەستەزمانە.
ڕۆڵە نازدار! ئەگەر بۆم بەخێو بکەی لە دنیایە،
شاری داودییەی بەشی خۆمت دەدەمێ گەردنت دەکەم ئازایە.
ڕۆڵە! حەزی دەکەی، جا ڕۆنیشە، بۆ من ببە بەپەنهایە».
دەڵێ: «بابە! بۆ لە من دەکەی فکرێ؟
بابە ئەوە لێم لە بیانووی؛ چونکە نانت گەلێک دەخورێ.
بابە ئەگەر بچمە کۆڵانان، نان نانەم پێ پەیدا دەکرێ،
ئەمن مێردم نەکردووە ئەو شەیتان و ڕمووزنەم پێ بەخێو ناکرێ».
ئەوجار ڕووی دە نازێ کرد تەواوە،
دەڵێ: «ڕۆڵە! چلۆن تەگبیرێ بکەین لەو کۆرپەی ساوە،
تووشی ئەستۆم بووە، چارەم بڕاوە.
کەسێک بۆم بەخێو بکا، شاری داودییەم بۆ وی داناوە؛
دەیدەمێ بەیەکجارەکی بۆ خۆی ببێتە ئاغایەکی تەواوە».
نازێ دەڵێ: «بابم بزانە، چ پەڵپێکی لە من گرتووە، بەو خولا، ئەوە بەمن ناکرێ.
هەرچەند دەکەی مەمکی هیچ کەسێکی ناگرێ.
بابە هەتیوی بێ دایک و باب بەمن بەخێو ناکرێ»

ئەگەر مام غەڵیفەی وای لە کچەکانی خۆی بیستییە،
دەڵێ: لە دنیای ڕوون فرزەند چ نییە،
ئەوجار وەرگەڕاوە، ڕووی کردە خاتوون ئەستییە،
دەڵێ: «ڕۆڵە! کچەکان جوابیان دام ئەتوو قسەت چییە؟»
دەڵێ: بابە ئەمن چ مێردیم نەکردووە چ مەمکم نییە؛
«بابـــە! ئەتوو دایەنێکی پەیدا بکــە مەمکی بداتێ، ئەمنیش بــۆ خاتری توو لەکنی ڕۆدەنیشم بەلانکەژێنییە»
دەڵێ: «ڕۆڵە! گەردنت ئازابێ لە بەشی خۆم لە شاری داودییە،
چونکە تووشی ئەستۆت دەبێ هەتیوبارییە».
نـــازادر دەڵـــێ: «بابم، شـــەڕی ئەوەیەتی، ئەگەر شـــاری داودییەی بـــدا بە خاتوون ئەستییە؟
تەماحی هەیە، دەگەڵ براکان و خوشکەکان هەمان بکا بێبەرییە؛
تەماحی هەیە، ماڵەکەی هەموو بدا بەفەرخۆڵە و بە خاتوون ئەستییە.
نازدار و لەولاڕا هات پڕی دا فەرخۆڵەی گرت و بردییە،
پێی گڕا هەموو کووچە و کۆڵانی شارییە،
فەرخۆڵەی هەر زیڕاندی زمانی نەچۆوە دەزارییە.
هێنایەوە گوتی: «بابە بەقوربانت بم ئەمن چارەم چییە؟»
ئەوجار نازێ هەڵی گرت ڕفاندی،
بردیە وەتاغێ باڵەخانێ، بەدایانی ئەسپاردی؛
عیلاجی نەکرا؛ بردیەوە کن بابی بەڕووساردی.
ئەگەر لەوێ دایدەنێ، لە دەورەی داوری،
خاتوون ئەستی پڕی دەداتێ و هەڵی دەگری.
فەرخ دمی بەسینگیەوە دەنێ، بێدەنگ دەبێ، لەوێندەرێ هیچ ناگری.
ئەگەر لەوێ کاری فەرخی بوو تەواوە،
میر لە دیوانێ بانگ کراوە،
دەیانگوت: «ئەوە برای مردووە، سەرەخۆشیی لێ کراوە».
خەبەر بە سوڵتانی ئەستەمبووڵێ دراوە.
دەڵێن: «مام غەڵیفەی شاری داودییەی برای مردووە، پشتی شکاوە؛




هەر تاقە فرزەندێکی لە پاش بەجێ ماوە».

سوڵتان خەڵاتی بۆ قەرار کرد، ئەنقابی میرایەتیی لێ ناوە.

وەکیـــل و وەزیران لێیان پرســـی: «فەرخۆلەت چ لێ کـــرد؟» گوتی: «ئەوە لە ماڵی تەسلیم بەخاتوون ئەستێ کراوە».

لەوێندەرێ ئەو قەرار و مەداری دنیایێ دەبوو تەواوە.

نێوبانگی جوانیی خاتوون ئەستێ دە هەموو دنیایێ گەڕاوە.

خەبەری بەشێخاڵی کەچەڵی دراوە.

شـــێخاڵ مەنسەبی دانا، سەر و بەرگی شوانانی دەبەر کرد، کەڕکێکی کوردانی بەشانی خۆی داداوە،

بەسەیاحی لە خاتوون ئەستێێ گەڕاوە

شاری داودییەی دیوە، هات و لە دەرکی میری بوو پیاوە.

کەڕکی خۆی ڕاخســـت، لەسەری دانیشت، گوتی: «دەشـــقەم خاتوون ئەستێم بەوێ بەچاوە».

ئەگەر نازدار هاتەدەرێ، هات، ماندوونەبوونی شێخاڵی کرد، گوتی: «مامە ماندوو نەبی بەخێرێی سەر ئەو دوو چاوە.

بۆ کوێ دەچی، بۆ لێرە ڕۆنیشتووی؟ هەستە بچۆ مەنزڵی بابم دیوان گیراوە».

گوتی: «دیوانی بابی توومی بۆ چییە؟

ئەمن بۆخۆم دەگەڕێم لە فەقیری و لە کاسبییە».

دەڵێ: «خوڵا ماڵت خرانەکا، ئەگەر ئەتوو فەقیر بی ئەمە شوانمان نییە؛

ئەدی برسیت نەبووە، بۆت بێنم نانییە».

گوتی: «ناوەڵڵا، جارێ برسی نیم فەسڵی نەهارێم نییە».

گوتی: «خاڵە! بەقوربانت بم! ئەگەر دەبیە شوانی مە، ئەتوو نێوت چییە؟»

گوتی: «کیژێ باریکەڵڵە!

ئەتوو نازانی، نێوم شێخاڵە کەچەڵە؟»

نازدار ئەگەر ئەو قسەی لە شێخاڵی بیست تەواوە،

لە ڕاستە خۆی بۆ ماڵێ گەڕاوە،

خەبەری بەدایکێ و بەنازێ و خاتوون ئەستێێ داوە،

گوتی: «شوانێک هاتووە لە دەرکێ مەحتەل ماوە».




گوتیان: «خولاکەی چۆن پیاوێکە؟» گوتی: «ئەســتۆی ئەهێندە ئەستوورە، دەڵێی کەلە دابەستراوە».

نازێ گوتی: بڵا بیبینم، بەچاوە.

هاتماندوونەبوونی لێ کرد، گوتی: «بەخێرێی ســەر عەمری من، مەڕمان بێ ساحێب ماوە».

شێخاڵ گوتی: «یەکیان لە یەکی جوانترن، بەمنیان گوتووە، خاتوون ئەستییان یەکجار کۆڵاوە».

لە قەرەواشــێی پرســی، گوتی: «ئەوە کێ و کێیە؟ گوتیــان: « ئەوە ناز و نازدارن تەواوە».

گوتی: «ئەدی خاتوون ئەستی لە کوێیە، نایەتە پێش چاوە؟»

قەرەواشەکە دەڵێ: «بەسەرینیی شلکی هەتیوباری تووشی ئەستۆی کراوە.

لەسەر شەیتان و ڕمووزنێکی تەعین کراوە».

نازێ چوو ئەو قسەی بۆ خاتوون ئەستی گێڕاوە،

خاتوون ئەســتی بڵندبوو، فەرخۆڵەی بەئامێزی گرت، ئەویش چوو شــێخاڵی بکەوێ بەچاوە؛

بەخیراتنی شــێخاڵی دەکرد؛ دەیگوت: «بۆ لێــرە مەحتەلی؟ بچۆ مەنزڵی بابم. ئەوە چێشتانە نەهار دروست کراوە».

گوتی: «پیاو ئەهـ! چم لە مەنزڵی بابی توو داوە؟

ئەمن کاسبم دەگەڕێم، کە کاری خۆم ببێ تەواوە».

خاتوون ئەستی دەڵێ: «خاڵە مەڕی مە بێ شوان ماوە».

خاتوون ئەستی لە ڕاستە خۆی گەڕاوە.

دایکی خاتوون ئەستێ خەبەری بەهەر چوار کوڕان داوە:

«شوانێکی زۆر قابیل هاتووە لەولاوە».

دایکی خاتوون ئەستی هاتە کنی، گوتی: «بابەکەم، دەبیە شوان؟»

گوتی: «بەڵێ لە کاسبییە دەگەڕێم» گوتی: «براله ئەدی چت ناوە؟»

گوتی: «خانم نۆکەر ناگیرێ، بەو حاڵە؛

پیاوێک خۆم تێ ناگەینێ هەر ژنانم دەکەن حەواڵە.

ئەگەر لە من دەپرسی، نێوم شیخاڵە».

گوتی: «مام شێخاڵ بەخێرێی سەر ئەو چاوە.
جوابم ناردۆتە کوڕەکان، ئێستا دێن لەولاوە»
نەهاریان بۆ دروس کرد، سفرەیان بۆ هێناوە،
نانەکەی خوارد هەر چوار کوڕەکانی مام غەڵیفەی هاتن لەولاوە،
گوتیان: «خاڵە ماندوو نەبی». بڵندبوو لە پێشیان راوەستاوە،
قسەیان دەگەڵ کرد، قەرار و مەداریان بۆ ڕۆناوە،
گوتیان: «مامە بچینە نێو مەڕی، تەسلیمت بکەین تەواوە».
بەڵان ئاخ! شێخاڵە کەچەڵ لە سوێی خاتوون ئەستێ جەرگی بڕاوە،
کوڕان ئەسپیان بۆ زین کرا و تاژییان دە ڕستەی کراوە؛
شێخاڵ کەرکی خۆی بەشانی داداوە،
دەستی دا گۆچانی، ملی لە بیابانێ ناوە،
گەینە نێو مەڕی، مەڕیان ئەژمارد، تەسلیم بە وێڵداشی کراوە.
گوتیان: «ئەمە حەزێ دەکەین، مام شێخاڵ حەقی مانگێت ببێ تەواوە».
شێخاڵ گوتی: ئاغای من، ئەمن هەتا چل شەوی حەقم نییە،
«ئەگەر شوانێکی چاک و پسپۆڕ بووم حەقم بۆ قەرار بکەن؛ دەنا دەرم بکەن، دەڕۆم بەیەکجارەکییە».
کێ بوو؟ لە کوڕی دە مام غەڵیفەی، ئەو شوانەیان لەسەر مەڕی تەعین کردییە،
بۆ خۆیان ڕەشەڕاوێ دەکەن، ڕوویان کردەوە شارییە.
بێینەوە سەروکاری فەرخۆڵە و خاتوون ئەستییە.
ئەوڕۆ نۆ ڕۆژە دایک و بابی وی مردییە،
فـــەرخ دەڵێ: «ئەمن بۆیـــەم دوعا کرد دایک و بابی من بمـــرێ، ئەگەر کامرەوابم لە خاتوون ئەستییە؛
توند توند ئەمن بە دوو بەنان لە دوو داران دەبەستن و خاتوون ئەستیش لەوێ دەنوێ و جا ئەو دنیایە کەڵکی بۆمە چییە؟»
تەمەنای دەکرد لە ڕەبییە.
هەموو کەس خەوی گران بییە.
«وەڵلاهی چی دی دەو لانکەدا نابم ئەوشەو دەچمە باڵ خاتوون ئەستییە».
فەرخ هاواری دەکردە خولای جەباری،

ئەو مەخلووقە هەموو خەوی بەسەردا باری،

دەسرازەی بەسەری خۆیدا فڕێ دەدا، لە لانکێ دەهاتە خوارێ بەیەکجاری،

بەســـەرینی خاتوون ئەســـتێ هەڵدەگەڕا، دەرزی لە بەرۆکی دەرهێنا، پێی دە یەخەی کێشا بۆخۆی چووە نێو سینگ و مەمکانی بەیەکجاری.

ســـبحەینێ کە دایکی خاتوون ئەســـتی لە خەوێ هەڵستا، چوو تەماشای لانکێی کرد، فەرخۆڵە دەوێدا نەماوە.

دەڵێ: ئەلحەمدولیللا! ئەوە شەیتان بوو مەفح کراوە.

ئێخەی کچەکەم بەرهەڵدا کراوە،

تەماشا دەکا دەنێو سینگی خۆی ناوە.

دایکی گەلێکی لە خاتوون ئەستی داوە،

دەڵێ: «ئەو شەیتان و ڕەموورنە چییە، دەباغەڵی خۆت ناوە؟»

خاتوون ئەستی دەڵێ: «ئەمن هیچ ئاگام لێ نییە ئەو ئەتکەم پێ کراوە،

ئەوە وا دەکەن بمرێ لەکن بابم ببم بۆسۆ و بەنناوە».

خاتوون ئەستی هەڵستا ڕووی خۆی هەموو ڕنی، گەلێکی لە خۆی داوە،

بۆ کن بابی چوو بۆ شـــکایەتێ بەهەموو مەخلووقی وێی دەکەوتن خاتوون ئەســـتییان گێراوە.

ئەوێ ڕۆژێ ڕۆنیشت گریا تا ئێوارێ

دایانیش نەیدووان، دەگەڵ کەس ناکا گوفتارێ.

هەمان بەقەراری شەوێ دی دەگرێ قەرارێ.

قەرارێ دەگرێ بەڕەوانی،

فەرخۆڵە، ئەتوو دەڵێی شەیتانی؛

دیسان هاتە خوارێ نێو سینگ و مەمکانی؛

ئەگەر دەستی دەباغەڵی نا، ماچی دەکا هەردک کوڵمانی.

خاتوون ئەستی لە خەوێ وەخەبەر هات، پێی زانی؛

گوتی: «بابانم بەقوڕێ گیرا، ئینجا بەقایە دەکەم ئەتوو شەیتانی».

گوتی: «گولە، ئەتوو دێیە کن ئەمن چت پێ دەکرێ؟»

گوتی: «ئامۆزا بۆ لە توو وایە، ئەمن منداڵم؟» گوتی: «کوڕە ئەتوو چی؟ ئەرێ وەڵڵا منداڵـــی». گوتی: «ئامۆزا حەزێ بکەم، لە تووش کەڵەگەتترم». گوتی: «کوا؟» ئەگەر




فەرخ خۆی لێک کێشاوە.

بەقەدەر خاتوون ئەستی درێژ بوو. خاتوون ئەستی ترسا گوتی: «وەڵڵاهی شەیتان و ڕموزنە؛ ئەمن بەدەستی ئەوەهەی دەچم».

فەرخ گوتی: «ئامۆزا! خۆ توو هێشـــتا ئەمنت نەدیوە». خاتوون جێبەجێ ئاشق بوو بەفەرخۆڵەی. فەرخ جێبەجێ لە قسەی خۆی پەشیمان بۆوە. خاتوون ئەستی حوکمی کرد گوتی: «دەبێ بتبینم».

«ئامۆزا! هەڵســـتە ئاوی دەسنوێژێ بێنە، دەسنوێژێ هەڵگرە». خاتوون ئەستی چوو دەسنوێژی خۆی هەڵگرت، هاتەوە گوتی: «ئامۆزا! بێنە دەسنوێژت بشۆم»

فەرخ گوتی: «نا ئامۆزا! ئەمن بۆخۆم دەسنوێژی خۆم دەشۆم».

فەرخ کە دەسنوێژی خۆی گرت تەواوە،

تەمەنای لە خولای دەکرد، لە پێغەمبەری دەپاڕاوە،

چارشێوێکی بەسەر خاتوون ئەستێی هەڵکێشاوە.

فەرخ تکای لە خاتوون ئەستی کرد: «وەرە لەو کارەی بگەڕێیەوە بەدواوە»

خاتوون ئەستی گوتی: «بەو قورعانەی خولا بۆ پێغەمبەری هێناوە،

مەگەر بمکوژی؛ دەنا دەس هەڵناگرم، هەتا ئەتوو نەبینم بەچاوە.

چونکە خەڵق دەیانگوت شەیتان و شمرە لە مامادی و ئامۆژنت بەجێ ماوە».

گوتی: «خاتوون ئەستی چاو لەسەریەک دانێ» زلێکی لێ دا گوتی:

«چاوهەڵێنە» گا و ماسیی دی بەچاوە.

گوتی: «سەرهەڵێنە» عەرش و قورشی لەبەر ڕاوەستاوە، تەماشای کرد نووری خولای دەگەڵ فەرخۆڵەیە، جێبەجێ زمانی شکاوە،

لەسەر کۆشی خۆی ڕۆنا، فەرخ خاتوون ئەستیی بەڵەک چاوە،

خاتوون ئەستی دەڵێ:

«ئامۆزا! تۆبە و ئیستیخفار تەواوە

ئەلحەمدولیللا شێخە ڕەحمەتی خولای بۆ بەرقەرار کراوە».

دەستیان دەستۆی یەک کرد، دمیان بەدمی یەکەوە ناوە،

خەنجەری قودرەتێ لە بارەگای خولای هاتە خوارێ تەواوە،

سەری تیخی دە نێوکی فەرخی دایە، دەسکەکەی لە نێوکی خاتوون ئەستی ڕاوەستاوە.

دەستیان بۆ یەک کرد بەسەرین، دمیان بەدمی یەکەوە نا لەپشتێنە بەژێر بوون بڵاوە،




خەویان بەسەردا باری تەواوە،
سبحەینێ کە لە خەوێ هەڵستان خاتوون ئەستی گوتی: «بابە بڵا ئەو لانکە بەرین بەولاوە،
فەرخ خۆ پیس ناکا، خاوێنە،ئیحتیاجی بەلانکێ نەماوە.
فێری کۆشی من بووە دەلانکێدا نابێ ڕاوەستاوە»
پڕیان دا لانکەکەی فڕێیان داوە،
دایانیان مەرەخەس کرد، مواجبی خۆی بۆ قەرار کراوە،
گوتیان: «فەرخ مەمکێ ناخوا و ئیحتیاجی بەکەس نەماوە».
ئەتوو وەرە بەراتی خۆت وەرگرە هەتاکو ساڵ دەبێ تەواوە.
شەش ساڵان فەرخی بەخێوکرد، عەمەلی وەهیچ کەس نەداوە،
ئەو بڵا دەگەڵ فەرخی ڕێک کەوێ چل شەوی شێخاڵی بوو تەواوە،
کوڕی مام غەڵێفەی سواری ئەسپی خۆیان بوون، تاژییان دە ڕستەی دەکردن، دەچوون دەیانکرد ڕشەڕاوە،
دەیگوت: «بڵا سەرێکی شێخاڵی بدەین، بزانین کەیفی چلۆنە، ئەو قەراری چل شەوی بۆخۆی کردی بزانین لەسەر قسەی خۆی ماوە».
دەهاتنە سەر کانییێ لە شێخاڵیان دەکرد سەڵاوە،
دەیانگوت: «مام شێخاڵ ئەوا چل شەوەت تەواو کرد، قەرار و مەداری حەقی خۆت ببڕەوە، بڵا ماڵی مە لە دوای توو بێ، ئەتوو زەحمەتت کێشاوە».
شێخاڵ دەڵێ: نازانم بڵێم چییە؟
حەقی من بەکێ تەواو دەبییە؟
هەتا کەنگێ بەخۆڕایی ئەمن بچمە مەڕییە؟
ئەگەر حەقم دەدەنێ ئیحتیاجم بەدراوی نییە،
ئەگەر دەشیڵێم عەیب و شوورەییە،
ئەمن بۆ دراوی نەهاتووم مەتڵەبم شتێکی دییە،
گوتیان: پێمان بڵێ بزانین چییە؟
گوتی: «قوربان! لە گەرمێنێ لە خزمەت سوڵتانێ قەت پیاوی وەک ئەمن موحتەبەر نییە؛
هیچ ئیحتیاجم بەماڵی دنیا نییە».

گوتیان: «ئاخر پێمان بڵێ بزانین جیهەتی چییە؟
گوتی: «بابە ئەگەر حەزی دەکەن بچمە مەڕی بمدەنێ خاتوون ئەستییە،
ئەمنیش دەچمە مەڕی بە گوڕەمەرگییە».
گوتیان: «قسێکی ساغە؛ بڵا بچینە خزمەت غەڵیفەی بزانین فەرمایشی چییە».
کێ بوو؟ لە کوڕی غەڵیفەی تازە لاوە،
سەری جڵەوی خۆیان بەردەداوە،
سەبرسەبر، لە دەشتی گەرمێنێ دەیانکردەوە ڕاوە؛
هەتا ڕۆژ لە هەموو شارێکی دەبوو ئاوا
دەهاتنەوە ماڵێ خۆیان دەبوون پیاوە،
دەچوونە خزمەت مام غەڵیفەی ئیکلامیان کێشاوە،
دەیانگوت: «قوربان! شوانەکەن دەڕوا. مەڕەکەن بێ ساحب ماوە».
دەیگوت: «شوانەکە چی لێ هات گەلێکی بدەنێ ماڵ و دراوە،
بچێتە بەر مەڕی خۆی ئەو شێخاڵە کەچەڵە تەواوە».
کوڕی مام غەڵیفەی گوتیان: «قوربان نایەوێ ماڵ و دراوە».
گوتی: ئەدی دەڵێ چ؟ دەڵێ: «خاتوون ئەستیم دەوێ، کێل گەردن و بەڵەک چاوە».
میر دەڵێ: «ڕۆڵە! یاخوڵا لەمنو نەکەوێ،
قەت کچی من ڕەشێخاڵە کەچەڵی دەکەوێ».
دەڵێن: «بابە چ بکەین ئەوە پاپەی گرتووە،
مەڕەکەی خۆڕایی کردووە».
دەڵی: «ڕۆڵە! وەنەبی؛
مەڕی خوڕایی کرد بەکونێ بابی.
ئەمن میری شاری داودییەی بم قەت کچی من بۆ پیاوی وا نابی».
هەڵستان کوڕەکان لەکن بابیان گەڕانەوە بەدواوە،
دەچوون لە دایکی خۆیان دەکرد سەلاوە،
دەیانگوت: «دایە کارێکی خراپ قەوماوە،
مەڕەکان بەرهەڵدایە پاپەی لە خاتوون ئەستی گرتووە ئەو پیاوە».
دایکی دەڵی: «ڕۆڵە! لە ڕووم هەڵمەگرن پەردەی حیجابێ»
دەبێ خاتوون ئەستی قوڕبەسەر بەختی هەروابێ،

هەتیوباری تووشی ئەستۆی بووە، جەرگی دایکی خەرا بێ؛
قەت کچی من بۆ شوانێ نابێ».
لەوێ قسەیان نەبوو تەواوە،
کوڕەکان هەستان هەرکەس بۆ مەنزڵی خۆی گەڕاوە.
سبحەینێ خەبەریان بەشێخاڵی داوە:
«سەبر بگرە هێشتا کارەکە نەبووە تەواوە:
خاتوون ئەستی قایلە، دایکمان ڕەزا نەکراوە،
ئەو مزگێنییە بەشێخاڵە کەچەڵە دراوە،
گوتی: ئەلحەمدولیللا کارم ڕاستی هێناوە».
شەو و ڕۆژ هەراسی بە مەڕی هەڵگرتبوو، لە بژوێنی دەلەوەڕاند، لە سەرینچاوەی دەدا ئاوە.
خاتوون ئەستی فەرخی بەخێو دەکرد تا شەش ساڵی دەبوو تەواوە.
خاتوون ئەستی بەبابی ڕادەگەیەنێ:
«خوڵا هەڵناگرێ بەمنداڵی هەتا کەنگێی دەمرێنێ؛
فەرخۆڵە گەورە بووە دەفامێنێ.
مەسڵەعەت ئەوییە بیبەنە مەدرەسەی خزمەت مامۆستای بڵا بخوێنێ».
مام غەڵێفە وای جواب داوە:
«بە خاتوون ئەستی بڵێن ئەمن شاری داودییەم بەوی داوە،
جارێ فەرخۆڵەم بۆ بکا گەورە و تەواوە.
هێشتا بۆ خوێندنێ یەک دوو ساڵی ماوە».
خاتوون ئەستی گوتی: «تەماشای بابم کە، چەند فەقیر و بەستەزمانە
ئەتوو فەرخت نەناسیوە دەڵێی شەیتانە.
بەبێ مامۆستاش دەرسی ڕەوانە».
مام غەڵێفە گوتی: «ئەگەر وایە تەدارەکی بۆ بگرێ، بۆی بکاتە چراخانە،
ڕۆژی جومعەی دەیبەینە خزمەت مامۆستای ئینشاڵڵا تا دەرسی ببێ ڕەوانە».
خاتوون ئەستی، ئەگەر وادەزانێ لەسەر یەک دەبژێرێ شوکرانێ، دەڵی:
«ئەلحەمدولیللا، کوڕە فەقێکە دەچێتە قوتابخانێ».
سبحەینێ بەیانی دەنوێنێ،

پیاو دەنێرێ مامۆستا فەقێیان تێ دەگەیەنێ:
« بە مامۆستای عەرز بکەن، ئینشاڵلا فەرخ دێتەوە دەرسێ دەخوێنێ».
«بە مامۆستای دەڵێ ئەلحەملای خۆش ڕادەبرێ گوزەرانە
گوتی بە فەقێکانە
«دەبێتە شیرنی خواردن لەو زەمانە؛
مزگێنیو لێ بێ فەرخی کوڕی مامادی دێتە ئێرەکانە،
دەگەڵی دەبێ خاتوون ئەستی کێل گەردنێ چاو جوانە.
جا فەقێینە هەموو مەبزێرنەوە شوکرانە»
سبحەینێ، ڕۆژ سەری دەرهێناوە،
تەدارەکی خاتوون ئەستی بۆ فەرخۆڵەی گیراوە،
لە هەموو ڕدێنسپی و پیاوماقووڵانی دەگێڕاوە:
«ئەلحەملای شوێنی مامادی نەکوژاوە
ئـــەوە فەرخۆڵە دەبەینە بەر خوێندنێ و ســبحەینێ بەیانی دەنوێنــێ، پیاوێکی زۆر زەریفە، عەدووان بەشەیتان و شمرییان لە قەڵەم داوە».
ئەوی خەڵق دەیگوت: «ئەلحەملای درۆیە پیاوێکی زۆر زەریف و تەواوە».
ناردیان چەندیان سەید و مەلا هێناوە،
لە مام غەڵیفەشیان دەگێڕاوە،
شیرینی و تەدارەک بۆ مەدرەسەی ڕەوانە کراوە،
چەند سیپارە بۆ فەرخی تەواوکراوە.
مام غەڵیفە هات؛ ڕەپێش کەوت. خاتوون ئەستی فەرخۆڵەی هەڵگرت، شاری داودییەی بەجێوە تەواوە،
هەمووی ڕووی دە مەدرەسەی مامۆستای دەکرد، وەژوورکەوتن، لێیان کرد سەڵاوە،
مامۆستا یەک پێ لەبەر مام غەڵیفەی و ئەو عالەمەی هەڵستاوە،
مامۆستا وا ئاوڕێکی داوە،
گوتی: «خاتوون ئەستی! یا خوڵا بەخێرێی ئەوە فەرخۆڵەت هێناوە،
سەیری خەڵقی چ شێتە، دەیانگوت: فەرخ بەخێو ناکرێ دایک و بابی نەماوە».
هێنایان سیپارەیان دە مست فەرخی ناوە،
بەو دەستی سیپارەی گرت، ئەو دەستیش قەڵەمەکەیان دە مست فەرخی ناوە.

گوتی: «ڕۆڵە بخوێنە». گوتی: «بەڵێ مامۆستا دەخوێنم».

فەرخ دەڵێ: «مامۆستا، ئەلف، دەڵێ بێمە، دەڵێ جێم دەڵێ هێمە،

ئەتوو کەلامولڵای خوار و سەر بێنە،

هەتا مەعنای هەمانت پێ بڵێمە».

ئەگەر فەرخ ئەو قسەی کرد تەواوە،

شەقەزلێکی لە گوێی مامۆستای داوە،

گوتی: «تەماشای ئەرزێ بکە»؛ مامۆستای ئەو دنیای دی بەچاوە،

گوتی: «فەرخۆڵە زلێکی دیشم لێ دە». گوتی: «مامۆستا هێشتا حیسابت نەبووە تەواوە».

مامۆستای فەرمووی: «منداڵە؛ خاتوون ئەستی. ئێستا ئەگەر پێی بخوێنی سەفی دەبێ؛ هێشتا دوو ساڵی دیی ماوە».

خاتوون ئەستی فەرخۆڵەی بەئامێزی گرت، بۆ ماڵێ گەڕاوە بەدواوە؛

فەرخ دەگەڵ کاری خۆی مەشغوولە و دەگەڵ خاتوون ئەستێ بەڵەک چاوە.

لەوێ بمێنێ گێچەڵی شێخاڵە کەچەڵی ژیاوە.

شێخاڵ دەڵی: «چی دی ناچمە مەڕێ؛ حەقم قەرار نەکراوە».

وێڵداش شوانی هاتەوە لەولاوە،

هاتۆتە خزمەت مام غەڵیفەی، ئیکلامی لێ کێشاوە،

دەڵی: «شوانەکەمان ڕۆیی؛ بەتەنێ ئەو مەڕە بۆ من نەدەحاواوە».

میر فەرمووی: «ئەدی شێخاڵ چی لێ هات؟» گوتی: «قوربان! نایەتە مەڕی دەڵێ حەقم بۆقەرار نەکراوە».

گوتی: «چەندی دەوێ بیدەنێ؛ چونکە شوانێکی چاکە» گوتی: «قوربان! دەڵێ حەقی من هەر خاتوون ئەستیی بەڵەک چاوە».

مام غەڵیفە ناردی؛ هەر چوار کوڕەکانی هاتن لەولاوە.

گوتی: «ئەوە چ قەرار و مەداریکو دەگەڵ ئەو شوانە حیزبابەی ڕۆناوە؟»

دەڵێن: «دیسان مانی گرتووە، مەڕەکە بەرهەڵدا کراوە.

لە دووی بنێرن بێتەوە، دا لێرە کاروباری بکەین تەواوە».

لە دووی شێخاڵیان نارد تەتەر و ئێڵچییە:

«بێتە ئێرە؛ بزانین کاری وی چییە».

دەیاننارد لە دووی شێخاڵیان دەهێناوە.
دەهاتە خزمەت مام غەڵێفەی، لێی دەکرد سەڵاوە،
مام غەڵێفە گوتی: «دەڵێن دوو ڕۆژە مەڕت بەرهەڵد کراوە؟»
دەڵێ: «قوربان! هەتا کەنگێ بچمە مەڕی بەقسەی ناتەواوە؟»
دەڵێ: «مەتڵەبت چییە؟» دەڵێ: «قوربان! ئابڕووم لێ هەڵگیراوە،
مەتڵەبی من هەر خاتوون ئەستییە.
ئەگەر ئەویم دەدەنێ، دەچمە مەڕییە؛
ئەگەر ئەویم نادەنێ ماڵی دنیایەم بۆ چییە؟»
ئەگەر ئەو قسەی دەکرد و دەگەڕاوە بەدواوە،
لە دووی کوڕ و ژنی خۆی دەنارد، دەیهێناوە،
میرگوتی: «بەڵان ئەو مەڕەی بفرۆشین؛ ئەتوو بزانە چ پەڵپێکم لێ گیراوە».
دەڵی: «خاتوون ئەســـتیم نەدەیەی ناچمە مەڕی؛ قەت بووە پیاوی وەک شێخاڵم ببێ بەزاواو؟
ئەگەر مەڕەی نەفرۆشم، چارەم بڕاوە.
فەرخۆڵە لە جێی دایک و بابانی ڕاوەستاوە؛
ئەمن برام نییە، ئەو تاقە فرزەندەی لە پاش بەجێ ماوە».
کوڕەکان گوتیان: «بڵا بیدەینێ؛ وەک سەگی هار بچێتە مەڕییە.
بڵا دایکم بچی، قایل بکا خاتوون ئەستییە».
مام غەڵێفە گوتی: «کوڕە! خوڵا هەڵناگرێ؛ ئەوە شانی من نییە.
خاتوون ئەستی بزانێ، خۆی دەخنکێنێ دیسان تووشی من دەبێتەوە هەتیوبارییە».
کوڕەکانی گوتیان: «قوربان، بڵا دایکم بچێ بزانێ، سوال و جوابیان چییە».
دایکیان ناردە کن شێخەڵ و خاتوون ئەستییە.
گوتی: «شێخاڵ! بزانم ئەتوو مەتڵەبت چییە؟»
گوتی: «ڕۆڵە خاتوون ئەستی! ئەتوو جوابت چییە؟»
خاتوون ئەستی دەڵێ: «دایە! بەخوڵای خۆم دەکوژم، ئەوهە مێردی من نییە».
گوتی: «شێخاڵ! ئەوە مێردت پێ ناکا. ئەتوو جوابت چییە؟»
گوتی: «خانم! ئەگەر دەمدەنێ ئەمن دەچمە مەڕی بەگۆڕەمەرگییە؛
ئەمن تەمام نییە، لێرەی بەرم بۆ جییەکی دییە».




دایکی خاتووة ئەستی ئەو خەبەرەی هێناوە بۆ میرییە:

«دەڵێ حاشا و مادوڵلا؛ ئەوە مێردی من نییە.

دەڵێـــم شـــێخاڵ، ئەوەە بۆ توو نابێ؛ ئەو ســـەگبابە دەڵێ: ئەمـــن دەچمە مەڕی بە گۆڕەمەرگییە».

ناردییە کن کوڕەکانی: «چ بکەم، چارە چییە؟»

کوڕەکانی گوتیان: «بابم قابیل بێ و قایل نەبێ، خاتوون ئەستی هەر ئی شێخاڵییە.

داومانەتێ چارە نییە».

حوکماین کردە سەر خاتوون ئەستییە،

دەبێ هەر مێردی بکا بەشێخاڵییە.

گوتی: «خۆم دەکوژم؛ قبووڵم نییە.

دەچمە شکایەتی سوڵتانی ئەستەمبووڵێ، دەبم بەعەرزچییە».

حوکمیان لێ کرد دەبێ مارەت بکەین بەیەکجارەکییە،

دەیاننارد‌نە کن مەلا و سۆفییە،

خاتوون ئەستی هەموو ڕووی خۆی پچڕییە:

«خولا هەڵدەگرێ؛ بەزۆرم دەدەن بەشێخاڵە کەچەڵییە».

خاتوون ئەستی هەڵات، خۆی ئاویتە کن بابیە:

«بابە! خولا هەڵناگرێ؛ ئەو گێچەڵە بۆ من چییە؟

بابە دیوتە بەقسەی تۆم کرد دەکێشم هەتیوبارییە»

بابی گوتی: «ڕۆڵە! چ بکەم، هیچ دەسەڵات بەچەنگی من نییە».

گوتی: «بابە! دەنا ئەوە خۆتو هەتیوی خۆت؛ لەو شارەی دەچمە شارێکی دییە».

گوتی: «ڕۆڵە! کەیفی خۆتە؛ ئیختیار بە چەنگی من نییە».

دایکیشی حەزی دەکرد بیدەن بەشێخاڵییە،

دا فەرخۆڵە بێ دایک و باب ببێتەوە خۆڕاییە.

کوڕی غەڵێفەی حوکمیان کرد تەواوە:

«مەڕ و ماڵمان خۆڕاییە، بووین بۆسۆ و بەنناوە».

حوکمە خاتوون ئەستی لە شێخاڵی مارەکراوە؛

قەول و قەرار گۆڕەمەرگییە داندراوە.

قەراری ئەوەەش کرا: ئەگەر خاتوون ئەستی بەڕازی خۆی نەبێ، دەستی لێ نەدراوە.

ئەوێ شــەوێ خاتوون ئەستییان مارەکرد، شێخاڵ لە خۆشییان داوەتی کرد، گەلێکی موخاریج کێشاوە.

سبحەینێ کەپەنکی خۆی بەشانی دا بۆ نێو مەڕی گەڕاوە،

خاتوون ئەستی دەگریا، فرمێسکی چاوانی دەتکوت بەحر و ئاوە،

فەرخ دەیگوت: «ئەو گریانەی مەکە تەواوە.

ئەلحەمدولیللا، ئەو کارە کراوە،

هەرچەندی موشتەری دنیایە بوو، لێت کشاوە؛

ئەوجار ئەمن و توو لێک دەبینین مراد و مەخسوودمان دەبێ تەواوە».

دەستی دەستۆی خاتوون ئەستیێ دەکرد گەلێکی دڵخۆشی داوە.

ســبحەینێ کە ڕۆژ مەعلوومی کرد کوڕی دە مام غەڵیفــەی تەگبیریان کرد: بچنە کن خاتوون ئەستی، بەو کارەی ناڕازییە، گەلێک شێواوە؛

ژنێکی چاکە، کوێرەوەریی گەلێک دەگەڵ فەرخۆڵەی کێشاوە.

ئەگەر نەهاریان دەکرد، هەڵدەستان لەجێی خۆیان، پیاوێکیان دەنارده کن دایکییە:

«دایکم! تەدارەکی بگرە دێین، دەچینە خزمەت خاتوون ئەستییە.

لێمان زیزبوو، چونکە بەحوکممان داوە بەشێخاڵییە».

کوڕی مام غەڵێفەی کە لەوێ هاتن واوە،

چەندیان کەیخودا و سەید دەگەڵ خۆیان هێناوە،

دەهاتنە خزمەت دایکیان، ئەویشــیان ڕەگەڵە خۆیان خست، دەچوونە خزمەت خاتوون ئەستیێ لێیان دەکرد سەڵاوە،

دەیگوت: «بەخێرێن، سەرچاوی من، برای دەتەواوە»

«ئەگەر ئەمن هێندە خەرابووم. بۆ نەودەکوشــتم، ئەمنو بەشوانێکی کەچەڵی حیزباب داوە»

دەیانگوت: «خوشکێ! کاری خوڵایە و وا قەوماوە».

دایکی زۆری دڵخۆشی و دەلاڵەت داوە.

ئەگەر وای دەزانی خاتوون ئەستییە،

دەڵێ: «براله! هیچ لەنگۆم نییە گلەییە،

بۆخۆم بەدبەختم لەکن خوڵای چارەم نییە،

مام و ئامۆژنم دەمرن، تووشی ئەستۆم دەبێ هەتیوبارییە.

دێم جحێڵ دەبم، برای خۆم حوکمێم لێ دەکەن، مارەم دەکەن لە شـــوانێکی کەچەڵی خوێرییە.
براڵە ئەنگۆ خۆش بن، ئەمن دنیای فانیم بۆ چییە؟
چی دیم هەتیوباری پێ ناکرێ هۆوەتا. فەرخۆڵەی خۆتان بەرنە کن کەسێکی دییە.
چی دی ئەمەگێ ناکێشم بەخۆڕایی دەگەڵ هەتیوی خەڵقییە.
گوتیان: «خوشکێ! بەشی خۆمان دا بەتوو شاری داودییە،
مەڵێ ئەمنی داوە بەشوانی، بەشم بەملْکیەوە نییە،
خوشکێ! ئەگەر لە فەرخۆڵەش دەپرسی، ئەویش ئیختیاری بەمە نییە.
خوشکێ! بلا بچینە خزمەت مام غەڵیفەی بزانین، فەرمانی چییە».
گەلێکیان داوە دڵخۆشییە،
گوتی: «براله! بەخێرێن تازە سوال و جوابم چییە؟»
جا لەویان خواست مەرەخەستییە.
هاتنە دیوانی مام غەڵیفەی، ئیکلامیان کێشا ڕاوەستان دەست لەسەر دەستییە.
مام غەلێفە سەری هەڵنەهێنا چاوی نەکردن لە چاوییە.
نایبێک لەوێ ڕۆنیشتبوو گوتی: «قوربان! بۆچی لە کوڕەکانی ناکەی مەرحەباییە؟»
گوتی: نایب! جا ئەوهە یەکیان کوڕی من نییە.
ئیختیاری شاری داودییەش بەچەنگی من نییە.
ئـــەوە ئێرەشـــیان بۆ بەجێ دێڵـــم، دەچمە دەرکی ســـوڵتانی ئەســـتەمبوولێ، دەبم بەعەرزچییە.
دەڵێم قوربان! قەت ناحەقیم قبووڵ نییە،
چوار کەسم لێ پەیدابوون، کەس نازانێ، ئەوە کوێندەرییە.
لێم بوونە لۆتی و شەرابخۆر. لێیان داگیر کردووم شاری داودییە.
تاقە کچێکم بوو بەحوکمیان لێ ئەســـتاندووم، داویانە بەشوانێکی کەچەڵی، نەگبەتی خوێرییە.
ئەمن ناچمەوە مەسکەنی خۆم چ جاری دییە.
سوڵتان دەفەرمووێ هەتا بۆخۆت ببی، کەس حەقی نییە.
دەڵێم ئەگەر ئیختیار بەخۆم نەبێ دنیام بۆ چییە؟
ئەگـــەر وابێ، دەچمە وڵاتی خاریج، خزمەت شاهەنشـــاهی، مواجبـــی خۆم وەردەگرم




دەیخۆم بەدنجییە».

جا بڵا بێینە ســـەر شێخاڵە کەچەڵ. دەڵێ: «خاتوون ئەستی لەمن مارەکراوە، بۆچی نایەتە مەڕییە؟

ئەگەر ئەمن شوانم، ئەویش ببێ بەبێرییە،
ئەگەر ئەو نایەتە مەڕی، ئەمنیش بەرهەڵدای دەکەم ببێ خۆڕاییە،
ئەگەر گوتیان: وەرە بچۆ مەڕی دەڵێم: بۆ دڵی خۆم کێشا ئەو کوێرەوەرییە.
ئەمن لەنگۆ دەوڵەمەندترم. ئاغایەتیی من لە ئێنگۆ کەمتر نییە.
ئەمن سەرباز و نیزامم لەنگۆ پترە.

ئەگەر دەڵێن نایێرینە مەڕی. دەچمە دەرکی ســـوڵتانی ئەســـتەمبووڵێ، بەحوکم ژنی خۆم دەستێنم، ئەوەم لەو کارەی چاکترە».

ئەگەر ئەو خەبەرەی بەکوڕی مام غەڵیفەی داوە،
کوڕی مام غەڵیفەی بۆ دایک و بابیان گێڕاوە.
گوتی: «ئەوە خاسیەتی چییە ببێ بەبێرییێکی تەواوە،
خولا دەزانێ، لێی مارەکراوە».
ئەگەر ئەو خەبەرەیان دا بە خاتوون ئەستییە.
دەڵێ: «خولایە! نەمکوژی چارەم نییە.
قەت بووە شێخاڵ شوان بێ، ئەمن ببم بەبێرییە
ئەمن چلۆن قبووڵ بکەم ئەو ناحەقییە؟
ئەو بێ سوحبەتییانەم بەسەر هاتووە، ئەویش لەسەر فەرخی داودییە».
فەرخ گوتی: «ئامۆزا لەسەر ئەمن مەکە گلەییە
ئەگەر شێخاڵ شوانە ئەتووش ببە بەبێرییە.
سبحەینێ تەدارەکێ بگرە بچینە نێو مەڕییە».
دایکی خاتوون ئەستی گوتی: «هەتا حەوتووێکی دی هیچ قەراری چوونێ نییە؛
جارێ دەبێ بچنە شیو و کۆڵێ ناز و نازدار و خاتوونێ ئەستییە».
سبحەینێ نازدار دەڵێ: خوشکێ، خاتوون ئەستییە!
ئەلحەملای گەورە بووە فەرخی داودییە،
دەگەڵ خۆتی مەهێنە شیو و کۆڵێ هەموو عەیش و ئەدەبی پیاوی دەناسییە؛
لە ماڵێی بەجێ بێڵە، بەسەعاتێکی دێینەوە کن ئەوییە،

بۆمە عەیب و شوورەییيە».
گوتی: «بەجێ دێڵم». خاتوون ئەستییە.
خاتوون ئەستی دەڵێ: «قوربانت بم مەیە سەراوێ؛ ئێستا دێینەوە، تاوێکی دییە».
شانە و سابوون و تەشیان هەڵگرتییە،
هەموو ڕوویان کردە ڕازی کانییە.
وسو ئاغا چەند ساڵە ئەوە دەمرێ لە سوێی خاتوون ئەستییە،
کۆشک و باڵەخانەی لەسەر شەتی مرادان دروس کردییە،
ئەگەر چاوی کەوت بەخاتوون ئەستییە،
دەڵێ: «خوڵایە، ئاورم بەربووە دەجەرگییە
ئەتوو بزانە خاتوون ئەستی بەسەرینی شلکی تووشی ئەستۆی بووە هەتیوبارییە،
یان ســەری خۆم دادەنێم، یان شــاری داودییە چۆڵ دەکەم، یان بەئیزنت خوڵای دێنم خاتوون ئەستییە».
ئەگەر فەرخ هەڵستا خاتوون ئەستی دیار نییە،
دەڵێ: «هاوارم وەبەر خوڵای، ئی دیکەم وەبەر ڕەببییە!
هیچی دی گیرنابم هەتا نەچمە کن خاتوون ئەستییە».
فەرخ لە ماڵێ هەستا، هات بەهەشتاوە،
لینگی دەدا دەتگوت کوڵاوی باهێناوە،
ئەگەر گەییە ڕازی شەتی تەماشا دەکا قسن لەوێ کێشراوە.
وسووی مەغانێ لەسەر بانی ڕاوەستاوە،
بانگ دێڵێ: «فەرخۆڵە بۆ وا لینگ دەدەی چت لێ قەوماوە؟».
دەڵێ: «وسو ئاغا لە خەوێ هەستام خاتوون ئەستیم لەکن نەماوە؛
ئەوە لە ڕازی کانییێیە دەچم، لێی دەکەم سەڵاوە».
وسو ئاغا دەڵێ: «ئاخ هەتا نەمردووم ئەو شەیتان و ڕمووزنە بەتڵاوە».
فەرخ چووە نێو قســنەکە، دەکونی بەرداندا تەماشــای دەکردن. ئەگەر نازێی دەدەی، چاوی لەســەرێەک دادەنا؛ ئەگەر نازداری دەدەی، هەروا؛ ئەگەر خاتوون ئەستیی دەدەی، لەبەری پێیرا تەماشای دەکرد هەتا تۆقی سەری. لەنێو دیوار ڕۆنیشت، پێی بەلایەکیەوە نا، سەریشــی بەلایەکیەوە نا؛ ئەگەر قەوەتی کردێ، بەسەر خۆیدا ڕووخاند. زیراندی، هاواری کرد. ناز و نازدار و خاتوون ئەســتی دەرپەڕین، ڕووت بوون خاتوون ئەســتی بەســەری

خۆی دادا، گوتی: «یا خولا موبارەک نەبێ ئەو شـیو و کولە؛ حەوت سـاڵە هەتیوبارییە دەکەم ئەوڕۆ لێو کوشـتم». هەموو وەبن بەردان کەوت بوو، بەردەکانیان لەسەر فڕێ دا. وسـووی مەغانی لەسەربانی تەماشای دەکردن، هێنادەرێ. خاتوون ئەستی لەسەر کۆشی ڕۆنا، بەهاسـتەم نەفەسی مابوو. گوتی: «خوشـکێ وەختە خەلازبێ یاسینێکمان لەسەر بخوێندایـە؛ بڵا مندار نەبێتەوە؛ خولا هەڵناگـرێ» گوتیان: «چ بکەین بۆ فەقێیەکی، بۆ مەلایەکی؟ گوتیان: کەس دیارنییە وسـوو ئاغا نەبێ؛ عەیب نییە بانگی بکەین». خاتوون ئەستی دەڵی بۆ مردنێ عەیب نییە، ئەوە نەجیمزادەیە کەم نییە».

بانگ دێڵێ:

وسوو ئاغا! وسوو ئاغای دینی،

گەورە عالەمێ، لە خەڵقی پەرژینی!

دەتوانی خەبەرێکم بۆ وە مام غەڵیفەی شاری داودییەی ڕابگەیەنی؛

دەشقەمێ مەلایەک بنێرێ یاسینێکی لەسەر فەرخی بێ دایک و باب بخوێنێ؟»

وسوو ئاغا بانگ دێڵێ: «ناز و نازاداری چاوبەنگییە!

هەرچەندی چاوم گێڕا هیچ کەس دیار نییە».

ناز بانگ دێڵی: بتبم بەقوربانی سەرە!

ئەگەر یاسینت لەبەرە،

پێت ناخۆش نەبێ هەتا ئێرە وەرە،

نازێ دەڵێ: «وسوو ئاغای، گیانە!

لەبەر هەمانمان هەن ئەو سەفەرانە،

وەرە یاسینێکی بخوێنە لەسەر فەرخۆڵەی بەستەزمانە».

وسـوو ئاغا گوتی «لێی گەڕێ ئەوە گۆڕم کا لە کۆڵ بۆوە؛ ئینشـاڵڵا خاتوون ئەستی بۆ من دەبێ». خۆی لە سـەربانی هەڵداشـت، بەلینگدان هات. کچەکان هەرسێک ڕووت بـوون. پاڵیان وێک دا، ڕۆنیشـتن، گوتیان «ئۆوەی ئابڕوومان چـوو، هیچمان بەخۆمان دانەداوە». خاتوون ئەستی دەڵێ: «ئەح! پەکم بەوەی کەوتووە، وسوو ئاغا ئەمن دەبینێ یـان نامبینــێ». نازدار دەڵێ: «بڵا پـاڵ وێک دەین، ئەوە گەییـە کنمان زۆر عەیب و شـوورەییە». فەرخ گوتی: «لەوەی پتر بێیتە پێشێ گۆڕی بابی دەگێم». نازدار گوتی: «قوماربازی شەیتان؛ دەزانم لەسەر توو چم بەسەردێ»

ناز بانگ دەکا: «وسوو ئاغا! بتبم بەقوربانی چاوانە!

تەشریفت تەسیحی نەکێشێ بۆ ئێرەکانە،
فەرخ شوکر چاکە؛ دەیگەڕێ زمانە».
وسوو ئاغا کە ئەو قسەی بیست تەواوە،
بە هەناسەساردی گەڕاوە.
گوتی: «حیزباب! لێ نەگەڕا خاتوون ئەستی ببینم بەچاوە».
نازێ و نازدار گەلێکیان فەرخۆڵە ماچ کرد، گوتیان: «بڕۆوە ئێستا ئەمە دە ئاوی هەڵدێینەوە، ئێستا دەگەڕێینەوە بەدواوە».
فەرخیان بەڕێ دەکردەوە بۆ ماڵێ، ئەگەر گەییە جێ بەبێ قەیدییە،
بەقەرەواشانی گوت: «شیری بابم لە کوێیە؟ دیار نییە».
ئامۆژنی گوتی: «یا شەیتان! ئەو شیرەت بۆ چییە؟»
گوتی: «ئامۆژن دەچم دەینمەوە ناز و نازدار و خاتوون ئەستییە».
گوتی: جا ئەتوو بۆچی دەچی؟ گوتی: ئامۆژنم هیچ ئاگای لێ نییە.
نەوەکو وسووی مەغابی ڕێیان لێ بگرییە».
گوتی: «ڕموونن! ئەو ئابڕووچوونەت لە چییە؟
بۆچی لە کچەکان نابی بەکێشکچییە؟»
فەرخ دەڵێ: «هەڵبەت ئاگام لێ دەبن، لە من زیاتر هیچ کەسیان نییە».
ئەگەر فەرخ ئەو قسەی بیست تەواوە،
شیری هەڵگرت و لە خۆی پێچاوە،
بەشاری داودییەدا بۆ سەر شەتێ گەڕاوە.
ناز و نازدار و ئەستی تەدارەکیان گرت تەواوە،
لەسەر شانە و سابوون و تەشتێ مەعرەکەیان بنیات ناوە،
ئەمە چ قەرەواش و سەرسپیمان دەگەڵ خۆمان نەهێناوە،
چلۆن ئەو شانە و سابوون و تەشتەی بەرینەوە بەولاوە؟
نازدار گوتی: «خوشکێ! یەکمان شانەی هەڵدەگرین، یەکمان سابوون، یەکمان تەشت، دەڕۆینەوە بۆ ماڵێ. هەرچی لە ڕێیە تووشی بووین، شەرعی خۆمانی پێ دەکەین: هەرچی لە هەمان جوانتر بوو، بلا هیچ هەڵنەگرێ». فەرخۆڵە شیرەکەی لە خۆی بەستبوو، بەکووچەیدا هاتەخوارێ. نازدار گوتی: «ئەلحەملای ئامۆزای خۆمانە، شەرعی خۆمان بەوی دەکەین. گوتیان: ئامۆزا گیان! وەرە شەرعمان بکە هەرچی لە هەمان جوانتر بین، شانە

و ســـابوون هەڵنەگرین». گوتی: «کۆڵو دانێن، ڕۆنیشـــتن، تا شەرعو بکەم». ڕۆنیشتن، فەرخۆڵەیـــان دەنێو خۆیان گرت؛ فەرخ گوتی: «لە خۆڕایی نەبێ هەر کەس جوانێی خۆی بڵێ جا ئەمنیش پێو دەڵێم؛

نازدار، ئەتوو بڵێ. نازدار دەڵێ:

«ئەگەر نەمرم، بژیم، بمێنم،

بسکان دابێڵم، چاوان بڕێژم، کوڵمان بنەخشێنم.

ئەگەر کلیلی سینگ و مەمکان بترازێنم،

دەبێ مردووانت بۆ لە قەبران هەڵستێنم».

فەرخ گوتی: «نازێ ئەتوو بڵێ». نازێ گوتی:

«بەحەقی ئەوەی کەم خولایە!

ئەگەر چاوان بڕێژم، کوڵمان بنەخشێنم، بسکانم بکەم تاتایە،

حاجیانت بۆ دەگێڕمەوە لە ماڵی خولای، لە ڕێی کابەتوڵڵایە،

نایەڵم، چ تاقیان بچنە زیارەتی ڕەسولوڵڵایە».

گوتی: «خاتوون ئەستی! نۆرەی توویە تووش بڵێ». خاتوون ئەستی دەڵێ:

«بەئاسمانێ کەم، بەڕۆژێ،

ئەگەر بســـکانم تاتای بکەم، کوڵمانم بنەخشـــێنم، بترازێنم کلیلی ســـینگ و مەمک و بەرکۆژێ،

تینێت بۆ دەســـتێنم لە مانگێ، تاریکی دەدنیایە دەخەم، شـــەبەقت بۆ دەســـتێنم لە ڕۆژێ».

فەرخ گوتی: «ئەو مردووی بمرێ، بۆ خۆشەویســـتی حەزرەتی ئیســـای ڕوحوڵڵا یەک یەک زیندووکراوەتەوە؛ دەنا بەکەســـی دی مردوو زینـــدوو نابێتەوە. پیاو هەتا پیر نەبێ، دەست لە دنیایە هەڵناگرێ، ناچێتە حەجێ؛ ئەگەر پیریش بوو، سەد هەزار جۆری بدەنێ، ناگەڕێتـــەوە. پیاویش ئەگـــەر حەزی لە یەکی کرد، هیچ ئیحتیاجی بە مانگ و ڕۆژێ نییە، تەماشـــای بکا؛ چونکە مانگ و ڕۆژ بە ڕەزای خولایە، هەربووە و هەر دەشـــبێ». ناز و نازدار گوتیان: «ئەمەکی خاتوون ئەســـتێ بەهیچێی نەدا». ئەوان شـــانە و ســـابوون و تەشـــتیان هەڵگرت؛ ڕۆین. ئەویش فەرخی ئاویتە قەڵاندۆشـــی خۆی، وەدوویان کەوت بۆ ماڵێ. هەتا ئەوان هاتنەوە، دایکی تەدارەکی بۆ گرتن، گوتی: کچەکانم چوونە شیو و کۆڵێ ماندووبوون، دەبێ قاوەڵتوونیان بۆ دروس بکەم». کچەکان هاتنەوە. ناز و نازدار دەپێشدا




بوون. گه‌ینه جێ؛ ناقایل بوون. دایکیان گوتی:

«ڕۆڵە! ئەستی کوا بۆچیو دەگەڵ نییە؟» نازدار دەڵێ:

«کارمان گەلێک تەواوە؛

ئەوە دەگەڵ کەڵەگای خۆیەتیَ لە دوایە بەجێ ماوە».

خاتوون ئەستیش گەییبە جێ، لە دایکی کرد سەڵاوە.

دایکی دەڵێ: کوێنم دەبەرکەن؛ کچەکەم دەگەڵ ئەو شەیتانەی ئابڕووی نەماوە.

نازدار دەڵێ: حەوا خۆ کچەکەشت ئاگای لە خۆی براوە.

نازێ دەڵێ: نازدار، خوشکێ! تووخوڵا چت لەو قسەی داوە.

نازدار دەڵێ: هاهوو! تازە ئەمە ئابڕوومان نەماوە.

ڕۆنیشتن ویستراعەتیان کرد تەواوە.

ئەستی دەڵێ: چلۆن ئابڕوویان بردم، لە خۆم بابان شێواوێ.

دەســـتی دەدا گۆزان، فەرخی لە قەڵاندۆشـــی خۆی دەکرد، دەهاتـــە خوارێ بۆ رازی سەراوێ.

وسووی مەغانی دەیکەوت بەچاوە.

چەند ساڵە پێوەیە بیدوێنێ؛ هێشتا نەیدواندووە. وسوو ئاغا گوتی: «کەس دیار نەبێ ئابڕووم دەچێ». تەماشـــای کرد دوو ســـێ پیاو دیاربوون، حەیای کرد بیدوێنێ. خاتوون ئەستی چوو گۆزەی پڕکرد، گەڕاوە ماڵێ. هەتا ئێوارێ دانیشت. ئێوارێ هەڵستا دەستی دا گۆزان، گوتی: «عاجزم دەچمە سەراوێ». فەرخۆڵە گوتی: «ئەمنیش دێم» تیروکەوانێکی بۆ دروس کردبوو. ســـواری قەڵاندۆشی خۆی کرد؛ تیروکەوانەکەی لەسەر سەری وی گرت. چوونە سەر ئاوێ، گۆزەیان پڕکرد و گەڕانەوە. وسوو ئاغا گوتی: «دەیدوێنم بەتەوەکولی خولایێ». بانگ دێلێ:

خاتوون ئەستی خاتوون ئەستێکی نازداری؛

دەگەڵ شێخاڵە کەچەڵی خەساری؛

زەحمەتکێش و ڕەنج بەباری.

قەت بووە بەسەرینی شلکی، تووشی ئەستۆت بووە هەتیوباری

چاوت ئەستێرەی ڕۆژێ، مەمکت سێوی خوساری،

بەژنت بەمن بمێنێ، بەدارێکی لە لێژی،

دەمت بەمن بمێنێ بەفینجانی قاوەی، مەمکت بەمن بمێنێ بەگۆی لە زێڕی.




ئاورم تێ بەربوو، نابێ سەر وەرگێڕی؟»

ئەو هەتیوی، کون بەگوو چییە بەملانی دەگێڕی؟»

فەرخ گوتی: «ئامۆزا! ئەوە بەمن و بەتۆ دەڵێ».

خاتوون ئەستی دەڵێ: «گووی خوارد لە گووی بابی؛ سەگ دەوەڕێ و کاروانیش ڕادەبرێ». فەرخ دەڵێ: «ڕاوەستە. ئینجا فەرخ بانگی کرد:

«وسوو ئاغا، وسوو ئاغایەکی نەڕی

دووە بەدوور دەوەڕێ وەک سەگی مەڕی.

ئەتوو قەت تەرخی ناکەی بوختان و بەدفەڕی

ئەتوو نازانی لە بنەچەکەی بەکرە مەرگەوەڕی؟

توو ڕاوەستە، تا دە زگتدا وەبکەم گۆپکی دە شێت پەڕی».

وسوو مەغانی لەوێڕا هەڵات. فەرخ پێ کەنی گوتی: «ئامۆزا! بۆچ هەڵات ئەو حیزبابە؟» کەس نەیدەزانی وسوو ئاغا لە ئەولادی بەکرییە، هەتا فەرخ ئاشکرای کرد. خاتوون ئەستی و فەرخ چوونەوە ماڵێ دانیشتن، هەتا سبحەینێ. فەرخ خەوی لێ کەوتبوو. خاتوون ئەستی دەستی دا گۆزان و هاتە سەراوێ. فەرخۆڵە وەخەبەرهات، تیروکەوانەکەی هەڵگرت، وەدوای خاتوون ئەستی کەوت. وسوو ئاغا ئەوێ شەوێ هەتا ڕۆژ خەوی لێ نەکەوت.

گوتی: «دەبێ فەرخی ببینم. دامێنی بگرم، ئەو قسەی ئاشکرا نەکا؛ ئابڕووم دەچێ لە دنیایە. مەگەر لێرە دانەنیشم بچمە وڵاتی بەسرایە».

ئەگەر فەرخ گەییە پشت ماڵی وسوو ئاغای، خاتوون ئەستی گەییبووە سەراوێ. پنجێک دوودڕک فیسقییێکی دەنێویدا بوو؛ فەرخ تەماحی بوو بیکوژێ. فەرخ دەگەڵ وی مەشغووڵ بوو. وسوو مەغانی چاوی لێ بوو؛ هەرای کرد، هاتە خوارێ. فەرخۆڵە تەماشای کرد وسوو ئاغا هات؛ زۆر ترسا. زۆر ترسا، گەییە و بەئامێزی هەڵی گرت. فەرخۆڵە پڕی هەرتک چاوانی ئاوبوو. وسوو ئاغا فەرخۆڵەی هەڵگرت و بردیە ماڵە خۆی گیرفانی پڕ کرد لە مێوژ و لە خورما. گوتی: «ڕۆڵە ئەو قسەی کردت، مەیکە جارێکی دی». گوتی: «وسوو ئاغا! ئەتوو مەڵە ئەمنیش نایڵێم». وسوو ئاغا گوتی: «فەرخۆڵە! بۆ خاتری توو ئەوا خاتوون ئەستیم بەخوشکی خۆم قبووڵ کرد». گوتی: «وسوو ئاغا! ئەوە ئەتوو بووی بە برای من». دەستی برایەتییان پێک دا بوون بە برا. فەرخ هاتەوە زگ فیسقەکەی بیکوژێ. خاتوون ئەستی لەولاڕا هاتەوە، فەرخی ئاویتە سەرشانی خۆی؛ چوونەوە بۆ ماڵی. ڕۆنیشتن بەخۆشییێ. حەوتووێکی چ باس و خەبەر نییە.

دیسان بۆوە گێچەڵی شێخاڵی، دێتەوە سەر خاتوون ئەستییە،
دەڵێ: «ئەگەر ئەمن شوانم ئەو ببێتەوە بێرییە،
«دەنا حاشا مادوڵڵا! ناچمە مەڕییە».
غەڵیفە حوکمی کرد : «ڕۆڵە! دەبێ بچی ببی بە بێرییە».
گوتی: «بابە! فەرخی بەرم. یان بەجێی بێڵم لە شارییە؟»
گوتـــی: «ڕۆڵە! فەرخۆڵـــە هەر دەبێ دەگەڵ ئەتوو بێ؛ خـــۆ چ دایک و بابی دیکەی نییە».
ئێستریکیان قەرار کرد بۆ خاتوون ئەستییە.
دەگەڵ قەرەواشێک و پیرێژنێکی سەرسپییە،
دەگەڵ چەترێکی بەغدایییە.
هەموو ڕۆژێ سواری ئەو ئێسترەی بێ بچیێتە نێو مەڕییە.
شێخاڵ دڵی بەو قسەی خۆش دەبێ، دەڵێ: «ئەوە ژنی منە بەیەکجارەکییە
ئەوجار ئینجا مەڕی خۆم دەلەوەڕێنم بەبێ تەخسیرییە».
هەموو ڕۆژێ مەحەلی چێشتانێ دەبووە تەواوە،
تەدارەکیان بۆ دەگرت و ئێستریان بۆ دەرهێناوە،
سواری ئێستریان دەکرد چەتری لەسەر ڕاگیراوە،
دەچوو لە شێخاڵە کەچەڵی دەکرد سەلام و سەڵاوە،
شێخاڵ دەڵی: «ئەتوو فەرخۆڵەت بۆ دەگەڵە خۆت هێناوە؟»
گوتی: «چ بکەم. هەر لەدووم دەگری، دایک و بابی نەماوە»
ڕۆدەنیشت و مەڕیان لە بێر دەداوە،
ئەوێ ڕۆژێ گەڕانەوە بەدواوە.
شـــوانان بەشـــێخاڵیان گوت: «ئەوە ژنی توو نییە، ئی فەرخۆڵەیە بەئەمانەتی لە توو مارەکراوە».
گوتی: وەڵڵاهـ! سبحەینێ مەرگی دەکەم تەواوە»
ڕۆژ گەیشتە مەحەلی چێشتانێ
خاتوون ئەستی دەدا فەرمانێ:
«ئێسترەکەی بێننە دەرێ، پیاو کاری خۆی بزانێ»
ئێستریان بۆ هێنا ئەوجارە

خاتوون ئەستێ لێی دەبوو سوارە
دیسان بۆ کن شێخاڵە کەچەڵی دەهاتە خوارە
سەلامی لە شێخاڵی کرد؛ شێخاڵ لەوی نەکرد پرسیارە.
لە بۆی دادەنا نان و ژەهرەمارە،
گوتی: «ئەوڕۆ نایێڵم فەرخ لە چەنگی من ببێ قوتارە».
مەڕیان لە بێر دەدا شێخاڵ سوێندی خوارد سێ جارە:
«هەرکەسێک بەرخێکی لەلای بڕوا، سێ جاری لێ دەدەم بەو دارە»
ئەگەر مەڕیان هاوێر دەکرد، بەرخێک دەرپەڕی لەلای فەرخۆڵەی هەژارە.
خاتوون ئەستی خۆی فڕێ دەدا، دەیگرتەوە ئەوجارە
وە عەرزی دەکەوت، نەیدەما ئیختیارە
شاڵواری هەڵدەکرا، کراسی بڵند دەبوو، هەموو بەدەنی دیارە.
شیخاڵ گوتی: «فەرخی دەکوژم ئەوجارە».
دەستی ڕەق دەبوو پێی دە عەرزی نەیدەکرد کارە.
فەرخ کە ئاوڕی داوە تەماشا دەکا لە عەرزییە خاتوون ئەستییە نازدارە
کەلەکەی و ڕانی هەموو دیارە،
دەڵێ: «بەرخم بەرخی پیرەمەڕێ
یا ڕەببی سەرت وە هەزاری گەڕێ
وەدەرت خستوون پەنجە و پانیەی لیلوپەڕێ
بەرخم بەرخی بەرانی!
عەمرم بەپیریش هەرجوانی،
لەبۆ فەرخۆڵەت وەدەرخستووە پەنجە و پانیەی بڵقیسای سولەیمانی.
بەرخم بەرخی شەکێ!
بەرەکەتت بکەوێتە عەمری دەگەڵ کەلەکێ.
لە بۆ فەرخی بێ دایک و بابت وەدەرخستوون پەنجە و پانیەی دەوێ مەلەکێ».
ئەگەر فەرخ ئەو قسەی دەکرد تەواوە
خاتوون ئەستی لەسەر جێی خۆی هەڵستاوە.
پڕی دەدا فەرخی لەسەر ئامێزی خۆی ڕۆناوە.
دەڵی: «ئاخر لەسەری توو دەبم بۆسۆ و بەنناوە».

بۆ سەر ڕازی کانیە هاتنەوە، تەدارەکی ماڵێ گیراوە.
شێخاڵ لەوێ ڕەقبۆوە دەستی ڕاوەستاوە
پێی لە عەرزێ نایە بەدواوە.
دوو گورگان سەریان لە مەڕێ دەسوێیە ناوە
بۆیە مەحتەلن، ئەگەر بێری بگەڕێنەوە بەولاوە.
تەدارەکی خۆیان دەگرت، بێرییان دەیانگوت: «شێخاڵ، ماڵئاوا»
ئەگەر ئەوان دەڕۆیین، ئەو گورگانە بۆ مەڕیان ڕاکیشاوە
هەروا بێری بوو،ڕووی خۆی دەڕنی، دەیگوت: «مەڕی مە نەماوە
ئەو گورگە بردی، بۆ دەنگێ ناکا ئەو پیاوە؟»
گوتیان: «ماڵ خراپ! ئاخر دەستی ڕەقبووە، دوعای فەرخی لێ کراوە».
خاتوون ئەستێ تکایێ لە فەرخی دەکا، دەڵێ: «بلا ئەو گورگانە بگەڕێنەوە بەدواوە».
فەرخ بانگ دەکا: «گورگ! ئەی جووتە گورگی دە کەنعانێ!
بە ڕەزای خولای ئاسمانێ
وەرن لە مەڕی من ببژێرن؛ بەرن بیکەن بە کەباب. ئەوە لەجیاتی زەکاتێم دانێ.
ئەی جووتە گورگەی ساحێبی بەراتێ!
وەرنە پێشێ شێخاڵە کەچەڵ دەستی ناکاتێ
یەکی چاک ببژێرن، بەرن دەرێی خولاێرا ئەوە لەجیاتی زەکاتێ».
کێ بوو لە جووتە گورگی جندییە
دەهاتنە خوارێ بەگورجییە
هیچ نەترسان لە شێخاڵییە.
یەکی چاکیان بژارد ڕایان کێشا بەبێ تەخسیرییە
دەڵێن: «ئەوە زۆر حەڵاڵە هەم زەکاتە؛ هەم ماڵی شیخ فەرخییە.
خولا ڕسقی ئەوڕۆی داینێ؛ کەرەمدارە بۆ ڕۆژێکی دییە».
بێرییان جڵەوی ئێستریان دەگرت، دەیانگوت: «فەرخۆڵە! دوعاێین بۆ بکە لە ڕەببییە
شێخاڵ دەست و پێی خۆش ببنەوە، بچێتەوە مەڕییە؛
دەنا گورگ پێی فێر بووە قەت یەکی نامێنییە».
فەرخۆڵە تەمەنای دەکرد لە خولاێ؛ حەزرەتی جوبرائیل دەهاتە کنی بەیەکجارەکییە
گوتی: «فەرخۆڵە! جارێکی دی دوعای مەکە لە کەسی دییە»




فەرخۆڵە تەمەنای دەکرد لە جوبرائیلییە،
دەیگوت: «تەخسیری من نەبوو دەستی لێ هەڵنەگرتم خاتوون ئەستییە».
بۆ ماڵێ دەهاتنەوە فەرخ و بێرییە.
ژنێک بێدین بوو، ئەوە مروەتی مەولوود سوراحییە
شەیتانیی کرد لە فەرخی فەقیر و لە خاتوون ئەستییە
دایکی خاتوون ئەستی جنێوی دا بە فەرخییە
گوتی: «ئەوە نەقڵی بابی کۆرپەکۆرپەکەی دەکا، ئابرووم بەرێ لە شاری داودییە
وەڵڵاهی قاعبە! ڕۆژێکی دی نابێ ئەو شەیتانەی دەگەڵ خۆت بەریە مەڕییە
شێخاڵ چاکە لە حەیفی ئەوەی خۆی نەکوشتییە».
خاتوون ئەستی دەگریا، دەپاڕاوە،
فەرخۆڵەی دەسەر کۆشی خۆی داناوە؛
هەر چوار برای هاتن لەولاوە.
گوتیان: «ها خوشکێ! بۆچی دەگری، چت لێ قەوماوە؟»
گوتی: «براله! ڕەبی خوڵاگیرم بن هەر لە من خراپ قەوماوە.
ئەمنو دەگەڵ کەچەڵێکی دە تەرازوویێ ناوە،
ئێستا دایکم هەموو ڕۆژێ دەمکا بۆسۆ و بەنناوە،
دەڵێ قایل نیم فەرخۆڵەی بەریە نێو مەڕی، چونکە ئەوڕۆ گورگ لە مەڕی داوە».
گوتیان خوشکێ! دایکم بۆ هێندە خراپە؛ جا چی بەسەر فەرخی فەقیرەوە داوە؟»
برایەکی دی گوتی: «دایکمان چ قسان بکا، وەبزانێ سەری تاشراوە».
سبحەینێ بەیانی دا، بێری خربوونەوە بۆ مەڕییە.
دایکی خاتوون ئەستیێ گوتی: « قەدەغەیە نابێ فەرخۆڵە بچێ چ جاری دییە،
ئەوڕۆ دەچین ئەمن و خاتوون ئەستییە».
خاتوون ئەستی گریا: «خوڵایە! ئەمن چارەم چییە؟
فەرخ بەجێ بمێنێ، دەمرێ بەبێ کەسییە».
فەرخی بەدزی بەڕێ کرد بۆ مەڕییە،
دایکی پێی نەزانییە.
دوو بە دوو سوار دەبوون لە ئێسترێ خاتوون ئەستی دەگەڵ دایکییە.
ڕەپێشیان کەوتن بێرییە.

تەماشایان کرد فەرخۆڵە دەڕوا لە بۆ مەڕییە،
بەتاقی تەنێیێ؛ کەسی دەگەڵ نییە.
دایکی وەڕگەڕاوە، سێ چوار چەپۆکی دا لە خاتوون ئەستییە،
دەڵێ: ئەوە خەتای تۆیە ئەو ـ شەیتان و ڕمووزنە ڕێی وەبەرە خۆی گرتییە
هەتاوەکی دەگەینە فەرخۆڵەی بەیەکجارەکییە،
ئامۆژنی لێی دەدا، ئێستری وەسەر دەپەڕاند پێی بریندار دەبوو، خوێنی لێ دەبوو جارییە.
خاتوون ئەستی خۆی لە ئێستریێ فڕی دەدا سوێندی دەخوارد دەیگوت: ناچمە مەڕییە
دەچمەوە کن غەلیفەی بابم، لێت دەبم بەعەرزەچییە،
بابم فەرخۆڵەی بەمن داوە بەئەمانەتییە
ئەگەر ئەتوو فەرخۆڵەی لەو چۆڵەی بکوژی، جا مـن لەکن بابم جوابم چ دەبێ، بۆم دەبێتە ڕووڕەشییە».
دایکی گوتی: « قەحبە! وەرە سواربە بڕۆین بۆ مەڕییە».
گوتی: «ئەتوو بڕۆ، بەخێرچی؛ ئەمن فەرخۆڵەی ناکەم خۆراییە.
دەبێ بابم بەو قسەی بزانێ، دەنا بۆ من دەبێتە غەیانەتییە؛
لەسەر حەوتوو و چلوان بوو، ئەمن ئەوهەم بەخێوکردییە».
دایکی گوتی: «وەرە سواربە؛ ئەوهەش لەگەڵە خۆت بێنە؛ قەت کەڵەگای وا نییە».
خاتوون ئەستی سوار دەبوو. پیلی فەرخۆڵەی دەگرت، دەیناوێتە سەر شانییە.
تووشی دڕووێکی بوو. فەرخ لە پشتەوە بوو. پڕی دا دڕوەکەی پچڕی، بردی لە پشتەوە وەبن کلکی ئێستریێ دا. ئەگەر ئێستر دڕوەکەی گەییە؛ کلکی ئاویتە سەرە. دڕووی دەکونی ڕاچوو. ئێستر دەرپەڕی ئەوبەر ئەوبەرە.
ئەگەر ئێستر هەڵات بەولاوە
هێندی خۆی لە دار و بەردی داوە
ئامۆژنی فڕێ دەدا، لەوێ بەجێ ماوە.
فەرخ دەستی دەدا هەوساری ئێستریێ، جڵەوی کێشاوە،
ئێسترەکەی ڕاگرت، دڕووەکەی لەبن کلکی دەرهێناوە.
ئەگەر چووە سەر ئامۆژنی، زمانی شکاوە.
خاتوون ئەستی بەسەر خۆی دەدا، گوتی: «دایکم نەماوە».




فەرخ پێی پێ کەنی، وەسەر پشتێی گێڕاوە.

خاتوون ئەســـتی دەستی دەستۆی فەرخی کرد گوتی: «دایکم چاک بکەوە؛ ئاخر ڕۆژ کەمی ماوە،

ناگەینە مەڕی؛ لێمان عاجز دەبێ ئەو شیخاڵی ماڵ شێواوە».

فەرخ گوتی: «ئامۆزا! بڵا لێرە بێ هەتا لەولاڕا دەگەڕێینەوە دواوە».

دەڵێ: «ئەگەر بۆم چاک نەکەیەوە کوێرم دەبێ هەرتک چاوە».

ئەگەر ئەو قسەیان لەوێ کرد تەواوە،

فەرخ لە خولاوەندی عالەمیان دەپاراوە.

ئەگەر شووێکی لە دایکی خاتوون ئەستی داوە.

بوو بە بەردێکی شین ڕەنگی مەخلووقی نەماوە.

خاتوون ئەستی و فەرخ سوار دەبوون؛ سەبوونی گەرمێنێ دەهات لەولاوە؛

خاتوون ئەستی گەرمای بوو عارەقەی لێ دەتکاوە.

فەرخ گوتی: «بانگی شەماڵی کەن بێ لەولاوە».

فەرخ بانگی دەکرد : «ئەی ڕەبی عالەمێ، بینای چاوانە!

حەزرەتی جوبرائیل بنێرە کن باڵووڵی دێرانە،

شەماڵ مەرەخەس بکرێ بێتە ئێرەکانە.

هەراسان بووە ئەستی کێل گەردنی هەنیە پانە،

سەبوونی گەرمێنێ پێی نادا وچانە».

ئەگەر فەرخ لە خولای دەپاڕاوە،

بە ڕەزای خولای شەماڵ مەرەخەست کراوە.

ئەگەر شەماڵ هاتە خوارێ، هێند بە حوکمە، کێوی گەورە گەورەی تێک داوە؛

هەرچەندی خیز و بەردی بڵندان بوو، هەمووی هێنا، لەسەروچاوی خاتوون ئەستییێ کرد بڵاوە.

خاتوون ئەستی دەڵێ: فەرخۆڵە، ئەوە چ مەکرێکە دەرت هێناوە؟»

دەڵێ: «بە شەماڵی بڵێم، بگەڕێتەوە دواوە».

خاتوون ئەستی دەڵێ: «منەتێکە لەسەر شانی منت داناوە؛

درەنگە، بێری گەینە مەڕی، مەڕ نەدۆشراوە.

«خراپم لێ قەومی، دایکم لەوێ بەجێ ماوە».

فه‌رخ دووباره له خولای پاراوه،
شه‌مال هێدیی کرد، بۆ مه‌ڕییان ئاژواوه.
هه‌تا گه‌ینه شێخالی لێیان کرد سه‌لاوه.
دابه‌زین به په‌له‌په‌ل، مه‌ڕیان لوبێر داوه.
ته‌داره‌کی خۆیان گرت. ئه‌وێ ڕۆژێ خاتوون ئه‌ســتی گوتی: «شیخال ده‌وڵه‌ت زیاد و ماڵئاوا»
شیخاڵ گوتی: «خاتوون ئه‌ستی! ئه‌من ئاغام، له‌به‌ر ئه‌تو شوانم،
ئه‌گه‌ر له‌به‌ر ئه‌توو نه‌بێ، براکانی توو به نۆکه‌ری خۆم ده‌زانم.
له‌به‌ر عیشقی توو که‌ڕکی کوردی هاتۆته شانم،
که‌لاشی دۆمی وا له پێیانم.
یاخولا! به‌خێرێی سه‌ر چاوه‌کانم».
ئه‌گه‌ر گه‌ڕانه‌وه به‌دواوه،
خاتوون ئه‌ستی ده‌ستی ده پشتێنێ فه‌رخۆڵه‌ی ناوه،
ده‌ڵێ: «وه‌خته له سوێی دایکم کوێرم بێ چاوه.
ئه‌گه‌ر نه‌گه‌ینه دایکم خراپ قه‌وماوه».
فه‌رخۆڵه ده‌ڵی: «ئامۆزا لێی گه‌ڕه زۆرم رق هه‌ڵستاوه.
«ده‌ربه‌ندی خۆم نیم، ئه‌گه‌ر ئێستر پێی له من ناوه.
حه‌یفی وه‌ی ده‌مکوژێ، له‌سه‌ری من له تووی داوه.
ئه‌گه‌ر لێم گه‌ڕێی، ده‌بێ هه‌روا به‌رت بێ، هه‌تا دنیا ده‌بێ ته‌واوه».
خاتوون ئه‌ستێ ده‌ڵێ: وا نابێ، حورمه‌تی ئی منیش و ئی تۆش به دایکمه‌وه ماوه».
ئه‌گه‌ر هات گه‌ییه دایکی، خاتوون ئه‌ستێ گه‌لێک گریاوه.
فه‌رخۆڵه گوتی: «لێی گه‌ڕه؛ ئه‌وه فه‌ساده شاری داودییه‌ی تێک داوه».
خاتوون ئه‌ستێ ده‌ڵێ:ئه‌گه‌ر دایکم چاک نه‌بێته‌وه، ئه‌من کوێرم ده‌بێ هه‌رتک چاوه.
ئه‌گه‌ر چووینه‌وه بابم ناڵێ، دایکت بۆ نه‌هێناوه».
فه‌رخ هاوارێ ده‌کا: ئه‌ی خولای لایه‌زانه!
ئه‌وجار بۆ خاتری من بێته زوبانه».
ئه‌گه‌ر شووێکی لێ دا. بوو به دێڵه‌سه‌یێکی ڕه‌ش ئه‌و به‌سته‌زمانه،
جا ســـه‌بوونی گه‌رمێنێ لێی ده‌دا، بۆچوڕووکی له پشتێ ده‌هات، هێنده‌ی ده‌رکێشابوو زوبانه.

ئێستر پێکی لێ دەنا دەری دێنێ هەرچوار سمەڵۆکانە.
هەتا گەینەوە قەراخی شاری داودییە،
دەڵێ: «فەرخۆڵە ئامان! ئەوە ئینساف نییە
بابم دەپرسێ: دایکت کوانێ، ئەو سەگەو بۆ چییە؟
وەرە چاکی بکەوە بۆ خاتری خولاّی و ڕەببییە»
دیسان بۆی دەپاڕاوە لە ڕەببییە؛
حەزرەتی جوبرائیل دەهاتە کنی بە قاسیدییە،
دەیگوت: «هەر دوعایەکی ئەتوو کردت خولاّ لێی قبووڵ کردییە».
ئەگەر فەرخ شووێکی لە ئامۆژنی دا ڕۆح هاتەوە بەرییە.
جنێوی دەدا بە فەرخۆڵە و بە خاتوون ئەستییە.
سوار دەبوون دەچوونەوە شارییە.
ئەو بێدینە دەچۆوە کن کوڕەکانی لە فەرخ و ئەستییان دەبوو بەعەرزچییە.
کوڕەکان گوتیان: « دایە ئابڕوومان مەبە دەیبەتلێنین بەدزییە،
ئەگەر مام غەڵیفە بزانێ ئاسارمان دەبڕییە،
لەسەر فەرخۆڵەی بەسەرماندا وێران دەکا شاری داودییە».
فەرخۆڵە وای گوت بە خاتوون ئەستییە:
ئامۆزا! نەتزانی، ئامۆژن لێن بووە بە عەرزچییە.
ئامۆزا! ئەمن دەڕۆم ئی دی کەڵکی تۆم نییە.
ئەگەر لێرە بم سەرم دەبڕن بەیەکجارەکییە.
سەفەرم سەفەرێکی ناتەواوە؛
ئامۆزا! دەوڵەت زیاد و ماڵ ئاوا»
گوتی: «بۆکوێ دەچی، بەمنداڵیم بەخێو کردی ئەمنی بابان وێرانی»
گوتی: «ئامۆزا! دوور ناچم. دەچمە ماڵی و سووی مەغانێ».
فەرخ لە جێی خۆی هەڵستاوە.
دەگەڵ خاتوون ئەستێ بانگی خۆشیان لێ داوە،
فەرخ لێی دا ڕۆیی گوتی: «ماڵئاوا»
گوتی «بڕۆ، بەخولاّت دەســپێرم، بە هەموو لایەکی ئەمنو دەمســت شێخاڵە کەچەڵی ناوە.

فەرخ هەڵستا چووەماڵی وسووی مەغانی.
خەبەریان دا بە وسوو ئاغای لە ماڵە خۆی پێی زانی.
بە پیرییەوە هات بۆخۆی و بە خێزانی.
ئەگەر فەرخ دەچوو لەوی دەگرد سەڵاوە.
وسوو ئاغا یەک پێ لەبەری ڕاوەستاوە.
گوتی: «قوربان! هەرچەندی ماڵی هەمە، ئەوا دام بەتوو لێت نەزرکراوە.
وسوو ئاغا نۆکەرێکە لە پێشت ڕاوەستاوە.
ئەوە ماڵی تۆیە، هیچ تەوەلوقی منی بەسەرەوە نەماوە».
ئەگەر تەماشایان کرد، مانگی موبارک وەدەرکەوت ڕەمەزانە؛ تەواوە.
هەموو کەس کەوتە سەروپای ڕەمەزانێ.
خۆشی کەوتە مردووی گۆڕخانێ.
هەتا بیست و حەوت لە ڕەمەزانێ بوو تەواوە،
مام غەڵیفە کەوڵێک و جوانوو ئەسپێکی بوو، لەبەر کوڕەکانی بە فەرخۆڵەی نەداوە؛
لە مێژە ئەو جوانوو ئەسپە بۆ فەرخی هەڵگیراوە.
مام غەڵیفە دەڵێ: «چ بکەین لە ڕەمەزانێ؟
هەرکەسێکی مزگێنیی مانگی موبارەکی بۆ هێنابام، ئەو جوانوو ئەسپ و کەوڵەم دەدانێ».
وا دەڵێن ڕدێن سپی و مەلێیە:
قوربان! ئەوڕۆ بیست و حەوتی مانگێیە،
هەتا سێ ڕۆژی دی، هەیهوو! لە کوێیە»
ئەو خەبەرە بەفەرخێ و وسوو ئاغای دراوە.
وسوو ئاغا گوتی: فەرخۆڵ ئەوڕۆ بیست و حەوتی مانگێیە؛ مامت جوانوو ئەسپێک و کەوڵێکی بۆمزگێنی مانگی موبارکی داناوە».
فەرخ گوتی: مانگ مانگێکی تەواوە؛
عەسرێکی تەمیزە فەسڵێکی مەلا بانگی داوە.
فەرخ و وسوو ئاغا وەسەربانی کەوتن، چاویان لە هەموو دنیایێ گێڕاوە؛
هەرچەندی خەڵقی داودییە، بەرەو ڕووی مانگی مونەوەر ڕاوەستاوە.
خاتوون ئەستێ کوندەیێکی هەڵگرتبوو بۆ چۆمی هات واوە؛

فەرخ گوتی: «وسوو ئاغای گیانە!
بڵێن بە خەڵقی خوڵای ساحب ئیمانە،
هەرکەس بۆ جیرانی خۆی بەرێ ڕۆن و برینج و کاسە جێژنانە».
خاتوون ئەستێ چوو کوندەی پڕکرد هاتەوە لەولاوە،
کوندەی وی خراببوو دڵۆپ دڵۆپ ئاوێ لێ دەتکاوە،
وەبەلەکی خاتوون ئەستێ دەکەوێ بەلەکی هەموو تەڕکراوە.
فەرخ دەڵێ: «تەماشای ئەو کوندەی کە، حەیای لەکن نەماوە؛
ئەمن لازمە دەگەڵ ئەوەی بکەم شەڕ و داوا».
وسوو ئاغا دەڵێ: ئەوە بێ سەر و ئەزمانە چی دەگەڵ توو پێ نەکراوە.
فەرخ بانگ دێڵێ: ئەی کوندەم کوندەی بەرانی
عەمرم بە پیریش هەر جوانی،
ئەگەر شەرمێ لەمن ناکەی، بترسە لە یەزدانی.
بوو لە من تەڕ دەکەی پەنجە و پێی بڵقیسای سولەیمانی.
کوندەم کوندەی بزنێ،
یا ڕەبی قەت کێردی قەسابانو هەڵنەگیرێ لەسەر گەردنێ
ئەتوو بۆ لەمن تەڕ دەکەی پەنجە و پانیەی دەوێ شەکرەژنێ
کوندەم کوندەی پانێری!
بتگاتێ نەخۆشیی ڕەشەگوێری
ئەتوو بۆ ئاوی لە کۆڵی ئەوێ شەکرەژنێ دەبوێرێ
کوندم کوندێکی نادانە!
گۆشتی تۆیان نەخواردده چ کافر و موسڵمانە
ئاوێ بۆچی دەبوێرێ بە خاتوون ئەستێیە غەیانە.
وسوو ئاغا تەماشای مانگی مونەوەر بکە؛ ئەوە لە حەوت تەبەقەی ئاسمانە،
فەرخ دەڵێ: وسوو ئاغا چ بکەین لەوێ ڕەمەزانێ؟»
«هەرچی بکەین هەرایە، بەغەیرەز شوکرانێ.
بڵا مزگێنیی مانگی موبارەک بدەین بە مام غەڵیفەی دەپێش هەموو کەسیدا بزانێ
مامی خۆمە هەر ئەو خەلاسم دەکا لە تەنگانێ،
جا مزگێنی بەرین بۆ مام غەڵیفەی، ئاغای شارییە».

مام غەڵیفە ئەگەر وای دەزانییە،
لەمانگی موبارەکیان دایە مزگێنییە،
ناردی کەوڵ و جوانو ئەسپێ نارد بەدیارییە.
فەرخ کەوڵی دا بە وسوو ئاغای جوانوو ئەسپی قبووڵ کردییە.
ئەوی ئەسپ و کەوڵیان هێنابوو، خەڵاتی کردن بەنەجیمییە،
گوتی: «عەرزی مام غەڵیفەی بکەن، ڕوح و سەرم هەر ئی وییە».
ئەوێ شەوێ لە مزگەوت و خانەقایە تەگبیریان ڕۆناوە،
لەبەر خولای دەپاڕانەوە سەڵەواتیان لێ داوە،
سبحەینێ کە نوێژی ڕەمەزانیان دەکرد، نانی هەموو کەسی دراوە.
کوڕی مام غەڵیفەی چوونە خزمەت بابیان، ڕاوەستاون تەواوە.
دەڵێن: «بڵا، بچین فەرخۆڵەی بێنینەوە. ئابڕوومان نەماوە،
لە ماڵە وسوو ئاغای، بەینەڵڵا پیاوێکی تەواوە».
مام غەڵێفە گوتی: «ئەگەر لە دوو فەرخی دەچن بەیەکجاری،
دەبێ هەمووتان خزمەتی بکەن بەقەننەداری.
بێتەوە ڕۆنیشی بەگەورەی شاری».
کوڕی مام غەڵیفەی لە بابیان قبووڵ کرد تەواوە.
لە هەموو کەیخواد و سەید و مەلایانیان گێڕاوە
هەموو بۆ ماڵە وسوو ئاغای دەهات تەواوە.
وسوو ئاغا بەپیریانەوە هات ئیکلامی هەموویانی کێشاوە.
گەینێ، کەوشی فەرخییان لەسەر سەری خۆیان داناوە؛
دەڵێن: «قوربان! گەورەییی شاری داودییەی بەتوو دراوە.
ئەوە کوڕی مام غەڵیفەن گەورەییی توو قبووڵ کراوە».
گوتیـــان: «وســـوو ئاغا چ دەفەرمـــووی لە بۆ مە؛ ئەمە دەگەڕێنـــەوە چ کاری دیمان نییە».
فەرخۆڵە گوتی: «حاشـــا و مادوڵڵا؛ نامەوێ ئاغایەتی شـــاری داودییە؛ ئەمن لە ماڵە وسوو ئاغای دانیشتووم بەنۆکەرییە»
وسوو ئاغا دەڵی: «ڕێم ناکەوێ ئەمن هیچ بەشم بەسەر ئەو ماڵ و دەوڵەتەوە نییە».
فەرخ دەڵێ: «قەت ناچمەوە نێو شاری داودییەی جارێکی دییە».




دەوێ هەموو گەڕانەوە بەبێکەیفییە،
فەرخ دەڵێ: «وسوو ئاغا! چوونەوە بۆ من چوونەوە عەیب و شوورەییە.
ئەگەر لێرەش بێ سەحەت بم، دەچمە ماڵێ خاڵم ئەوا لە شاری شامێ میری وا نییە»
کەیخواد و کوڕی مام غەڵیفەی هاتنەوە بەدواوە،
مزدەیان بەمام غەڵیفەی داوە.
گوتی: «لێی گەڕێن هەتا ڕادەبری شەش لە شەشەکانێ؛
ئینشاڵڵا دەیبەنەوە سەر مەکانی خۆی هەتا هەموو کەس پێ بزانێ».
کوڕی مام غەڵیفەی بەدزی بابیان و خاتوون ئەستییە بۆی هەڵدەکەنن زیندانێ؛
شـــەوی فەعلەی بەزێڕێک بەکرێ دەگرن هیچ کەس نازانـــێ قوت وچان نادەن کە گڵ کێشانێ،
هەتا ڕۆژ دەبێتەوە، فەسڵی مەلا بانگدانێ.
ئەگەر شەش لە شەشەکانێ چوون تەواوە
کوڕی مام غەڵیفەی دیسان هاتن لەولاوە
چوون، ئیکلامی لە فەرخۆڵەیان کێشاوە
کەوشیان لەسەر سەری خۆیان داناوە.
فەرخ ئاوڕێکی بە وسوو ئاغای داوە
دەیگوت: «وسوو ئاغا نازانێ چ قەوماوە؟
دەبێ هەر بچمەوە، داوە لەمنیان ڕۆناوە».
لە جێی خۆی هەڵستا کەوشیان بۆ ڕۆناوە
وەدەرکەوت بۆ ماڵە مامی خۆی گەڕاوە.
خاتوون ئەستی تاماشای کرد، ئیجهەی ئامۆزای و برای هاتن لەولاوە.
خاتوون ئەستی نەیزانی زیندانی بۆ دروس کراوە.
دەودەمیدا موسڵمانێک هات، خەبەری بە ئەستی داوە.
خاتوون ئەستی دەڵێ: «وای کوێرم بێ چاوە!
لە قسەی ئەنگۆ دەنا هەر ئەوەندەی لەسەر دنیایە ماوە».
هەڕای دەکرد، دەزووی بەدەرزییەوە کرد، جامێکی ئاو هێنا، تێی ئاویت، لەســـەر ڕێی دانـــا. فەرخ ئەگەر چاوی پێ کەوت گوتی: «ئـــەوە دەزووە کفنم پێ دەدروون؛ ئەو جامە زیندانە تێی دەکەوم، تێدا دەخنکێم. ئەو ئاوەش پێم دەشۆن». ئەگەر وای چاوپێ کەوت،

مســـتێکی لە دەمی خۆیدا، خوێن هاتە خواری؛ گـــەڕاوە. گوتیان: «قوربان ئەو خوێنە چ بوو؟» گوتی: «نازانم! دەچم دەمی خۆم دەشۆم». گوتیان «قوربان! ئەو خەڵقە هەموو نۆکەری تۆیە. دەمی خۆت لە ماڵێ بشۆ». گوتی: «نا ئەمن عەمبەڵیم، دەبێ بچمە سەر شـــەتی داودییەی. ئەنگۆ ڕۆنیشـــن، ئێســـتا دێمەوە». ئەگەر لەوان ڕەدبوو، دەمی خۆی بەدەســـتڕەی ئەســـتڕێ هەڕای کردە ماڵە وسوو ئاغای. وســـوو ئاغا گوتی: «قوربان! چ قەوماوە؟»

فەرخ دەڵی: «وسوو ئاغا گیانە!
ئەمگوت کوڕی مامم دەگەڵم غەیانە
جوانوو ئەسپەکەم بۆ بێنە دەرێ، ئەمن دەڕۆم لێرەکانە.
دەگەڵیان دەرنابەم، هەمووی شمر و شەیتانە.
وسوو ئاغا دەڵێ: «سەرت لەسەر دادەنێم، فەرخۆڵە گیانە!»
فەرخ دەڵی: «چاوم بڕاوە، وسوو ئاغا گیانە!
دەبێ بڕۆم لێرەکانە».
جوانووی فەرخیان هێنادەرە،
لێی بکەن زینی موحتەبەرە.
پێی نا ڕکێف کەوتە سەرە،
دەڵی: «وسوو ئاغا دادەبەزمەوە، بەخۆڕاییە ئەو سەفەرە
شیرەکەی بابم بۆ بێننە دەرە،
جوانوو ئەسپەکەم بۆ بگێڕن ئەو سەر ئەو سەرە
کێ بوو؟ لە فەرخۆڵەی نازدارە،
شیری بابی وەچەنگ کەوت ئەو جارە
دەستی دایە، بۆ یەختەخانەی ماڵە مامی چووە خوارە،
دەرکی کردەوە، چوو، لە تەویلەی گرتی قەرارە.
بەتەویلەدا هات، لە ڕەفیسکەی هەموو ماین و ئەسپانی داوە،
قەت یەکێکی بەساغی نەماوە.
هەڵات و بۆ ماڵە وسوو ئاغای گەڕاوە،
پێی دەرکێفی نا، وەسەر زینی کەوت تەواوە،
دەڵی: «وسوو ئاغا! گێچەڵە، بۆخۆم و بۆ تۆم بنیاد ناوە».

مەیتەر و میرئاخوڕ هاواریان برد بەهەشتاوە
خەبەریان لە مام غەڵیفەی و لە کوڕانیان دەگێڕاوە.
کوڕی مام غەڵیفەی دەنگی لەشکریان دا هاتن لەولاوە.
ئەگەر وسوو ئاغای وا دەزانێ زرێی دەبەرکرد مەتاڵی دە دەستی هەڵکێشاوە
خزمی خۆی هەموو بانگ کرد، لە پێش کوڕی دە مام غەڵیفەی ڕاوەستاوە
سـوێندی بە کەلامولڵایە خوارد: «ئەگەر هاتوون فەرخـی بکوژن، نایەڵم، یەک یەک سەری بچێتەوە بەدواوە».
هەموو دەیانگوت خێرە؛ ئەمە خزمەتی دەکەین. هەر گەورەیە سـاحب ئیختیارە. هەر زەرەری لە خۆی داوە.
فەرخ گوتی: «وسوو ئاغا پێی ناوێ دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا».
ڕکێفی لە جوانوەکەی دەدا؛ ئەمەگی خاتوو ئەستێی لەسەر بوو، تۆڕی بەسەر هەرتک چاوان کشاوە.
خەبەر بە خاتوون ئەسـتێ دەدرێ، دەڵێن: جوانووەکەی کوێر بوو، ڕێی بۆ هیچ کوێ سەرەدەر نەکراوە.
خاتوون ئەسـتی گوتی: « بلا بمکوژن لەسەر فەرخی». بانگ دێڵێ: ئەی جوانووڵە، جوانووڵەی سەری سالان!
ڕەنگت دە کلکێ دەدەم، خەنەت دەگرم دە بژ و یالان.
ڕۆحـی خۆمت نـەزر دەکەم، ئەگەر فەرخم بۆ دەرکەی، لـە دەس دژمنان لە دانگەی مالان.
ئەی جوانووڵە جوانووڵەی سەر هۆزان!
چرای چاوی خۆم فرزەندی ڕەش بۆزان
ڕۆحـی خۆمت نەزر دەکـەم، ئەگەر فەرخم بۆ دەرکەی لە چەنـگ دژمنان، لە دەس ئامۆزان.
ئەی جوانووڵە، جوانووڵەی گوفتارێ!
ڕەنگت دە کلکێ دەدەم، بژانت دەگرم لە ژەنگارێ
فەرخم بۆ خەلاس بکەی، بۆ شاری شامێ بچیتەوە خوارێ
ئەگـەر خاتوون ئەسـتی گەردنی جوانووڵەی ئازا کرد و ڕۆیی لـە دنیایە ڕووی کردە کوێستانێ و کێو سەرایە

لەوێندەرێ بەفر نایداتێ ڕێگایە.
ئەوا لەشکری دێ لە دوایە،
وسوو ئاغا هەروا دەگەڵیانە، سوێندیان لێ دەخوا بە کەلامولڵایە
دەڵێ: «نابێ ئیلاقەی فەرخی بکەن، ئەمەگم دەچێ بەزایە».
فەرخ بانگی بەفرێ دەکا:
«بەفری کوێستانێ! گەلێک بەفرێکی نادری»
بووی بەجەردە جابر، ڕێ لە موسڵمان و ڕێبوار دەگری
نایەڵــی میوان بگاتە ئاودانییە، مەنزڵێکی پەیدا بکا، لە تینوان نەخنکێ، لە برســان نەمری».
بەفر دەڵێ: « فەرخۆڵە، چرای چاوانم
ئەمن خانەخوێم ئەتووی میوانم
ئەمن بەڕەزای خوڵای بینای چاوانم
بەرەکەتی ئەرز و ئاسمانانم.
لەوەش بەدەرەوە ڕۆژی هەرچی بەگیانم؛
لەوی زیاتر، دەرمانی نەخۆش و بیووردارانم».
فەرخ دەڵێ: «بزانم چلۆنم لێ هاتۆتە مۆلەکێ، هەر نەخۆشێکی تۆ تەڵەب دەکا، ڕەبی! لێی ببیە کۆخە و برک،
لێی بچییە دە کەلەکێ. هەر نەخۆشێکی بەتوو ڕاس دەبێتەوە، هەڵنەستێ لەوێ کەونە لێفۆکێ».
ئەگەر فەرخ دیسان ئاوڕی دەداوە،
وسوو ئاغای دەپێشدایە، بەیداغی ڕاکێشاوە.
فەرخ هاوار دەکا: یا ساحبی عەرز و ئاسمانێ!
ڕەبی! خەلاسم بکەی لەوێ تەنگانێ.
ڕەحمی بەوی کرد ساعبی عەرز و ئاسمانێ
هەور دەچریکێنێ، هەڵی کردە شەماڵی، لێی دا لە گۆپاڵ بارانێ.
هەتا دوو ساعاتان باری تەواوە
لە پاسان خوڵا ڕەحمەتی کرد، دنیا ڕۆشەن کراوە
لە هەموو زینو و بانوان هەڵستا سێڵاوە

فەرخ ئاوڕی وەدوای خۆی داوە
دەڵێ: «بە خوڵای دەمکوژن سەفەرم ناتەواوە
خاتوون ئەستێ چاو بەڵەکەم لێ بە جێ ماوە».
شەتی داودییەی پڕ هاتووە لە سێڵاوە،
فەرخ ئیختیاری لێ بڕا، ملی لە شەتی داودییەی ناوە.
فەرخ چوو دە شەتێوە، وسوو ئاغا دەستی بە قورعانێ داداوە
سێ جاری کەلاموڵلای کرد تەواوە،
دەڵێ: فەرخ لە شەتی داودییە بخنکێ، نایەڵم عەبدێکو بگەڕێتەوە بەدواوە.
پاکانو سەردەبڕم شاری داودییەی دەکەم بڵاوە.
خوڵا فرسەتی جوانووی فەرخی داوە
گەییە بەری ئەوبەری چەنگی لەسەر دیواری ڕۆناوە
چۆم ڕای دەدا خوارێ، قەوەتی نەماوە.
کەلێنێکی خوڵا بەوی دا، دەستی ئاوێتە سەرێ، فەرخ نێوی هێناوە
هێزی لە خۆی دا، فەرخ کەوتە بەیاری، لینگە چەمکێکی دەرکێفیدا ماوە.
فەرخ خلاس بوو جوانۆکەی برد ئەو ئاوە
فەرخ دەڵێ: «لەشەتی مرادی پەڕیمەوە
جوانوولەم چوو بەزینەوە
بەپێ و چەکمە زێڕینەوە
خاتوون ئەستی لێرە نییە بیگێڕینەوە».
فەرخ دەرپێیەکی جاوی دەپێدا بوو. پێیەکیشی پێخواس بوو دەرپێیەکەی تەڕببوو، لە لاقانی دەهاڵا، پێوەیان ماندووبوو؛ فەرخ دەڵێ:
نە هەورازت لەبەرێ شەقاوێک
نە کۆڵت پێ بێ گەزە جاوێک
نەپووڵ قەرزداری هیچ کەس بێ قۆشە دراوێک».
فەرخ دەڵێ: لەوڕۆ بەدەر هیچ میوان بەشەتی داودییەی نەکا ئیختوبارێ
نەخۆی بە خانەخوێ دەزانێ، نە لە میوان و ڕێبواری دەکا پرسیارێ
لەوڕۆ بەدەر کەس بەشەتی داودییە نەکا متمانێ
نە پرسیارێ لە مێوانێ دەکا، نە خۆی بە خانەخۆی دەزانێ

ڕەبی شەتی داودییەی خوڵاگیرم بی ئەوێ ڕۆژێ خوڵا دەکا دیوانێ.
لەوڕۆ بەدەر هیچ میوان بەشەتی داودییەی نەکا ئیختوبارێ
نەخۆی بە خانەخۆی دەزانێ نە لە میوان و خانەخۆی دەکا پرسیارێ
ڕەبی لە ئاهی من سێ مانگەی بەهارێ نەبێ چۆڕی ئاوێت لێ نەیەتە خوارێ
چ بکەم ئەمن بەناچاری
بانگێکم وەبەر خولای، یەکم وەبەر جەباری».
فەرخۆڵە خەوی بەسەردا باری،
جوانووی فەرخی لە دەریا وەدەرکــەوت بەیەکجاری. بەفەرخۆڵەی نەدەزانی لەکوێیە، بۆیە گریا بەزاری، شەماڵ کە هات بێنی فەرخی بۆ جوانووی هێنا بەیەکجاری.
ئەگەر بێنی فەرخی کرد تەواوە
لینگی دا هەتا چوو لەسەر فەرخی ڕاوەستاوە
گوتی: «هەلی ناستێنم، خەمگینە، شاری داودییەی لێ بەجێ ماوە
خەمناکە لە خاتوون ئەستی هەڵبڕاوە».
دەستی بە لەوەڕێ کرد لەوێ ڕاوەستاوە
پیرەبارگینێک نەخۆشە چەند ساڵە دەرکراوە
لە چۆڵ و بیابانی لەوەڕاوە
ئەگەر جوانووی فەرخی کەوت بەچاوە
لەسەرڕا دێتەخوار بۆ شەتی داودییەی دەیگوت: «بزانم کێیە لەوێ ڕاوەستاوە؟»
جوانوولەی فەرخی ئەوی کەوت بەچاوە
گوتی: «ئینشاڵلا ئاوەدانییەکەم بەو گیاندەبەرە، وەچەنگ دەکەوێ تەواوە
ئەگەر پیرەبارگین هات لەولاوە
جوانوولە ئەگەر تەماشای کرد، گوتی: هەو خۆ ئەوهە گولە دەرکراوە
دەگەڵ جوانووی فەرخی دەستی کرد بەشەڕ و داوە
هەرچەند بەدەنی جوانووی فەرخییە هەمووی پچڕاوە
جوانوولکە سەرەسمێکی وە فەرخی هەڵداوە
فەرخ لە خەوێ هەڵستا تەماشای کرد هەموو بەدەنی جوانوولکەی پچڕاوە.
دەڵێ: «خودایە! حەقی من و شەتی داودییەی بکە تەواوە!
ئەمن چ بکەم دەگەڵ شەتی داودییەی شەتێکی بێ ئامانە

لە منی ئەستاند ئەو جوانوولە بەستەزمانە
بزانە چییان لێ کردووە ماسی و نەهەنگانە».
ئەگەر ئەو قسەی کرد تەواوە،
پیرەبارگین ئاخێکی ساردی هەڵکێشاوە
دەڵــێ: «خوڵایە! نەمزانــی فەرخۆڵەیە، وام لە جوانوولەی کــرد، کوێرم بێ هەرتک چاوە».
خەجاڵەت بوو، لە ڕاستەخۆی گەڕاوە،
فەرخ بانگ دەکا، دەڵێ: «بەهاران، گەینە بوهاران
ئەو پیرەبارگینی ئەگەر نایەنی دوو پاران
نەبوو، بێیە کن ئەمن بۆت بچمە بارەگای خوڵای وەک تکاکاران؟
ئەتوو بۆ لە جوانوولەی من دەپسێنی پۆست گۆشت و دەماران؟»
فەرخ بەپیرەبارگینی دەڵێ: «ئەگەر پیاو پیاوی بکوژێ
ئەگەر چووە ماڵێی نابێ دەگەڵی بەئینجەت بێ.
ئەگەر پیاو ژنێ لە پیاوی هەڵگرێ، ئەگەر چووە ماڵێی، دەبێ دەگەڵی بەسوفەت بێ
پیرەبارگین! هەڕۆ، بڕۆ؛ هەتا لە دنیایە زیندووی، ئەو دەردە لەسەر تایفەی ئەنگۆ هەر موسەللەت بێ»
فەرخ جوانۆکەی هێنا، سەر شەتی ڕای گرت.
لە فەرخی غەریبی ناتەواوە
هەر ئاوی هێنا، بەپشتی جوانۆکەیدا کراوە،
هەتا هەمووی دەشووشتن تەواوە.
خوڵا ڕەحمی دەگەڵ کرد هیچ برین لە بەدەنی جوانووی وی نەماوە.
سبحان ئەلەزی سەخەرە لەنا ماکونی سەخەرە لەنا موکرینینە[1].
فەرخ زینی خۆی دێنا دەیکرد لە جوانوولەی نەخشینە
دەیگوت: خوڵایە بۆ شاری شامێ لە کوێڕا بچینە؟
فەرخی ڕووی کرد بەولاوە
تەماشای کرد: جەنگەڵ و قامیشە ڕاوەستاوە

---

١ ـ لام وایە ئەو نایەتە بێ کە لە کاتی سواربووندا دەیخوێنن بۆ ئەوەی نەکەون: «سبحان الذی سخر لنا هذا و ما کنا له مقرنین». هێمن

جووتێک ڕەشیشەی دەخوێن، لەبەر ئەوان جوانوو ڕێی پێ سەرەدەر نەکراوە.

فەرخ بانگ دێڵێ: «ڕەشیشە، هۆی ڕەشیشە!

بۆچی لێرەو داناوە ساز و چەقەن و هەزار پیشە؟

ڕەشیشە ئەنگۆ ناردن

بوون بەجەردە، ڕێێ لە موسڵمان و ڕێبواری دەگرن

نایەڵن موسـڵمان بگاتە ئاوەدانییە، مەنزڵێکی پەیدا بکـەن، لە تینوان نەخنکێن، لە برسان نەمرن.

ڕەشیشەی زەنوێرە!

ئەو ساڵ حەوت ساڵە ڕێو دەبەست بردووە لێرە

ئەتوو نەتزانیوە ئەو ماشووقەی توو چاوێکی کوێرە؟»

ئەگەر ڕەشیشەی ئەو قسەی بیست تەواوە

دەیگوت: «وای! تیرێکی لێ دام جگەرم براوە

ئەوساڵ حەوت ساڵە ئەمن دەگەڵ ئەوەی ماڵم پێکەوە ناوە».

ڕەشیشـە نێرەکە نەیزانیبوو، مییەکەی چاوێکی کوێرە. هەڵسـتا چوو، تەماشای کرد بزانێ فەرخ ڕاست دەکا. ئەگەر چوو تەماشای کرد؛ وایە. بەتەپڵی سەریدا نووسا، چەرمی سەری دەنێو چاوان کرد.

مێیەکە زیزبوو لێی دا ڕۆیی. نێرەکەش وا ڕۆیی فەرخ ڕزگار بوو لە جەنگەڵەی.

گەییە ئاوەدانییانە

مەنزڵێکی دەگرت ئەو بەستەزمانە

دەیکردەوە نوێژی شێوانە

دەیگوت: «خوڵایە! چییان لێ هات ئەو ڕەشیشە فەقیرانە!

مێیەکە بریندارە نایەتە سەری لوقمانە

ئەرەستووش دیارنییە لەو مەکانە

وەبەری خۆیان گرت چۆڵ و بیابانە».

فەرخ تەمەنای دەکرد لە بینای چاوانە:

خوڵایە! ڕەحمێکی بکەی بەو بەستەزمانانە

خەتای من دەگرن زۆر خەجاڵەت بووم لەو ڕەشیشانە

ڕەبی ڕووناکایی بێتە بەر چاوانە».

سەری نەخشین ببێ بۆ خۆی ببێتەوە جوانە».
ئەگەر فەرخ بۆوان پاڕاوە
لەکن خولای دوعای قبووڵ کراوە
سبحەینێ نێرەکە، لە مێیەکەی گەڕاوە
گەیشتێ لێی کرد سەڵاوە
مێیەکە زیز بوو جوابی نەداوە
دەیگوت: «دوێنێ بۆچت وا لێ کردم خراپم لێ قەوماوە».
نیرەکە گوتی: تەخسیری تۆیە وا قەوماوە
حەوت ساڵە حەڵاڵی منی، چاوت کوێرە بەمنت نیشان نەداوە
بۆ خاتری فەرخۆڵەی ئەوا لە تووم کرد سەڵاوە».
لێی قبووڵ کرد گوتی: «بەخێرێی سەر ئەو چاوە».
ماوەتەوە بۆ فەرخی بڕواتەوە بەولاوە.
ئەوێ ڕۆژێ لە ئاوەدانییەی مەحتەل ماوە
هەتا بەخێر و بەسەلامەت جوانۆکەی حەساوە
سبحەینێ بەیانی داوە
فەرخۆڵە لە خولای دەپاڕاوە
دەیگوت: «ئەمن لە چۆڵ و بیابانێم ئەستێی فەقیر چیی لێ قەوماوە؟»
خاڵی دە شاری شامێ خەونی پێوە دییە
دەڵێن: «فەرخۆڵە دێتە ئێرە. حەوت ساڵان دەبێتە میری شامێ لەوی زیاتر هیچ کەس نییە».
ئەگەر خاڵی ئەو قسەی دەبیست بەیەکجارەکییە
هەڵدەستا، دەگەڕا بەهەرچەندی کەیخواد و ڕدێن سپیی شارییە:
«ئەرێ ئەنگۆ چ میری دیو قبووڵن، یا قبووڵ نییە؟»
کەیخواد جوابی وییان داوە بەسەحییە:
«سەد میری دی بێ لە توو زیاتر کەسمان قبووڵ نییە».
سبحەینێ بەیانی داوە
میر هەڵی گرت کەشکۆڵێک، دار عاسایەکی تەواوە.

هەرچەندی مەنزڵی ساحب مەنسەبان بوو، هەمووی گەڕاوە
دەیانگوت: «میر خێرە وات لێ قەوماوە».
دەیگوت: «خوڵا خێران کا، دەڵێن: میرێک دێ لەولاوە».
دەیانگوت: «هیچ میرمان قبووڵ نین، ئەو کەشکۆڵ و عەسایەی بگێڕەوە بەدواوە».
میر بەقسەی خەڵکی دەگەڕاوە،
پێنسەد زێڕ بۆ مەولوودی پێغەمبەری تەعین کراوە
کە میری شامێ بەفەقیر و زەلیلانی داوە.
ئەگەر ئەو لەوێ بەرقەرار کراوە
جوانوولەی فەرخیش لەوێ دەحەساوە
برینەکانی پاک چاکبوونەوە، تووکیان دەهێناوە.
دەیهێنا زینی دەکرد، لە خوڵاوەندی عالەمیان دەپاڕاوە:
«ئەمن بۆ شـــاری شـــامێ دەچم بۆ ماڵە خاڵم، خاتوون ئەســـتی قەلەندەر چیی لێ قەوماوە؟»
ئەگەر ڕێی وەبەر خۆی گرت، بۆ شاری شامێ هاتە خوارە
گەرمای هاوینێ لەوێ دەیکرد کارە،
لە خۆی و لە جوانوولەی بڕا ئیختیارە
دەیگوت: «یا ڕەبی عالەمێ! هاوارە!
بیابانە واحیدەلقەندەهارە».
هەرچەندی کەوی کوێستانێ بوو، هەمووی بۆ خزمەتی فەرخی دەهاتە خوارە
ئەوبەر ئەوبەر تێک دەۆەڕین دەیانکردەوە هاوارە.
جوانووی فەرخی ڕێی دەرنەدەکرد، لەبەر ئەوان لە عەرزی نەیدەکرد کارە
فەرخ دەڵێ: «بەهارە چ لە ڕەون!
موتریبی دە کێوانم کەون
ئەویش دێن، ڕەپێش جوانوولەی فەرخی دەکەون.
بەهارم چ لە ڕەو دین!
قەرەچی دە کوێستانیم کەو دین
کەوی کوێستانێ، گەلێک نادرن

ڕەبی، شەوارەو لێ دانێن بەداوو بگرن
دە قەفەسی دۆمانو بکەن، دێو دێو پی بگەڕێن، قڕانو هەڵگرن
قەت کێردی قەسابانو لەسەر گەردنێ هەڵنەگرن
بۆچی ڕێ لە جوانووی فەرخی بێ دایک و باب دەگرن؟
نایەڵن بگەنە ئاوەدانییێکی، بڵا لە تینوان نەخنکێن، لە برسان نەمرن
یا ڕەبی هەر باڵێک بڕۆن، دە بەفرێ بکەون، ڕاوکەر بووگرن».
ئەگەر فەرخ ئەو قسەی کرد و گەڕاوە
هەرچی کەو بوو لە ڕاستەخۆی گەڕاوە.
فەرخ لێی دەخوڕی بۆ شاری شامێی ئاژواوە.
فەرخ دەگریا لەو چۆڵەی بەستەزمانە
دەیگوت: «هیچ کەس نییە، دەگەڵی بکەم قسانە
دەچم لە ماڵە خاڵم دەبم میوانە.
خاڵم لەکنم نامکا بەخودانە
دەبمە دژمن و بێگانە
نازانم ڕێی شاری شامێی ئی چەند شەو و ڕۆژانە».
کێ بوو لە فەرخی نازدارە
دەگەڵ جوانۆکەی دەهاتە خوارە
تووشی دەبوون کاروانی و ڕێبوارە
لە ڕێی شاری شامێی دەکرد پرسیارە.
دەیانگوت: «مندالی فەقیر، بەستەزمانە!
کوا شاری شامێ لێرەکانە؟
لە کوێ دەردەچی بەو جوانووەیەوە؛ ئەوەە نابڕی مەنزڵانە».
فەرخ دەیگوت: «دەیگەمێ بەئیزنی خولا و ڕەسوولانە».
خاڵی وی لە شاری شامێ خەبەری بیستییە
دە خەوێدا پێیان گوتییە
دەڵێ: «نابێ هیچ کەس لەو شارەی ڕاگیرێ بەمیوانییە
هەتا ساڵێکی دی لەو شارەی میوانم قبووڵ نییە».

میر قەرار و مەداری دانا لە شاری.
لەکنە خۆی فەرخ دێتە ماڵە خاڵی بەخەمخواری
فەرخ غەمگین بوو ئەوێ ڕۆژێ؛ دەڵی: «چ بکەم، لە من غەریبێ
خاتوون ئەستی بەجێ ماوە فرمێسکی لە چاوی دێ بۆ خۆمی بۆم دەگرێی بەزاری.
چ بکەم نە بەپیادەیی دەگەمێ نە بە سواری
لە کۆڵاناندا دەمرێ بەهەژاری».
فەرخ ڕاست بۆ شامێ دەهاتە خوارە
دەیگوت: «جوانوولە! بڕۆ، ئەو فکرانە نایەن بەکارە
بچینە شاری شامێ بگرین قەرارە
بزانین، کەنگێ ڕەحمەتمان لە بارەگای خولای بۆ دێتە خوارە».
میری شامێ دەڵێ: «چ بکەم، هەڵگرن جێی خەمێ؟
بچن خەڵکی شامێم هەمووم بۆ بنووسن، پاکی مووچە و مواجبی دەدەمێ
هەموو کەس بەڕێ و شوێنی خۆی بزانی
لە دەوڵەتی من کەم نابێ بەئیلتیفاتی سوڵتانی
ئەمما قایل نیم، هیچ کەس، کەس ڕابگرێ بەمیوانی.
ئەمیندار وەدەرکەوتن تەواوە
شاری شامێ هەموو محەلەی نووسراوە
میرزایان دانا نێوی عالەمانیش بکەن تەواوە
هەموو عالەمیان لە قەڵەم داوە
میر دەڵێ: «سبحەینێ ڕاوە».
پێنسەد سواریان کرد تەواوە
پاک تاجی و توولەی دە ڕستەی کراوە.
وەدووی ڕاوی ئاهووی دەکەوتن، هەموو لێک بوونەوە بڵاوە.
تەماشایان کرد، تاقە سوارێک هات لەولاوە
جوانۆلەیەکی قولەی پێیە، منداڵێکی نابالقی سوار بووە، دەڵێی نەخشەکێشراوە.
خەبەریان بۆ میری شامێ هێناوە،
گوتی: «بێنن، بیبینم بەهەرتک چاوە».




دەچوونە کن چەپەر و ئێلچییە

دەڵێــن: «میر تەڵەبت دەکا». دەڵێ: «ئەمن غەریبەی شــارانم، میر حاجەتی بەمن نییە؛

ئەمن دەچمە شاری شامێ بە میوانییە».

دەڵێن: «هەڵســتە بچینە کن، کورە. میری شــامێ زۆر ماقووڵە». دەڵێ: «لەوەش ماقووڵتر بێ، ئەمن ئیحتیاجیم بەوی نییە».

ئەگەر دەگەڵ فەرخیان دەرکرد گوفتوگۆ

هاتنەوە کن میری، دەڵێن: «میر هەرچەندی دەکەین، ئەو منداڵە نایەتە کن ئەتۆ».

میر دەڵێ: «حوکمێی لێ بکەن، بڵا: مەیە شاری شامێ، بۆ لایەکی دی برۆ»

فەرەخ گوتی: «ئەمن غەریبەی شارانم

دێمە شاری، لە ماڵەیەکی دی میوانم،

میر دەترسێ، دەڵێ دێ دەخوا ئەو نانم!».

ئەو قسانەیان بۆ میری عەرز کرد و گێڕاوە

جاڕیان ڕاکێشا، هەموو لەشکر خڕکراوە

ئەوبەر ئەوبەری ڕێیە کووچەی سەربازی ڕاگیراوە،

فەرخ هات لەولاوە،

بەهەردووک دەستانی لەو عالەمەی کرد سڵاوە

حوکمی میری بوو، کەس جوابی نەداوە.

فەرخ زۆری بە زگ خۆی سووتا بەستەزمانە

دەڵێ: «خاڵەمە خۆی لێ کردووم بە بێگانە».

دووبارە سڵاوی کردەوە لە هەمووانە

بۆخۆی دەیگوت: «عەلەیکەسەلام، گەلی غەیبییانە»

فەرخ سڵاوی خۆی ئەستاندەوە تەواوە.

حوکمی میری بوو، ئەویش بە خۆی و لەشکری بۆ ماڵێ گەڕاوە.

فەرخ سەری جڵەوی خۆی بەرداوە

ئەو کووچە و کۆڵان گەڕاوە.

تەکێیەکی موشایخان بوو چوو، لەوێندەرێ ڕاوەستاوە

جڵەویان دەگرت و دەیانکرد پیاوە».




جارچی میری ڕەشـــاری دەکـــەوت، دەیگوت: «هەرچی ئەوهەی ڕاگـــرێ، بزانە تالآن کراوە».

سۆراخیان کرد جارچییان، خەبەریان بۆ میری هێناوە

گوتیان: «قوربان ئەوا لە تەکیەی موشایخان بووە پیاوە

ئەمە قەوەتمان پێ نەشکا دەری کەین، مەسکەنی شێخان گەلێک عالی و تەواوە».

میر گوتی: «بۆم دانێن ئەو کەوشانە

ئەمن حوکمم کردووە کەس ڕانەگرێ ئەو میوانە

بچمە تەکیەی شێخان دەگەڵیان بکەم دوو قسانە».

میر هات لەولاوە،

گەییە دیوانی موشایخان، لێی کردن سەلاوە.

شێخان فەرموویان: «میرا بەخێرێیەوە لەو ڕاوە

میرا ئەوڕۆ چت دی، چەند ئاسکت هێناوە؟»

دەڵێ: «ڕاوی ئەوڕۆم، یا شێخ نەبوو تەواوە».

قەننەیان بۆ میری هێنا قەننێکی کێشاوە.

میر فەرمووی: «ئەو کوڕە چکۆڵە کێیە میوانە، هاتووە لەولاوە»

شیخان فەرموویان: «میر ئەتوو چت بەسەری ئەو منداڵەیەوە داوە؟»

میر فەرمووی: «ئەی فرزەندەی میوانە!

ئەگەر لێت بپرسن مەسەلانە

دەفامی جواب بدەیەوە قسانە؟»

ئەگەر میر ئەو قسەی دەکرد تەواوە.

فەرخۆڵە بۆخۆی جوابی دەداوە

دەیگوت: «فرسەتە، بەخولای ڕاوەستاوە».

میر فەرمووی: «بەنۆکەرانە

بچن ئەحمەدەکوێر هەیە، بیبەننە ئێرەکانە

دا دەگەڵ ئەو مناڵەی بکا دوو قسانە

«ئەگەر نەیزانێ جوابی بداتەوە، دەری دەکەم لێرەکانە».

ئەحمەدەکوێریان هێنا لەولاوە

دەیانگوت: «ئەو کوڕە بدوێنە، بزانە منداڵێکی زەریفە، دەزانێ بکا قسانە».

ئەحمەدەکوێر دەڵێ: «بەوەی کەم لە ژووری سەرییە

جانەوەرێک پەیدا دەبییە

بۆ گەدا و پادشا فەرقی نییە

ئەوی دەسووتێنن بە ئاورییە».

فەرخ دەڵێ: «ئەی ئەحمەدەکوێری نادانە!

لەنگۆ وایە میوان حەیوانە.

ئەمن ڕۆنیشتووم لە مەجلیسی ئەو شێخانە

بۆ من عەیبە، بکەم ئەو قسانە

ئەوی لە بەدەنی ئینسانی دەبێ ئەوا بەڕەزای بینای چاوانە

لەکن ئەوی نییە فەرقی پادشا و گەدایانە

ئەبلە! ئەوە ئەسپێیە، دەیکوژن بەدەستانە».

ئەحمەدی کوێر گوتی: «پتوو لە من! هەتیوێکی خوێڕی لەولاڕا دێ میری شەمێ دەبێ ئەمـــن بێ ئابروو بکا». ئەحمەدی کوێر زیز بوو، لێی دا ڕۆیی. میر فەرمووی: «بچن مەلا حەسەنی بێنن؛ زۆری بدەنێ بێ، بەفڕان ئەوەم بۆ دەربکا».

مەلا حەســـەن هات، جێیان پێ نیشـــان دا، ڕۆنیشت. بەخێرهاتنی ئەو کوڕە چکۆڵەی کرد.

مەلا حەسەن دەڵێ: «ڕۆڵە گیانە!

شتێک هەیە بێ زەبانە

بەعەرزی دەبێ گوزەرانە

بەدەستی ئی عەبدانە

ئەوی دەبێ بەچراخانە

پشکۆژە دەبێ لەو مەکانە

هەر دەڵێی گوڵی نیسانە

شایان پێ دەبێ ئەوانە

ڕەزای بینایی چاوانە

بەئەنعام دەیبەن بۆ پادشایانە

ڕێی ئەنعامێ دەدەن ئەوانە».




فەرخ دەڵێ: «مەلا حەسەن هاتووی لەوێوە

منداڵێکی غەریبم، مەم بزێوە

ئەو سەر و سمێڵەت دە کونی کەرێوە

ئەوە نازانی شەمامەیە سوورَ دەبێ بە برکێوە».

مەلا حەسەن دەستی دا عەبای خۆی، ڕۆیی. میر، مەلا حەسەنی گێڕاوە. مەلا حەسەن بـەدزی گوتـی: «قوربان واناب‌ێ بچن دیزێکی پڕ بکەن لـە مێوژ و گوێز و خورما و گەزۆ بێنن لێرەی دانێن، نانیش دانێن بۆ مەجلیسـێ. ئەگەر زانی چی تێدایە، ئەوە یا شێخە یا شەیتانە. ئەگەر نەیزانی بۆ بابی ئاقڵ دەکەم. وەدەری دەنێم لەو شارەی». دیزێکی وایان هێنا لە مەجلیسێیان دانا، نانیشیان هێنا، لە مەجلیسێیان دانا؛ هەمووی مەحتەل ما

کەس نانی نەخوارد. مەلا حەسەن گوتی: «نانخواردن بۆ نییە؟» فەرخ گوتی:

ئەمن غەریبم ئەگەر قسان بکەم شوورەیییە.

مەلا حەسەن پاپەی لەمن گرتییە

لە قەستی دەپرسێ بۆ ناخۆن نانییە؟

ئەوە شەڕی ئەوەیەتی لێم بپرسێ، ئەوە چییە؟

ئەگەر شێخان پێیان ناخۆش نەبێ، جوابی ئەوەی دەدەمەوە بەسەحییە».

شێخان مەرەخەستیان کرد فەرخی داودییە.

فەرخ دەڵێ: «ئەگەر پێنجین ئەگەر شەشین

ئەسپاردەی بیلالی عەبەشین

هەموومان غولامی دیزەی ڕەشێن

وەرن مێوژ و گوێزان لێک وەبەشین.

بیبەشینەوە بەرەوانی.

مەلا حەسەن غەزەبی میوانی

ئینجا تەرەدەس بخۆن نانی

میر دەگەڵ مەلای خۆی زانە».

میر و مەلا حەسەن هەڵستان، لێیان دا ڕۆین.

میرگوتی: «مەلا حەسەن وەرە بچینە ئێرانە

بزانین، مەسڵەعەتمان چلۆن دەبێ دەگەڵ ئەو میوان و شێخانە».

چوون ڕۆنیشتن دوو بەدووە

هەزار تەگبیریان کردووە
هیچ فایدەی بۆ وان نەبووە.
میر و مەلا گوتیان: «ئەمە چ بکەین لە دنیایە؟
ئەو شێخ و میوانە چارەیان نایە».
شاری شامێ سێ ڕۆژان نەیبوو هیچ ئاغایە.
شلووخ بوو شامی گرانە
لێی پەیدا بوو لۆتیخانە
شەڕیان کەوتە سەر ژنانە
نیوەیان بوون بەقاوەخانە
کەیخودا و ڕدێنداری وانە
ڕوویان کردە دیوانی شێخانە:
«قوربان ئاخر شامێ بوو وێرانە
بەبێ پادشا نابێ گوزەرانە
ئەدی بۆ دیار نییە میری ئێرانە؟
شێخ ناردیانە کن میرییە:
«بۆ بێ حوکمە جیهەتی چییە؟»
میر فەرمووی: «بابە! ئەمن ئیختیارم نییە،
پەیدا بکەن میرێکی دییە».
خەبەر هاتەوە بۆ شێخییە.
شێخ فەرمووی: «ئەمە مەسڵەحەتمان چییە؟»
وەهای گوت: «یەکی دییە
ئەوە شێخێلی بێ قەیدییە:
لەوی مەکەن گلەییە.
ئەوە دوو مانگە میر نییە
پەیدا بکەن یەکی دییە
خەبەر بنێرینە سوڵتانییە
بزانن فەرمایشی وی چییە».

شیخ قسەیان کرد تەواوە
بانگی نیوەڕۆی داوە
فەرخ لەوێ هەڵستاوە
گوتی: «بزانم جوانۆکەم ئاوڕاوە».
تێلغوراف بۆ سوڵتانی کراوە.
سوڵتان فەرمووی: «میری خۆیان لەوێیە تەواوە».
خەبەر دە شێخان گەڕاوە
چراخانیان بۆ رۆناوە.
سبحەینێ کە ڕۆژ کراوە
مەجلیسی تاقیقەی گیراوە
بازی یەقینیان هێناوە
هەردووک چاوی وی بەستراوە
هەڵیان ئاویت، ڕاوەستاوە
لە هەوای لەنگەر بەستراوە
سەر بەرەژێر هات گەڕاوە
ئیکلامی فەرخی کێشاوە
شێخان قۆڵیان بۆ کێشاوە
قەند و نەباتیان هێناوە
شیرنی ئی میری خوراوە
تەختی حەقیان بۆ هێناوە.
شێخی گەورە هات لەولاوە
گوتی: «سەلام عەلێک فرزەندە لاوە!
ئەلحەملای چرات هەڵکراوە».
قۆڵی فەرخی گرت لەولاوە
لە جێگای خۆی هەڵستاوە
لەسەر تەختێیان ڕۆناوە
بانگی حەقیان بۆ لێ داوە

تانج و تۆماریان داناوە.
ئەوا جێی خاڵی گیراوە.
تا حەوت ساڵان ڕاوەستاوە
میرە و بەیەقین ڕۆنراوە.
فەرخ دەڵێ: «خولایە! چم لێ قەوماوە؟
ئەمن میرێتییێ چ لێ بکەم بەبێ خاتوون ئەستیییێی بەڵەک چاوە؟
خۆ مە داخلی ناکەم ئەو دونیایەم بۆ نابێ تەواوە.
ئەگەر دنیاش تەواو نەبێ فایدەی چییە
ئێستا خاڵم لێ دەکا گلەییە
خولا دەزانێ خەتای من نییە.
ئەمن میرایەتی چ لێ بکەم؛ گزیریم پێ خۆشترە بچمەوە شاری داودییە».
کە حەوت ساڵە میرێتی فەرخی بوو تەواوە،
گوتی: «ئەو دنیایە چ لێ بکەم، بۆ کەس نەماوە؟
لازمە قاقەزێکی بنێرم بەولاوە.
بنووسم قاقەزێکی بێ کەسییە
بنێرمە خزمەت مام غەڵیفەی شاری داودییە
دەشقەمێ بۆ منی بنێرێتە خاتوون ئەستییە».
فەرخ ڕۆدەنیشت قاقەزێکی کرد تەواوە
چ بکەم ئێلچییەکم ببێ بینێرم واوە؟
کاری من بەو عەبدانە نابێ تەواوە
خولایە دەفریام بێی لە هەموو کاران
بچمە قەراخی شاری شامێ بۆ پرسیاران
هەمووم کەوتۆتە کن باڵداران».
لە شاری شامێ دەچوو بەولاوە
تەماشا دەکا دەستێک سی دێن واوە.
فەرخ بانگ دێلی: «ئەی سییە! ئەی سییەی قۆرقۆڕەکەرە!
لە گەرمێنێ هاتووی سەفەری کوێستانێت لەبەرە

ئەمنیش فەرخی داودییەم لەوێ دەربەدەرە
ئەمن غەریبم لەوانی قەلەندەرە
وەرە ئەو قاقەزەم تا شاری داودییە لە بۆ بەرە».
سێ دەڵێ: «فەرخۆڵە! ئەوە َلە چەنگ من نایێ
گەلێکم دز و درۆزن هەن لەسەر ڕێگایێ
خەجاڵەت دەمێنم چم پێ نایێ».
فەرخ دەڵێ: «سی! ئەگەر حەزێ دەکا پیاو بێ پەنهان بێ
هەر لە حەوت ساڵان یاخوا! ساڵێکو قڕان بێ».
فەرخ لەوێندەرێ بەجێ دەما، بەدڵ شکستەیییە،
ئەگەر دەیڕوانی دەستێک قورینگ دەهاتن لەلایەکی دییە.
بانگ دەکا: «ئەی قورینگە قورینگەی نەوجوانە!
وەرە خوارێ گەلێکم بەتوو هەیە فەرمانە
ئەو قاقەزەم بۆ بەرە شاری داودییەی گەورە و گرانە».
قورینگ دەڵێ: «فەرخۆڵە! ئەمن لە بڵندان ئەتوو لە نەوییان»
فەرخ دەڵێ: «لە بڵندان، وەرە نەوییان، لە نەوییان وەرە زەوییان
لە زەوییان وەرە کن فەرخی مامادییان».
قورینگ دەهاتە خوارێ تەواوە
فەرخۆڵە بەپیرییەوە چوو دەستی دەستۆی کراوە
قاقەزەکەی هەڵگرت و لەبن باڵی موشاممای داوە.
قورینگ دەڵێ: «ئەمن بەقسەی توو دەچم ئەگەر سەر نەیەنمەوە دواوە
گەلێکم جەردە لەسەر ڕێ ڕاوەستاوە».
فەرخ دەڵێ: «هەڵستە، لەسەر سەرم لەنگەرێ بگرە، نسحەتم بکەم تەواوە».
قورینگ هەڵفڕی لەسەر فەرخی ڕاوەستاوە.
فەرخ بانگ دێلی: قورینگێ، سەربەخۆیە!
ئەتوو ئێلچی ئەمنی، کۆبەکۆیە
ئەمن دایم ڕوحم لەکن ئەتۆیە
ئەگەر دەڕۆی لە ڕێیەت دەگاتێ هەلۆیە

پیاوێکی ناچیزەیە، ترۆیە
هەتا دەتوانی، ملان کۆم بکەی لەبەری بڕۆیە
ئەگەر لەوێندەرێ ڕەدبووی بەخاترە
لەولاتریش هەن ڕێگرە
ئەویش مەسکەنی سەقرە
هەتا دەتوانی لەبەری بڕۆ، دەسەری هەڵبڕە
ئەگەر بەخێر لەوێ ڕادەبری
بازە ڕێت لێ دەگرێ
بازێکی چەنگ بەخوێنە
ئیکلامی لێ بکێشە ئامانی لەبەربێنە
دەعبایەکی ساحب ڕازە
نەجیم و گەلێک مومتازە
لەوێندەرێ ئەو دەتکا سەرفرازە
بڕۆ لەوێش دامەمێنە
لەسەر ڕێت جەردەیە، ئەویش مەسکەنی شەهێنە
ئەستۆ کە چ بکە ئامانێی لەبەر بێنە
ئەگەر بەخێر جا لەوێ هەڵدەبری
شەوت بەسەردا دێ بەفر و سەرما ڕێت لێ دەگری
لەوێندەرێ خۆت باوێ گۆلی کا بەکری
ئەو خەواسێکی چاکە بەتوو ڕێی دەگری
دەتباتە ماڵە خۆی، زۆرت قەدر دەگری
سبەینێ بۆ چیشتانێ لە شەتی مرادێ ئینشاڵلا لەکن خاتوون ئەستی ناز و نازدارێ داوری».

کێ بوو لە فەرخی تەواوە
گەلێک لەوی لەبۆ خۆی گریاوە
قورینگ شەقزنی لە باڵی خۆی دا، هەڵستاوە
قورینگ ڕۆیی، فەرخ بەجێ ماوە.

قورینگ لە هەموو تەنگانان خەلاس بوو هەتا شەوێ لە گۆلی کا بەکری دەکرد سەلاوە
ئەو تۆڕی بەسەر ئاوێدا داوە
بۆ مالێی برد گەڕاوە بەدواوە.
ئەگەر زانی ئێلچی فەرخۆلەیە، هەتا سبحەینێ ئەستۆ کە چ لە پێشی ڕاوەستاوە
سبحەینێ مەرەخەستی دەکرد؛ شەقزنی لە بالی خۆی داوە.
بۆ هەندەهەندی چێشتانێ لەشەتی داودییەی لە خاتوون ئەستی و ناز و نازدارێی کرد سەلاوە.
دەیانگوت: «خولاکەی! ئەوە دەعبا بریندارى کردووە، یان گولله یان لێ داوە».
نازدار بۆی چوو هەرچەندی کردی بۆی نەگیراوە
نازێ بۆی چوو هەلات؛ دەتگوت شێتە حەمایەت نەکراوە
خاتوون ئەستی بۆی چوو، بالی خۆی کرد بلاوە
خاتوون ئەستی بە ئامیزێی دەیگرت دەیهێناوە.
دەیگوت: «خوشکێ! بلابیگەڕێین بزانین کوێی بریندار کراوە».
بالیان هەلدەهێنا، قاقەزێکی لێ موشەمما دراوە.
هەرسێ خوشکەکان جارێکیان لە بانگێ داوە
لەوان وابوو مردووە ئەوهە قاسیدە جوابی هێناوە
هەلیان گرت؛ بۆ کن مام غەلیفەی چوون تەواوە.
مام غەلیفەی دەلێ: «ڕۆلە ئەوە چییە؟».
دەلێ: «بابە ئەوە قورینگە؛ قاقەزی فەرخۆلەی هێناوە».
مام غەلیفە قاقەزەکەی خوێندەوە؛ گوتی: «کارێکی گەورە قەوماوە
«ئەو قاسیدە سەرئەفراز بکەن، بلا بڕوا بەولاوە
بزانین ئەو مەسلەحەتە بەکێ دەبێ تەواوە».
مام غەلیفە پیاوەێکی زۆرزانی
ناردی لەدوو هەموو کوڕەکانی
گوتی: «ڕۆلە! ئەوە قاقەزی فەرخۆلەیە خۆوزانی».
ئەگەر خوێندیەوە تەواوە
گەلێک بەزەلیلی نووسراوە

کوڕەکان گوتیان: «بابە ئەمە چ بکەین لەو کاری ناتەواوە؟
خۆ ئەوە لە شێخاڵە کەچەڵی مارەکراوە.
بەخوڵای! نایدا بۆ شاری شامێ خاتوون ئەستێ بنێرین بەولاوە».
مام غەڵیفە دەڵێ: «بچن شێخاڵم بۆ بێنن» شێخاڵیان هێنا لەولاوە
ئیکلامی مام غەڵیفەی کێشاوە.
مام غەڵیفە گوتی: «مام شێخە! کارێکی خراپ قەوماوە
دەبێ دەگەڵ کوڕەکان بیکەین تەواوە
لە سوێیان هەموو جەرگم سووتاوە
بە هەمووان تەگبیرێکم بۆ بکەن، فەرخۆڵە لە وڵاتی غەریبیێ بەجێ ماوە».
شێخاڵ گوتی: «ئەمن نازانم ئەو قسە چییە؟
ئەنگۆ هەڵبەت بەمن دەڵێن: بنێرە شاری شامێ خاتوون ئەستییە
وەک تێ دەفکرم ئەو کارە هەی سەروپای نییە؟
ئەمن ژنی خۆم بۆ بنێرەمە شامێ بۆ خەڵقییە؟
قەت ئەوهە ڕەزایە بۆ دینییە.
دەڵێن ئەتوو ژنی خۆت بنێرە بۆ یەکی دییە.
وەڵڵاهی! ئەمن دەچمە کن سوڵتانی ئەستەمبوولێ دەبم بە عەرزچییە»
شێخاڵ هەڵستا ڕۆیی بەزیزییە،
مام غەڵیفە گوتی: کوڕینە! ئەمە مەسڵەحەتمان چییە؟
بۆمە عەیبە فەرخۆڵە بمرێ لە غەریبییە
کوڕەکان گوتیان: «دایکمان بێ بچینەوە کن شێخاڵییە».
دایک و کوڕ ڕێک کەوتن بەیەکجارەکییە
چوونە نێو مەڕی داوێنی شێخاڵیان گرتییە
گوتیان: «دەبێ خاتوون ئەستی بەمە بدەی بەزامنییە».
گوتی: «ئەگەر خاتوون ئەستێ بنێرنە شاری شامێ، ئەگەر نەیداتەوە چارەم چییە؟»
بوونە زامن ئەو کوڕانە
سوێندیان خواردبوو بە قورعانە
«شێخاڵ برا گەورەی هەموانە




خاتوون ئەستێت بۆ دێنینەوە ئێرەکانە».
دایکی بۆی خوارد سوێندی دییە:
«ترست نەبێ نەبەدییە
فەرخ ئاشقی ئیللاهییە
ئەو کارەی ئەتوو دەڵێی نییە
بۆت دەینمەوە ئێرە خاتوون ئەستییە».
ئەگەر ئەو قسانەی کرد تەواوە
شێخاڵیان هێنا لەولاوە
دەتگوت ئێخسیرە گیراوە
مەلایان هێنا تەواوە
قورعانیان هێنان لەولاوە
چل شەوانیان قەرار داناوە
خاتوون ئەستییان قورعان داوە
تەدارەکی بۆ گیراوە
لەشکری بۆ دروس کراوە
سەربازی لەسان دراوە
پاک ئاڵای بۆ هەڵکراوە
لەسەر سەحاتێ ڕاوەستاوە
ئەگەر شەیپووریان کێشاوە
گوتی: «دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا».
لە بۆ شامێ بەڕێ کراوە.
عەزرەتی غەوس هات لەولاوە
ئەوقاسیدێکی تەواوە
تەنگەی عەزری بۆ کێشراوە
چلۆن بەچەپەری ئاژواوە
حەوت ڕۆژی کرد تەواوە
چەندی سەرباز بەجێ ماوە

سوارەی شکستی هێناوە.
ڕۆژێکی هاتە ڕۆژئاوا
لە دەورەی شامێ هەڵی داوە
خەبەر بە فەرخی دراوە
فەرخ چەندی مزگێنی دا: «چرای دنیایەم هەڵکراوە».
فەرخ ئەگەر وا دەزانێ
بۆ خوڵای دەبژێرێ شوکرانێ
قۆشەنی درا لە سانێ
لەوێ دووربەدوور دەڕوانێ
دەڵێ: «ئەدی خاتوون ئەستی کوانێ؟»
خاتوون ئەستیی بەڵەک چاوە
تەدارەکی بۆ گیراوە
نەیزانی ئەوە شاری شامێیە لەوێی هەڵداوە
بەڵەدی هێنان لەولاوە
دەیگوت: «سبحەینێ دەگەمە شامێ ڕۆژئاوا؟»
هەموو سەدەقیان لێ داوە
ئەو مەخلووقە پاک لێی گۆڕاوە
هەتا نوێژی شێوان تەواوە
بانگی خەوتنان لێ دراوە
فەرخ بۆ دز چوو بەولاوە
دەنێو قۆشەنێ گەڕاوە.
هەمووی خەستەیە، یەک هەڵنەستاوە
بۆ خاتوون ئەستی هات واوە
لە چادرێی دەکرد سەلاوە
هیچ کەسیش جوابی نەداوە
دەستی دا لێفەی، هەڵداوە
کێشکچی هاتووە لەولاوە

توند توند ئەو دزە گیراوە
خاتوون ئەستی لە خەوێ هەڵستاوە
گوتی: «ئەوە چ بووە چ قەوماوە؟»
گوتیان: «ئەستێ بەڵەک چاوە
دزێکی حیزباب هات لەولاوە
قولینچکی لێفەی تووی هەڵداوە».
خاتوون ئەستی: دەچریکێنی
قۆشەنی پاک وەخەبەر دێنی
بانگ دەکا فەڕاشان هەڵدەستێنی
دەڵێ: «دەبێ هێندەی لێ دەدن تا دەیمرێنی».
هێندیان لێ دا چارەی نییە
زمانی شکا لە بێ کەسییە
چونکە دزە تکای نییە
هەولێ دەدەن زنجیر نییە
کەزی ئەستۆی پچڕی ئەستییە
دەست و پێیان توند بەستییە.
فەرخ دەڵێ: «ئەوا دەمرم لە خۆشییە
برا ئەو ئێلچییە کوێندەرییە؟
هاتووە لەشاری داودییە
ئێلچی توو شامێت بۆچییە؟
ئەگەر وای زانی خاتوون ئەستییە
گوتی: «هەرتک چاوەکەم کوێر بییە
خۆ ئەو فەرخی داودییە
ئەمن هاتوومە کن ئەوییە
ئێستا بووە بەدزی خەیبەرییە
دەست و پێیان کردەوە بەیەکجارەکییە.
بیست و نۆ ڕۆژان پێکەوە ڕۆنیشتن؛ سوال و جواب نییە».

گوتی: «سوێندم خواردووە بەیەکجارەکییە
ئەگەر نەچمەوە کەلامولللا دەمگرییە
خۆلا دەمکوژێ چارەم نییە».
فەرخۆڵە گەلێک دەگرییە
سبحەینێ تەدارەکیان گرتییە
لە سانیان دا تفەنگچییە
هەمووی سواری عەرەبییە
فەرخۆڵە قوڕی وەسەرییە
شامێ جێی غەریبان نییە
بەرێی کرد خاتوون ئەستی
ئەویش لەدووی بوو ئێلچییە
کە چل شەو تەواو دەبییە
نەگەییە جێ ئەستییە
شێخاڵ چاوەڕێی ئی وییە
لە خەسووی کرد گلەییە:
«ئەدی ئەستی بۆچ دیار نییە؟»
بەسەریدا هات نەخۆشییە
هاتەوە شاری داودییە
هێند نەخۆش بوو، حاڵی نییە
حەوتوویێکی زوبان نییە
میوانی خولای هاتن لە غەیبییە
ڕوحیان وەرگرتبوو لەوییە
بۆتە چەمبەر و گرییە
دایکی چوو سەر خمییە
چەند مەلا و سۆفی و قازییە
هەڵیان گرتبوو خاتوون ئەستییە
بردیان لەبۆ قەبرییە

ته‌سلیمیان کرد به‌خاکییه
غه‌یره‌ز خولای هیچ که‌س نییه
کار به خولای ده‌بێ ته‌واوه
مه‌خلووق بۆ ماڵێ گه‌ڕاوه
بانگی خۆشییان لێ داوه
هه‌تا حه‌وتوو بوو ته‌واوه
ته‌داره‌کی بۆ گیراوه
خێر و حه‌سه‌ناتی بۆ بکه‌ن؛ لاوه
ئه‌گه‌ر حه‌وتووی بوو ته‌واوه
فه‌رخۆڵه هاته‌وه له‌ولاوه
گاڕانێک له‌وێ ڕاوه‌ستاوه
سه‌بر سه‌بر چوو به‌ولاوه
ده‌ڵێ: «گاوان! له شاری داودییه‌ی چ قه‌وماوه؟»
ده‌ڵێن: «نه‌تزانی مامی ڕدێن سپی، هاتی له‌ولاوه؟
خاتوون ئه‌ستی ئه‌وڕۆ حه‌وت ڕۆژه نه‌ماوه
بچۆ خێراتی بخۆ ته‌واوه».
ده‌ڵێ: «گاوان! هه‌ڕۆ بڕۆ ڕزقت سواربێ؛ بۆخۆت پیاده بی، قه‌ت نایگه‌یێی». فه‌رخ لێی چووه شاری داودیه.

فه‌رخ چووه ماڵه پیرێژنێکی، گوتی «وه‌ره، له ماڵێمان ڕۆنیشه؛ ده‌چم خێراتی خاتوون ئه‌ستییێ دێنم ئه‌تووش بخۆ، ئه‌منیش ده‌خۆم. ئه‌و هه‌ویره‌ی باوه‌شێن بکه مێشی لێ نه‌نیشێ». فه‌رخ ده‌گریه: «ئای له خۆم فه‌قیر و ئێخسیری
حه‌وت ساڵانم له شاری شامێ کرده‌وه میری
ئێستا سه‌ره‌نجامانم هاتۆته‌وه سه‌ر باوه‌شێنی هه‌ویری».
فه‌رخ چوو به‌ولاوه
نانی خێراتیان به‌فه‌رخی داوه
به‌سه‌ر سه‌ری شێخاڵیدا کرد. شێخاڵ ده‌ستی دا خه‌نجه‌رێ؛ گوتی: «ده‌تکوژم ته‌واوه».
فه‌رخ بۆ قه‌بران هه‌ڵات ڕێی که‌وتن واوه

هەتا گەییە قەبری خاتوون ئەستی، دەستی لە کێلەکەی وەرهێناوە.

فەرخۆڵە دەڵێ: «خولایە! نە بەکەبرێنی، نە بە سەبرێنی

گیانان دەدەی گیانان دەستێنی

یانە خاتوون ئەستێ بۆ من وەژێنی

یانە ئەمنیش بەکێلی وێوە بمرێنی».

هەرچەند دوعای دەکرد فەرخی بەستەزمانە

لێی نەهاتە جواب خاتوون ئەستێ نۆجوانە

لە بارەگای خولای دەهات میوانە

ڕوحیان لێ وەرگرت ئەو بەستەزمانە

دەهاتنە سەری ئەو هەموو خزمانە

زەریفیان دەشوت سەید و مەلایانە

کن خاتوون ئەستێ لێ بوو گۆڕخانە

فەرخ لە خاتوون ئەستێ میوانە.

ڕەحمەت لە گوێدێرانە

بەنەحلەت ببێ شەیتانە

تەوفیقێ بدا بینای چاوانە

***



# مەحمەڵ و برایمی دەشتیان

مەحمەڵی دەشتیان لە ئەشکەوتێکی بێشوەی بوو؛ جێ هەواری باب و باپیری خۆی بوو مەڕێکی زۆری بوو. هەموو ڕۆژێ ڕسقی دەهێنا بازاڕی دەیفرۆت. برادەری زۆر بوو لە شاری چەلیـــان. بـــە برادەرێکی گوت: «بزانە نۆکەرێکم بۆ ببێنـــەوە؛ یەکتەنم چم پێ ناکرێ». ڕۆژێکی پیاوێک بە بازاڕیدا هات؛ چو بەر ئەو دووکانی کە مەحمەڵ ڕای ئەسپاردبوو. گوتی: «بابـــم، نۆکەرییە ناکەی؟» گوتی: «بەڵە وەڵڵا». گوتـــی: «دەبێ بچیە کن مەحمەڵی دەشتیان؛ ئەو پیاوی پێ دەوێ». گوتی: «نازانم لە کوێیە». شاگردێکی ڕەگەڵ خست. لە شاری بردە دەرێ، ڕێی پێشان دا. ڕۆیی بۆ ماڵە مەحمەڵی، مەحمەڵ بۆ بازاری دەهات. لە ڕێیە تووشی یەک بوون. گوتی: «ئەتوو کێی؟». گوتی: «مەحمەڵی دەشتیانم». گوتی: «کاکە مەحمەڵ! خولا چاکی دا. ئەمن دەهاتمە ماڵی توو، ئەوا لێرە تووشت هاتم. ئەگەر ڕێـــک کەوتین، دەچمـــە ماڵێ؛ ئەگەر ڕێک نەکەوتین دەگەڕێمـــەوە». گوتی: «بابم نێوت چییە؟» گوتی: «نێوم برایمی نۆکەرت». گوتی: «قەراری حەقم دەگەڵ بکە؛ دەبێ ببینە برای دایک و بابی». گوتی: «هەتا نۆکەری تۆم، براین. ئەگەر لە نۆکەریت چوومە دەرێ، هەر کەســـە کوڕی بابی خۆمانین». گوتی: «کێ دەناســـی؟» گوتی: «کەس ناناسم». گوتی:« بابت نێوی چیە؟» گوتی: «بابم زوو مردووە؛ لە کەســـم نەزانیوە نێوی چییە». گوتـــی: «ئەمن چۆن بەقایە بە توو بکەم؟» گوتی: «ئەوەتی هێندە بووم ســـەد تومەنم پەیدا کردووە. ئەو سەد تومەنی لە کن توو دادەنێم بەوادەی؛ هەتا شەرتم هەڵدێ؛ حەقی

لەتوو وەردەگرم، ئەگەر ئەتوو بەمن چا بووی ئەمنیش بۆ توو چاک بووم، دراوەکەت لەکن دادەنێمەوە سەرلەنوێ دەبمەوە نۆکەر».

لە پاشــێ مەحمەڵ برایمی کردە برا گەورە. ڕەپێش خۆی خســت بۆ ماڵێ، هاتنە کن دایکیان، سەلامیان لە دایکیان کرد. گوتی: «دایە! ئەوە برا گەورەی منە». گوتی: «ڕۆڵە! ئەگــەر برای تۆیە، کوڕی منە». مەمکی ئاوێتە ســەر زاری ئەوی بە دایکی خۆی قبووڵ کــرد. هەموو ماڵی خۆی تەســلیم بە برایمی کرد. برایم لەســەر ماڵە خۆی ڕاگەیی هەتا سێ ســاڵان. هیچ مەحمەڵی نەدەدواند ئەو سێ ســاڵانە؛ برایم گوتی: «بران! قەت برای لەوەی چاتر دەبێ. مەســەڵەحەت ئەوەیە؛ جا ژنێکی بۆ مەحمەڵی بێنم؛ دایکیشمان ئازابێ کەم دەبێ کارمان یەکجار زۆرە». بانگی کرد: مەحمەڵ! ســبحەینێ زوو وەرە نێو مەرێ؛ کارم پێت هەیە». مەحمەڵ بەیانی دەســتی دا گۆچانی، چووە کن برایمی. برایم شێست، حەفتا ســەری بەران و بەختەی تەســلیم بە مەحمەڵی کرد؛ گوتی برا! ئەوەی بفرۆشــە. بزانم ژنێکت بۆ بێنم. دایکیشــمان ئازابی زۆرە بحەسێتەوە». مەحمەڵ جەڵەبی ڕاکێشا بۆ بازاڕی چەلیان. گەییە قەراخ شاری فکری کردەوە گوتی: «برا بە منی نەگوتووە قیمەتی. دەشــقەم هەرزانی بدەم، پێــی ناخۆش بێ؛ بڵێ گەورەیی ڕانەگرتم». لەوێ تەســلیم بە پیاوێکــی کرد جەڵەبەکە، بۆخۆی بەلینگــدان چووە کن برایمی. بە برایمی گوت: «ئەتوو قیمەتــی ماڵەکەت نەگوتووە. بفەرموو قیمەتی، بڵا ئەگــەر کردی دەیدەم. ئەگەر نەیکرد ماڵــی خۆت بۆ دێنمەوە». برایم گوتی: «هەروا دەبێ لــە دنیایە؛ ئافەرین برا!» گوتی: «براڵە! برۆ یەکی تێکڕا بەچوار ڕیاڵانی بدە». مەحمەڵ گەڕاوە بەلینگدان، گەییە جەڵەبی خۆی. ڕای کێشا بۆ بازاری.

خاتوون پەریخان کچی میرزۆرابخانی بوو؛ حاکمی شاری چەلیان بوو. بۆ خۆی زۆر پیر بووبوو، حوکمەتی دە مست خاتوون پەریخانێ نابوو. حەسەن بەگ کوڕی میرزۆرابخانی بوو، چکۆلە بوو؛ خاتوو پەریخان زۆری کەیف لە پیاوان بوو. هەر کەسێک بە کووچەیدا ڕابردبا خاتوون پەریخان کەیفی دەیگرت.

خاتوون پەریخان دەیگوت: «وەرە حەزم لێ بکە». ئەویش قەبووڵی نەدەکرد. خاتوون پەریخان دەیگوت: «بڵا بیســووتێنن؛ نەکــوو لەکن خەڵقی بڵێ، ئابرووم دەچێ». پیاوی دەگرت؛ دەنێو چیغی دەنا؛ نەفتی پێدا دەکرد، دەیســووتاند. قەرەواشــێکی بوو؛ هەموو ســبحەینان دەبوو بچێ، ئاوی نــوێ بێنێ، خاتوون پەریخانێ چاوی پێ بشــوا. ئەگەر قەرەواش چوو بەکاروانسەرایدا تەماشای کرد چێودارێک ئەوە جەڵەبی دەفرۆشێ. قەرەواش ئاشــقی ئەو چێودارەی بوو، ناتوانێ بچێتە ســەراوێ، ناتوانی بگەڕێتەوە؛ هەتا وەخت و

ســـەعاتی بەسەرچوو. بەپەلەپەل چوو گۆزەی پڕکرد، هاتەوە. خاتوون پەریخان لە خەوێ هەڵســـتا. گوتی: «ئەو قەرەواشە لە کوێیە؟» قەرەواشی دی گوتیان: «نازانین؛ ئەو قابە چۆتـــە جندەبازییە». زۆر نەچوو قەرەواش هاتەوە. خاتوون پەریخان گوتی: «جەللابیش بێنن تەنافیش بێنن. تەنافی دەکەم، دەیخنکێنم».

گوتی: «قوربان! بانگم کە ســـەرێ عـــەرزت بکەم. کەیفی خۆتە ئەگەر دەمخنکێنی». گوتی: «وەرە ســـەرێ». گوتی: «قوربان! گۆزەم هەڵگرت چوومە سەراوێ، ئەهلی بازاڕ هەمـــوو دەزانێ؛ ئەگەر دەمکوژی ئەگەر دەمبڕی. ڕووڕەشـــیی خۆم دەڵێم. چێودارێک لە بازاڕییە، هێندە جوانە دەڵێی یوســـفی میسرێیە. ئەگەر چاوم پێ کەوت لە سوێیانی شێت بووم. نە توانیم بێمەوە، نە توانیم بچمە ســـەراوێ. پێم دە بەند چوو هەتا ســـەحاتێکی. لەپاش سەحاتێکی بەپەلەپەل چووم گۆزەم پڕکرد. هاتمەوە. حاڵ و کەیفییەتی من ئەوەیە جا ســـاحب ئیختیاری». گوتی: «ئەوەی بەرن ئەمباری بکەن. بانگی فەڕاشـــان بکەن». فەڕاش هاتن. خاتوون پەریخان گوتی: «بڕۆن ئەو چێودارە هاتۆتە بازاڕی ئەوەی بۆ منی هێناوە بیکڕم، بیکەمە خێر و خێرات. ئەوە لە بازاڕی شاییەکان زیاتر داوەتێ لە قیمەتی، بۆیە دەیفرۆشـــێ. بڕۆن هەرچی لێـــی کڕیوە، دراوی بدەنەوە؛ ئەو شـــەک و بەختەی لێ بستێننەوە. ئەو چێودارەی بەجەڵەبەوە بۆ منی بێننە ئێرە».

فەڕاشـــان هەڕایان کرد، حوکمیان لـــە چێوداری کرد؛ گوتیـــان: «هەرچی فرۆتووتە دەبـــێ دراوی بدەیەوە، شـــەک و بەختەی خۆت بســـتێنیەوە». گوتـــی: «ئاخر چ بکەم خەڵق نامداتـــەوە». گوتی: «کوڕە! حوکمی خاتوون پەریخانێیە. هەرچی نەیداتەوە بابی دەردێنین». هەموویان ئەســـتاندەوە، جەڵەبیان ڕاکێشا هێنایان. خاتوون پەریخان چاوی شووشت. کوڵمەی خۆی جوان کرد. چاوی ڕشت. سینگی خۆی ترازاند. خۆی ئاوێتە سەر پەنجـــەران. مەحمەڵ زۆر ترســـا، گوتی: «ئەوڕۆ دەمســـووتێنن». مەحمەڵ لەولاڕا هات. خاتوون پەریخان چاوی پێ کەوت، ئاشقی بوو. لە سوێیان وەخت بوو شێت بێ. مەحمەڵ ئیکلامی لێ کێشـــا. بانگی کرد گوتی: «چێودار دەیفرۆشی؟» گوتی: «بەڵێ، قوربان!». گوتی: «تێکڕا بەچەندی سەرجەم؟» گوتی: «تێکڕا بەچوار ڕیاڵان»۔ ئەگەر بیگوتایە دە ڕیاڵ هەر لێی دەکڕی ـ. جەڵەبەکەیان ئەژمارد، حیسابیان دا. تەسلیم بە پیاوێکیان کرد. گوتی: «ئەوەی بلەوەڕێنە، هەتا چل شەوی؛ حەقی مانگێ دە قران بێ. موخاریجت لەسەر خاتوون پەریخانێ بێ. ئەوەی دەکاتە خێروخێرات ئینشـــاڵڵا». گوتی: «بێنن شتێکی بۆ ڕاخەن». تەکلیفیان کرد دایاننا. خاتوون پەریخان لێی پرســـی: «نێوت چییە؟» گوتی: «مەحمەڵی دەشـــتیان نۆکەرت». گوتی: «قوربان حەقی جەڵەبەکەم بدەیە؛ مەرەخەس

دەبم». کوێخا دەرکی بانگ کرد گوتی: «مەحمەڵی بێنە ژووریٚ حەقی بەدەمیٚ». گوتی: «کوێخـــادەرک خەڵوەتە کەس لێـــرە نەمێنیٚ». مەحمەڵ کە لە پلیکانان وەســـەرکەوت، کـــە خاتوون پەریخـــان چاوی پیٚ کەوت وای ئاشـــق بوو نێوکی کـــەوت. گوتی: «وەرە ژووریٚ». هاتە ژووریٚ. ئیکلامی کێشـــا. لەکنە خۆی داینا گوتی: «مەحمەڵی دەشـــتیان ئەمن میرغەزەب نیم. هەموو ڕۆژیٚ پیاوێکی دە چیغی وەردەگرم، دەیسووتێنم. قسەی دڵی خۆم دەکەم لێم قەبووڵ ناکەن؛ ئەمنیش بۆیە ئەو عالەمەی وا لیٚ دەکەم. بەقسەم دەکەی یان نا؟» گوتی: «قوربان! بفەرمووو بزانم چ دەڵێی». گوتی: «مەحمەڵ! ئەمن زۆرم حەزم لەتوو کردووە، ئەتوو دەڵێی چی؟» گوتی: «قوربان! ئەمن لە سوێی توو جەرگم خرابووە؛ ئەمما ناوێرم بڵێم». دەســـتی دەستۆی مەحمەڵی کرد. دەمی بەدەمیەوە نا. سوحبەتێکی زۆریان کرد. یەکێکی خۆشـــی لیٚ دا، هەتتا سبحەینیٚ لەکن ئەوی بوو. برایم هەر چاوەڕیٚ بوو؛ دەیگوت: «مەحمەڵ نەهات». هەتا ڕۆژ برایم خەویٚ لیٚ نەکەوت، لە سوێی مەحمەڵی. سبحەینیٚ خاتوون پەریخان تەدارەکی پادشایانەی بۆ مەحمەڵی گرت، بەوادەی دوو ڕۆژان مەرەخەســـتی کرد. مەحمەڵ هاتەوە بۆ ماڵیٚ. برایم گوتی: «براله! بۆ وا درەنگ هاتی؟» ئەو تەدارەکی لەکن خاتوون پەریخانی هێناوە پاکی لە پێش برایمی دەشـــتیان داناوە. لە ڕووی هەڵنەهـــات بە برایمی بڵیٚ؛ هەمووی بۆ دایکی گێڕاوە. ئەویش هات بۆ برایمی گوت. برایم گوتی: «براڵە ســـبحەینیٚ دەبیٚ بچیەوە؛ ئەوە ژنە بیٚ دینە، نەک پەشیمان بێتەوە. شەیتان شەیتانیٚ دەکا؛ نەکوو بەمانسووتێنیٚ ئەو بیٚ دێنە. ئەوی ئەمن پێت دەڵێم، ئەتوو بچوو وای پیٚ بڵیٚ؛ ترســـت نەبیٚ». برایم تەدارەکی ئاغایانەی بۆ خاتوون پەریخانیٚ گرت، هەڵستا مەحمەڵی بەڕیٚ کرد.

مەحمەڵ ئەگەر هات و گەڕاوە،

دیاری و سەوقاتی برایمی لە پێش خاتوون پەریخانیٚ داناوە.

خاتوون پەریخان پیٚ کەنی گوتی:

«بەخێرێی سەر چاوی من؛ ئەوە دیاری و پێشکێشی مەڕییە بۆ منت هێناوە».

کاکە مەحمەڵ گوتی:

«خاتوون پەریخانی چاو هەڵۆ!

ئەوە پێشکێشی برایمی دەشتیانە، ناردوویە بۆ تۆ».

خاتوون پەریخان کەیفی دەماغێی هێناوە

دەڵیٚ: «بەخێرێی، سەر چاوی من شۆڕەلاوە!

ئەتوو چلۆن لە ڕووت هەڵات بۆ برایمی دەشتیانت گێڕاوە؟»
مەحمەڵ دەڵێ:
خاتوون پەریخانێ چاوبەنگییە!
ئەگەر قسەی توو نەگێڕمەوە بۆ کاکە برایمییە
لەکن ئەتوو خەجاڵەت دەبم، لەکن ئەویش دەبێتە ڕووڕەشییە.
برایم وای عەرزی توو کردییە
ئەمن ئێڵچیم، چ تەکلیفم لەسەر نییە.
کاک برایم بەمنی فەرمووە: ئەمن ناتوانم بچمە کن میری، بکەین خوازبێنییە
دەبێ لیرە بڕۆین، بچینە مەملەکەتێکی دییە.
خاتوون پەریخان دەبی قاقەزێکی بۆ بنێرێ، بەدزی میری شارییە
ئەشکەوتی بێشوەی ئەوە کردمە پێشکێشی وییە
مەر و ماڵی من دە تاعلقەی ویدایە، بۆخۆم دەبمە شوانکارەی یەکجارییە
ئەگەر دەڵێ: بەقای پێ ناکەم، لە منی وەرگرێتەوە بیدا بەیەکی دییە.
ئەمە چارەمان نییە، دەبێ لەو شارەی بڕۆین بۆ شارێکی دییە».
خاتوون پەریخان گوتی:
برایم ساحب کەماڵە، لە هیچ دەوڵەتان پیاوی وا نییە
بابم هێند بەحوکمە مەگەر بچین بۆ نێو عرووسییە.
ئەو شەو دەبێ لێرە میوان بە تەدارەکی دەگرم بەحەوتووێکی دییە.
ئەوێ شەوێ مەحمەڵ لەوێ نەگەڕاوە
هەتا سبحەینێ کەیف و نەهەنگی خۆیان کرد تەواوە
سبحەینێ بەڕێی کرد بۆ ماڵێ گەڕاوە
هاتە خزمەت برایمی ئەو قسانەی هەموو بۆ گێڕاوە
برایم دەڵێ:
بەخێرێی، سەر چاوی من شۆڕەلاوە!
بڵا سەری من ببڕن، مەخسوود و مرادی توو ببێ تەواوە.
سبحەینێ دەبوو بەچێشتانە
لە خەوێ هەڵدەستا خاتوون پەریخانە
بانگ دەکا مەیتەر و میرئاخورانە:

کێهە وڵاغت جسنە، حدوودە، ئەگەر پیاو پێی بکا متمانە؟
میرئاخوڕ دەڵێ:
«قوربان، ئەوا هەنم حدوودی بێ نیشانە
دایکیان لە ئەنێزەی گەرمێنیانە».
گوتی: «بچۆ، بیانێینە؛ بیانبینم. بیانکەم. نیشانە».
میرئاخوڕ هەڕای کرد بەهەشتاوە
جووتێک حدوودی ئەسڵی هێناوە
لە پێش خاتوون پەریخانێ ڕاگرت هەرتکی کەوتن بەچاوە
لە بۆ ئێختەخانەی ڕاکێشاوە
ناردی زێڕینگەری هێناوە
ڕەخت و ڕەشمەم بۆ بکە تەواوە
ئەوی دانا بەدڵ و جانە
بۆی دروس بکا ڕەختی ڕۆمیانە
بێنن نەجاڕی نازدارە
بۆم دروس بکا قەڵتاغی جەوهەردارە
تا تەدارەکی بکرم بۆ حدوودی دە بەکارە
دە بڕۆن و ڕامەمێنن
وەستای سەڕاجم لە بۆ بێنن
تەکڵتووی ئاوریشم دۆزم بۆ پێک بێنن
دەبڕۆن، ڕامەوەستن چی دییە
ئاسنگەرم بۆ بێنن بە موشتەرییە
بۆم دروس بکا ڕکێفی ئاڵدووز دانەلغاوی هەوێزە مرواریيە
دە بڕۆن چی دی ڕامەمێنن
بچن شیرگەرانم بۆ بێنن
شیری میسریم بۆ بغەمڵێنن
زەرگی نەزەریم بۆ بێنن
لە تەنگانی بشەتێنن
بیشەتێنن یەکجارییە

بۆم بچنە کووچەی شارییە
بکڕن زرێی داودییە
مەتالی حەوت قۆبەییە».
کە ئەو تەدارەکەی گرتییە
ناردی لە دوو میرئاخوڕییە.
میرئاخوڕ هاتووە لەولاوە
حدوودی هێنا پێش چاوە
کە لەکنە خۆی زین کراوە
لەسەر پشتەی ڕۆنراوە
زۆر چاک تەنگەی کێشراوە
کە ڕەختیان هێنا لەولاوە
کە حدوودی پێ غاملاوە
ئەو ئەسپانەیان گێڕاوە
تەدارەکی چاک گیراوە
زرێی داودییان هێناوە
تەسلیم بە میرئاخوڕی کراوە
قۆڵی خۆی تێ هەڵکێشاوە
لەسەر ملی ڕاوەستاوە
مەتالی حەوت قوببەییان هێناوە
کە ڕیشتەی دەستۆی کراوە
لەنێو شانێ ڕاوەستاوە.
گوتی: «چەندو بەو زرێیە داوە؟»
گوتیان: «قیمەتی لەسەر دانەنراوە
چی بدەیەی، قبووڵ کراوە».
ماشەڵڵا لەو تەدارەکەی گیراوە
لە مەحمەلی دەشتیان دەگێڕاوە
مەحمەڵ چووە خزمەت برایمییە:
«کاکە! خاتوون پەریخان لەدووی ناردووم؛ نازانم کاری چییە».

برایم وای بە مەحمەڵ گوتییە:
بچۆ خزمەت خاتوون پەریخانێ، بزانە کاری چییە.
مەحمەڵ تەدارەکی خۆی گرت بەیەکجارەکییە.
ئەگەر مەحمەڵ تەدارەکی گرت تەواوە،
دەهات و لە خاتوون پەرێخانێی دەکرد سەلام و سەڵاوە،
دەیگوت: «نازانم، بۆ نێو عورووس برۆین، دەنا لە هیچ کوێیان چارە نەکراوە».
بانکی کردە میرئاخۆڕانە:
ئەو ئەسپانە زین کەن، بیانیەننە ئێرانە.
ئەوریان پێ بچنە ڕاوێ؛ بۆ شاهیدیێ ڕەگەڵو دەخەم ئەو شوانە.
بچن بزانن کێهەیان جسنە لەو ئەسپانە؛
کەڵکیان هەیە، پیاو سواریان بێ ڕۆژی تەنگانە».
سواریان دەبوون بەڕەوانی
ڕوویان دەکرد چۆڵ و بیابانی
تاژی و توڵەیان دەبردن، دەگەڕان بەتەرخانی
کەروێشکێکی گەرمەلانیان دەکرت، دەیانهێناوە بۆ خاتوون پەریخانی
لە پێشیان دادەنا. دەیانگوت: « ئەتوو چرای هەرتک چاوانی»
برۆ ماڵە خۆت بار بکە بۆ شارویرانی».
مەحمەڵ ئەگەر ئەو قسەی بیست لە خاتوون پەریخانێ
گوتی: « بە خوڵای سەرمان دەبڕن لە گۆشەی مەیدانێ»
هاتەوە کن برایمی دەڵێ: « براڵە! کەوتووینە ڕۆژی تەنگانێ
ناچێتەوە پاشێ حوکمی خاتوون پەریخانێ
حوکمی سەختە و گرانە
هەر دەبێ با ر بکەین لێرەکانە
بچینە نێو عورووسی، دەنا لە نێو کوردی نانبێ گوزەرانە
دەگەڵ برایمی قسەیان بوو تەواوە
دایکی مەحمەڵ گەلێک گریاوە
دەڵێ: « ڕۆڵە! خراپم لێ قەوماوە
« ڕۆڵە! مەحمەڵ، خولاگیر بی، ئەتوو چت لە کچی میر زۆرابخانی داوە؟

گوتی: « دایە چ بکەم ئیختیار لە چەنگی خۆن براوە» .
ماڵە خۆیان بار کرد، ئەشکەوتی بێشوەی بە جێ ماوە .
شەو و ڕۆژێکیان لێ خوری، لە پاشێ مەحمەڵ گەڕاوە بەدواوە .
لەو مەحمەڵی ڕەوانە،
گوتی: « ناچم، کاک برایم گیانە!
سەرمان تێدا دەچێ، زۆر فەساتە ئەو خاتوون پەریخانە» .
برایم گوتی:
« نابێ بشکێ قسەی پیاوانە
ئەمن بەجێم هێشتووە عەرز و مەکانە
بڕۆ خاتوون پەریخانم بۆ بێنە ئێرانە
هەتا دنیا خرا دەبێ لێمان دەگێڕنەوە قسانە
ئەمن دەس هەڵناگرم؛ چونکە میر زۆرابخان میری چەلیانە» .
ئەو قسەیەیان تەواوکرد بەیەکجاری
مەحمەڵی دەناردوە لە بۆ شاری
ڕووی دە شاری دەکرد، دەخزمەت خاتوون پەریخانێ
ئیکلامی دەکێشا، بانگیان کردە باڵەخانێ
ڕویان دەنا لە دیوانێ
خاتوون پەریخان دەیگوت:
کوێخای ئەو شارەی کوانێ؟
پێشکاری خۆم بۆ بانگ بکەنە مەیدانێ
هەمان بەسەری خۆم سوێند دەدەم، یان بە قورعانێ
ئەمن تەماحمە بەسەفەر بچم، نەکو میرزۆرابخان پێ بزانی
زگی سەد کەسی دەدڕم لە دیوانێ» .
ئەگەر ئەو مەسڵەعەتەی کرد تەواوە
شەو بەسەر داهات و بانگی شێوانی دراوە
دوو هەگبەی لە ماڵە خۆی لە زێڕ و ئەشرەفی کرد تەواوە
ئەسپی حدوودیان لە خاوێ دەرهێناوە
دوو بەدوو سوار دەبوون ڕکێفی خۆیان لێ داوە

شاری چه‌لیان له‌وێ به‌جێ ماوه.
که له ئه‌شکه‌وتی بێشوه‌یان بارکرد هیچ که‌سێک نه‌یزانی
خێڵی خۆی لێ نا بۆ شاروێرانی.
هه‌تا حه‌وت ڕۆژانێ که‌س سۆراخی خاتوون په‌ریخانی نه‌زانی
هه‌ڵگیرا و داد و دیوانی
شاری چه‌لیان وه‌خت بوو ببێ وێرانه
هیچ که‌س نه‌بوو بکا حوکمانه
له‌لایه‌کی بوو خانه‌بگیری، له‌لایه‌کی بوو فه‌سادخانه
هه‌موو شاری چه‌لیان بووه لۆتیخانه
مه‌خلووق ده‌ڵێ: «بلا به‌س تێک ڕابمێنین
«بلا خه‌به‌رێکی به میر زۆرابخانێ رابگه‌یه‌نین».
مه‌خلووق هه‌ڕای کرد به‌ڕه‌وانی
پاک چووه کن میر زۆرابخانی:
«توو خانێکی بێ متمانی
حه‌واڵی شاری نازانی
شارێکی یه‌کجار گرانه
لێی په‌یدابوو لۆتیخانه
هیچ که‌س نییه، بکا حوکمانه
دیار نییه ئه‌و خاتوون په‌ریخانه».
میر زۆرابخان وا ده‌زانێ
ده‌ڵێ: «وه‌کیل و وه‌زیری کوانێ؟»
ناردی له دوو وه‌کیل و وه‌زیرانه
«وه‌رن بکه‌ن ته‌گبیرانه
ده‌ڵێن شاره‌که‌م وێرانه
ته‌گبیران بکه‌ن ته‌واوه،
بزانن، له شاری من چ قه‌وماوه؟
هه‌ڵبه‌ت په‌ریخان نه‌ماوه
جا بزانن جیهه‌تی چییه

بۆچی ئەو شارە خۆڕاییە».
ئەگەر میر ئەو قسەی کرد تەواوە
کەوڵی بەشانی داداوە
یەکجار خۆشی بوو هەنگاوە
خەرقەی لێ بەجێ ماوە
گوتی: «خوڵایە چ قەوماوە؟»
لە دەرکی دیوانێ ڕاوەستاوە
گوتی: «بچن کوێخا دەرکی بێنن لەولاوە».
چەندی فەڕاش ڕاوەستاوە
ئیکلامی میریان کێشاوە
گوتی: «کوێخا دەرک، ئەمینداری تەواوە
بۆچ وا دیوان هەڵگیراوە
ئەو شارەم لێ وەرگەڕاوە؟
حیزباب! دەرت دێنم هەرتک چاوە
هەڵبەت پەریخان نەماوە
بۆچت لە من نەگێڕاوە؟
دەرکی دەروازەی بکە ئاوا»
کویخا دەرک، وای جواب داوە:
«قوربان! مەعزوون نی بچی بەولاوە
مەعزوون نی یەک هەنگاو بچییە
خاتوون پەریخان حاکمی شارییە
چ بکەم، ئەوە حوکمی وییە».
میر گوتی:
«حیزباب! ئەگەر وا بەحوکمە، بۆچی شارم خۆڕاییە؟»
گوتی: «قوربان! چ بکەم، دەستەڵات بەدەستی من نییە.
ئەوشەو حەوت شەوە خاتوون لەماڵێ نییە.
ئەگەر میر ئەو قسەی دەبیست تەواوە
خەدەنگی لە جەرگی دراوە

دەڵێ: «کارێکی گەورە قەوماوە
چلۆن ئابڕوومان بوو بڵاوە
ئیختیارم دە مست کچێ ناوە»
حەوت شەو و ڕۆژان تەواوە
چەندیان کاتیب دادەناوە
چەندی قاقەز دەنووسراوە
لە بۆ شاران بەڕێ کراوە
هەموو کەس بەسەر کراوە
جێ و جیهەتیان هەموو تەواوە
هەر جووتە شوانەکەی ئەشکەوتی بێشوەی نەماوە.
میر دەڵێ: «دیسان لێم شێواوە
دەگەڵ کرمانجم لێ قەوماوە»
بۆخۆی دیوانی داناوە
چەندی نۆکەر ڕاوەستاوە
تا ساڵەوەخت بوو تەواوە
تەواو دەبێ ساڵ لەوانە
ئەوجار شەڕی مەحمەڵ و برایمی دەشتیانە
مەحمەڵ دەڵێ:
«قەت گیر نابم لێرەکانە
تا دەچمەوە ئەشکەوتی بێشوەی جێی باب و باپیرانە».
کاکە برایم دەگریە دەڵێ: «ئەمە دوو کرمانجین خوێڕییە
میر زۆرابخان پادشای شارییە
نابینە موقابیلی وییە
دەسەڵاتم بەدەس نییە
دەنا دەکوژم مەحمەڵییە»
مەحمەڵ گوتی:
«کاک برایم گیانە!
ئەشکەوتی بێشوەی جێی باب و باپیرانە

چی دی گیرنابم لێرانە
چی دی گیرنابم لە جێی خەمێ
دەچمەوە خزمەت میری گەلێکی ماڵی دنیایە دەدەمێ».
برایم گوتی:
«سەگبابە! چلۆنم دەدوێنێ
میر بۆ ماڵی دادەمێنێ؟
پەکی کەوتووە لە خەزێنێ
حیزباب بەتاجی و تولانمان دەخنکێنێ
خاتوون پەریخان ئاوارە دەمێنێ».
مەحمەڵ ئەگەر ئەو قسەی بیستییە
حەمایەڵی کردەوە لە قۆڵییە
سوێندی خوارد بەزاتی ڕەببییە:
«لەو شەو بەدەرەوە گیربوونم نییە
هەتا دەچمە ئەشکەوتی بێشوەی بەیەکجارەکییە
بۆ خەڵقی ناکەم خۆڕاییە
لە زۆران زۆر دەمرێ، لە کەمان کەم دەمرییە
میر ئەگەر دژمنایەتیم دەگەڵ ناکا، بەماڵی دنیایەی دەکەم خەنییە
جا لەوی بەدەر بزانم، قسەی چییە».
ئەوێ شەوێ تا بەیانی برایم هەر دەگرییە
دەڵی: «سەرم چوو بەیەکجارییە
مەحمەڵم چوو چارەم چییە؟»
کە سبحەینێ ڕۆژ گرتی قەرارە
کاکە مەحمەڵ بوو سوارە:
«خاتوون پەریخان، نازدارە
بلا بۆ چەلیان بچینە خوارە»
کاکە برایم زۆر گریاوە
خۆی ئاویتە کن کەیخودا و ڕدێن سپییان؛ چوون مەحمەڵی دەشتیان گێڕاوە
هێنای ئەوێ ڕۆژێ قەراری دەگەڵ ڕۆناوە

برایم ده‌ڵێ:

«سبحه‌ینێ براڵه! ماڵه خۆم بارده‌که‌م ده‌چینه‌وه به‌ولاوه».

سبحه‌ینێ که به‌یانی به‌ر‌داوه

ناردی ماڵ و ده‌وڵه‌تی خۆی هێناوه

باری کرد سه‌بر سه‌بری ئاژواوه

هه‌تا شه‌وی به‌سه‌ر داهات مه‌نزڵی گرته‌وه تا سبحه‌ینێ ڕۆژ کراوه

برایم گوتی:

مه‌حمه‌ڵ و په‌ریخان وه‌رن، قه‌رارێکی پێکه‌وه بکه‌ین ته‌واوه

میرزۆرابخان پیاوێکی ماقووڵه، ئه‌مه شیرمان له ڕووی کێشاوه

ئه‌مه بۆ ئه‌شکه‌وتی بێشوه‌ی ده‌چین، ئه‌جه‌ل ئێمه‌ی هێناوه واوه.

مه‌حمه‌ڵ ده‌ڵێ:

ئه‌و قسانه‌م هیچ پێ خۆش نییه

ئه‌گه‌ر سه‌رم ببڕن، به‌یه‌کجاره‌کییه

ئه‌من ده‌س هه‌ڵگرتنم له ئه‌شکه‌وتی بێشوه‌ی نییه».

سبحه‌ینێ باریان کرد، هاتنه خواره‌وه

هه‌تا ئه‌شکه‌وتی بێشوه‌ی نه‌یانگرت قه‌راره

که له‌وێنده‌رێ ڕۆنیشتن به‌یه‌کجاره

پێیان زانی دژمن و براده‌ر و یاره

خه‌به‌ریان بۆ میر زۆرابخانی برده خواره

لێیان مه‌علووم کرد ئه‌وجاره

میر زۆرابخان ڕاده‌مێنی

دیوانی خۆی ده‌ڕه‌نگێنی

کێ بێ ئه‌و حه‌قه‌م بۆ بستێنێ

مواجبی زۆرم لێ بستێنێ

که سه‌ری مه‌حمه‌ڵم بۆ بێنی».

وه‌کیل و وه‌زیر وایان گوتییه:

«قوربان! ئه‌وه کارێکی گه‌وره نییه

ئه‌و خوێڕیانه قابله‌تیان چییه؟»

میر ئۆرابخان دەنگ هەڵدێنی لە دیوانێ:
«هەر کەسێک لە دڵم دەرکا ئەوێ خەمێ ئەوێ ژانێ
ئەو مووچە و مواجبی بۆ باب و باپیرانی بوو هێندەی دیکەشم دەدانێ
هەر کەسێک وەیکوژێ لەنگۆ، لە هەمووانە
دەیدەمێ کوێتی کەفەڵ پانە
دەگەڵ بۆرەی دە کەحلانە».
کۆنە نایب دەڵێ: «میران!
بەوەکیل و بەوەزیران،
بکەین ڕایە دەگەڵ تەگبیران
سبحەینێ سواربین بچین مەحمەڵ و برایمی دەشتیان بدەینە بەر شیران».
حەسەن بەگ کوڕی میرییە دەڵێ:
«بابە ئەو ڕابەری، زۆر ڕابەرێکی چاکە
بەزار زارگوتە بەدڵ دەگەڵ ئەمە پاکە
ئەو ڕاوتەگبیری ئەو نایبە بۆ مەی دەکا
قەت باب بۆ کوڕی خۆی ناکا».
میر دەڵێ:
«دەنا سوارێکم دەوێ لە شێیە
بڕوا ببێ نیشتەجێی
بزانێ مەڕی مەحمەڵ و برایمی لە کوێیە».
ئەو کێ بوو لە سواری شێی کەحلانە
لە هەمووی دەچوو بەسەرڕەو و لینگدانە
تا گەییە مەڕی مەحمەڵ و برایمانە.
دەیگوت: «ماندوو نەبێ، بەدەوڵەت بی، شوانە!
ئەمن خزمم، نابمە بێگانە
مەڕی مەحمەڵ و برایمان کێهەیە لەوانە لە هەمووانە؟
کە برایم دەڵێ:
«سوار! بەئیلاهی کەم، بەڕەببییە
بە موحەمەدی کەم بە نەبییە،

ئەو مەحمەڵ و برایمی دەشتیان ئەتوو لێی دەپرسییە
ئەمدییە ئەمناسییە
بچۆ، پرسیارێ بکە لێکی دییە»
سوار دەڵێ:
«مەحمەڵ! بۆ وا شێتی، چ نەزانی؟
کاوڕم دەیە، دەگەڵ شەکی، بەرتیل دەگەڵ بەرانی
دەچمەوە کن میرزۆرابخانی
دەڵێم میرێکی بەمتمانی
ئەلحەملای ساحب دیوانی
حورمەتت هەیە لەکن سوڵتانی
ئەمنت ناردووە بەڕەوانی
سۆراخی مەڕی مەحمەڵ و برایمی دەشتیانم نەدەزانی».
هەرچی برایم بوو لە پێشی مەڕی بوو سوار سوال و جوابی دەگەڵ ئەوی دەکرد.
هەرچی مەحمەڵ بوو لەنێو مەڕی بوو؛ مەڕی زابوو بەرخی فرچک دەدا جوابی سواری داوە.
مەحمەڵ دەڵێ:
«سواری، پووچی گوتی
ئەوڕۆ بەرتیلدان لە مێردان نییە
سەری سواری دەکوتم دە مەشکی ژنێ مێر زۆرابخانییە».
مەحمەڵ دەڵێ:
«سوارە! مەحمەڵی دەشتیان ئەزم
ساحبی دوازدە بەران و حەوت نێریی مەرەزم
بەحەقی قورعانێ هەتا وابزانم لەسەر ئەو قەوەتەی بم لەبەر گوخۆری دە چەلیان هەڵنایەم و نابەزم.
سوارە! مەحمەڵی دەشتیان ئەمنم بۆخۆمە
ساحبی دوازدە بەران و حەوت نێریی بە ئەسرۆمە
هەتا لەسەر ئەو قەوەتەی بم، لەبەر مەردچاک و میری ئەو شارەی نارۆمە
ئەگەر میر لێی پرسی، لەبەر جوابی میری نەبێ، ئەمن دە شانانترا دەگروومە».

ئەگەر سوار وای دەبیستییە
پشتی دە مەحمەلّی دەشتیان کردییە
دەڕۆیی بەرەو میرییە
خۆشی داژوا ئەو ئێلّچییە
بەوی دابوو مزگێنییە
دەلّێ: «میر، ئەگەر لەشکر زۆر نەبێ، زەفەربردن بەوی نییە».
برایم دەلّێتە مەحمەلّی جندییە:
«لێت حەرام کردم هێندییە
سوار ڕۆیەوە بەزیزییە
دەچێتە خزمەت میرییە
قسان دەکا بەیەکجارییە
میر مەجلیسی گرتییە
لە باسی سەری من و توو زیاتر هیچ نییە».
مەحمەلّ دەلّێ:
«برایم! خۆ میر پیاوێکی زۆرچاکە
بەزارگوتە بەلّ دەگەلّ ئەمە پاکە
ئەگەر بەگوێی خۆم گوێم لێ بێ، میر گەفێ لەسەری من و توو ناکا».
برایم دەلّێ:
«کاکە مەحمەلّ بۆ وا چ نازانی؟
مەڕی خۆت وەرگێڕە سەر بەردی بەردەلانی
ئەمە بۆخۆن برۆین، سەری پەزی بە کونی بابی خودانی
ئەمە شەڕمان پێ ناکرێ دەگەلّ گەلّێکی وەک زۆرابخانی
هەر ئەودەمەی خۆت بەئەبلە و عەوام زانی
لەبەر پێشکاری شەیتانی
ئێستا دژمنی میری چەلیانی
دەمانکوژن، کەس نازانی
مەڕی خۆت وەرگێڕە سەر چێشتێ و چێشتەنگاوێ
زەینی خۆت بکە تیشکی ڕۆژێ، ڕووی خۆت بکە دە تیشکی تاوێ

ئەورۆ میر زۆرابخان بەئینجەتی سەری من و توو دێتەوە ڕاوێ،
مەرد ئەوەیە لە مەیدانێ خۆی دەرناوێ».
کاک مەحمەڵ دەڵێ:
«کاکە برایم! ئەمن ڕێوی نیم، لە کونان وەشرم
کەروێشک نیم، لەبەر هات و ڕەوی سواران خۆ دە گەرمەلانان گرم
ئەورۆ لە مەیدانێ، بەخەنجەرێکی دەبان، لە بۆت دەگەڵ سواری دە چەلیان دەمرم».
«برایم دەڵێ:
مەحمەڵی خاڵ لە ڕووە!
بەس بەسەر ئەمن برۆ ڕوو بەڕووە
ئەوە سوار وەدەرکەوتن لە زینوان، میر دەرووە، نایبی لەدووە
ئاوڕ وەدە، گاڵتە خەنجەرە بۆ سەری من و تووە
پیاوی مەیدانێم دەوێ، نەیمێنێ ناز و ئەرجووە
نەمگوت مەچۆوە ئەشکەوتی بێشوەی. دەتگوت مڵکی بابمە بەجێم هێشتووە.
ئەمە دوو شوانەوێڵەی فەقیر، ئێستا دەگەڵ میری دەبین ڕووبەڕووە
تکای هیچ کەسیش ناگیرێ، هەر هاواری سەری من و تووە».
مەحمەڵ دەڵێ:
«ئەوە هەموو تانەیە، بۆتە ناسۆر، لە جەرگی من قایم بووە».
ئەگەر مەحمەڵ وای گوتییە
ڕقی هەڵستا لە برایمییە
دەڵێ: «خەتای وییە ئەو کەمییە
بەخوڵای چی دیم قبووڵ نییە
بزانم ئەو میرە کوێندەرییە
هیچی خاتوون پەریخان نییە
دەیکوژم بەیەکجارەکییە
بۆخۆم دەبمە میری شارییە».
تیرێکی دەبردە بەر ماڵی کەوانێکی هیندییە
بەرەو ڕووی سواری چەلیانی هەڵداشتییە
ئەگەر دای لە سواری پێشوو، بستێک لە سوارەکەی دوایەی تێ پەڕییە

مەحمەڵ دەڵێ:

«برایم سەرهەڵدێنم لە خوڵای دەکەم شەرمە

هێشتا ملی مەحمەڵی لە دەعوایە نەبووە گەرمە

بە دوو تیران چوار سواری دە چەلیانم کردوون ئێختەرمە».

برایم دەڵێ:

«کاک مەحمەڵ خاڵ لە ڕووە!

ئەتوو بەسە بەسەر ئەمن برۆ ڕووبەڕووە

«ئەگەر ئەتوو کوشتووتن چوارە ئەمنیش تەواوو کردوون دووە».

مەحمەڵ دەڵێ:

«برایم! ڕەبی بەماڵە زۆراب خانی وەرکەن نەوتە

خۆت خۆتێک لە دڵی مەحمەڵی دەشتان دەکەوتە

ئەورۆ لە سواری چەلیانم تەواوکردن شەش و حەوتە».

برایم دەڵێ:

«کاکە مەحمەڵ! ئەتوو لە خۆت گەڕێ

میر هاتۆتە سەر ئەمە بۆ ماڵ و مەڕێ

ئەمن یەکێکم ماوە،

لە توو ڕاس کەمەوە ئەوێ گەڕێ».

هەرچی برایم بوو، شەشی کوشت و مەحمەڵ حەوتی کوشت بوو. میر گوتی: «دەعوام دەگەڵ نەکردوون، سێزدە سواریان لەمن کوشت. مەحمەڵ سەرکێوییە سافییە؛ بەندێکی بانگ دەکەم بێتە خوارێ، سەد سواری دەنێرمە ڕێیە بیکوژن. هەرچی کوڕی کوژرا، هەرچی بابی کوژرا، هەرچی برای کوژرا، ئەوانە بێنەوە خەڵات و بەراتیان لێ زیاد دەکەم».

میر دەڵێ:

«ئای مەحمەڵ، کاک مەحمەڵ گیانە!

ئەوە نابێتە شەڕی مێردانە

ئەتوو لەوێ سەرێ فڕێ دە تیروکەوانە

دەس دە خەنجەرێکی دەبانە

وەرە خوارێ شەڕێ بکە دەگەڵ ئەوهانە

کاک مەحمەڵ ئەمن ئەو هونەریانە حسێب ناکەم بە هونەرێ

ئەتوو تیروکەوانی خۆت فڕێ بدە لەوێندەرێ
وەرە کاڵتەی لە پێش میری بکە بە خەنجەرێ»
ئەگەر مەحمەڵ ئەو قسەی دەبیست تەواوە
تیروکەوانی خۆی فڕێ داوە
بۆ نێو لەشکری هات بەهەڵداوە
کاک برایم سەر هەڵدێنی
فرمێسکان بەسەر ڕدێنی وەش هەڵدەوەرێنی
هەرتک دەستان دە ستۆی مەحمەڵی وەردێنی
دەڵێ: «کاکە! بەقوربانت بم، مەچۆ خۆت دەدۆڕێنی».
مەحمەڵ دەڵێ:
«لە برایمی من، شێت و چ نەزانە!
میر بانگی یەشتۆتە پیاوان، نەک ژنانە».
لەوێی فڕێ دا تیروکەوانە،
هەڵدەوەشا خوارێ بۆ نێو سواری چەلیان بە خەنجەرێکی دەبانە.
کاک مەحمەڵ گەییبە پێدەشتێ
سەد سواری چەلیان بەجارێکیان ڕادەماشتێ
هەموو شیری دەبانیان پێ، میسریان دە پشتێ.
خولایە ئەتوو چەند کەرەمدار و نادری
لە پشتی ئەو سوارانەم سەد شیری دە مسری
بازییەندێک و حەمایەڵێکی دەبەر دابوو ئەو شـــیرانە شـــتاق مەحمەلی دەشـــتیانیان نەبڕی
ئەو کێ بۆ؟ لە مەحمەڵی بچووکە،
بە دەستێکی خەنجەری دەبانە، بە ئی دیکەی کێردووکە
دە نێو سواری چەلیان گەڕا وێنەی تەیر و باشووکە
کێ بوو؟ لە مەحمەڵی فەرخە
دە باغەڵێکدا هەیە کاری ساوا دە ئی دیکەیدا هەیە بەرخە
دەنێو سواری چەلیان گەڕا بە گێرە و چەرخە
میرزۆرابخان دەنگ هەڵدێنی:

«کەسێک جوابێم بۆ وەکۆنە نایبی کۆن ڕابگەیەنی
خولاّ بکا سواری دە چەلیان یەک لێ نەمێنی
دەشقەمی ئەو ئاورەی لە جەرگی میری وەکوژێنی».
کێ بوو لە سواری شێ کەحلانە
دەڕۆیی بەسەرڕەو و لینگدانە
دەگەییە کۆنە نایبی بەئیکلام کێشانە
لەبۆی دەگێڕێتەوە هەموو قسانە
ئەگەر کۆنە نایب ئەو قسەی بیست تەواوە
یەکجاری ڕق هەڵستاوە
هیچی نەدەدی بەچاوە
دەنگی ئی قۆشەنێ داوە
دوازدە پاڵەوانی هێناوە
لە ڕۆینێی کردووە هەشتاوە
دەیگوت: «زۆر کەمم هێناوە».
هەتا گەییە لە میری کردەوە سەلاّوە
میر عەلەیکی وە وی نەداوە.
دەڵێ: «میرا! بەقوربانت بم، چ بووە، چت لێ قەوماوە؟»
میر دەڵێ:
«نایب! بۆچ وا شێت و چ نەبینی؟
ئەو تاقە فەردەی لە مەیدانێ دەبینی
ئەوهە بێ بابی کردوون چل لانکی کەوان زێڕینی».
کێ بوو لە نایبی جاران
وای دەخوریە مەردچاک و کەمانداران
لە مەحمەڵی دەشتیانیان کرد بەتیرباران
برایم دێ دۆلاّو دۆڵە
وەسەر خۆی دەکا قوڕ و خۆڵە
دەڵێ: «براڵەڕۆ! بزرم کردووی تۆڵە»
کاک مەحمەڵ سەر هەڵدێنێ

ده‌لێ: «برایم! خولا بکا هیچ عومرت بۆ من نه‌مێنی
حه‌زێ بکه‌ی یه‌ک و چوار تۆڵه‌ی من ده‌ستێنی».
برایم ده‌لێ:
«مه‌حمه‌ڵ! به‌سم له‌سه‌ر بکه قیژه قیژێ
ئاورم ده به‌ده‌نێ به‌ربوو، له ده‌روونێم ده‌پرژێ.
قه‌ت بووه ده ڕۆژی وه‌ک ئه‌وڕۆدا برا له‌سه‌ر برای خۆی نه‌کوژرێ».
کێ بوو؟ له برایمی جارانه
به‌ده‌ستێکی تیره به ئی دیکه‌ی که‌وانه
به دوو تیران ده‌یکوشتن چوار که‌مانداری ده میرانه
برایم گه‌ڕاوه ده‌لێ:
«مه‌حمه‌ڵ! به‌وه‌ی که‌م به‌حه‌واوه
ئه‌گه‌ر ئه‌من و تۆی به‌ڕۆژێی هێناوه
ئه‌گه‌ر قبووڵ بکه‌ی یه‌ک و چوار تۆڵه‌ی مه‌حمه‌ڵی ده‌شتیان ئه‌ستێندراوه».
مه‌حمه‌ڵ ده‌لێ:
«برایم! بۆم بلێ به‌دایکی خۆم، دایکی پیره
لێم حه‌لاڵ بکا چۆڕێک شیره
ئه‌مه‌گی ویم زۆر به‌بیره
دایک و کوڕی بێ ته‌خسیره
زگی سووتا ئه‌و فه‌قیره
له‌کنم جێی من زه‌مهه‌ریره».
هاته ئاسمانێ هه‌ورێکی تاری
ڕێژنێکی بارانێ له‌وی ده‌باری
مه‌حمه‌ڵ عه‌مری دا به‌حازریان؛ سه‌لاوات له پێغه‌مبه‌ری موختاری
میر بانگ دێلێ:
برایمه‌ی سه‌رسه‌مه
ئه‌گه‌ر ئه‌تور له خۆت بگری بێیه‌وه کن ئه‌مه،
ئه‌من یه‌ک و چوار تۆڵه‌ی مه‌حمه‌ڵه‌ی به‌تور ده‌ده‌مه
ده‌لێ: میر، وا نه‌بووه قه‌ت وا نابێ

ئەتوو تازەکە لە من کوشتووە مەحمەڵی زەرد و زۆڵ و چەلەبی

قەت دەویّ گەرمەبرینێدا مەسڵەعەتی من و توو نابی

میر دەڵیّ:

برایم لە خۆت بگرە وەرە ئێرە

حەیفە ئەولاد ئینگۆ لە دنیایە ببیّ وەجاخ کوێرە

برایم بەمیری گوت: «ئەگەر توو بێی، ئیلتیفاتم دەگەڵ دەکەی، ئەمن گۆڕی مەحمەڵی دەگێم. دوازدە پیاوچاکان دەگەڵ حەســەن بەگی کوڕت بنێرە بەر ئەشــکەوتیّ، ئەمنیش دێمە خزمەت ئەتوو».

ئەگەر میر وای دەزانی ئەو قسانە

دوازدە کەس لە ساحب مەنسەبانە

دەگەڵ حەسەن بەگی جوانە

سەرتاپای کردن ڕەوانە

بۆ کن برایمی دەشتیانە

ئەگەر ئەو گەینە بەر ئەشکەوتیّ، برایم بڵندبوو لەوانە

فرێی دان تیروکەوانە

عەرزی کرد: حەسەن بەگ، گیانە

ئەلحەمدولیللا شوکرانە

مەحمەڵی دەشتیان شەیتانە

ئەو فەوت بوو لەو مەکانە

ئەتوو تەشریفت هاتە ئێرانە

بچنە ئەشکەوتیّ ئەوانە

ئەو کەیخودا و ماقووڵانە

دێمە کن حەسەن بەگی بەدەستانە

دەگەڵی دەچم بۆ شاری چەلیانە

ئەشکەوتی بێشوەی دەکەم وێرانە

چونکە ئی مەحمەڵی دەشتیانە

ئەلحەملای کوژرا لێرانە

چوونە ژوور ئەو کەیخودایانە

بە برایمیان کرد متمانە
برایم هاتەخوار بەئیکلام کێشانە
دەستی بردبوو بۆ ئێخانە
لێی دا بەخەنجەری دەبانە
زیرەی لێ هات بەستەزمانە
لێک ڕاهی بوو ئێسک و خوانە
دەرکی ئەشکەوتێی گرت لەوانە
کوشتنی دوازدە کەیخودای میرانە
لەشکرێکی عەزیمی بەسەردا چڕاوە
بەشیرێکی دەبان دەستی خەنجەری برایمی پەڕاوە
ئەویش پارچە پارچە کراوە
میر هاتبوو لەولاوە:
دەگەڵ کرمانجم لێ قەوماوە
تاقە کوڕێکم بوو نەماوە
ڕیشەی جگەرم سووتاوە
دەنگ هەڵدێنی میر زۆرابخانە:
هەی بەندە موسڵمانە
شەڕێ مەکەن دەگەڵ کرمانجی نادانە
گەلێکی وەکو میرزۆرابخانی لەبەر جووتێک شوانەوێڵان چوون هەر وەک ژنانە
ئەوی باعیزی کوڕی من بوو خاتوون پەریخانە.
گوتی: «بچن، بۆم بێننە ئێرانە
بیدەنە بەر خەنجەرانە
بەشی منە ئەو زگ سووتانە».
خاتوون پەریخانیان هێناوە
جەللابی بۆ تاعین کراوە
سەید و مەلا هاتن لەولاوە
شاڵ و قورعانیان هێناوە
لە دەرەوەی خاتوون پەریخانێ ڕۆنراوە

میر پەکی کەوت و گەڕاوە
سەید و مەلای دە دنیایە
هەڵیان گرت شاڵ و کەلامولڵایە
دایان نا لەسەر ڕێگایە
میردەڵێ:
«چ بکەم؛ چارەم نایە
نایکوژم، بۆچ دەکەن تکایە؟»
گوتیان: ئەو کارە وا پێک نایە
ئەگەر گرتووتە خاتری کەلامولڵایە
وەها شیرنە بەجێ نەمێنێ لە سەحرایە
تۆ میرێکی بەئیمانی
بەدڵی خۆت نییە غەیانی
ئەوی ژنن پاک میسلی شەیتانی
بیبە متبەقێ فرێ دە، بڵا وەک سەگ بخوا نانی».
ئەگەر قسەیان کرد تەواوە
میر لە بۆ ماڵێ گەڕاوە
بانگ لەسەر بانگی لێ داوە:
«چ بکەم شارم بێ کوڕ ماوە»
ئەوەشمان کردووە تەواوە
بەحسی خاتوون پەریخانێ ماوە.

خاتـــوون پەریخانیان لە مەتبەقێ دانا. هەشـــت مانگ بوو ڕەدوو کەوتبوو؛ هێنایان لە مەتبەقێیان فڕێ دا. ئەودەمی پادشـــای شـــاری بوو، ئەوجار لە مەتبەقێ وەک کچەتیوان کەوت، هەتا مانگێکی. زگی پڕبوو؛ هاتە سەر نۆ مانگ و نۆ ڕۆژێ خۆی. خاتوون پەریخان زا؛ دوو کوڕی بەزگێکی بوو. هەتا پەنجا شـــەوی شـــاردیانەوە، نەیانهێشت میر بزانێ. لە پاشـــێ میر خەبەریان دایـــە؛ میر زۆر کەیفی پێ خۆش بوو، هێنـــای گوێزەبانەی بۆ وان کرد. هێنایـــان نێویان لێ نان. تەگبیریان لێ کرد: «نێویان بێنن چی؟» کەس نەیدەوێرا بەمیـــری بڵێ نێوی بابـــی خۆیان لێ بنێ. میر بۆخۆی هەڵی دایـــە گوتی: «چ قەیدییە، نێوی باب و مامی خۆیان بێ؟» هەموو کەس قۆڵی کێشـــا. ئی گەورەیان نێونا برایم، ئی

چکۆڵـەی نێویان مەحمـەڵ. موبارەکییان کرد. لێیان گەڕان هەتا پێنج ساڵ تەواو بوو. سەری شەشەی دەبەر خوێندنیان نان؛ هەتا شەش سالانیان خوێند. ڕۆژێکی جومعە بوو، فەقێ مەرەخەس کرابوون. کوڕی بێوەژنێکیان گرت، زۆریان لێ دا؛ کوڕەکە لە چەنگیان هەڵات. گوتی: «حیزباب، هەموو کەس دەتوانێ لەمن دا؛ ئەنگۆ بچن تۆڵەی باب و مامو بستێننەوە». گوتی: «وەرە، وەرە، کەوایەکت دەمێ، ئەو قسەم بۆ بکە». گوتی: «ئەها! نایەم، دیسان لێم دەی؟» گوتی: «بچینە کن دایکێمان، بزانێن ئەمە کوڕی کێین؟» هاتنە کن دایکیان؛ لە متبەقێ بوو لە دایکیان پرسی: «دایە! ئەمە کوڕی کێین؟ بابی مە کێ بووە؟ گوتی: «ڕۆڵە! بابی ئەنگۆ میر زۆرابخانە». گوتی: «دایە ئەتوو کچی کێی؟» گوتی: «ڕۆڵە! ئەمنیش کچی میرزۆرابخانم». گوتی: «دایە ئەمە لە کێ بووین؟» گوتی: «ڕۆڵە! ئەنگۆ لە من بوون» گوتی: «دایە! چلۆن دەبێ میر زۆرابخان کچی خۆی گابێ؟» گوتی: «ڕۆڵە! لەو قسانە گەڕێ» مەحمەڵ دەستی دا خەنجەرێ، گوتی: «وێستا ڕاستێ نەڵێی دەتکوژم». گوتی: «ڕۆڵە! باب و مامی ئەنگۆ میر زۆرابخان کوشتنی». گوتیان: «دایە! جا وا ئاسوودە بووین». دەستیان دا خەنجەرێ، چوونە دیوانی میری. مەحمەڵ لینگی دا میر زۆرابخانی، ئەوی کوشت. برایم لینگی دا نایبی ئەویش ئەوی کوشت. چوونەوە کن دایکیان، هێنایانە دەرێ لە متبەقێ.

کردیانەوە میری شاری
خەلاس بوو بەیەکجاری
بەیەکجاری و بەنادری
یا خولا (ڕەحمان بەکر) نەمری
لە بەندان دەڵێی شاترە
لە کتێبی مەلای سازترە

***



## قۆچ عوسمان



بەخالەقی بەرقەرارە

بەوەی ڕۆی نابوو ڕۆژگارە

مەخلووق ببین ئیختیبارە

دنیا نابێ بەرقەرارە

ئەو لە بۆ عەبدی هەژارە

قوچ عوسمان پیاوێک بوو ڕووت و قووت و لەوێ دە بێکارە

ئەگەر لە دایکی خۆی زیزبوو، لە مەرگەوەڕێ لە بۆ بەغدایە دەهاتە خوارە

دەهاتە کن ئەولادی شـــا ڕۆستەم بەگان. سێ ســـاڵان دەبوو سەقا و سێیان دەبوو بە ئابدارە

سەری حەوتوومەی دەبوو بە پێشخزمەت و دارکاری دەکرد وەکیل و وەزیر و ڕدێندارە

دە مەرکەزی ئەو ماقوڵییەیدا بوو، شەوێکی بە دایک و بابان بوو ئینتیزارە

سبحەینێ لە دەرکی ئاغای خۆی ڕۆنیشتبوو، دامابوو زوێر و زگارە.

ئاغای دەڵێ:

«ڕۆڵە، قۆچ عوسمان، فرزەندی بەرقەرارە!

ئەگەر ئەتوو هاتییە کن ئەمن، هەتیوێک بووی، کەس پێنەویست و لەوانی دە بێکارە

سێ ساڵان لە دەرکی من بەرقەرارە بووی، کەس پێی نەبووی ئیختیبارە
ئێستا ئەمینی ماڵە منی، بۆخۆت بووی بە قەنەدارە
ئەگەر دەڵیی ماڵم کەمە، زۆرم نییە ئیختیارە
کلیلی گەنج و خەزێنانیش وەرگرە ئەوجارە
بیبەخشە بەباری، داغانی بکە بە خەڵوارە
ئەمانەتی من لەتوو فەرز بێ، حیسابت دەگەڵ برادەران ڕاگرە دینار بەدینارە».
دەیگوت: «ئاغای من! خوڵا ڕاوەستاوت کا، ببێ بەرقەرارە
مەنسەبی ماقووڵییێم زۆرە، چی دی ناکەی ئیختیارە
ئەمما ئەو شەو دەخەویدا بە دایک و بابی خۆم بووم ئینتیزارە
دەبێ مەرەخەســتم بکەی، بچمەوە کن دایک و بابانم، بەوەعدەی حەوت شەو و حەوت ڕۆژان، جا دێم دەبمەوە نۆکەری بێکارە».
ئاغای خۆی لەوێ دەگەڵی کرد گوفتارە،
دەیگوت: « ڕۆڵە! ســەبرێکم لێ بگرە، هەتا قــاوەی دەخۆم، قاوەی دەخۆم قەننەی دەکێشم، دەکەمەوە نەهارە».
دراوی بۆ داگرت بەبارێ، زێڕ و ئەشرەفیی دەکرد سەربارە
سوێندی بەسەری خۆی دەدا ئیختبای پێ نەبوو، بەکەلامولڵای ئەسپارد ئەو جارە
دەچووە ئێختەخانان دەری دەهێناوە، جوانوولێکی نۆزینی سێ ساڵی؛ دە پشتێی دەکرد زینێکی مورسەت، لەتەنیشتی ڕکێفی ئاڵدۆز لەسەر دەستە قایشێکی جیڕی بوڵغارە
دە زاری دەکرد دانەلغاوێکی حەوێزە مروارە
دەچووە جیبەخانەی ئاغای خۆی، هەڵی دەکێشــا دەمەرقۆپانێکی ساچاغ گوڵەباتوون لەوی بەرقەرارە
دە پێی خۆی دەکرد چەمکێکی مووسڵی، لەوانی دەگوڵینگدارە
دەقەبووڵیانی دەنا جووتێک دەمانچەی سەر بەدووگمە
بۆ ڕۆژی تەنگانان دێن بەکارە
دەیاویتە شانی خۆی زرێیەکی داوودی لە ملانی ببوو بەرقەرارە،
دەشــانی دەکرد مەتاڵێکــی هەیزەران، عەوت قوبە، ئەویش بــۆ ڕۆژی دەعوایە دێن بەکارە
دەستی دەدا ڕمبێکی دووپاری، هەژدە قەفی لەوی جەوهەردارە

هەرچــی بەوی دژمن بوو، دەیگوت: «ئەو ماڵە میر ســەیفودین بەگی دەبا لە کۆڵمان دەبێتەوە ئەو شەیتان و شوفارە

هەرچێکی بەوی دۆست بوو، شین بوو، گریان و هاوارە

دەیگوت:«ماڵی ئاغای میر سەیفودین بەگی برد؛ نایەتەوە ئەوجارە».

مەرکەبی ســەگلاوی لە ئێختەخانەی دێنادەرێ بە ئیزنی خولا و پێغەمبەری لێ دەبوو سوارە

لە هێندێکیان پێکەنینە، لە هێندیکیان گریانە، قوچ عوسمان

دەلێ: «خولاکەی تەمەنایان بۆ بکەن لەو جەبارە».

قوچ عوسمان بۆ ماڵە دایک و بابان دەهاتە خوارە

لە هێندێک جێیان بەڕۆیین لە هێندێک جێیان بە وردەغارە

شەوێکی وەختی نوێژی شێوان بەمەرگەوەڕێ بوو ئینتیزارە

بە منداڵی ڕۆییبوو، بە ماڵە دایک و بابی خۆی نەدەزانی ئەوجارە

دەیگوت: ئەســپ مرادە، جڵەوی شــۆڕ دەکەمەوە، هەر جێیەکی ئەو لیی ڕاوەســتا، لەوێندەری دەگرم قەرارە

ئێنجا سبحەینێ لە ماڵە دایک و بابی خۆم دەکەم پرسیارە.

جڵەوی مەرکەبی ســەگلاوی شــۆڕ دەکردەوە بە کووچە و کۆڵاناندا دەهاتە خوارە لە دەرکێکی چکۆڵانەی دەگرت قەرارە.

بانگــی دەکرد: ئەی خانەخــۆی! لیی وەدەرکەوتن پیرێژنێــک و پیرەمێردێکی پیر و ئیختیارە

دەیگــوت ئەو شــەوە میوانی ئەنگــۆم دەیانگوت: ئەمە لە میوانــی وەک توو دەبنین خەجاڵەت و شەرمەزارە

خەرجی بازاڕمان نییە، نیمانە پووڵ و پارە.

ئەوە ماڵە وەزیر و وەکیلان لەوی ببە بەرقەرارە.

دەیگوت: میوانم ئەوشەو، هەر لێرە دەبم ستارە.

مەرکەبی سەگلاوییان لێ وەرگرت، کردیان بەرقەرارە.

ئەو دایک و بابی دەناسینەوە، ئەویان نەدەناسی ئەوە فرزەندی خۆیان ئەوجارە.

ئــەو پیرێــژن و پیرەمێردە دەیانگوت: چ بکەین، بە نانی وشــکی لە میوانی وا دەبین خەجاڵەت و شەرمەزارە.

قوچ عوسمان ڕۆحمی بە دایک و بابان دەکرد ئەوجارە
بانگیان دەکا: پیرێژن و پیرەمێردی ئیختیارە!
ئەنگۆ لەکنم هیچ فرزەندو نەبوون، بۆو بێ بەکارە؟
دایک و بابی قوچ عوسمان دەیانکردە گریان و هاوارە
دەیگوت: ئەو ساڵ حەوت سالە کوریکمان هەیە بۆ بەغدایە چۆتە خوارە.
بابی چاوی کەم بینا بووە، دایکی لیی براوە ئیختیارە
قوچ عوسمان دەڵێ: پیرێژن و پیرەمێردی ئیختیارە!
ئەگەر قبووڵ بکەن، ئەمن ئەو عوسمانم جنێوو و دامێ، لێو دام، پاش نوێژی نیوەڕۆیەو دەرکردم یەکجارە
دایک و بابی بیلن دەبوون، دەیانکردە هاوارە
دەڵێن: ڕۆڵە، قوچ عوسمانە، تاقانە، بەختەوەرە!
وەرە ڕۆنیشە لەکن دایکی خۆت هەتا سەد ساڵی دی، بابت دەبێتە پێشخزمەت، دایکت دەبێتە کەنیز و کاردارە.
دەیگوت: دایک و بابی من، پیر و ئیختیارە!
شوکرانەی زۆرم وەبەر جەبارە
ئەگەر دیدار ئاخرەت نەبوو ئەوجارە
ئەمن ئاغایەکم هەیە، خولا بیکا بەرقەرارە
هێندەی سەد ساڵ بیخۆن، لێو نابڕێ و لێو نابێ قوتارە
ئەمنی سوێند دا بە خولای بە کەلامولڵای ئەسپاردوومەوە دووبارە
ئەگەر نەچمەوە کن ئاغای میر سەیفودین بەگ، بە جوانی دەمرم، کەلامولڵا دەمگرێ، لە خەجاڵەتی ئاغای خۆم نابم ڕزگارە
دەبێ بچمەوە کن ئاغای میر سەیفودین بەگ تا نەبمەوە مستەخەسارە،
دایکی دەڵێ: ئەلحەمدولیلای! کوڕم ساحب ئیختیارە
حەوت شەو و ڕۆژانی لەوێ دەگرت قەرارە.
ڕۆژێکی مەرکەبی ســـەگلاوی هێنادەرێ، دەپشتی کرد زینێکی مورسەت لە تەنیشتێی ڕکێفی ئاڵدۆز، تەنگەی دەکێشا بە قایشێکی بوڵغارە
هەگبەی لە تەرکی قایم دەکرد دایک و بابی وی دەیانکرد هاوارە،
دەیگـــوت: ڕۆڵـــە! بۆ کوێ دەچی؟ دەیگـــوت: دایک و بابی من مەرکەبی ســـەگلاو و




خەفەخانە، پێی دەچمە ڕاو و شکارە،

دەیگوت: ڕۆڵە! ئەدی ئەو هەگبەی بۆ لە تەرکی بەرقەرارە؟

دەیگوت: ئەوە وەسـیەتی ئاغای میر سەیفودینە، کەسێک پیاوی بکوژێ، خۆی باوێتە کن ئەمن، سندووقی سەری ئاغای خۆم بیکەم ڕزگارە

کەسێک ژنێ هەڵگرێ، بێ دامێنگیری من بێ، تەسەدوقی سەری ئاغام دەیکەم قوتارە

ئەسـپم لە ڕاوی لاقی بشکێ زینم لە عەرزی بمێنێ، دووسەد تومەنی دەدەم، دەبمەوە سوارە

هەتا ئاغام زیندوو بێ، پیاوە نابم ئەوجارە

دایـک و بابـی من، مەگرین، هەتا میر سـەیفودین بەگ خۆش بێ لـە فەقیری بوون قوتارە

پێی دە ڕکێفێکی دەنا، هاواری دەکردە جەبارە،

سووچی ڕەکێفی بە مەرکەبێ نیشان دا؛ هەرتک چاوی مەرکەبێ کوێر بوو، لە عەرزییێ نەکرد کارە.

دەهاتەوە کن دایک و بابان، دادەبەزی ئەوجارە

دەستی کرد بە گریانێ، دەڵێ: سەرم نابێ قوتارە!

لە ئاهـ و ناڵەی ئاغای خۆم قەت نابم ڕزگارە

چونکە سوێندی داوم دەگەڵیشی داناوم قەرارە.

دایک و بابی من! ئەنگۆش خێرێم لێ نابینن ئەوجارە.

حەوتووێکی لەکن دایک و بابانی گرت قەرارە

فرمێسکی چاوانی دەتگوت بەحرە، ڕووبارە

دایک و بابی ڕوحمیان پێ دەکرد ئەوجارە

دەیانگوت: ڕۆڵە قۆچ عوسمانە بەختەوارە!

بۆچیت هەیە هێندە گریان و هاوارە؟

دەڵێ: دایک و بابی من! بەچەنگی خۆم نەماوە ئیختیارە.

چ بکەم بەبێ ئیمانی دەمرم، خێرێم لێ نابینن ئەوجارە.

دایکی بە مێردی دەگوت: چاکە، ئەو فرزەندەی خۆمان بکەین ڕزگارە

چونکە لە بەغدایەی زۆر هەن شەیتان و شۆفارە.

بابی دەڵێ: بەخولام بەزامن دا، پێغەمبەری بۆ ببێ بە تکاکارە

شیری تۆی خواردووە، بیکە ڕزگارە
هەرتکیان مەرەخستیان دەکرد ئەو کوڕی نازدارە.
سبحەینێ ئەگەر سوار دەبوو بە کووچە و کۆڵاناندا دەهاتەخوارە
خەلقی مەرگەوەڕێ پاکی بۆ دەبوو تکاکارە،
دەیانگوت: بڕۆ هۆمێدەوارت بێ دوازدە ئیمام و چوار یارە.
دەهاتەوە کن دایک و بابان، ئیکلامی کێشان سێ جارە
دەڵێـــن: ڕۆڵە! هەڕۆ بڕۆ؛ هەرچەندی مۆمن و مەلایکەتن، لە بارەگای خولای بۆت بینە تکاکارە.
ئەگەر سواری مەرکەبی دەبوو لە هەموو لایەکی ببوو ڕزگارە
ســـووچی ڕکێفێی بە مەرکەبی سەگڵاو نیشان دەدا. ماشـــەڵڵا هێندێک دەڵێن تەیرە، هێندێک دەڵێن شامارە.
لە مەرگەوەڕێ بۆ بەغدایە دێتەخوارە
لە هێندێک جێیان دەڕوا بە ڕویین، لە هێندێکیان بە نەرمەغارە
ڕەگەڵی دەکەوتن خزم و برا و یارە
دەیانگوت: هەتا بەغدایەت دەگەڵ دێین ئەوجارە.
شەوی بەسەردا هات، مەنزڵی گرتبوو قەرارە
سبحەینێ سوار دەبوو، بەڕێی خۆیدا دەڕۆیەوە خوارە
لـــە ڕێیە گەییە خدری زینـــدە و خدرەلیاس، ئەویش لە بارەگای خولای بۆی بوون بە تکاکارە
لە دەشتی باڵینێ ئازیزم دەهاتە خوارە.
بە تەڕات و بە نەرمەغارە
تەماشا دەکا، لە دەشتی باڵینێ ڕشبەڵەک بووە، سەلالەت بە چ قەرارە
تەماشا دەکا، داوەتە، لۆتی و ڕەقاسە لەو کارە
لە لایی سەرچۆپییە گرتوویانە پیاوی، بە کێرد و کەمبەرە و چەکمەدارە
لەلای نێوەڕاستێ گرتوویانە، کیژی بەژن باریک و سینگ سەدەف و چاو بەڵەک لەوی گوێ بەگوارە
لەلای گاوانیە گرتبوویان پیاوی ژن جوان و زۆر خۆر و خوێڕی و بێکارە
تەماشای کرد گومبەزێک لە دوور دیارە




ئەو گومبەزە تەنیشت بە ئاشقەیە چوار تەرەفی بە حەساره

قوچ عوسمان دەڵێ: خولایە! ئەوە چییە؟ لەکێ بکەم پرسیاره؟

لەولارا دەهات پیاوێکی ئاقڵ و کەماڵداره

جڵـــەوی دەگرێ، دەڵێ: وەره، بچین لە ماڵە مـــن میوان بە، ئەتوو دیارە غەریبی لەو شاره.

دەڵێ: قوربان، ڕێم لەبەره؛ قسێکم هەیە، لێت دەکەم پرسیاره.

دەڵێ: ڕۆڵە! وەرە بچین دابەزە، قەننەیەکی بکێشە لەکن مامی خۆت ڕۆنیشە بکەینەوە گوفتاره.

دەڵێ: مامە! خولات لێ ڕازی بێ، سەفەرم لەبەرە بمکە ڕزگاره!

دەڵی: ڕۆلە! ئەتوو دانابەزی، بزانم ئەوە چییە لیی دەکەی پرسیاره.

دەڵێ: مامە! ئەو گومبەزەی لەوێیە، چوار تەرەفی بە حەساره

ئەوە هێندێک دەڵێن: چاکی ترکانە، هێندیک دەڵێن کلیسای هەرمەنیان بەیەکجاره.

دەڵێ بابم: درۆیان کردووە، ئەو مەخلووقەی شۆفاره

قەد بە قسەی ئەو خەڵقەی مەکە ئیختوباره

ئەوە کەمبەر بەســـتەیە بە منداڵی شـــەهید کراوە، هیمەت و بەرەکەتی حازر بێ، ئەوە پیر چاکە سواره

هەرکەســێکی بە لەبزێکی شـــیرینی زیارەت بکا، بە دڵێکی ئیخلاس لەسەر ئەوەی بکا تۆبە و ئیستغفاره

ئەمن زامنم - ڕێگای چل ساڵان دوور بی، لە تەنگانانت دێ لە هیمداد و هاواره.

قوچ عوسمان ئاقل بوو، کەماڵداره

دەچـــوو لەوێندەری پیـــاوە دەبوو، جلەوی دەگرت، پیاوێکی ڕیش ســـپیدی بەرقەراره سەعاتێک دەگەڵ ئەو پیاوی ڕدێن سپیدی دەکرد گوفتاره.

دەیگوت:

قوربان! ئەوە کێیە؟ دەیگوت: هیمەت و بەرەکەت حازر بی، ئەوە پیرسواره.

قوچ عوسمان ئاقل بوو هەڵستا زیارەتی کرد سێ جاره،

دەیگوت: پیرســـوار! بەقوربانت بم لە بەغدایەم دژمن زۆرن، جارجار لە هیمدادم وەره.

شەو و ڕۆژێکی لەوێ گیر دەبوو تەمانای دەکرد لە خولای ئەوجاره.

ئیجازەی وەرگرت، دەبوو بە تۆبەکاره

له‌وێنده‌رێ سوار ده‌بوو بۆ شاربازێرێ به‌غدایه ده‌هاته خواره

ته‌ماشــای کرد، له‌لایه‌کی ئه‌ســنافه، له یه‌کی به‌قاڵه، له ته‌ره‌فی دیکه حه‌تاره برێکی دیی داژوا، له کاروانسه‌رایه هاته خواره

ته‌ماشای کرد، کوردی که‌رک ده‌به‌ر بوون؛ ده‌یگوت: ئه‌وه چییه؟

ده‌یانگوت: ئه‌وه هه‌مووی جه‌ڵه‌ب فرۆشه، سوێندخۆره، بێ ته‌ڵاقه، هه‌مووی چێوه‌داره.

برێکی دی داژوا، له کاروانسه‌رایه هاته خواره

ته‌ماشای کرد، عه‌جه‌می که‌وڵ ڕه‌قی په‌پاغ ڕه‌ش بوون گوتی: ئه‌وه چییه؟ گوتیان: عه‌جه‌مه، عه‌لی په‌رسته، نوێژنه‌که‌ره، هه‌مووێ کرێباره.

برێکی دیی داژوا، له کاروانسه‌رایه هاته خواره

ته‌ماشای کرد، کوڵاپان ڕۆنیشتبوون، ئاسکیان له‌به‌ر دووکانێ بوون

گوتی: ئه‌وه چییه؟ گوتیان: جووه، ئه‌رمه‌نییه، له خوڵا نه‌ترسه، هه‌مووی قه‌وه‌داره.

برێکی دیی داژوا له کاروانسه‌رایه هاته خواره،

ته‌ماشای کرد، غه‌ڵبه‌غه‌ڵبێک به‌قه‌د دووهه‌زار که‌سی به‌ئه‌ژماره

شینکێکی قه‌زوانییان له‌وێ ڕاگرتبوو، کلک له‌سه‌ر چووان، یاڵ و دووی به‌ژه‌نگاره

هێندێکیان پێیان ده‌دا دووسه‌د و سێسه‌د به‌ئه‌ژماره

هه‌ر که‌ســێک چوار گوڵه ده‌زووی له ماڵه خۆی بان، ده‌یبرده بازێڕی هه‌ڕاج فرۆشــی ده‌کرد، ده‌یکرد به‌پوول و پاره

ده‌یگوت: ده‌شــقه‌م ئه‌ســپی بۆره‌م وه‌گیرکه‌وێ، جا قه‌ت له خۆم نابڕێ له ئه‌ولادیشم نابێ قوتاره

ئه‌گه‌ر قۆش عوسمان گه‌یێ، سێ جاری دا چوار که‌ناره

له ته‌ره‌فی ڕاســتی ڕۆده‌نیشت، ده‌یگوت: «ساحبی ئه‌سپی بۆره، وه‌ره». ئه‌شره‌فیی بۆ ده‌بژارد هه‌زار به‌هه‌زاره

جڵه‌وی ئه‌سپی بۆره‌ی له چه‌نک موشترییان ده‌رێنا، بۆ شاربازێڕی ڕاده‌کێشا خواره

هێندێک ده‌یانگوت: به‌نک کێشــه. هێندێک ده‌یانگوت: قوماربازه. هێندێک ده‌یانگوت: ئه‌وه شه‌رابخۆره، فێره قوماره.

ئه‌گه‌ر گوێی لێ بوو له ڕقی خه‌ڵقی گه‌ڕاوه دووباره

ده‌یگوت: بابم ساحبی ئه‌سپی بۆره وه‌ره! دراوی له کۆشان بۆ فڕێ ده‌دا خواره.

ده‌یگــوت: بابم، گه‌ردنم ئازا بکه نه‌ک دڵت له‌دوو بێ، خێری لێ نه‌بینم، له قیامه‌تێت

له ئاهـ و نالآن نابم ڕزگاره.

جڵەوی ئەسپی بۆرەی دا بە هەتیوێکی، حەقیشی دابوویە شەش پارە

ئیختیبـــاری بەوی نەدەکرد، بۆی بەکرێ دەگرت دوو پیاوی ڕدێن ســـپی لەکنی دادەنا بەئەمینداره

دەبـــوو بە هەمووانی خزمەت بکەن، ڕنەکی بکەن ڕۆژێ ســـێ جـــارە، بۆیان دەکردە پاشبەند و پێشبەند ئاوریشمێکی بەرقەراره.

ئاوریشمی خاویان بۆ دەکردە سەلکە ڕێشمە، ئی دیکەی بۆ دەکەن گوڵنەوسارە،

لەســـەر دووکانی نەجاڕانـــی بۆ دروس دەکـــرد، قەڵتاغێکی چـــوار کولاغەی چناری جەوهەرداره

لەسەر دووکانی سەڕاجانی بۆ دروس دەکرد، تەکەڵتووێکی ئاوریشمدۆزی بەئیختوباره

لەسەر دووکانی هەمەدانیانی بۆ هەڵدەگرت، دەستەقایشێکی جێڕی بوڵغاره

لەســـەر دووکانی ئاســـنگەری جووتێک ڕکێفی دروس دەکرد، دانـــە لغاوێکی حەویزە مرواره

لەسەر دووکانی شیرگەران دروستی کرد جووتێک زەرگ بۆ باڵەتەنگێ میسری و گۆردە و قەداره

لەسەر دووکانی خەیاتی دروستی دەکرد سەرزینێکی پارچێک ماهووت، یەکێک مەحمەڵ، یەک ئەتڵەس، چوار تەرەفی دەکرد بە خارای نەوبەهاره

چل دەستی ئاوریشم هەڵدەگرت، دەیکردە ساچاخ، ئەویشی دەنا لە چوار کەناره

جووتێـــک تۆڵەی فینۆیان دەگێڕان، ئەویشـــیان بەپووڵ کڕی ببێتە شـــاتر، بڕۆن لە کەناره

ئەگەر ئەو تەدارەکەی دەبوو بەرقەراره

سوار دەبوو بە کووچەی شارباژێڕێ دەهاتە خواره

دەیگوت: «ئەوە ئاسمان کون بوو ئەسپی بۆرەی پێدا هاتۆتە خواره

پێشکێشە بۆ ئاغای میرسەیفودینی دەبەم؛ لەمن وایە لێم خەرج نەکردووە شتاقە پووڵ و پاره».

حەوتووێکی لە شارباژێڕی ڕۆدەنیشت، خزمەتی ئەسپی بۆرەی دەکرد ئەوجاره

پاش حەوتووەی سوار دەبوو بەئیزنی خولای لەبۆ بەغدای ڕەنگین دێتە خواره

نوێژی شێوان داخیل بەبەغدایە دەبوو، بەدەرکی ئاغای خۆی دەبوو ئینتیزاره

تەق تەق لێی دا لە خواجە بێدارە

لێی وەدەرکەوتن، کەیخودا و ئەمیندارە

تەماشا دەکەن قۆچ عوسمان بووە بەرقەرارە

مزگێنییان بۆ ئاغای میرســـەیفودین بەگ برد: قۆچ عوسمان هاتەوە. ئەسپێکی بۆرەی پێیە، چەند باشە، چەند بەکارە!

هەر بەو شەوەی دەچوونە تەماشای ئەسپی بۆرە کەیخودا و پیاوماقووڵ و ئەمیندارە

جێبەجێ دەهاتنە دیوانێ، دەبوون بەرقەرارە

دەیگوت: ئەسپی بۆرە چۆنە؟ هێندێک دەیانگوت: باشە، گەلێک بەکار.

هێندێــک دەیانگوت: بۆزە و بەدعەمەلە؛ ئەگــەر دە توومەنی پێ درابێ پێنجی چوون بەخسارە

ڕۆژێ تەنگانان سەری سوارەی خۆی ناکا ڕزگارە.

قۆچ عوسمان دەڵێ: خوڵا خراکا ماڵە شەیتان و شمری، دەنا بەدکارە

ئەنگۆ چل کەس دەگەڵ ئەمن بکەن مەرج و قەرارە

بگرنەوە مراوییەکی باڵ کووڕ دەگەڵ بازێکی خاسە تەوارە

سبحەینێ لە دەشتی خورمالغێ دەگەڵ ئەسپی بۆرەیان دێننە خوارە

ئەگەر خوڵای کرد، ئەو ئەســپی بۆرەیان بەجێ هێشــت، ڕەمانەی ئەسپی بۆرە بکەن، سەری من بدەن لە قەنارە

ئەگەر ئەسپی بۆرەش باز و مراوییان بەجێ بێڵێ، یا بۆخۆم لەکن ئاغای میرسەیفودین بەگ نابم، یان شتاقو لە بەغدایە ناکەم ئیختیارە.

ئەوێ شەوێ دەگەڵ ئەوانی ڕۆنا قەول و قەرارە

هەر بەو شەوەی وەکاریان خست قەتار و نەهارە

گیا و پووشیان کێشا بەبارە

هەڵیان بەست چۆم و ڕووبارە

ئاویان لە دەشتی خورماڵغێ دەنا ببێتە زەل، ئەسپی بۆرەی لێ نەبێ قوتارە

تۆڕەوانان تۆڕیان داویت، دەیانگرت مراوییەکی باڵ کووڕی هارە

حازر بوو بازێکی خاسەی تەواوە

سبحەینێ بەیانی باز و مراوییان هەڵدەگرت، بۆ سەری مەیدانێ چوونە خوارە

برادەرێکی قۆچ عوســمانی بوو، دەیگوت: قۆچ عوســمان لەو خەوەی هەڵستە، ئەوە





مەرجکەر بۆ سەری مەیدانێ چوونە خوارە

تەگبیرێک بۆ من بکە، خزمەتی کێهە ئاغای بکەم ئیختیارە.

دەڵێ: براله! ئاغای دنیایە فایدەی نییە، خۆت بسپێرە بەخوڵای دوامەتی بەجەببارە.

دەیگوت: ئەســـپی بۆرەم بۆ بێننە دەرێ، لێی بکەن زینی مورســـەت، بیاوێنە سەری قایشی بوڵغاوە

ئەو تۆڵە و تاژییانە بەرنە ژوورێ، بڵا ئازا بێ نەکێشن؛ ئەمن دەبم گوناهبارە

بانگێکم وەبەر ئەو خوڵایە ئەگەر بۆخۆی جەبارە!

دەیگوت: پیرسوار، بەقوربانت بم، ئەوجار بەهێمدادم وارە (وەرە).

بەقەد دوو هەزار کەســـی لەوبەر ئەوبەری مەیدانـــی خورماڵغێی گرت قەرارە. هەرچی بەوی دۆست بوو گریان و هاوارە

دەیانگوت: ڕەمانەی ئەسپی بۆرە دەکەن، سەری قۆچ عوسمانی دەدەن لە قەنارە.

هەرچی بەوی دژمن بوو شادیی بوو، پێکەنین بوو، دەیگوت: ئەوجار دەرناچێ ئەسپی بۆرە، ڕەمانەی دەکەن، سەری ویش دەدەن لە قەنارە

بەغدا خۆش دەبێ لە کۆڵ دەبێتەوە ئەو شەیتان و شۆفارە.

ئەگەر ســـەری جڵەوی ئەســـپی بۆرەی وەرگێڕا، بۆ سەری مەیدانێ دەهاتە خوارێ، لە هێندێک جێیان بە ڕۆیین لە هێندێک جێیان بە نەرمەغارە،

هەتا دەگەییە مەرجکەران دەیگوت: هەر ئەو قســـەی شەوێ دیم دەگەڵ ئەنگۆ قەول و قەرارە.

ئەمن لە قەولی خۆم نابمەوە، دەبێ تەمام ببێ ئەو گوفتارە.

دەیگوت: یا ئەڵڵاهـ، یا خوڵای کەریم، یا پێغەمبەری موختارە!

پیر سوار، هاوارم وەبەر ئەتۆیە دووبارە!

باز و مراوییان بەردان، ئەویش دەســـتی بەجڵەوی ئەســـپی بۆرەدا دەهێنا، لە ســـێ فرسەقی مەیدانی خورماڵغێ دەهاتە خوارە

ئەگەر خەلاس دەبوو، ســـەری جڵەوی هەڵدەکێشا، ئاوڕی وەپشتی خۆی دا، تەماشای کرد باز و مراوی دێن بەچریکەچریک و هاتوهاوارە

دەچوونە تەماشای شوێنی ئەسپی بۆرە کەیخودا و ئەمیندارە

تەماشایان کرد بەردێک بەقەد دەنکە نۆکێکی لە قوڕێ چۆتە خوارە

هێندێک دەیانگوت: ئەوە جێی ناڵە. هێندێک دەیانگوت: جێی بزمارە.




هێندێک دەیانگوت: ماڵە خێوت بەقوربێ گیرێ ئەســپی بۆرە، دەگەڵی دەرناچن باز و باڵدارە.

قۆچ عوسمان دەمودەست دەبوو سوارە

دەهاتە کن میرسەفودین بەگێ، ئیکلامی دەکێشا سێ جارە

دەیگوت: ئاغا! بەقوربانت بم، یانە بۆخۆم مەرەخەس بکە

یانە شتاقان لەو شارەی ناکەم ئیختیارە».

ڕۆدەنیشتن کەیخودای دە نابەکارە،

وەکیل و وەزیر و موختارە

قاقەزێکیان دەنووسی بۆ سوڵتانی ئەستەمبوڵێ ئەوجارە

بەقاسیدی دا بەڕێیان دەکرد بەهاوارە:

سوڵتان! ئەسپێکی بۆرە بۆ میرسەیفودین بەگی هاتووە بابی بەحرییە، بۆخۆی باڵدارە

لەتوو زیاتر کەس قابلیەتی نییە، پێ دە ڕکێفی نێ، لێی ببێ سوارە.

ســـوڵتان قاقەزێکی نووسی لەبۆ میرسەیفودین بەگی: ئەسپی بۆرە و مەرکەبی سەگڵاو سوارین، وەرنە ئێرە، بەنگۆم هەیە کارە.

میرسەیفودین بەگ گوتی: گووی خوارد لە گووی بابی، ئەمن جارێکی دی خزمەتی وی ناکەم ئیختیارە.

حەقیش دەگەڵ بەغدایە نییە، ئەوە داگیرم کرد یەکجارە!

ئەوە خەبەرە چوو بۆ سوڵتانی ئەستەمبووڵێ دووبارە.

سوڵتان تەگبیری دەکرد بە مەخلووقی دنیایە:

ئەوە تەماحی هەیە، لێم داگیر بکا بەغدایە.

ئەوجار خەبەریان دا بە میرسەیفودینی:

دەبێ تەشریفی موبارەکت بێ سوڵتان ببینی.

میرسەیفودین دەڵێ: ئەمن سوڵتانم بۆ چییە؟

قبووڵ دەکەم لەمسە و ئورووسی سوڵتانم قبووڵ نییە.

سێ ساڵان دەگەڵ قۆچ عوسمانی گەڕان، نەهاتنەوە ئاوەدانییە.

سوڵتان فەرمووی: عەیب و شوورەییە

نۆکەری من بۆ بارگینێکی بگەڕێ لە وڵاتییە.

کێ بوو لە سوڵتانێ ئاقڵدار و دانا




بۆ میرسەیفودینی مۆر کرد قورعانە:
هەڵستێ، بێتە ئێرەکانە
ئەمن لێی ناستێنم بارگینی، هەزار تەگبیرم هەیە، چۆڵ بوو ئەو عەرز و مەکانە
ئەو ئەسپە موبارەک بەوی بێ، ئەوا بۆم نارد قورعانە.
ئەســپەکەی بێنە ببینم مەسڵەعەتێ دەکەین. ئینجا شەڕیشم لێ قەومیوە دەگەڵ هەر چوار دەوڵەتانە.
ئەگەر میرسەیفودین وای دەزانی
تەگبیری کرد بە خزمانی:
دووڕوو نابێ بۆ سوڵتانی
دەبێ نۆکەری قەدری بزانی
بچۆ بەخۆت و قۆچ عوسمانی،
ئەودەمی لەوێ خۆی زانی
ئەگەر سواربوو بەڕەوانی
دەگەڵ نۆکەری وەک قۆچ عوسمانی
دەڵێ: ئەوە دەڕۆم بۆ خزمەت سوڵتانی
خەبەر بدەن بە دایکم بزانی.
دایکی لەبەر شین و گریانی
فرمێسک دێ لە چاوانی
دەڵێ: ڕۆڵە! مەچۆ کن سوڵتانی
بەخوڵای، سەرت دەبڕن لە گیانی
تەماشاکەن قۆچ عوسمانی
غەزەبی بۆ کوڕی من هانی
هاوار لەبەر غەزەبی سوڵتانی!
قەت بووە دەگەڵ ئاغات بێ غەیانی.
گوتی: دایە چارەم نییە؛
سوێندی خواردووە بە ڕەببییە
کەلامولڵای مۆر کردییە
ئەوا لە بۆ منی ناردییە

لەکن سوڵتانی درۆ نییە.
دایکی یەک بە بەغدایە گریاوە
دەڵێ: کوڕم سەر نایەنێتە دواوە
بێ کوڕم زمانم سووتاوە
سەلام لێ ڕابوو کەسم نەماوە
کەسم نەماوە لە دنیایە
کوڕم سەر نایەنێتە دوایە
چ بکەم، بەغدا بێ ئاغایە
خەبەر بۆ عورووسی بچوایە
دەشقەم تکایان بۆ بکردبایە.
میرسەیفودین بەڕەوانی
بەخۆی و بەقۆچ عوسمانی
چوو لە بۆ خزمەت سوڵتانی
میرسەیفودین زۆر ترساوە
ئاوڕی وە قۆچ عوسمانی داوە
دەڵێ: نەترسێم سوڵتان گەلێک پیاوە.
قۆچ عوسمان دەڵێ: قوربان سوڵتان زۆر تەواوە
کەلامولڵا مۆرکراوە
هەموو قسێکمان بڕاوە
تا چوو لە ئەستەمبووڵێ بوون پیاوە
حەوتوویێکی لەوێ مەحتەل ماوە
خەبەر بە سوڵتان دراوە
گوتی: بڕۆن، ڕامەمێنن
بەخۆ و بە ئەسپی بۆرەی بێنن
ئەگەر هاتە گەییە دیوانێ
ئەسپی بەرنە ئێختەخانێ
دە ملی کەن کۆت و زەولانێ
دە ملی کەن بەخۆی نەزانییە




ئەو ساڵ حەوت ساڵە لە من یاغییە.
کە کۆتیان دە ملی کردییە
بردیانە خزمەت سوڵتانییە
عەرزی کرد: قوربان سووچم چییە؟
سوڵتان فەرمووی: جوابت نییە.
عەرزی کرد: ئەو کەلامولڵایەت بۆ مۆرکردییە؟
خۆ لە زاتی توو درۆ نییە.
درۆ نابێ بەڕەوانی
بەفەرمانی خولای سوڵتانی
ئەمینی پێغەمبەرانی
ئاخر لەسەر چم هەیە غەیانی؟
سوڵتان فەرمووی: مەیدوێنن
قورقوشمی بۆ وەتوێنن
نابێ بەزێڕی بخنکێنن
میرسەیفودین دەگرییە
دەڵێ: قوربان! قابیلەتی ئەوەم نییە
بەغدام دا بەتوو بەیەکجارەکییە
مەمخنکێنە سووچم نییە
سوڵتان فەرمووی کەس نەمدوێنێ؛ تکا نییە
بەحەقی ئەوەی ڕەببییە
دەنا بارگینم بۆچییە؟
ئەو ساڵ حەوت ساڵە یاغییە
خەرج و پیتاک بۆ من نییە
ئەمن بەغدای وام بۆچییە؟
هەروا دەزانم شار نییە.
هیچ کەس نەبوو تکاکار
بۆخۆی گەلێک گریا بەزار
هاواری کرد بوو: یا جەبار!

یا بینای پەروەردگار!
یا پێغەمبەری موختار!
خەلاس بم ئەمنی گوناهکار.
چەند هاواری کرد پاڕاوە
فەقیر تکای بۆ نەکراوە
بەپاش ئەوەیان گێڕاوە
هیچ وچانیان لێ نەداوە
هەر بردیان لە ستۆیان داوە
جێبەجێ سەری بڕاوە
خەبەر بەقۆچ عوسمان دراوە
دەڵێ: چاوم کوێر بوو ئاغام نەماوە
ئاغاکەم چوو بوو ئەوجارە
سەریان لەوێ فڕێ دا خوارە
بەحەقی ئەوەی جەبارە
پاش میرسەیفودینی نازدارە
لەسەر ئەسپی بۆرە بوو ئەو کارە
ئەمن پێی بووم گوناهکارە
هیچ کەس نابێ لێی بێ سوارە
لێی سواربێ لە مەیدانێ
بیکێشنەوە ئێختەخانێ
ئەمن دەمبڕێ ڕێی گوزەرانێ
ڕێی گوزەرانێم بڕاوە
ئەدی کەلامولڵایە چ بوو ناردی لەولاوە؟
نێوی خولای تێ نووسراوە
فەرمان وە درۆ گەڕاوە
ئیشالڵا خولا لێی تێک داوە
ئەمن دنیای ڕوونم نەماوە.
قۆچ عوسمان پیاوێکی هاری




بۆ ئاغای گریا بەیەکجاری
هاواری کرد: یا پێغەمبەرا تور موختاری
هەم موختار و مودەبیری
بێ ئاغا چ بکەم ئەمنی ئێخسیری
دەستی دابووە قەبزەی شیری
گوتی: خوڵایە، کەس نەزانێ
لینگی دا بۆ ئێختەخانێ
کە گەییە ئەوێ، دانامێنێ
دەستی دا، شیری دەردێنێ
پاشووی ئەسپی بۆرەی دەپەڕێنێ
دەڵێ: لەپاش ئاغام نەمێنێ
بڵا نەمێنێ بەیەکجاری
ئەمنیش حەرام دەکەم سواری.
خەبەر بە سوڵتانی دراوە
ئەویش لە ئێختەخانەی گیراوە
سەری ئی ویش براوە
خەبەر بەبەغدایە گەڕاوە:
هەرتکیان مودەیان تەواوە.
دایکی میری دەڵێ:
هاوینێک گەیوەتە دایکی میرسەیفودین بەگی؛ چەند هاوینێکی گەرم و دژوارە
وەک بەدەشتی باڵینێدا دەچوومە خوارە
ئەمدی چ پیاوی بەفێس و دەستڕۆک، کیژی مل بەهیزارە
وەکو بڕێکی دی بە دەشتی باڵینێدا دەهاتمە خوارە
تەماشا دەکەم، غەڵەبەیەک لە دوور دیارە
ئەگەر دەگەیمەوە برا ماقووڵێکی لێک دەکرد پرسیارە.
دەمگوت: ئەوەە چییە لەوێ دیارە؟
دەیگوت: نازانم بەیەکجارە.
بڕێکی دی بەکۆلانی ڕۆمییاندا دەچوومە خوارە

تەماشام دەکردەوە ئەوجارە

ئەو غەڵەبەیە دوو هەزار کەس دەبێ بەئەژمارە

دایک ســـەری بێ بەقوربانی سواری لە شـــین بۆرەی، لەبن خێوەتی وەزیری بەغدایەی دەکرد تەقڵە و هاوارە

خولا ماڵە ڕۆمییان خراکا، بەدەنگێکی بڵند هاوار دەکەن

سەری میرسەیفودینیان بڕی قالبیان لە مناران فڕێ دا خوارە.

لەو دەوری هەتا ئەو زەمانی

بابادەمی، هەتا نۆشیروانی

لە نۆشیروانی هەتا جمجمە سوڵتانی

هیچ کەسم نەدی وەک میرسەیفودین بەگی نان بدا، سەغی بداتەوە نانی

ڕاوکەرە، ڕاوی خۆی داویتە بەڕیە و بیابانی

کار ئاسکان دەگرن بە قەفی گۆچانی

قەڵێدەی زێڕیان دە ملی دەکا، بەریان دەداتەوە بیابانی

دایکی دەڵێ: ڕۆڵە! ئەوە ناشوکرییە.

دەڵێن: دایە! ناشوکری نییە، لەپاش مردنی من ساڵێکی دەبێتە نان گرانی

ئاغا و نۆکەر و نایبی من ڕووی خۆیان بکەنەوە چۆڵ و بیابانی

کار ئاسکان بگرن بە قەفی گۆچانی

قەڵێدەی زێڕیان لە ملی دەرێنن بیدەن بەپاروو پارووی دە نانی

ئەو ئاسکانە بەردەنەوە بیابانی.

دایک دەڵێ: ڕۆڵە! ئەوە بەخشەندەیی نییە. دەڵێ: دایە! بەرشەوێ دەکوژمەوە کەڵی، پاشەوێ بەرانی.

دایک دەڵێ: ئەوەش بەخشەندەیی نییە. دەڵێ: «دایە! دەبەخشم شیرێکی دەبان بەندە شیرێکی سورمە کەوڵێکی دە ڕۆمییانی».

خولا! ماڵە ڕۆمییان خرابکا؛ بەدەنگێکی بڵند بانگ دەکەن، دەڵێن: سەری میرسەیفودین بەگیان بڕی، قالبیان فڕێدا دیوەخانی دە تەتەرخانی.

ئینجا بەگمە خاتووم دەڵێ: خوشکێ گەورەی خانێ!

بڵا ئەســـتۆی خۆمان بەرن ســـەر کووپەڵەی خمی. ئەتوو تێبنێ بەرسەرێ ئەمن تێی دەنێم بەرتانێ




ئەستۆی خۆمان هەڵببڕین بە تیخان سەری خۆمان بتاشین بە گوێزانێ
ئەوڕۆ دوو ڕۆژە نوڕەنوڕی تاژی و تۆڵان نایە لە دەرکی ئۆترەخانێ
چووڕی بازی نایە لە جبەخانێ
کۆڕە کۆڕی ئەسپی بۆرە نایە لە دەرکی ئێختەخانێ.
مافوورە و سەرەندازان تۆزیان لێ کەوت، کەس نییە لەسەری بکا سەرترینجانێ
تاس و تەبەغ ژەنگیان لێ کەوت. لە پاش کاکی وەک میرسەیفودینی کەس نییە پێی بکێشێ شیلانێ
خولا ماڵی ڕۆمییان خرابکا، سەری میرسەیفودینیان بڕی، کەس بە جەندەکی نازانێ
دایک سەری بەقوربانی سەری سواری شین بۆرە بێ، وەکو لەبن خێوەتی وەزیری بەغدایە دەیکرد تەقڵە و جلیتانێ
دایک دەڵێ: چ بکەم لێم بڕا چارە
هەرچەندی خانووم و خاتوونن، پاکی بێ ئاغایە، وەکیل و وەزیرم بێ سەردارە
نۆکەر و تابیعەی کوڕی من پاکی ئەستۆ خوارە
ئەدی قۆچ عوسمان نەهاتەوە لێی بکەم پرسیارە؟
دایک سەری بێ بەقوربانی سواری لە شین بۆرەی، ئەگەر لەبن خێوەتی وەزیری بەغدایە دەیکردەوە تەقڵە و هاوارە:
ڕۆڵە، بەگمێ، گەورەێ، وەرە، کوێنی دەبەر بکەین ئەوجارە
خۆمان باوێینەوە کن شاهەنشای، دەشقەمی بنداتێ تۆپ و تۆپخانە و سەربازی بەکارە
حاشا لە دینی کوردی عرووس و ئینگلیس بەئیختیبارە
ئەگەر خوێنێم بۆ نەستێنن ئەوجارە
دەچم لە بارەگای خولای دەبمە عەرزچی و شکایەتکارە.

***



## جولندی

مەدینـــە تازە ئـــاوەدان کرابۆوە. پێغەمبەری خوڵای لە مەدینـــی بوو. دنیا هەموو ئی کافران بوو. بەغەیرەز مەدینەی. ڕۆژێکی هەموو کافران چوونە دیتنی پادشـــای جوڵندی. تەماشایان کرد دوو مووی لە چەنەی سپی ببوو. وەزیرێکی بوو گوتی: «قوربان! قەت بووە ئەتوو مووت ســـپی ببێ؟» گوتی: «مووی ســـپی هەر بۆ من چاکە». گوتی: «لەبەر چی دەفەرمووی؟» گوتی: «وەڵڵاهی لەبەر تایفەی حیز و خراب». گوتی: «ئاخر حیزییەکەی مە چییـــە؟» گوتی: «وەڵڵاهـــ، حەمەدەمینێک[1] پەیدابووە مەدینەی ئـــاوەدان کردووە. عەلییەکـــی جادووکاری هەیە؛ ڕەعیەت و مەخلووقی مـــن دەکوژێ. بەخەزای دەزانێ. ئەو عەلییە نێویان نا شێری خوڵای. ئەمن دەمرم، ئەو عەلییە بەقەوەت دەبێ مەدینە دەستی لە کافران دەســـتێنن. بوت و سەنەمی من دەشـــکێنن. ئەمن دە قەبریشدا ناحەجمێم؛ لە حەیفی ئەو حەمەدەمینێ ئەو مووەم لێرە سپی بوون». وەزیر گوتی: قوربان. جادووبازان بێننە ســـەری بە ســـیحر بیگرن، بیکوژن، تاقە ســـوارێکە، لە کۆڵی بکەنەوە». پادشای جولندی گوتی: «هەزار سیحرباز دەرەقەتی نایە؛ سیحری ئەو عەلییەی هێند زۆرە، کەس دەرەقەتی نایە». شەیتان هاتە مەجلیسی جوڵندی گوتی: «قوربان! بۆ وا موشەوەشی؟» گوتی: وەڵڵاهـ شـــەیتان! لەبەر ســـیحری عەلی جادووکار». گوتـــی: «قوربان! پاڵەوانان بنێـــرە بیکوژن». گوتی: «حەمەدەمین هێندەی مەکر هەیە دە مەدینەیدا عەلی جادووکار

---

[1] ـ حەمەدەمین مەبەست (محمد الامین)ە کە نێوی پێغەمبەرە.

ناکوژرێ». شـەیتان گوتی: «قوربان! ئەدی مەسـەلەعەتت چییە؟» گوتی: «کەسـێک خەبەرم بۆ بێنێ حەوت ڕۆژان لە مەدینەی وەدەرکەوێ، مەدینەی وێران دەکەم؛ داری لەسەر بەردی نایەڵم. حەمەدەمینی دەبەتڵێنم. بۆ کوێ دەچێ بەتاقەسـوارە؟ خۆ چ موحەمەدی نامێنن بچێتە نێویان. دنیا هەمووێی خۆمە هەر جێیەکی بچێ هەر دەیکوژن».

شەیتان گوتی: مزگێنی حەوت ڕۆژانت بۆ بێنم چم دەدەیەی؟

گوتی: لە بوت و سەنەمی زیاتر، لە چاوێکیم زیاتر هەرچی ئەتوو بتەوێ دەتدەمێ.

شەیتان کە لەوێ هەڵستاوە

محلەقێکی لە خۆی داوە

هەتا مەدینەی موبارەک ڕانەوەستاوە

خۆی کردە سۆفێکی ئیفتادە، دە شاری مەدینەی گەڕاوە

چەن مودەتێکی کرد تەواوە

ڕۆژێکی کە لە خەوێ هەڵستاوە

تەماشا دەکا عەزرەتی عەلی سوار بووە راوەستاوە

پرسی: ئەوە سەفەری کوێی لەبەرە بۆ کوێ دەچییە؟

ئەسحابێک جوابی داوە بەبێ قەیدییە

گوتی: نازانم سەفەری کوێی لەبەرە ئەما عەزرەتی فاتیمە لە ماڵ نییە

یەکی دی گوتی: ئەوا لە دوای وی بووە بەئێڵچییە

یەکی دیش گوتی: دەچێتە خەزایە بەیەکجارەکییە

یەکی دی گوتی: وەڵڵاهـ! بە شەڕە نە دەعوایە

عەزرەتی فاتیمەی لە ماڵی خولایە.

ئەوی دی گوتی: شەوێ دی چووە خزمەت حەزرەتی ڕەسوڵڵایە.

وەدووی فاتیمەی دەکەوێ دەچێتە کابەتوڵلایە.

ئەگەر شەیتان ئەو قسەی بیست تەواوە

محەلەقێکی لە خۆی داوە

هەموو دنیایە بە سەیاحی گەڕاوە

حەزرەتی عەلی ڕکێفی لە دولدولی داوە

زۆری بەپەلە ئاژواوە

لەهیچ کوێی وچان نەداوە




هەتا چوو لە مەکەی موعەزەمە بوو پیاوە
شەیتان حازرە، راوەستاوە
حەزرەتی عەلی نازداری
دوو رکاعەتی نوێژ کرد لە بارەگای جەباری
زۆر پاڕاوە بەهەژاری:
یا خالەق! بۆخۆت موختاری
لە هەموو جێیەکی دیاری؟
دنیا و قیامەت ڕۆت نا بەیەکجاری
جا لەوێ ڕۆنیشت خەوی بەسەردا باری
شەیتان خۆی لێ حازر کرد بەیەکجاری
بەیەکجاری خۆی حازر کرد
سوورەتی کچێکی جوانی دەگرت
بەیەکجاری خۆی مەعبووب کرد
خۆی دەباڵ عەزرەتی عەلی ڕاکرد
دەمی بەدەمیەوە نا هۆشی برد
هیندە جوان بوو، ئەوی کەیفی گرت
دە خەوێدا گانی پێ کرد
ئەگەر لە کاری خۆی بوو تەواوە
عەزرەتی عەلی لە خەوی هەڵستاوە
گەلێک، گەلێک بۆخۆی گریاوە
گوتی: هەڵبەت خولام لێ ڕەنجاوە
هیچ حورمەتی من نەماوە
بۆیە شەیتان قەوەتی بەمن شکاوە.
وای گوت عەزرەتی عەلییە
گوتی: ئینجا بزانم لێم ڕەنجیدە نەبووە ڕەببییە
بزانم قەوەتی جارانم هەیە یان نییە
حەزرەتی عەلی گریا و گوتی:
لە خۆم ناچارێ

گەییبە دیواری حەسارێ
کە شانی وە دیواری داوە
گوتی: بزانم جورحەتەکەم ماوە.
بەدڵ لە خولای دەپاڕاوە
سەڵەواتی لە پێغەمبەری داوە.
کە هێزی وە دیواری بەیتێ داوە
پێی چەقاند و شانی داوە
دیواری بەیتێ وەکو جۆلانەی سووڕاوە
گوتی: یا ڕەببی خولایە! شوکری توو ناکەم تەواوە
دەگەڵ شەیتانم لێ قەوماوە
جا چ بکەم بۆ چۆڕێک ئاوە؟
لەشم نوێژی پێ نەماوە.
کاتبێک هاتووە لەولاوە
سەڵاوی لێ کرد تەواوە:
بەخێرێی، سەر ئەو دوو چاوە
دەستی حەزرەتی کێشاوە
بردی کانیی نیشان داوە
کە شێر لەوێ ڕاوەستاوە
شەیتانیش هاتە ئەو ناوە
پەردە بۆ شێری گیراوە
کە خۆی دە کانیە هەڵکێشاوە
شەیتان سەدەقی لێ داوە
سەدەقی لێ دا بێ قەیدییە
شەیتان بەسەر کانیە هەڵمیستییە
خۆی قوم کرد عەزرەتی عەلییە
ئاخر شەیتان نەبەدییە
دڵۆپێک لە میزی وییە
پەریە سەر سەری شێرییە

دەگەڵ ئاوێ تێکەڵ ببیە
چوو گرتی هەرتک چاوییە
چاوی گرتن ئەو فەقیرە
هەرتک چاوەکەی داگیرە
بەحاڵ جلی دەبەرکراوە
لە ڕاستەوخۆی، ڕۆنیشت زۆر گریاوە
زەفەری بۆ هەموو جێیان براوە
خەبەر بە فاتیمەی دراوە
دەڵێن: عەزرەتی عەلی لێی قەوماوە
هەرتک دەستی لەسەر چاوی ڕۆناوە
دوڵدوڵی لەکن نەماوە.
کە عەزرەتی فاتیمەی وای بیستییە
یەکجار خۆش هات بەڕەوانییە
دەڵێ: ئامۆزا! ئەوە چت لێ قەومییە؟
هەر ئەتووی شێری ڕەببییە
خۆ زەلیلی بۆ توو نییە
دەڵێ: سەفەری توو بێ فیکری بردم
داخ و دەردی توو سواری کردم
دەتگوت لە سوێیانت مردم
لەکنم شەیتان وای لێ کردم
دەمگوت: هیچ کەس پێم نابا چارێ
شەیتانی بینم بەردی لێ بارێ
لێی ئەستاندووم ڕێی ئیختیارێ
ئێستا چاوم لێ ناکا کارێ
حەزرەتی فاتیمەی فەرمووی چاوشەهێنم!
خوداوەند ببێ بەدەزبێنم
جا دەرمانی لە کێ بستێنم
بنێرم ئەرەسوو و لوقمانی بێنم

ئەگەر شەیتان وای دەزانی
خۆی خلقەت کرد بە موسڵمانی
چەندە پیرێژنێکی لەتیف و جوانی
نوور هەیە لە نێوچاوانی
خۆی کردە دایەی ئەرسوو و لوقمانی
گوتی: هاتوومە کن شێری یەزدانی
لەکن من هەیە دەرمانی
کە وایان زانی ئەسحابە
ماشەڵڵا چەند پیرێژنێکی جوانە
- بە نەحلەت بێ ئەو شەیتانە -
دەرمانی کرد دە چاوانە
بێ هۆشی کرد بەستەزمانە
گوتی: بێنن بۆی بکەن جۆلانە
بڵا قەناعەتێ بگرێ ئەو بەستەزمانە
دەبێ رای ژێنن، هەتا حەوت شەو و حەوت رۆژانە
ئەگەر چ دەرمانی دیکەی تێ کەن زەلیل دەبێ لە چاوانە
ئەمنیش رووڕەش دەبم لە بارەگای بینای چاوانە.
بۆی دانا قەرار و پەیمانە:
ئەمن ئەوا دەڕۆم لێرەکانە
عەزرەتی فاتیمە گیانە
نیگاهداشتییێ بکە لەو زەمانە
نابێ یەکی دی بێتە ئێرانە
دە چاوی وی بکا دەرمانە
ئەگەر شەیتان وا دەزانێ
دەستی کرد بەلینگدانێ
کەس نایبینێ پی بزانێ
کێ بوو لە شەیتانی نەحلەتییە
هەر دەڕوا، پایەی بۆ نییە

هیچ کەس نایبینێ و غەیبییە
لەوێی ڕۆنان کێشکچییە
چووە کن دوڵدوڵی بەدزییە
نسحەتی وی زۆر کردییە
دوڵدوڵ لێی قبووڵ نەکردییە
تەماحی بوو بیگرێ بە گازییە
خۆی ئاویتە سەر سەرییە
شەیتان دەڵێ: «ئەگەر دەمکوژی حەقت نییە
کوشتنی من بە چەنگ توو نییە.
چووە بۆ کن زولفەقارییە
ئەو بێ زمانە ئاگای لێ نییە
گوتی: زولفەقاری لێ بدزم بەیەکجارەکییە
بیبەم بۆ شای جوڵندییە،
لەکن خولای وای پێ خۆش نییە
ئەگەر ئەو کارەی کرد بوو تەواوە
محەلەقی لە خۆی داوە
چووە پێش جوڵندی ڕاوەستاوە
گوتی: مزگێنیم بۆ توو هێناوە
ئەسحابە کاریان تەواوە
حەزرەتی عەلی چاوی داگیراوە
جا لەوڕۆکە بەولاوە
قەراری حەوتووێکم ڕۆناوە
دەرمانی چاوی تەواوە
ئەو شەیتانی نەحلەتییە
بۆ شای هێنا مزگێنییە:
هەر ئەتوو پادشای عەسرییە
شێری خولای لە ماڵ نییە
دەڵی: بەڵات لێ کەوێ، شەیتانی نەحلەتییە




بۆزەسوارێک لەوێ وەدەردەکەوییە؛

لەبەر ئەو بۆزەسوارەی کەس ڕێی دە مەدینەدا نییە

جولّندی دەڵێ: بەڵات لێ کەوێ، شەیتانی نەحلەتییە!

مەدینەی نەبیم نوورانییە

لەبەر ئەو سوارەی کەس ڕێی نییە.

شەیتان عەرزی کرد: پادشای جولّندییە!

ئەو بۆزەسوارە یەقینییە،

ئەوە پێی دەڵێن شێری ڕەببییە

ئەوە خۆشەویستی نەبییە

بەو بوت و سەنەمەی ئەتوو دەیپەرستییە

بەقایەم پێ بکە بەسەحییە

لەبەر توو بووم بەئێڵچییە

لە مەکەی موعەزەمەم گرتییە

چاویەشم داوە بەوییە

دەرمانم بۆ دروس کردییە

سەبەب بە شاری جولّندییە

هەڵبەت قەرارت تا سەر نییە

ئەمنت نارد بەدڵخوازییە

دەرمانم کرد دە چاوییە

ئێستا ئەتوو بەقات نییە

لەکنم مەیلت پەشیمانییە.

پادشای جولّندی وای گوتییە:

شەیتان ئی من و توو برایەتییە

هیچ ماڵم لە توو تەخسیر نییە

قسەیان خۆش بوو دەگەڵ شەیتانی

شا وەری گرت ئیمتینانی

ناردیە سەر بووسی سوڵتانی

سەدهەزاری لەشکر هانی




هەزاری بوو کەمبەرزێڕین

هەزاری بوو کورسی نشین

پاک لە سەری عەلی قین

هەزاری ببوو هەر میرزا

پاکی هات پێشوازی پادشا

شای جولندی زۆر بەناوە

لەنێو خەڵقی راوەستاوە،

تەگبیر لە عەلی ڕۆنراوە:

مەدینەی دەکەم بڵاوە.

سەرداریک هاتبوو لەولاوە

بەیداغی لەسەر ڕاوەستاوە

ئیکلامی پادشای کێشاوە

گوتی: قوربان هەڵبەتە عەلی نەماوە

دنیا ئی توو یەکبەر کراوە.

یەکی دی هات لە نەبەدییە

گورزێکی لەسەر شانییە

هاتە کن شای جولندییە

گوتی: قوربان! ئەو قۆشەنە چییە؟

گوتی: ئەوهە بۆ سەر عەلییە

گوتی: بەسەدەقەت بم ئەو تاقە سوارە چییە؟

یەکی دی هات بەدڵ و جانە

ئەوی سەرکردەی تۆپانە

هاتە کن شای نەوجوانە

گوتی: قوربان! مەدینەی دەکەم وێرانە.

پادشا بەوەی پێ کەنی: گیانە!

بەو بوت و سەنەمەی پێم هەیە متمانە

ئەگەر شەیتان بکا درۆیانە

یەک نایەتەوە ئێرانە

عەلی هێن زاڵم و زۆرزانە
بەشەیتانیش ناکەم متمانە
چونکە نیەتی جێ و مەکانە
کێ بوو لە پادشای تەواوە
لە هەموو عێلاتی گێڕاوە
کە لەشکری بوو تەواوە
جوڵندی پێی دە ڕکێفی ناوە
حەوت شەو و ڕۆژانی ئاژواوە
ڕۆژێکی بۆ ئێوارێ دەورەی مەدینە دە حەسار ناوە
بیلالی حەبەشی بدا لە بانگی ئێوارێ
تەماشا دەکا چوار تەرەفی مەدینەی ماوە دە حەسارێ
کێ بوو لە بیلالی عەبەشییە
نەیدا لە بانگی موحەمەدییە
دەچوو ئیکلامی نەبییە
عەرزی کرد: یا ڕەسوڵڵا سەری منت بێ بەقوربانی سەرییە!
بانگم نەدا چارەم چییە؟
هیچ بڕ تەخسیر لە من نییە
لەشکرێکی زۆرم دییە
بێ سامانە و چارەم نییە
بانگیش بانگی موحەمەدییە
جا نازانم فەرمانت چییە؟
وەهای فەرموو نەبییە
ئەی بیلالی عەبەشییە
بۆ خاتری من ببە ئێلچییە
بچۆ بزانە ئەو لەشکرە چییە؟
کێ بوو لە بیلالی عەبەشییە
بە فەرمانی خۆشەویستی ڕەببییە
ڕۆی و نەیکرد تەخسیرییە




بزانین قسەی یەکجارەکییە

لە پێشەوە گەییە ئالآچییە

بیلال گوتی: ئالآچییە!

ئەتوو و دینەی دەپەرستییە

سەرکردەی ئەو لەشکرە کێیە، لەچی شەقییە؟

ئالآچی گوتی: بیلالی عەبەشییە!

بەهەقی ئەو خولایەی لە ژووری سەرییە

قسێکم پێ بڵێ بەسەحییە

بیلال گوتی: بەسەری خۆشەویستی ڕەببییە

هەرچی بڵێی عیجبی نییە

جوابت دەدەمەوە بەدڵییە

ئالآچی گوتی: بیلال شەرت و شرووتی دینو چییە؟

بیلال گوتی: لە گەورەی خولای، لە خۆشەویستی ڕەسووڵلایێ ماشەڵلا.

ئالآچیی بڵێ: واشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمدا رسول الله.

ماشەڵلا لە بیلالی نەوجوانە

بە ئالآچیی کافرانی هێنا شاد و ئیمانە

ئەویشی کرد موسڵمانە

بیلال گوتی: ئالآچییە!

ئەدی سەرکردەی ئەو لەشکرەی کێیە لە چی شەقییە؟

گوتی: بیلالی عەبەشییە!

سەرکردەی ئەو لەشکرەی کافرێکە لەوانی جوڵندییە

هاتۆتە سەر مەدینەی دەڵێ خراپی دەکەم بەیەکجارەکییە.

ئەگەر بیلال وای بیستییە

هەموو مووی قالبی بوو بە دەرزییە

لە هەموو بەرگان تێ پەڕییە

چۆوە خزمەت ڕەسووڵلای بەیەکجارەکییە

دەڵێ: یا ڕەسوڵلا! سەری منت بێ بەقوربانی سەرییە

هێناومەتەوە قسەی سەحییە

سەرکردەی ئەو لەشکری کافرێکی جوڵندییە
هاتۆتە سەر مەدینەی دەڵێ: خراپی دەکەم بەیەکجارەکییە
بەجارێکمان لێ پەیدابوو ناڕاحەتییە
ئیمامی عومبەر چۆتە گەنم کڕینێ، حەزرەتی عەلی چۆتە بەیتوڵڵایە؛ لە ماڵ نییە.
ڕەسوڵڵای فەرمووی: «بیلال مەترسە، هۆمێدی مە ڕەببییە».
پێغەمبەری خولای دەست هەڵدێنی:
خولایە! ئەگەر ناتەوێ ئۆمەتێم لێ بەقرپێنی
چەند مەلەکانم لەژێر زەمینێ بۆ دێنی
چەندانم لەسەر زەمینێ بۆ دێنی
چەندیش هاتن لە ژێر زەمینێ، هەموو هاتنە یارمەتی موحەمەدی مەدینێ
دەستیان کرد بە خەندەقێ خەندەق درینێ.
ڕەسوولی خولای ڕاوەستاوە
تا خەندەگ بوو تەواوە
تەواون کرد بەدڵ و جانە
چل گەز قووڵە چلیش پانە
کە خەندەگ بوو تەواوە
پڕ لە ئاو ڕاوەستاوە
قامیش لەوێ هەڵستاوە
کە جوڵندی لە خەوێ هەڵستاوە
لەشکری پاک خڕ کراوە
ساحب مەنسەب هات لەولاوە
دەڵێ: سیحری عەلی زۆر تەواوە
ئەو خەندەقە چییە بنیاد نراوە؟
دوێنێ ئەمن ئەوهەم نەکەوت بەچاوە
کەنگێ لە عەلیان گێڕاوە؟
شەیتان گوتی: لێرە نەماوە،
ئەوە لە مەکەی دێشێ چاوە.
جوڵندی دەڵێ: سیحری عەلییە ڕۆنراوە




تەگبیرم بۆ بکەن بە هەمانە

بلا لێی دروس بکەین کڵ و پردانە

هەموو ڕۆژێ نایەمە ئێرانە

دەبێ مەدینەی بکەم وێرانە

وێرانی بکەم یەکجارییە

بکوژم تاقە سوارییە

دنیا بۆ من یەکبەر ببییە

قەت نەمێنێ موحەمەدییە

وایان گوت وەزیری وییە:

قسەی شەیتانی بەعی نییە

بە بوت و سەنەمێ سوێند خواردییە.

گوتی: عەلی لە ماڵ نییە

نابێ لەو کارەی خۆش ببییە

چونکە ئەو درۆی کردییە

ئەو شەیتانی نەحلەتییە.

ئیمامی عومبەر لە ماڵ نییە

شەیتان هێنای مزگێنییە:

مەدینە چۆڵ و خۆڕاییە.

شا گوتی: ئەدی ئەو خەندەقە چییە؟

گوتی: شا بەسەری توو ئاگام لێ نییە

ئەو ماینێکی ئیمامی عومبەرییە

لە ماڵی خۆی دەرپەڕییە

بەتەڵەبە و چارەی نییە

ماینی ئیمامی عومبەر لەوبەری بەدحاڵە

ئەسپی جوڵندی ڕەشە، زەنگییە، گەردن بەخاڵە

لێی سواربوو جوڵندییە

ئەگەر لەوبەری بەهەر چوار پێیان فڕییە

چل گەز خەندەقی قووڵ و خەندەقی پان وەبەری خۆی بڕییە

جولّندی دە مەدینەی دەگەڕا کۆلّان بەکۆلّانە
هاوارە لە من ئاسحابان لەبەر ئەو کافرەی دەرکیان لە خۆیان گاڵەدانە
دوازدە ئەسحابا بوون، لەو مەکانە
لەجێی ئیمامی عومبەر و حەزرەتی عەلی نەوجوانە
شەڕیان دەگەڵ جولّندی دەکرد، تابیان نەهێنا ئەو بەستەزمانە
تفاقی دوازدە ئەسحابانە، هەر دوازدەی لێ کوشتن
دەست و باسکی بەخوێنێ داڕشتن
بەخەندەقی چل گەز قووڵ و بەریندا ڕۆیشتن
ئەگەر ئەسحابە وایان زانییە
هەمووی شین و واوەیلا و گرییە
پاک ئیجماعی کرد، هاتە کن خۆشەویستی ڕەببییە
دەڵێن: یا ڕەسووڵلایە ببین بەقوربانی سەرییە!
ئیمامی عومبەر و عەزرەتی عەلی لە ماڵ نییە
ئەو کافرە هەمان قڕ دەکا چارەمان چییە؟
ڕەسووڵی خولای فەرمووی: «مەترسێن هۆمێدمان ڕەببییە.
دەستێکی دی گوتی: وەڵلاهی ئەوجار مەدینە بەجارێکی وێران دەبییە
ئەتوو بۆچی لەدووی عەزرەتی عەلی نانێری ئێلّچییە؟
ڕەسووڵی خولای دەنگ هەڵدەیەنی
دەڵێ: کەسێک جوابێکم بۆ وە شێر عەلی ڕابگەیەنی
قەسرێکی بەهەشتێ باقی لە من بستێنی.
دایکە پیرێک لەوێ بلّند دەبییە
دەڵێ: ڕەسووڵی خولای، بتبم بەقوربانی سەرییە!
ئەگەر پێناوداری منی بەقەسرێکی بەهەشتێ باقییە
ئەمن ئەوڕۆ جوابت بۆ دەگەیەنمە شێری ڕەببییە.
دەڵێ: دایکەپیرێ سەرسپییە!
وەناکەم بتبێ گلەییە
دەتدەمێ قەسری یەقینییە
دایکە پیرە وای گوتییە:

ڕێی نۆ شەو و نۆ ڕۆژان بۆت دەبم بەئێڵچییە
ڕێی مەکە و مەدینان هێندە کەم نییە
حەزێ دەکەم قسەی خۆم ببیەم بەسەحییە،
دا سبحەی لە تۆم نەبێ گلەییە
شکایەتت لێ ناکەم لە بارەگای ڕەبییە
بزانم لە بەهەشتێ باقی، لە قەسری من سوور یا سپییە؟
وەهای فەرموو سەردارە:
ڕێی نۆ شەو ونۆ ڕۆژان دەبییە زەحمەتکێش و خزمەتگوزارە
لە بەهەشتێ باقی، لە قەسری سوور و سپی دڵی خۆت بکە موختارە.
کێ بوو لە دایکی پیری سەرسپییە،
ئەگەر ئەو قسەی بیست لە خۆشەویستی ڕەبییە
دەستنوێژی خۆی هەڵگرتییە
بەرماڵی خۆی ڕاخست دوو ڕکاعەتی سونەت و دووانی نوێژ کردییە
لە دایکە پیرەی دوعاکردن بوو
لە ئێخی جبرایل بردن بوو
لە ڕەبی عالەمێ قبووڵکردن بوو
کێ بوو لە دایکە پیرەی گوڵباوە
لە خولای خۆی زۆر پاڕاوە:
لە مەدینەی خەراپ قەوماوە
شێری خولای لێرە نەماوە
کاک عومبەر ڕۆیی بەولاوە
ڕەبی سەفەرم ببێ تەواوە
جوڵندی هاتووە لەولاوە
پاڵەوانێکی تەواوە
ئەو شارەی دە مەحسەرە ناوە
دوازدە ئەسحابە کوژراوە
کەسی لە پێش ڕانەوەستاوە
دەڵێ مەدینەی دەکەم بڵاوە

دایکە پیرە ڕاوەستاوە

قنووتی دەخوێند تەواوە

شەقژنی لە باڵی خۆی داوە

چووە ئاسمانێ ڕاوەستاوە

ئیکلامی عەزرەتی عیسای کێشاوە

لە پێش دەستی ڕاوەستاوە

ئەستۆ کەچە، ڕاوەستاوە

حەزرەتی عیسا بۆی پاڕاوە

عەرزی وی ببوو تەواوە

دەڵێ ئەلحەملای کاری من نەبوو ساوە

لەوێ ئیجازەی وەرگیراوە

دایکە پیرە، مەرەخەس بوو گەڕاوە

نۆ شەو و نۆ ڕۆژ تەواوە

سەعاتێکی قەرار دانراوە

ڕەزای دوو کەسی بەڵەک چاوە

خۆشەویستی خولان بەناوە

لە عەزرەتی فاتیمەی کرد سەڵاوە

عەزرەتی فاتیمە دەڵێ: «عەلیکوم ئەســـلام و ڕەحمەتوڵڵاهی دایکە پیرە سەر هەرتک چاوی من هاتی

وەرە کن من بخۆ پاروێک زاد و زەوادی

دایکـــە پیـــرە دەڵی: عەزرەتی فاتیمـــەی، حەقە و بەڕێی دوور هاتمـــە، تێرم نەوەک برسییە

ئەتوو نازانی چ دەعوایەک لە ماڵی بابان قەومییە؟

هاتوویە سەر مەدینەی کافرێکی جوڵندییە

کوشتی دوازدە ئەسحابەی دە نەبییە

دەڵێ مەدینەی وێران دەکەم بەیەکجارەکییە

ڕەسووڵی خولای ئەمنی نارد و بە قاسیدییە

حەزرەتی فاتیمەی دەڵی: عەلییە، وای عەلییە!

قاسیدی ڕەسووڵی خولای هاتوتە ئێرە بەیەکجارەکییە
هەتا دەعوایەک لە ماڵی بابی من دەقەومییە
ئەتوو چاوی خۆت لەسەر ئەمن دەبەستییە
دەڵێ: فاتیمەخانێ! لە خولای خۆت ببێ شەرمە!
ئەوڕۆ ئاوری چاوانم ساتی لە گەرمە.
فاتیمە دەڵێ: عەلییەی قەیتانە! ئەگەر پێت نەماوە هونەری دە مێردانە
دوڵدوڵی بدە بە من دەگەڵ چەکانە
یان دەستێنم تۆڵەی ئەو ئەسحابانە
یان ئەمنیش دەچم بە دەردی وانە.
حەزرەتی عەلی دەڵێ: دایکە پیرە چاوبازە!
چۆ دوعایەکم لە خزمەت خودای بۆ بخوازە
کێ بوو لە دایکی پیرێ سەرسپییە
چوو دەزنوێژی هەڵگرتییە
بەرماڵی خۆی ڕاخستییە
دوو ڕەکاعەتی سونەت کرد، دوو ڕەکاعەتی نوێژی دییە
لە دایکی پیرەی دوعاکردن بوو
لە مەلایکەتان وەرگرتن بوو
لە ئێخی جبرایل بردن بوون
لە ڕەبی عالەمێ قبووڵکردن بوو
دایکە پیرە دەڵێ: ڕەبی پادشایەکی موختاری
هەم قادر و ساحب ئیختیاری
موتلەقا بۆخۆت جەباری
هاتە ئاسمانێ هەورێکی ڕەشی تاری
کل و تۆتیای لێ باری خۆش خۆشە
چاوی ئەو شەنگەسوارەی پێ بوو گوڵی گەشە
لەبەر فەرمانی جەباری
هاتە بەر ئاسمانێ هەورێکی تاری
کل و تۆتیای لێ دەباری

له بۆ چاوی شۆڕه سواری
کێ بوو له دایکه پیره سه‌رسپییه
به‌ده‌ستی مومباره‌کی کلچێوکی مه‌رجانی گرتییه
کێشای ده چاوی شێر عه‌لییه
سوێندی لێ بخۆ بڵێ شتاقه بڕ ئه‌له‌م له چاوی وی نییه
ئه‌وا چاوی هه‌ڵات، غه‌نیمی جوڵندییه
کافران قڕ ده‌کا، به‌یه‌کجارێکییه
ئیمام بانگ دێڵێ: قه‌نبه‌ره!
دوڵدوڵم بۆ بێنه ده‌ره
لێی بکه زینی موحته‌به‌ره
سه‌فه‌ری ماڵه مامم که‌وته به‌ره.
که دوڵدوڵیان هێناده‌ره
لێیان کرد زینی موحته‌به‌ره
ئیمام بۆخۆی کێشای ته‌نگه‌وبه‌ره
پێی نا ڕکێف که‌وته سه‌ره
کێ بوو له شێری گوڵباوه
چه‌ندی ئه‌سحابه و ئه‌ولیا له ده‌وره‌ی ڕاوه‌ستاوه
ئاوڕێ وه خه‌ڵقی ده‌داوه
عه‌زره‌تی فاتیمه‌ی وه‌ستاوه
هه‌رتک چاوی پڕ له ئاوه
دێته خوار وه‌کو سێڵاوه
ده‌ڵێ: مه‌دینه‌ی بابم نه‌ماوه
کوێرم ببن هه‌رتک چاوه
شێری خوڵای بۆ ڕاوه‌ستاوه
له‌کنم له جوڵندی ترساوه
بۆیه‌کی ناڕوا به‌ولاوه؟

عه‌زره‌تـــی عه‌لی فه‌رمووی: «ئه‌وڕۆ بیانووی لێ ده‌گرم. ده‌شـــقه‌می گه‌ردنم ئازا بکا. ئه‌گه‌ر ئه‌وڕۆ گه‌ردنم ئازا نه‌کا، ئیدی ناکرێ هه‌تا قه‌بری». بانگی کرد:

فاتیمەی چاوبەنگییە!
ئەو سەفەرەم یەکجارییە
نامبینیەوە جارێکی دییە
عەزرەتی فاتیمە دەگری
دەڵێ: شێری خولای یەکجار نادری!
مەدینەی بابم، شوولووغە بۆیە هۆک و بیانووانم پێ دەگری
چ بکەم ئەوڕۆ حاڵم وایە
مەدینەی بابم دە شڵووغی دایە
هەڕۆ بڕۆ بەشی بەهەشتی خۆم سەرتاپاخوار دایە
عەزرەتی عەلی فەرمووی: فاتیمەی ساحب خاترە!
لەبزت لە ئاوی حەیاتێ خۆشترە
بەهەشتی توو چ لێ بکەم ئی خۆم لە ئی توو پترە
فاتیمەی چاوبەنگییە!
قسێکت پێ بڵێم بەسەحییە
ئەوشەو نا شەوی دییە
عەزرەتی جوبرائیلی هات بەقاسیدییە
گوتی: هاتووم بەڕەزایە ڕەببییە
ئەو سەفەرەم یەکجارییە
دەمکوژن و چارەم نییە
ئی من و توو دەبێتە دیدار ئاخرەتییە
کوێر ببن چاوی عەلییە
داخولای کێ بەتەمات بێ، لەپاش ئەمن دەگەڵت ڕۆدەنیشێ بە حەلاڵییە!
ئەجەلم هاتووە بە دەستی جولندییە
قەت پاڵەوانی وا زەبر بەمست نییە.
عەزرەتی فاتیمە گوتی: بەحەقی ئەو خولایە!
بۆیە بیانووانم لێ دەگری، چونکە مەدینەی بابم دە مەحسرەدایە؟
هەڕێ، بڕۆ گەردنت خۆش و ئازا بێ فیسەبیلیلا بۆ خاتری حەزرەتی ڕەسووڵڵایە!
کێ بوو لەو شێری گوڵباوە

دەماخی ببوو تەواوە

ئاورِی وە پشتی خۆی داوە

چەند ئەولیا ڕاوەستاوە

پاکی بۆی لە خولای پاڕاوە

لەبەر ئەو فاتیمەی گوڵباوە

چاوی دەتگوت ئەستێرەیە و شەبەقی کشاوە

دوڵدوڵ ناڵێکی لێ داوە

عەزرەتی عەلی نەحرەتەی کێشاوە

لە ڕەبی عالەمێ پاڕاوە

سەڵەواتی لە پێغەمبەری داوە

لە دایکە پیرەی تەواوە

ئەوێ ڕۆژێ هات و گەڕاوە

شێر گوتی: دەوڵەت زیاد و ماڵئاوا!

دوڵدوڵ تەیرێک بوو، لە هەموو تەیران زێدەیییە

ئەوێ ڕۆژێ چەن دەیکرد وە دایکە پیرەی ڕانەگەییە

دایکە پیرە وای گوتییە:

«ئەگەر بۆ نوێـــژی نیوەڕۆیەی نەگەمـــەوە مەدینەی موبارەک، نوێـــژی بەجەماعەتم دەچییە».

پێرێژن گوتی: «عەلی تەنگەی دوڵدوڵی توند کێشـــاوە، لە حیرســـا؛ دوڵدوڵ ناتوانێ بڕوا؛ بەقسەی قەرزی دەگەڵ بکەم هەتا بڕێک خاو دەبێتەوە، تەنگەی دوڵدوڵی چا دەکا، دوڵدوڵ خۆش دەڕوا زوو دەگەینەوە مەدینەی».

ئیمام تەنگە و بەرەی ساز کردییە

دوور و نیزیک وە دایکە پیرەی ڕا دەنۆڕییە.

پیرێژن بانگ دەکا:

ڕێی مەکە و مەدینە ڕێی بۆ شەو و نۆ ڕۆژان بەناوە.

ئەوێ ڕۆژێ چوو دەمودەست گەڕانەوە بە دواوە

بۆ هەندەهەندی نیوەڕۆیە، لە ڕەسووڵی خولایان دەکرد سەلام و سەڵاوە

ڕەسووڵی خوڵای فەرمووی: عەلییە، وای عەلییە!
لەکن ئەمن بخۆ پارووێک زاد و زەوادییە
نەک لە شەڕی ئەو کافرەی هیلاک ببییە
دەڵێ: مامە، هەرێ مامە!
وەسەر پشتی زمانم ناچێ هیچ بۆ تەماعە
تا تۆڵەی ئەو دوازدە ئەسحابە نەستێنم تەمامە
ڕەسووڵی خوڵای فەرمووی: عەلی، کاکە! وەرێ کاکە
لەکن ئەمن بخۆ پارویێک زاد و زەوادی پاکە
نەک لە شەڕی ئەو کافرەی ببی هیلاکە
دەڵێ: «مامە، سوێند بەسەری توو بە سی و چوار[1] جزووی کەلامە
وەسەر پشتی زمانم ناچێ تەعامە
هەتا تۆڵەی ئەو دوازدە ئەسحابان نەستێنم بەعامە.
عەزرەتی عەلی سوار دەبی بەکۆڵاناندا چووە خوارێ
جوڵندی کە چاوی بەحەزرەتی عەلی دەکەوێ، خۆی ڕادەبزێوی
ڕەخت و ڕەشمەی دروس کراون لە زێڕی و لە زێوی
قەسد دەکا چای عەزیم بەسەر یەکدا تێک برێوی
حەزرەتی عەلی بانگ دێڵێ: «جوڵندی، جوڵندییە پەڕقۆزە!
ئەتوو ئەو شاش و پەڕەت لەسەری نەبێ پیرۆزە
ئەتوو مەدینەت بۆ لە مامی من کردووە ئاڵۆزە؟
جوڵندی ئەو جوڵندیی پەڕبلاوە
شاڵ و شاش و پەڕت لەسەری نەبێ تەواوە،
ئەتوو بۆ مەدینەت لە مامی من تێک داوە؟
جوڵندی دەڵێ: ئەمن ڕۆڵەم، ڕۆڵەی شێری
هیچ کەسم پێ ناوێری

---

[1] ـ قورئانی پیرۆز سێ جزووە، بەڵام ڕەحمان بەکر بە سی و چوار جزووی ناوهێناوە.

شێر عەلی نەبێ، ئەویش گەردنێم بۆ ڕادەدێری
ولایەتی مەدینەی بە من دەسپێری.
عەزرەتی عەلی دەڵێ: بابی حەسەنم، بابی حوسێنم
شاماری چەنگ بەخوێنم
نەمرم ئەوڕۆ ڕوحێت لە بەدەنێ دەستێنم
بابی حەسەنی ئەزم، بابی حوسێنی ئەزم
شاماری چەنگ بەبەزم،
نەمرم ئەوڕۆ ڕوحێت لە بەدەنێ دەگەزم.
جوڵندی دەڵێ: ئەی عەلی فێرە جەنگە!
توو لەو شارەت خۆش دێ دەنگە
بنۆڕە دوڵدوڵی، پساونی بەرۆک و تەنگە
کە ئیمامی عەلی بەدوڵدوڵێدا نۆڕییە
جوڵندی گورزێکی دا لە تەوقی سەرییە
هەتا سینەبەندێ بەدوڵدوڵەوە بەعەرزی ڕەق و ئیشکیدا بردییە
دوڵدوڵ هاتە دەرێ لە خاک و لە خۆڵێ،
دەستی کرد بە خورپینێ و بە سمکۆڵێ
عەزرەتی عەلی دەڵێ: زولفەقار!
بەو خولایەی کەرەمدار
بەسەری نەبی نازدار
بتدەم لەو گۆڵی مندار
لەتی نەکەی وەک خەیار
لە خۆم ناتبەستم چ جار
دەتبەمە سەر وەستاکار
بتکەن بە ناڵ و بزمار
بە چەکوچان بتکەن هەژار
لە بۆ دوڵدوڵی نازدار
دنیا دەبێ وەرگەڕێ یەکجار
کە شیرێکی دا لە تەپڵی سەری جوڵندییە




عەزرەتی جوبرائیلی پەڕی وەبەر نەدابا بەڕەزای ڕەببییە
ئەویٚ جاریٚ دنیا وەردەگەڕا بەیەکجارییە
جولٚندی دەڵیٚ: ئەی عەلییە!
ئەو شیری توو میسرییە
ئەو زەبرەی توو بە من چ نییە
دەڵیٚ: بەڵات لیٚ کەویٚ، گوڵی مندارە
ئەتوو خۆت ڕاوەشێنە، بۆخۆ و بە ئەسپت بووی بە چوارە.
بۆ خۆ و بە ئەسپی کەوتە خوارە
کیٚ بوو لە ئەسحابەی بەستەزمانە
سەریان دەرهێنا لە کۆلانانە
سەڵەواتیان لە پێغەمبەری دەدا، بە عەزرەتی عەلییان دەبژارد شوکرانە
کیٚ بوو لە ئەسحابەی نازەنینە
لە کووچە و محەلانیان سەر دەرهێنا
سەڵەواتیان دەدا لە موحەمەدی ئەمینە
هەر دەو دەمیدا ئیمامی عومبەر گەییە جیٚ، لە سەفەری دەغڵ کرینە
کیٚ بوو لە ئەسحابەی جندییە
سەڵەوات لە پێغەمبەری، خەزا پیرۆزە لە عەزرەتی عەلییە
دەڵێن: یا ئیمامی عومبەر. گەنم لە کوێیە، قیمەتی بەچەندییە؟
ئیمامی عومبەر گوتی بەوانە:
بە عەزرەتی عەلی ببژێرین شوکرانە
گەنم ئەلحەملای هەرزانە
حەیفە لە عەمباری کافرانە
«بیست و چوار ڕووبە دراوان بدەن، ڕووبوێکو گەنم دەدەنیٚ، دەڵێی شیلانە».
مزگێنیان دەبرد بۆ ماڵ و خیزانە
کیٚ بوو لە ئیمامی عومبەری گردە
لەو خەندەقەی باسکی خۆی کرد بە پردە
مەخلووق پێیدا رادەبردە
ئێستری خاڵندی بنی وەلی زۆر بیٚ مەفەڕە

لەسەر دەستی ئیمامی عومبەری هەڵدەپەڕی ئەوبەر ئەوبەرە

دەڵێ: ئێســـتری کاک خاڵندی بـــۆ خاتری وەی هەر بەقیمەت بێ بتبێ ســـەرە هەتا زیندووی نەتبی بەرە.

ڕەسووڵی خولای فەرمووی: عەلییە وەی عەلییە!

بەسیان بکوژە، بێ ئینسافی دەگەڵ ئەو فەقیرانە چاک نییە

دەڵێ: مامە گیانە!

بەو خولایەی لەیەزانە

«دەست هەڵناگرم لەو کافرانە

هەتا خوێن نەیە، نەبا سەرانە».

ئەکرا بشکێ قسەی شێری جەباری

هاتە ئاسمانێ هەورێکی تاری

ڕشێنی بارانێ لێ دەبارێ

هەروا خوێن دەهات ڕای دەماڵێ سەر و جەندەکی لاری

ئیمام دەنوارێتە ڕۆژێ

دەڵێ: ڕەبی، نەدۆڕێنم نوێژێ

ڕوحم بە ئاوری جەهەننەمێ دەسۆژێ

وا جوڵندییان کردووە فەنا

ئەو لەشکرەی کافرێک نەما،

(ڕەحمان بەکر) بۆتە وەستا.

***



## خەزێم

کچــی دۆمی حەزی لە کوڕی دۆمی دەکرد. ڕۆژێکــی داوەت بوو. هاتنە کن کوڕەکەی گوتیان: «مەقامان بڵێ داوەتێ دەکەین ئینشاڵلا». کوڕەکەی گوتی: «لێم ڕاوەستن هەتا نیوەڕۆیــە؛ نیوەڕۆیە جوابو دەدەمەوە». پیاوەکان ڕۆیــن. کوڕەکە لەدوو کچەکەی نارد، گوتی: «ماڵە وەستا شاڵی داوەتیانە بچم یان نەچم؟» گوتی: «بەڵێ. دەبێ بچی داوەتێ بکەی». نیوەڕۆیە هاتنەوە کنی. گوتیان: «داوەتەکەمان بۆ دەکەی یان ناکەی؟» گوتی: «بەڵی؛ دێم». کوڕەکە هەڵســتا چووە مەیدانێ، دەســتی بەموقامان کرد. داوەتی گێڕا. تەماشــای کرد دۆستەکەی وی نەهاتبوو. دەگریا، گوتی: «شاگرد! ئەو داوەتەی بگێڕە». وەدەرکەوت، چووە کن دۆستەکەی خۆی، گوتی: «عومرەکەم، ئەوە بەرگەردیان کردووی، بۆچی دەگری؟» گوتی: «وەڵڵا کەسی ئیلاقەی نەکردووم؛ بەڵا کراسم نییە بۆیە نایەم». گوتی: «ئەوە دەچمە نێو داوەتێ بانگت دەکەم پارچە هەیە بە جووانە، هەر کراسی کەیفت دێنێ بیکڕە». گوتی: «ئەمن ســێ کراســم بۆ کردووی». گوتی: «ئاخر دایکیشم چوار کراسی بۆ کردووم، حەوت کراسم هەیە، هیچیان بەکەیفی من نین» گوتی:

دەچم بانگت دەکەم. چۆوە، دەڵی:

«ڕۆژێک لە ڕۆژان سەر لە سبحەیانێ

یارم ڕاوەستا لە پێش هەیوانێ

بە زوڵفی لوولی دەکا شەرانێ
هەنیەی زەریفە مانگی ئاسمانێ
بەچاوی ڕەشی دەکا گریانێ
کوڵمەی فانۆسە وا لە دیوانێ
کەپۆی یاقووتە، مەگەر هەیاسی دانا مەعنای بزانێ
لێوی ئیستیفە، لەسەر دووکانێ
ددانی گەوهەر، وا لە کارخانێ
پرسیم بۆ دەگری ئەی عەمر و چاوم ئەی کیژە جوانێ!
دەڵێ؛ کراسم نییە بچمە دیلانێ
دەڵێم بینایی چاوم گەوهەر و دوڕم!
من باڵدار نەبووم، بە باڵان بفڕم
محەندەک نەبووم، بەخۆم بخۆڕم
بچمە میسر و شام کراسێک بکڕم
بچمە میسر و شام
ئەگەر پێم بچێ حەوت ساڵی تەمام
ئاوی مەکانان بە من بێ حەرام
هەتا بە سەد ساڵی هەر بۆ خۆم غولام
ئەو کراسە بە من دەبێ تەمام
لە کاری خولای چلۆن تەعەجوب مام
ڕۆژێک لە ڕۆژان چوومە بازێڕی
خواجەیەکم دی کیمخوای دەگێڕی
نیو گەزم لێ کڕی بە سێ سەد زێڕی
دوو سەتیشم دا ئەکو وەی گێڕی
خولاکەی وەستاینە! کراسی چابێ
هەر دورووومانی لالێک تێدابێ
نازدارم زیزە، پێی قایل نابێ
دەبێ قایل بکەم، دنیا خرا بێ
ئەگەر ئەو زیز بوو کاسبیم نابێ

کاسبیم نابێ دەبم سەرگەردان
خەریک و خەمناک کەوتمە خێڵان
وێڵداش و خزم لێم دەکەن فێڵان
هەی! مزگێنی بەرن کراس هاتەوە
دەبڵێن بە لەیلام بێ بیباتەوە
دەڵی کراسم دەوێ ساف لە ماهووت بێ
دەوری دامێنی دوڕ و یاقووت بێ
لە ڕاستی مەمکی دەنکی زمڕووت بێ
کراسم دەوێ، ساف لە کیمخوا بێ
کۆبەی قەنەوز، بەری خارا بێ
لاڵ و گەوهەر گوڵاوڕێژی بێ
کەتانی هیندی پەڕاوێزی بێ
نێوی مەمکانی نەخش و نیگار بێ
وێنەی هیندوستان کاری دیار بێ
سەد وەستام دەوێ، لە پایە عەرزی
دووسەد شاگرد بێ بۆخۆی و دەرزی
کراس بدروێ لە گوڵووکی ڕەزی
لە بەژنی یارم بۆخۆی بلەرزی
سەد وەستام دەوێ لە بانی کۆیە
هەشتا لە مووسڵێ، شێست لە شنۆیە
کراس بدروون لە گوڵی لیمۆیە
دەبڵا تەنک بێ
ناسک و شلک بێ
بۆ چاو هەڵۆیە
سێ سەد وەستا بێن لێرە لە لاجانێ
شێست بێن لە مووسڵی چل لە تارانێ
کراس بدروێ گوڵووکی ڕێحانێ
دەبڵا تەنک بێ

ناسک و شلک بێ
بۆ نەشمیلانێ
سێ سەد وەستا بێ لەلای دریازێ،
شێست بێن لە مووسڵێ، چل لە شیرازێ
کراس بدروێ لە گوڵی پیوازێ
دەبڵا تەنک بێ
ناسک و شلک بێ
بۆ بووکە نازێ
گەلی برادەران با گوێ بدێرن ئەو باسە
تەماشی ئەو کوڕەی، چەندە ئیخلاسە
لە دنیای ڕوون بوو بە خەواسە
لە سوێ ئەو کچەی بوو کەڕ و کاسە
نازانم هیندییە، یانە بڵباسە
بۆ خاتری خولای! ئەمن بناسە
یار دەبەر ناکا قەت ئەو کراسە
دەڵێ ئەدی چ بکەم لە ڕووی دنیایە؟
لەوەی زیاتر چم لێ پێک نایە
لە بۆم بانگ کەنە سەید و مەلایە
دەگەڵ دایکی خۆی بکەن تکایە
بڵا ڕەحمەتی من نەچێ بەزایە
تکایان لێ کرد بەهەموو دنیایە
وەرە، کراس تەواو بوو بچۆ دەستی شایە
ئەوڕۆ هەڵپەڕە، تا ڕۆژاوایە
دڵت خەمگین نەبێ بکە سەفایە
سەید و مەلاینە! چەند بەجگەرم
ئەنگۆ وا دەزانن، زۆر قەلەندەرم
لەنگۆ وایە، زۆر منەتبەرم
خۆڵی حەوت گوندان دەکەم بە سەرم




ئەو کراسەبێ و نایەتە بەرم
لەو خەڵقە وایە من سەوداسەرم
لەنگۆ وا بێکەس و بێ برادەرم
حاشا و مادوڵلا! وا قەلەندەرم
دێم هەڵدەپەڕم تا کەیفیش بەرم
ئەگەر وای زانی ئەو نازەنینێ
هات و دەستی گرت لە هەڵپەڕینێ
خۆی بەعەزرێدا دا تا ڕۆژاوایە
خەزێمێکی ئاڵتوونی لە کەپۆدایە
دە کەپۆی خۆی کرد لە بۆ جوانی
هێند هەڵپەڕی لە ڕووی زەمانی
لە کەپۆی کەوتبوو بەخۆی نەزانی
بەخۆی نەزانی ببوو جانفیدا
ئاخر لەو کراسەی وا کردبوو حاشا
ئەلحەمدولیلا خەزێمیش نەما
هەتا ئێوارێ فەسلی ڕۆژاوا
داوەت بەرهەڵدا کرا، خەڵقی گەڕاوە
کە چووە ماڵێ شووشتنی چاوە
بسکی خورمایی دوو بە دوو کراوە
ئەگەر ئاوێنەی بۆ خۆی هێناوە
تەماشا دەکا ڕەنگی سووتاوە
لە کەپۆی خۆی نواڕی خەزێم نەماوە
چ بکەم، چ بکرێنم، ئەمنی فەقیر
مەگەر خوڵاوەندی عالەمین بکا دەزگیر
لێم قبووڵ نەکرد کراس لەو فەقیر
خوڵا وای لێ کردم بووم خوڵاگیر
کوڕەکە گوتی: «بڵا بچم بزانم، کراسەکە درواوە یان نەدرواوە».
ڕۆژێک لە ڕۆژان فەسڵی نەوبوهار

بەڕێزەی مالاندا دەچوومە خوار
یارم ڕاوەستا زویر و زگار
فرمێسکی چاوی قەت نەیگرت قەرار
بەسەر کولمانیدا دەهاتە خوارَ.
دە دلم بەربوو ئاورێکی بێ ئیختیار
پرسیم: بۆ دەگری حەبیبی نازدار؟
لە عەیبەتان دڵ ناگرێ قەرار.
پرسیم: «بۆ دەگری، ئەی عەمرم، چاوم
یارێ، نازدارێ، بسکێک لە خەنەی، یەک لە ژەنگارێ».
دەڵێ: «خەزێمم لێ کەوت فەسلی ئێوارێ
مەگەر ئێلچیان بنێرمە بێنارێ».
پرسیم: «بۆ گریای ئەی ماڵە بابم
ئەی عەمر و چاوم یار نازەنینێ
لێم بووی بە پەریزادەی چینێ
دەڵێ: خەزێمی کەپۆم کاری مێردینێ
لە کەپۆم کەوت لە هەڵپەڕینێ
مەگەر بچم بۆ ولاتی مەدینێ»
ئەگەر لاو زانی ئەو قەرە خەبەر
خۆڵی حەوت دێیان لاو دەکا بەسەر
دەڵێ: ئەگەر نەمرم، بژیم، بمێنم
دەبێ ئینشاڵلا ئەو کارەی پێک بێنم
یانە ماڵی خۆم پاک دەدۆڕێنم
یان ئەوەتا سەری خۆم دەبەتلێنم
یان دەچمە ئیسفەهان خەزێمێک دێنم
یان دەبێ لێم ببڕێ ڕێی گوزەرانێ
یان عێلی تەرک دەکەم، هەموو کەس بزانێ
لێم حەرام ببێ گەرمێن دەگەڵ کوێستانێ
قەت چەکوچی نەکوتم لەسەر سندانێ




له خۆم حەرام دەکەم ڕێی گوزەرانێ
یان بۆ خەزێمی دەچمە ئیسپەهانێ
بە قاسیدی بە هەموو کەس بزانێ
هەر ئەوێ دەمێ گوت بە دەلالان
لە بۆم بگەڕێن لە هەموو مالان
هەر لە گەورەیان هەتا مندالان
هەر لە مندالان تا ئیختیاران
تازیەی ڕابگرن تا حەوت سالان
پاک سەرو دەبڕم مال بێ بەتالان
ئەگەر تەزکەرەی پادشای دەخوێنی
ڕەئیسی بەبان تاعجوب دەمێنی
ئەو سال ئیساغا خەرجێ نەستێنی
توخمی پیر غەیبم لێم بکە سەلاوێ
پایزێک دادێ، مەکەن هیچ ڕاوێ
هاتەهات مەکەن لە چۆمی گەرماوێ
ئاذەربایجان تا ولاتی ئێران
قافلە دە بەند چوون هەموو ڕێ گیران
لە شاری سنەی دووکان هەلگیران
خەزێم بزر بوو، دادێکی گیران
ئێران و توووران بەغدا و ئیسپەهان
تەورێز و تاران جزیرێ بۆتان
سەردەشت و سنە تا ولاتی سەقز
عالەم لە تازییەی خەزێمی بوو کز
سەردەشت و سنە بەلای شنۆوە
عالەم ڕۆنیشتووە دەست بەئەژنۆوە
ورمێ و مەراغە تاکو قەندەهار
بازاڕ و دووکان نەبێ قەت لە شار
بەبە لە سەران قەت نایەتە خوار

حوکماتی نەکا ئەو پادشای سەردار
نابی ئەو دنیا ببێ بەرقەرار
تەڕەدود ببڕێ لە ڕێی ڕاگوزار
حوکماتێ نەکا پادشای ئامێدی
داسنی و دنیا و سما و ئێزیدی
ناچنە تەوافی قەبری شێخ ئادی
داسنی و دینا، تەمامی وڵات
قایل نیم هیچ کەس ڕمبازێ بکات
قایل نیم هیچ کەس بکا جلیتانێ
هەر تازیەبار بن بۆ نەشمیلانێ
دەبێ خوڵا ئەو کارە بزانێ
یانە تێک دەدەم وڵاتی ئێرانێ
دەبێ ئینگلیس و عرووس بزانێ
ئەویش تازیەی ڕابگرن بۆ نەشمیلانێ
خەزێمی لێ کەوت لە گەڕی دیلانێ
سەنگە و دەلۆ خێڵی پالانی
لەک و زەنگەنە، خزمی بوویانی
وڵایەتی شوان، لاس و ڕۆژبانی
لەوێش بەتازیەی خەزێمیان زانی
لەوێش ڕۆنیشتن بەدڵگرانی
دەڵێم: «خەبەرێک هات لە وڵاتی ئێرانێ
دەبێ گەرمێنیش پاک پێ بزانی
خەزێم بزر بوو، هیچ کەس نەیزانی
خەزێم بزر بوو، لە گەڕی لاوان
ئەوجار ئیساغای نارد بۆ دەراوان
لاوی دە خمیدا دەسڕە و کوڵاوان
خەزێم بزر بوو تازیە لە لاوان
گریان زۆر بووە بۆ بەڵەک چاوان




خەلق خەمگین بوو بێ سووچ و تاوان
پاک تازیەبار بوو خەڵقی ئێرانێ
خەبەرێ بەرن پادشا بزانێ
ڕوحمێکی بکا بۆ ڕێ گوزەرانێ
بنێرێ زێڕینگەر بێ لە ئیسپەهانێ
خەزێمێکی دروس بکا، بۆ نەشمیلانێ
بلا سوڵتانی ئەستەمبووڵێ بەوەی نەزانێ
دەنا دە مەخلووقی دەخەن قڕانێ
شادی هەڵدەگیرێ لە مەملەکەتی ئێرانێ
زێیە بادینان چ گەورە و پان بوو
قومێکی ئاوێی تێدا نەمابوو
ماسیی بەستەزمان هەمووی خنکابوو
لە دەریام کردووە وا پرسیارێ
دەگەڵ دەریام دوو قسەی گوفتارێ
دەڵێم: «بۆ ئیشک بووی بەتەڕی بەهارێ؟»
دەڵێ: «تازیەیە بۆ خەزێمی یارێ»
جوابێکی بەرم بۆ ئێرەوانێ
قاقەز بنووسم، دەگەڵ فەرمانێ:
«خەزێمی ئاڵتوون ئی کیژە جوانێ
لە کەپۆی کەوتووە لە گەڕی دیلانێ»
دە چیای سەفینێم بگەڕێ خەبەر
هەر گوڵێک لە عەرزی سەر بێنێتەدەر
بەقوڵینگی فەرهاد پۆلای بەجەوهەر
لە ڕەگوڕیشەی بۆ دەکێشمەدەر
لۆلۆ شەقاوی لە دەم ڕووباران
خەیبەتیان دەکەم، سەد هەزار جاران
چەقالە و گێوژ وا بەکەوتەوە
بریان، لێک وەران، بەهەڵاتەوە

شینێکیان گێڕا، خۆش نەبێتەوە
تەتەرێک لەلای مووسڵێ هاتەوە:
«مزگێنیم لە تو، ئەی هەرێ لاوە!
خەزێم بزر بوو ئەوە بینراوە (بَیندراوە!)
خەزێم بزر بوو سونگەی زەمانی
مزگێنیم هێنا بۆ ئەولاخانی».
خەبەریان دابوو بە مەخلووقی ئێرانی
بلا چەپەر بڕوا، مەخلووق بزانی
تازیە هەڵگیرا لەنێو موسڵمانی
هەزار ڕەحمەت بێ لە بابی (ڕەحمانی)
خەزێمی فێر کرد بە (ساحیبی ئەڵمانی)

***



## کاکه میر و کاکه شێخ

کاکــه میر و کاکه شــێخ ئاغای مەرگەیــان بوون. مەیتەریان بــۆ وڵاغی خۆیان قەت نەدەگرت. دەبوو ژنی ڕەعیەتان بێ تەویلەی بماڵێ، ئەســپان ئاو بدا، کا و جۆیان بداتێ. ئەگەر خەلاس دەبوو بچێتەوە، دەیانگرت دەرکەیان لێ دەگرت دەیانگا و دەیانناردەوە. ژن و کچیان هیچ نەیەشت.

هەیــدەر گۆران پیاوێکی ڕەشــید بــوو خەڵقی دییەکەی پاکی وەخــڕ کردەوە؛ پاکی قورعانی خوارد گوتیان: «دەبێ قسەمان یەک بێ سبحەینێ دەبێ بانگێێشتنیان بکەین بۆ ماڵە هەیدەر گۆرانی، فەسڵی نەهارێ».

کاکە شــێخ و کاکە میر و دوازدە برا بوون؛ بانگێێشــتنیان کــرد. هەر برایەکیان دە نێوانی دوو کرمانجاندا دانا. نانیان هێنا دایان نا؛ گوتیان: «بیسمیلا». دەستێکیش گوتی: «یائەڵڵا». هەر کەس لە جیرانی خۆی گرت، سەری هەر دوازدان مەجلیسیان بڕین. خوێن بەســەر نانیدا ڕژا. ڕایان کێشــا ماڵە کاکە میر و کاکە شێخان. هەموو ژن و کچی وانیان فەســاد کرد، بەتۆڵەی خۆیــان عیوەزیان کردەوە. هەیدەر گــۆران هەموو مەخلووقەکەی هەڵگرت. پاکی بردە سەر کووپەڵەی خمی. پاکی دە خمی نا، پاکیشی دە قوڕێ نان. ڕۆین بۆ ئەستەمبووڵێ بۆ شکایەتی سوڵتانی. یای ئەستی دەڵێ بە یای بەغدانێ:

«خوشکێ دڵم بە غوولوورە، چەندی بە غوولوورە




تەماشـــای ئێختەرخانەی کاکان بکە، دەبەر بۆر و بدەوانم کەوتووە جل و هەوســـار و توورە

لە دیوەخانی کاکان هەڵگیراوە هەژدە مووتەکا و دوازدە مافوورە

ئەو ڕۆژانە خوشـــکی کاکان ڕســـەر بەقوڕ بان ئەگەر لەسەر ماڵێ کاکی مەیان هەڵگرت کەوڵ و تاقم و سێ قەڵات و سەمبوورە

ئەوێ ڕۆژێ مل بەکوێن بای، ئەگەر لە داری جەنگەی لەشـــکر لە دوو کاکی مە دەبوو جەمبوور بە جەمبوورە

ئێستا بێ ساحێب بووم حدوودی بێ نیشانە، بێ سەلا بوون خانمی دە ڕووسوورە

چەندم گوت کاکە مەچۆ، ماڵە هەیدەری پیاوێکی غەیانە، لە دۆستایەتی بەدوورە

خەڵقی مەرگە! ئەمن چ بکەم، چ بکرێنم

بۆخۆم دەعوایە بکەم تا بەسوڵتانی ڕابگەیێنم

ئەمن خوێنی دوازدە برای خۆم لە کێ بستێنم؟

یای بەغدان دەڵێ یای ئەستییە:

«خوشکێ ئەو هەلا و هەرایەت بۆ چییە؟

جارێ بچین، جەنازەیان بێنینەوە، لە ماڵە هەیدەر گۆرانی تەسلیمیان بکەین بەگڵییە

ئەو دەمی مەسڵەحەتی لێ دەکەین بزانین تەگبیرمان چییە».

چەندی نۆکەر و پێشخزمەتە ڕاوەستاوە

ئەوی ڕەعیەت بێ لە وڵاتی مەرگێدا نەماوە

چوونە ماڵە هەیدەر گۆڕانی، جەنازەی برایان هەڵدەگرت و دەیانهێناوە

بانگ لەسەر بانگیان لێ داوە

دەڵێ: «هیچ کەس وای لێ نەقەوماوە

لە دوازدە برایان یەک نەماوە».

پاک کفت و دفن کراوە

پاکی چوو دە خاکێ نراوە

مەخلووق بۆ ماڵێ گەڕاوە

یای ئەستی دەڵێ: «خوشکێ یای بەغدانێ! خەبەرێکم دەبیست یەکم دەدەینا غلۆوێک لە دەرکی ماڵە بابی مەیە نازانم ئەوە غولۆوە نە شایییە و نەشینە».

کێ بوو لە کارەکەرێ گوار زێڕینە

لەو لایەڕا دەچوو بەگوشادی و بەپێکەنینە
لەو لاڕا دەهاتەوە بەگریان و ڕووپچڕینە
دەڵێ: «خاتوونینە! وەرن، هەموو وێکڕا بگرینە
ئەو غوڵووە لە دەرکی ماڵە بابمان بوو، شایی بوو، لێیان بوو بەشینە
لە دیوەخانێ کاکانیان هەڵگرتن ئافتاوە و مەسینە
لە ئێختەخانێ کاکی مەیان دەرهێنان جوانوولەی دە نەوزینە
خاتوونیان پیل دەگرت و دەریان دەهێنا
سواری جوانوولەیان دەکردن بە قەرەپۆشی دە شینە
بە مردن و تالانیش قایل نەبوون ژنیان بە ئێخسیر بردینە
جا، مە تەگبیرێ چلۆن بکەین، خەبەرێ بدەین بە سوڵتانی ئەمینە».
یای بەغدان دەڵێ: «خوشکێ! چەندم گوت: کاکە مەچۆ، بەری مەرگێ بە میوانی
مەچووە ماڵە هەیدەری دەگەڵ هەیدەر گۆرانی
فێڵی وانم گەلێک زۆرترن لە فێڵ و فەرەجی شەیتانی
قەت بووە، لەکنە خۆت، پیاوەتی بکەی، بدەیەوە نانی
قەت واش دەبێ، بێ ڕوحمی و بێ ئیمانی
سەری دوازدە برایان ببڕی لەسەر سفرەی دە نانی
خولا بکا مەرگەییان ببینم هەر وەهایان بەسەرێ
رسقی وانم بچیتە سەر پشتی ماکەرێ
سەد باری ڕەحمەتان بێ لە کوڕی مێرێ دەگەڵ مێرە دسکەرێ
بە تۆڵەی ئاغای خۆی هەژدەی دانە بەر خەنجەرێ
هەژدەی دە دیشی داویتنە بەرێ
لە زەبری دەستان و لە خوێنی جگەرێ
ئەوا لکەی شل دەبوو لە خەنجەرێ
نەحلەت لە بابی ئەو وەستایە بێ لەپاش کوڕی مێرە دسکەرێ
ئەگەر سێ بزماران نەدا لە گوێ خەنجەرێ
ئەگەر خەنجەر بزماری بێ، لە دەسکی نایەتەدەرێ
هەی ڕۆ، براله ڕۆ!
ئەو جێی کاکە میر و کاکە شێخ لێیان دەکرد شەقێن و شەڕەکۆ

ئێستا، مەرگەیی گووخۆرباب دەیکەنە برنجاڕ و پەمۆ
کەس نییە جووتەی دە ئاغایان
جووتەی ناسکە سواران
هەڵگرێ بیانباتەوە موقبرەی کن بابی خۆ».
«ڕەحمان» خۆش بی «ساحب» ڕەحمەت لە تۆ

***



بابی لەشکری دەڵێ:

«دڵم ڕاناوەستێ لەبەر ئەوان خەمان، لەبەر ئەوان گلەییان. ڕۆژم لێ هەڵات لە لای کێوی ئادێ، شەبەقێکی دەدا بنی بێنارێ، ئی دیکەم وە زارگەلییان،

بەلایەکمدا دێ کوولەکوولی شوانان، بە ئی دیکەمدا قەیتوولێکی ناسکە بێرییان

چوورەچوورە بازیم لەبنا گوێیان خۆش دێ لەسەر دەستی دەقوشچییان

هەڵات هەڵاتی شکینێ ماڵوێران، ڕقەی چۆغەداری، ناسکەی دە تووڵە و تاژییان

دەبەر نازدارێمدا هەیە کراسێکی لەوی دەقەنەوزییان

خڕخاڵی زێڕ ڕاناوەستن لە بەلەکان، دەکەونە سەر شلکەی پانییان

دەڵێم شیرێکی بکرم بەسەد قورۆشی، بیدەم لە سینگ و مەمکی گراوێ‌خان سولەیمان بەگی قوڵی بەگان؛ چەند دەکەم چ مووی لێ نابڕێ، لەبەر دوڕ و یاقوت و فەرەنتییان

بەو شـــیرەی زەحمەت درا ســـینگ و مەمکی وی، دەڵێم بچم شکایەتێ بکەم لە ڕەبی عالەمییان

ئێستا ئەو ڕۆیوە، ئەمن بەجێ ماوم بۆ غەریبییان

سوێسن و هەڵاڵەم لێ پەروەردە بوون لە کۆسرەتی شاڵەبەگییان

کێلی سەرینێم هەڵێن لێی هەڵگرن ڕستە و قەلێدەی دە تاژییان

حەفێک و سێسـەد موغابن لەبۆ خان سولەیمانی قوڵی بەگان. ئەگەر بێ حاڵ دەبوو
به پیاڵەی ژەهرەماری له کۆڵانی ده ڕۆمییان
هیچ کەس لەو ڕۆ بەدەر به ڕۆمییان نەکا متمانێ
بەنۆکەری خۆیان غەیانن خولا دەزانێ
بۆچیان دەخوێننەوە کە ڕۆژی قۆشەن دێتە مەیدانێ؟
سولەیمان بەگی قوڵی بەگان کە زرێی دەبەر دەکرد، قتڵاوی له خۆی دەدا،
دەستی دەدا زەرگی، به ژەهرەماری خزمەتی دەکرد به دیوانێ
ڕۆمی! یا خولا چاوو کوێر بێ، لەجیاتی قاوەی ژەهریان دانێ
ڕۆمی زۆر بڵحن، مەرد چاکان دەبڕن له مەیدانێ
دەبێ سوڵتان بەو کارەی نەزانێ».
لەشکری دەڵێ: «ئەگەر نەمرم، بژیم، بمێنم
خوێنی خان سولەیمان بەگی خۆم ئەمن دەستێنم
به ئیزنی خولای ئینشاڵڵا، سەد ئینشاڵڵای لەسەرە».
ڕۆڵە! سولەیمان بەگ ئەتۆ دیوتە، ئەگەر لەشکر و قۆشەنت دەکرد ئەوبەر ئەوبەرە
شاش و پەڕی تێلتاوسی دەنا لەسەرە
سوڵتانی ئەستەمبووڵێ دەیفەرموو هیچ کەس نیەتی ئەو نۆکەرە
ڕۆڵە! لەجیاتی قاوەی له فینجانی ژەهرێت کرد نەزەرە
ڕۆڵە! ئەوا خانم و خاتوون دەگرین ئەوبەر ئەوبەرە
ڕۆڵە، هێندێکی مل به کوێنە، هێندێکیش خاک بەسەرە،
ڕۆڵە! دڵم نایە هیچ کوێت لێ بکەم به گۆڕخانە و بەموغبەرە
ڕۆڵە! هەتا به سوڵتانی ئەستەمبووڵێ نەدەم ئەو خەبەرە
ڕۆڵە! جەرگ و دڵم سووتا، لێم خرا بووە هەموو جگەرە
ڕۆڵە! بڵحەڕۆمی زۆر بێ خیرەتن، له بەختی من هەژاری
نه بەپیادەی دەگەمێ نه به سواری
حەیف و ســێ سەد مەغابن له بۆ خان سولەیمان بەگی قوڵی بەگان بێهۆشیان دەکرد
به پیاڵەی ژەهری وەک ژەهری ماری
ڕۆڵە! به گولەی عرووس و ئینگلیسی برینداری
ڕۆڵە! بچم ئەرەسوو و لوقمانی بێنم بەیەکجاری




بریناتت دەرمان بکەن ڕزگارت بکەن لە زەمانی
سواری ئەسپی خۆت ببیەوە، دەڵێن: تەماشای بکەن لە عارەب سواری
ڕۆڵە! شەڕی دەوڵەتییە ئەوا هاتۆتە سەرت پۆستەی خوندکاری
دەبێ بچیە دیوانێ خزمەت سوڵتانی، مووچە و مواجبی خۆت وەرگری بەیەکجاری
ســـوار ببی ئینشـــاڵڵا ببیە سەرکردە، ئاڵای ســـوڵتانی وەرگری، گەورەی قۆشەنی بی بەئیختیاری
ڕۆڵە! ئەتوو بۆ سەر هەڵنایەنی لەبۆ لەشکری، خوێنت لەدەم و سمێڵان دەبارێ؟
ڕۆڵە! دڵم ڕاناوەستێ لەبەر ئەوان خەمان لەبەر ئەوان گلەییان
ڕۆڵە! ڕێم نەبوو ڕاببرم لەبۆ کوێستانی هەڵەدنییان
ڕۆڵە! لێرە ڕۆنیشم، یا بچمە مەملەکەتی هیندییان
ڕۆڵە! ڕێم نەبوو ڕابرم لەبەر سەیاح و قاسیدی هەموو دەوڵەتان، دوامین لەبەر سەرباز و تفەنگچییان
دڵم بەخەمە، گەلێک بە خەیاڵە
ئاورم دە بەدەنێ بەربووە، غورزەمە، لێ هەڵگرتووم، کەماڵە».
ئەوا میوانی دەوڵەتیم هاتوون لەشـــکری دەڵێ: «داخوڵا! خان سولەیمان بەگی قوڵی بەگیان لە ماڵە؟
لەبۆت بە قۆپەنی بیزایە هەڵبلێم، دەهاتە دەرێ، غوررزەم بە غوررزەم ماڵ بە ماڵە
لـــە بۆت بە کەڵەبابی ســـپی هەڵبلێم لـــە دەربەندی بازیان چفەی خـــۆم لێ نەکا بە کۆپاڵە
لەبۆت بە سی کوێرە هەڵبلێم لەسەر شەت و بەحرانم لێ نەکا بە گاڵەگاڵە
ڕۆڵە! دەگەڵ تۆمە بۆچ وا بێ فیکری؟
چاوان هەڵنایەنی لە بابی خۆت بفکری
بۆچ هەڵناستی جڵەوی ئەو میوانانە بگری؟
دەترسم بای شەماڵ بێ، جێی خان و میر و سوڵتان لە من بگری
خان سولەیمان بەگی قوڵی بەگان بێ بۆ خۆی بە سوارەی، بە سپا و لەشکری
لە شینکێ ماڵوێران ڕستەی خۆر ڕاکێشێ بکەوێتە دووی بڵێ: ها بیگری نەگری
حەیفێک و سێ سەد موغابن بۆ خان سولەیمان بەگی قوڵی بەگان بە پیاڵێکی ژەهری و ژەهرەماری لە کۆڵانی ڕۆمییان خەجڵی




حەیفێک و سێ سەد موغابن بۆ نەڕێکی وەک خان سولەیمان بەگی قوڵی بەگان ئەگەر بێ حاڵ دەبوو بە پیاڵێکی ژەهرەماری لە کۆڵانی دە ڕۆمییان».

***

## قەر و گوڵەزەر

وەختێکی شا عەباس لە ئیسفەهانێرا هات بۆ دمدمی، هاتە سندووسی! میوانی فەرەجوڵلا خانی، ئاغای سندووســـی بوو. فەرەجوڵلاخان زۆر حورمەتی گرت. شـــاعەباس لەو سەرێ کە گەڕاوە، فەرەجوڵلاخانی دەگەڵ خۆی بردە ئیســـفەهانێ. فەرەجوڵلاخان دوازدە کوڕی بوو. کوڕی لە هەمووان گەورەتری قەر بوو. قەری کردە حاکمی سندووســـی. خەبەریان بۆ قەری هێنا گوتیان: « حەمەدی پاشـــاغان کچێکی هەیـــە نێوی خاتوون گوڵەزەرە؛ قەت جوانی وا نییە». قەر قاســـیدێکی نارد بۆ کن خاتوون گوڵەزەرێ. قاســـید چوو سووڕەتی خاتوون گوڵەزەرێی بۆ هێنا. بەقەری نیشان دا. قەر لە سوێیانی شێت و شەیدا بوو. قەر ناردییە کن بابی گوتی: « بۆم عەرزی شـــای بکا بە نۆکەری خۆی قەبووڵم بکا؛ ئاشق بە کچی حەمەدی پاشاغان بووم؛ جا کەیفی خۆیەتی». هەڵی گرت لێی نووسی: «ئەو عێلی گەرمێنییە؛ ڕێی ناکەوێ ئەمن بنێرمە کنی کچێکم بداتێ. بۆ خۆی بنێرێ خوازبێنی بکا».
قەر قاقەزێکی بۆ حەمەدی پاشاغانی نووسی:

«حەزێ دەکەم بە وڵاتی سندووســـێش ڕابگا، خاتوونێکی هەیە بە منی کەرەم بکا».
حەمەدی پاشاغان بۆی نووسییەوە: «چلۆن ڕێک دەکەوین؟ ئەو خەڵقی کوێستانێ و ئەمن خەڵقی گەرمێنێ. کچی من لە کوێستانی بەڕێ ناچێ و ئەویش نایەتە گەرمێنێ».
قەر گوتی: «هەڵدەســـتم بۆ خۆم دەچم ئەگەر کەیفم گرتی، دێمەوە لەشـــکری دەبەم بـــەزۆر لێی دەســـتێنم. ئەگەر کەیفم نەیگرت دێمەوە ماڵە خۆم». جا هەڵســـتا بەرگێکی

نۆکه‌رانه‌ی ده‌به‌ر کرد، ڕۆیی بۆ نێو عیلی حه‌مه‌دی پاشاغان. خاتوون گوڵه‌زه‌ر به‌سه‌ر ماڵه ڕاده‌گه‌یشت. گوتیان: «بابم له‌چی ده‌گه‌ڕێی». گوتی: «له شوانییێکی، له به‌ر خه‌وانییێکی ده‌گه‌ڕێـــم». چوون به خاتوون گوڵه‌زه‌ریان گوت: «کوڕێکی جوان له شـــوانییی ده‌گه‌ڕێ ئه‌تۆش چ شـــوانت نییه». ئه‌گه‌ر خاتوون گوڵه‌زه‌ر ته‌ماشـــای کرد کوڕه جحێڵه‌یه‌کی زۆر جوان بوو. گوتی: «کوڕه! شـــوانیت پێ ده‌کرێ؟» گوتی: «به‌ڵێ قوربان؛ باب و باپیرم هه‌ر شـــوان بوو». گوتی: «نێوت چییه؟» گوتی: «دایک و بابم نه‌بووه هه‌ر به هه‌تیوی گـــه‌وره بووم، پێیان گوتووم قه‌ر». گوتی: «له کـــوێ هاتووی؟» گوتی: «قوربان هێند گه‌ڕاوم ئیسفه‌هانیشـــم دیوه». گوتی: «به‌رخانم لێ نادزێ؟» گوتی: «قوربان دزی به‌من ناکرێ. که‌په‌نک و گوچانیان داێی». ته‌ســـلیم شـــوانانیان کرد. ڕۆژێکی له مه‌ڕی هاته‌وه. خاتوون گوڵه‌زه‌ر بۆخۆی له بن پانکێی دانا.

ســـه‌ربه‌خۆ پێی گوت: «شازاده قه‌ره! نانی بخۆ». قه‌ر نانی خوارد و هه‌ڵستا به‌رخی وه‌رگێڕا چووه ده‌شتێ. به به‌ند به ئاواڵ شوانانی گوت:

«بابم حاکم بوو له ئیسفه‌هانێ، بۆ خۆم میریه‌تیم ده‌کرده‌وه ده‌گه‌ڵ به‌گله‌ره

چه‌ندم له دیوانێ ڕۆده‌نیشتن میرزای زێده‌نووس و سینه‌ده‌فته‌ره

چه‌ندم له‌به‌ر ده‌ستی ڕاده‌وه‌ستان کوڕه کوڕه‌ی به‌کێرد و خه‌نجه‌ره

چه‌ندم له دیوانێ هه‌بوو پیاوی قابیلی مواجب به‌سه‌ره

ڕۆژێ سه‌د ته‌ورزین به ده‌ستی پاشای سجده‌ی به‌خێرێیان دێنامه به‌ره

ده‌ربه‌ند به ماڵی دنیایه‌نه‌بووم؛ عه‌زیزم! ده‌مناردەوه ده‌ربه‌ده‌ره

ده‌چوونه مواجب وه‌رگرتنێ، هه‌موو نۆکه‌ر سه‌ربه‌سه‌ره

حوکماتی سندووسی هه‌موو به چه‌نگ ئه‌من بوو سه‌رانسه‌ره

ناوه‌ڵڵا که‌س نه‌بوو ده‌نگێ بکا له‌به‌ر پادشای قه‌جه‌ره

وێستا به‌ســـه‌ری ڕووت و پێی پێخاوس به‌رخی حه‌مه‌دی پاشاغان له خرخڕه‌ی باڵێنێ ده‌چه‌لێنم ئه‌وبه‌ره

چاره‌م نییه، وێستا ده‌بێ هه‌تا ئێواره‌ی گۆچانێ بچه‌قێنم، له‌پێش به‌رخۆڵان ڕابوه‌ستم ده‌سته‌ونه‌زه‌ره

که‌په‌نکی شوانانم ده‌ستۆیدایه، کڵاوی چوار گۆشه‌م له‌سه‌ره

هێشتا ئه‌وه‌م له ده‌وری حوکماتی بابم پێ خۆشتره، ئه‌گه‌ر هه‌موو ئێواره و سبحه‌ینان خاتوون گوڵه‌زه‌ر به له‌فزێکی شیرین ده‌ڵێ: ماندوو نه‌بی، شازاده قه‌ره!

بابم حاکم بوو لە ئیسفەهانێ بۆ خۆم میریەتیم دەکرد لە سندووسی

چەندم لە دیوانێ شل دەبوو میرزای قابیل و ئێشک ئاغاسی

ڕۆژێ هەزار عەرزچیم دەهاتە پای دیوانێ، دادی هێندێکیانم دەگوت، عەرزی هێندێکیانم نەدەپرسی

وێستا بەرخی حەمەدی پاشاغان لە خرخرەی باڵێنێ دەچەلێنم لەبەر ڕووی تۆ بە پێی پێخاوسی

بە زگێکی تێر و بە دووان برسی

وێستا ئەو خۆشییەم گەلێک لە دەوری حوکماتی بابم پێ خۆشترە، ئەگەر هەموو ئێوارە و سبحەینان خاتوون گوڵەزەرێ باریکەڵە بە لەفزێکی شیرین لەقەری بێ کەس و باب دەپرسی

بابم حاکم بوو لە ئیسفەهانێ ئەمنیشیان تەڵەب دەکرد حوکمم دەهاتەوە سەرە تەدارەکم دەگرت، بارگەوبنە، چەندم ڕەنگین دەکردنەوە نۆکەرە

ئاڵام هەڵدەکرد، شەیپووریان دەکێشا ئەوبەرە ئەوبەرە

هەموو نۆکەران چفەیان دروس دەکرد پەڕیان دەدا لەسەرە

هێندێکیان بەرگیان عەجەم بوو، هێندێکیان کوردەواریان دەکردەوە بەرە

ئەگەر تەدارەکم بۆ دەگرتن، لە سانم دەدان، لێم دەکردەوە نەزەرە

چ بکەم، وێستا غەریبی شارانم، لەوانی دەربەدەرە

کەڕکی کوردیم دە بەردایە کوڵاوی چوارگۆشەم لەسەرە

دەوەرە عەزیزم ئێستا گۆچانی کوردیم بە مستەوەیە، بە کەڵاشی دۆمان دەکەم ئەوبەر ئەوبەرە

ئەگەر سوار دەبووم، ئاڵایان لە دوو ڕادەکێشام، لووزەوی سوارانم دەکەوتەوە سەرە

هێندیک دەیانگوت: ئەوە کوڕی پادشای ئێرانێیە؛

هێندێکیانیش دەیانگوت: ئەوە شازادە قەجەرە

ئەگەر سوار دەبووم لە سندووسی بۆ ئیسفەهانێ بچمەوە خزمەت پادشای بکەمەوە نەزەرە

ئەگەر داخیل بە ئیسفەهانێ دەبووم، دوو مەنزڵم مابوو فەرەجوڵڵاخانی بابی خۆم دەینارددەوە خەبەرە

پۆست و پاکەتی بابم بۆ دەهات، دەیگوت: لەسەری بابت کەوێ، زێڕ و ئەشرەفی




ببەشێتەوە ئەوبەر ئەوبەرە

ئەگەر داخیل بە ئیسفەهانێ دەبووم، تۆپ و تۆپخانە و سەرباز بە پیرمەوە دەهاتن دەیانکردەوە ئەوبەر، ئەوبەرە

هێندێک دەیانگوت: ئەوە کوڕی پادشای سێ تۆقە. هێندێکیش دەیانگوت: ئەوە کوڕی فەرەجوڵڵاخانی قەجەرە

ئێستا چ بکەم بەرخۆڵەی حەمەدی پاشاغان دەچەلێنم ئەوبەر ئەوبەرە

وێستا دەستم بە گۆچانی کوردی شل بوو، پێم لە کەلاشی دۆمان هاتۆتەدەرە،

ئێستا بە سەری ڕووت و بە پێی پێخاوس بەرخی حەمەدی پاشاغان دەکەم ئەوبەر ئەوبەرە

چەندم، بەرهەڵدا کردوون، نازر و نۆکەر و نیزام و ئەسکەرە

چەند بێ خودانن میرزا و پیاوی دە موحتەبەرە

کوانێن ئەو پیاوانەی ڕادەوەستان دەستەونەزەرە؟

وێستا بەرخی حەمەدی پاشاغان لە خڕخڕەی بالینێ دەچەلێنم ئەوبەر، ئەوبەرە

ئەو خۆشییەم پێ گەلێک لەوان خۆشتر ڕادەبرێ، ئەگەر هەموو ئێوارە و سبحەینان خاتوون گوڵەزەر بە لەفزی شیرین دەڵێ:

ماندوو نەبی شازادە قەرە

ئەگەر لە سندووسی وەدەر کەوتم بۆ ئیسفەهانێ، دەهاتنە پێشم، وەکیل و وەزیر و موختاری دە دیوانێ

تەگبیریان بۆ دەکردم دەیانگوت: لە شای بستێنە ئینشاڵڵا ڕێی گوزەرانێ

پیاوێکی زۆر نەجیب و ئاقڵ، هەتا دێیەوە لەسەر مەملەکەتی سندووسی دانێ ئەگەر ئەو قسانەم دەبیست تەواوە

بە ئاقڵی خۆم پیاوێکی زۆر ساحب کەماڵم لەسەر مەملەکەتی سندووسی دادەناوە

وێستا زۆر خراپم دەگەڵ خاتوون گوڵەزەرێ لێقەوماوە

ئەو خۆشییەم هێشتا لەو خۆشیانە پێ خۆشترە ئەگەر هەموو سبحەینان خاتوون گوڵەزەر دەڵێ: قەری غەریب، ئەو بەرخانە بێنەوە واوە

لە خۆم غەریب و خانە وێرانێ

سەد عەرزچیم بوو سبحەینێ هەڵدەستام، دەهاتمەوە دیوانێ

حدوودی گەرمێنم بوون لە ئێختەخانێ




دەمگوت زینیان لە پشتی کەن تاجی و تولآنم بێننە دەرکی دیوانێ
دەمگوت نۆکەران بانگ کەن، سواران بدەن لە سانێ
ئەمن وێســـتا ئەو خۆشییەم پێ خۆشترە لەو خۆشییانە ئەگەر خاتوون گوڵەزەر دەڵێ ماندوو نەبی هەموو ئێوارە و سبحەینانێ
خولآیە ئەو پیاوە چاکە کە تۆ لێ بی ڕازی
ئەگـــەر ڕۆژ دەبۆوە لە لایەکم دەبوو تۆپ و تۆپخانە و لە ئی دەکەم دەنگی مووزیک و سەربازی
لەلای دیکەم دڵ بریندار بووە، خاتوون گوڵەزەر گرتوویەتی بە گازی
ئەگەر خودا نەخواستە بچمەوە حوکماتی سندووسی دیسان لە دڵم، دەبێتەوە بە شین و تازی
دەترســـێم ئەمن ئێرە بەجێ بێڵم ناموســـڵمانێک بێ خاتـــوون گوڵەزەرێ لە حەمەدی پاشاغانی بخوازێ
ڕۆژم لێ هەڵات گەیشتە محەلی چێشەنگاوێ
زەینـــێ خۆم دەدا تاوڵی حەمەدی پاشـــاغان یەکی بەژن باریکـــی کێل گەردن لەبەر خۆی دابوو چارشـــێوێکی دارای دە پێی خۆی کردبوو جووتە کەوشـــێکی سەغری دەستی دەدا دەســـتێک ئافتاوە و مەسینەی ئەرزەڕۆمی سەبر سەبر. نەرم نەرم دەهاتەوە بۆ ڕازی سەراوێ».
ئەوا دێ لە قەری بێ دایک و باب دەکا سەلام و سەڵاوێ
قەر دەڵێ: «عەلێک ئەسلام و ڕەحمەتوولآهی خاتوونێ کێل گەردنێ بەڵەک چاوێ!
تاوی لەرز و نۆبەتێ گرتوومی، وەرە بە دەستی موبارەکت بمدەیە چۆڕێک ئاوێ».
خاتوون کە خۆی نەگرت بە عینوان و تەکەببور دەستی دا جامی دەچۆوە سەرچاوەی کانی بازنە و کرمەک و گوارە و ئەنگوســـتیلەی لەدەســـتی خۆی دەرهێنا، لە جامی ئاوێی دەنا دێنێ لەپێش قەری بێ دایک و بابی دادەگری
قەر لەبەری پێیانی هەتا تۆقی سەری دەوێ خاتوونێ دەفکری
هەرچەند دەکا و دەکرێنێ چ عەیبانی لێ ناگری
دەڵێ: «قەر بابت ماقووڵە یا بە باپیرم لێ گەورەتری؟
ئەمن دەترسێم شکایەتی خولآت لێ بکەم، دەترسێم لێم بێ بە کوفری
ئەگەر هێندە ساحیب حیلەی، بۆ کەپەنکی شوانانە وەستۆی خۆت دەگری؟

ئەگەر خۆت بە پیاو دەزانی بۆ نانێری لە دووی سەرباز و لەشکری؟
ئەگەر هێندە بە عیلمی بۆ دەس لە حوکماتی سندووسی هەڵدەگری؟
وا ناکەی جارێکی یەکت پێ هەڵخەڵەتێ وەئەستۆی خۆت بگری
دەستم شل بوو بۆچی جامی ئاوێم لێ وەرناگری؟»
قەر دەڵێ: «خاتوونێ! خولاوەندی عالەمیان دەستت دە عەمری گری
لە نەمامەکانی بەهەشتێ ئەتۆم پێ چاتری
ئەوی ئەتوو فەرمووت بە قەری غوربەتی پێ دەگری
تاوی لەرز و نۆبەتێ گرتوومی، ددانم ددانی ناگری
کەس رێی ناکەوێ عەیب و عاران لە توو بگری
ئەگەر بڵێم بابم ماقووڵترە بۆم دەبێتە کوفری
ئەگەر بڵێم باپیرم گەورەیە خولا لێم هەڵناگری
خاتوونێ حەمەدی پاشاغان ئەمن میوانم دەبێ قەدرم بگری
ئەتوو خانەخوێی دەبێ دە غەریبان بفکری؛
ئەتوو نەجیب زادەی کەس نابێ مەقسوود لە دەرکی توو بمری
نابێ خەیاڵێکی بکەیەوە لە تیپ و قۆشەن و لەشکری
ناڵێی ئەگەر پیاو دڵ هیلاکی نەکا نایە کەپەنکی شوانان وەخۆی گری
پیاو چلۆن چۆڵ پەرەستیێ دەکا، دەست لە مەنسەبی هەڵدەگری
کارێکی وا بکە، ئەگەر خولاوندی عالەمێ لێت هەڵگری
وەرە چۆرێکم ئاوی بە دمەوە بکە، هەوەڵ سندووقی سەری خۆت، دومینت ئی براکانت، دەشـــقەمێ جامی دەستی توو لێم ببێ بە شـــیفا قەری بێ دایک و باب لە وڵاتی غوربەت بەبێ کەس نەمری».

خاتوون گوڵەزەر ئەگەر بۆ قەری دێنا ئاوە
دووبارە لە قەری غەریبی دەکرد سەلاوە
دەیگوت: «چونکە پێڵاوی غەریبییێت وەکن ئەمن هێناوە
هانێ بەدەستی خۆم بتدەمێ ئاوە
نازانم کوڕی کێی وات لێ قەوماوە
وەرە بۆ خاتری خولای نێوی خۆت بە من بڵێ تەواوە
لەبەر نەناسینێ ئەمن هیچ ئەلفەتم بە توو نەداوە».




قــەر دەڵێ: «خاتوونێ! عەمروچاوم! بابم ڕاهبەری ئیسـفەهانییە لە پێش پادشـای ڕاوەستاوە

بۆخۆم حاکمی سندووسی بووم ویلایەتم لە خۆم تێک داوە

چەندم کۆشک و تالاری عەزیز و شیرین لێ بەجێ ماوە

چەندم حدوودی بێ نیشـانە لـە ئیختەخانام هەمووی مەحتەلن، کـەس نییە پێیان بکاتەوە ڕەشەڕاوە

ئێسـتا نۆکەر و تابیعەی من هەموو تازیـەدارن؛ دەڵێن قەری کوڕی فەرەجوڵڵا خانی نەماوە

خاتوون ئاوری تۆم تێ بەربووە هەموو جگەرم سووتاوە

خاتوون ئەمن بۆیەکی مردووم وێستا بەمنەتم دەدیێی چۆڕێک ئاوە»

شکایەتیان لە حەمەدی پاشاغان کرد، گوتیان: «خاتوون گوڵەزەر ئاشقی قەری بووە».

حەمەدی پاشاغان، پێی زانی کە قەر ئاشقی خاتوون گوڵەزەرێ بووە گوتی:«مەسلەحەتە خێڵی ئاوا بکەم بۆ گەرمێنێ، کەس نەزانێ»

جا هێنای تەدارەکی گرت خێڵێ بەرێتەوە ئەودیوی. سـبحەینێ زوو خێڵی بردەوە بۆ گەرمێنێ. قەر چووە سەر ئاوێ دەستی بە گریانێ کرد.

حەمـەدی پاشـاغان زانی. لەدووی نـارد گوتی: «ڕۆڵە! وەرە ئەمن دەسـت لە توو هەڵناگرم، هەرچەند دراوت دەوێ دەتدەمێ؛ مەبە نۆکەری کەس، هەتا سـاڵێکی دی خێڵ دێتەوە، دیسان وەرەوە کنە خۆم ببە شەریکی ماڵی من».

قەر دەڵێ:

لە خۆم بێ کەس و سەڵایە!

جا من ئاورێکم گرتووە هیچ چارم نایە. لە توو چلۆن بسـتێنمەوە ماڵی دنیایە ئەگەر ئیزنم بدەی ئەمن دێمەوە گەرمێنی گەرمەسێر دەکێشمەوە جەفایە».

حەمەدی پاشاغان دەڵێ: «ڕۆڵە! ئەوە نابێ ناکرێ

ئەتوو خەڵقی کوێستانێنی بۆ گەرمێنێت بەرم لێم قبووڵ ناکرێ

چەندت زێر و زەمبەر دەدەمێ، بە دڵ و بە جان بگەڕەوە بەدواوە

خۆ من دەربەند نیم دەگەڵ خۆم دەبردی ئەما مۆر و قاقەزم بە دەوڵەتان داوە».

ئەوێ ڕۆژێیان چادر کوێستەوە بۆ موبارەکی لە جێیەکی دیکەیان هەڵداوە.

قەر دەگەیە خاتوون گوڵەزەرێ دەیگوت: «خاتوونێ گیانە!

تیرێکت لێ دام زۆر بێ دەرمانە

هیچ خەبەرت زانیوە بابی من لە ئیسفەهانێ سەتی وەک بابی تۆی لەبەر دەستانە

دەستم لە پادشایەتی هەڵگرتووە هاتووم لەبەر توو بووم بە شوانە

وێستا وا بابت دەڵێ لێرە مەمێنە ئەمن دەڕۆم ئەتوو بە جێ بمێنە لێرەکانە

ئەگەر ئەمن لەبەر خاتری توو نەبێ دەنێرم لە سندووسی بێتەوە سەرباز و تۆپخانە

بە خوڵای ئەمن ئابڕووی بەهەزار سالم چووە لەنێو عێلانە

یانە پاکی بەقڕ دەدەم، یانە تالان دەکەم حەمەدی پاشاغانە

نایەڵم ئەتوو بەرنەوە گەرمێن ئەمن ببم بێ خودانە»

خاتـــوون دەڵێ: «قەر ماڵوێران! ئەگەر خۆت بێ خودان کرد ئەمنیشـــت! کردووە بێ سەلایێ

نەبوو دە ڕۆژان دە پێش ئەو قسەدا خۆت ئاشکرا بکردایە، وێستا چ بکەین چم لەدەس نایە»

قەر دەڵێ: «ئاخر ئەمنیش بووم بێ سەلایە

وێستا چ بکەین چم لەدەس نایە

ڕێی وڵاتی سندووسیم لێ بەسترا دەگەڵ ئی بەغدایە».

خاتوون گوڵەزەر دەڕوا لەبۆ کوێستانی دە عەزیم، قەری بێ دایک و باب بەجێ دەمێنێ لەبۆ خەموخەفەتی دەوێ دنیایە

قەر دەڵێ: نایە چەندی گازی گوڵەزەری باریکەڵە دەکەم نایە

خۆی لە من کردە کەوێکی گەردن ڕەش، خۆی هەڵدەکێشـــا کێلی دە کوێستانێ قەری بێ دایک و باب بە جێ ما لەبۆ خەم و خەفەتی دەوێ دنیایە

هەرچەند کل لە چاوی ئەوی کافربابەی دێ، لە چاوی قەت کەسی نایە»

قەر دەڵێ: «خاتوونێ گوڵەزەر گیانە!

ئەتوو دەچییەوە گەرمێنی گەرمەسێر، ئەمن بەجێ دەمێنم لێرەکانە

ئەمن خەمگینم ئەتۆش نات بێتەوە گوزەرانە

خاتـــوون گوڵەزەر! وەرە. ســـوێندێکت بۆ بخۆم بە حەدیـــس و یەکێکت بۆ بخۆم بە کەلامووڵلایە

ئەوە دەڕۆیەوە گەرمێنی گەرمەسێر، ئەمن بۆ کن هیچ بەنی ئادەمیان لە ڕووم هەڵنایە

خاتوون عەزیزم! دەزانم دەگەڵ بەغدایەم لێ دەقەومێ شەڕ و دەعوایە




خاتوون بۆ خاتری خولا و پێغەمبەران پێم مەکە دەعوایە
دەزانم گێچەڵم لێ دەقەومێ دەگەڵ شاری بەغدایە»
خاتـــوون دەڵـــێ: « قەرە ئەتـــوو ئەگەر هاتیە ئـــەو وڵاتەی خۆت کـــردە غەریبێکی قەلەندەرە
عەزیزم وێستا لەبەر ئەمن لە ماڵ و حاڵی خۆت بووی دەربەدەرە
جا ئەگەر ئەمن بڕۆم، ئەتوو کەس نییە لێی بکەی نەزەرە
ئەمنیش سوێندت بۆ دەخۆم بەزاتی خولای و بەکەلاموڵلای ئەکبەرە
«ئەمن حەلالی دنیایە لە خۆم حەرام دەکەم، هەتاوەکو قەر لە گەرمێنێ گەرمەســێرم دێنێتەوە دەرە»
قەر دەڵێ: «نایە! ئەمڕۆ دوو ڕۆژە دەنگی خاتوون گوڵەزەرێم لە بنی گوێیان نایە!
خۆی لێ کردووم بە کەوێکی گەردن ڕەش، خۆی هەڵکێشا کێلی کوێستانێ
قەری بێ دایک و بابی بەجێ هێشت لەبۆ کوێرەوەری و خەفەتی دەوێ دنیایە هەرچەند کل لە چاوی ئەو کافربابەی دێ، قەت لەچاوی کەس نایە»
ئەگەر ڕاز و گلەییان لێک دەبوو تەواوە،
خاتوون بۆ گەرمێنی گەرمەسێر دەڕۆیی، قەر لە وڵاتی کوێستانێ بەجێ ماوە
حەمەدی پاشاغان دەڵێ: «دەنا ڕۆڵە قەرە! دەوڵەت زیاد و ماڵئاوا»
قەر دەڵی: «لەخۆم خانەخەراپ و ماڵوێرانێ!
ئەمن چلۆن بەبێ کەسی لە دوور وڵاتی بکەم گوزەرانێ؟»
خێڵی حەمەدی پاشاغان باری دەکرد تەرکی دەکرد ئەو مەکانە
قەر وە دووی خێلاتی دەکەوت بێ سەر و بێ زمانە
ئەگەر حەمەدی پاشاغان داخیل بە گەرمێنێ دەبوو، بەکری شێخانی دەبۆوە میوانە
سێ ڕۆژانی قەرار دەگرت، بۆ تیجارەتێ دەچوو ڕووی دەکردە شارانە
قەر ئەوا لە بیابانان، تەماشا ڕێیانی دەکرد، کاروانێک دیارە
دەڵێ: «بچم حەواڵی ئەو کاروانەی بکەم پرسیارە
ئەو کاروانە نازانم نە گایە، نە گادارە
نە وشترە، نە وشترپارە
نە پیادەیە، نە سوارە
بچم حەواڵێکی حەمەدی پاشاغان لە وی بکەم پرسیارە».

قه‌ر ده‌یزانی به‌کری شێخان حه‌زێ له‌ خاتوون گوڵه‌زه‌رێ ده‌کا

به‌کری شـێخانیش ده‌زانێ قه‌ر حه‌ز له‌ خاتوونێ ده‌کا. قه‌ر خه‌ڵقی کوێستانێ بوو، به‌کریش خه‌ڵقی گه‌رمێنێ بوو. ئه‌وا ده‌ڕوا بۆ تیجاره‌تێ

قه‌ر بانگ ده‌کا: «کاروانی، ئای کاروانی!

ئه‌تو هیچ هه‌واڵی خێڵی حه‌مه‌دی پاشاغان نازانی؟»

به‌کر گوتی: «ئه‌من کاروانم،

ڕه‌ئیسی گه‌رمێن و کوێستانم

هه‌واڵی خێڵی حه‌مه‌دی پاشاغان زۆر چاک ده‌زانم

ئه‌مشه‌و سێ شه‌وه‌ له‌نێو خێڵی حه‌مه‌دی پاشاغان میوانم

ئه‌گه‌ر خه‌به‌ری خێڵی حه‌مه‌دی پاشـاغان له‌من ده‌پرسـی: خاتوون گوڵه‌زه‌ر نه‌خۆشه‌ ده‌ردی گه‌لێک گرانه‌

عه‌زیزم ئه‌من ئه‌وێ شه‌وێ له‌وێ بووم بۆیان کرده‌ سه‌ده‌قه‌ چل شه‌کی جووت ددانه‌

ئه‌منیش چوومه‌ سه‌ری نه‌زمانی ده‌گه‌ڕێ نه‌هه‌ڵدێنێ چاوانه‌

نه‌خۆشییه‌کی هێند گرانه‌ له‌کنم هه‌تا ئێوارێ نازی ئه‌و به‌سته‌زمانه‌».

قه‌ر بانگ ده‌کا: «به‌کر به‌کری شێخانی!

مووت بکه‌وێ له‌سه‌ری زیانی!

به‌کر به‌کری ماڵ شێواوه!

یا ڕه‌بی، سه‌فه‌رت نه‌بێ ته‌واوه

خێرێ له‌ جوانی خۆت نه‌بینی کوێرت ببێ هه‌ردووک چاوه

ئه‌وه‌ چی خه‌به‌رێکه‌ له‌ بۆ منی ماڵوێرانت هێناوه؟

یا ڕه‌بی! سه‌فه‌ری خێرت نه‌بێ، به‌سه‌لامه‌تی نه‌گه‌ڕێیه‌وه‌ به‌دواوه»

به‌کر ده‌ڵێ: «ئه‌تو خه‌ڵقی کوێی له‌ خاتوون گوڵه‌زه‌رێ ده‌که‌ی پرسیارێ؟

خاتوون گوڵه‌زه‌ر هه‌ زمان خۆشه‌ به‌شوان و گاوانان ده‌کاته‌وه‌ بێگارێ

ئه‌گه‌ر خاڵی بار ده‌کا، بسکێکی ده‌نێ ده‌خه‌نه‌ی یه‌کی ده‌نێ ده‌ ژه‌نگارێ

هه‌نییـه‌ی خاتـوون گوڵه‌زه‌رێ ده‌ڵێـی ڕۆژی منه‌وه‌ره‌، له‌ مابه‌ینی عه‌رز و ئاسـمانێ ده‌کاته‌وه‌ کارێ

مه‌خلووقات گوزه‌رانی له‌به‌ر ده‌کا له‌ سبحه‌ینێ هه‌تا ئێواره‌».

قه‌ر ده‌ڵێ: «هه‌ی به‌کر، به‌کری شه‌یتانه‌!




خوڵا چلۆنت لێ قەبووڵ دەکا لەگەڵ من دەکەی ئەو قسانە
چ بکەم، دڵ هیلاکی کردووم گاگا دەبم بە نۆکەر و گاگا دەبم بە شوانە
ئەگەر لێم موعەبین بێ نەخۆشێکی هیلاکە ڕاستن ئەو قسانە
بۆخۆم دەبمە ئێڵچی، دەچم دێنمە سەری ئەرەستوو و حەکیمێکی وەک لوقمانە
دەشقەم خوڵا تەوفیق بدا ڕاست ببێتەوە، شایی بە دنیایە، ئەوجوانە».
بەکر دەڵێ: «بەخوڵای! نەخۆش بوو خەڵقی هەمووی بۆی ڕاوەستابوو، لە ئامین ئامینی فەقێ و مەلایانیان دێنانەوە سەرێ لە بۆی بخوێننەوە یاسێ. ئەگەر یاسینیان کردبوو تەواوە
چاوی هەڵات زیانی کراوە
نۆکەر و پێشخزمەتان موژدەیان لە بۆ حەمەدی پاشاغان هێناوە
حەمەدی پاشاغان شوکرانەی دەبژارد گەلێک لەبەر خوڵای پاڕاوە
ئەگەر ئەمنیش زانیم خاتوون گوڵەزەر چابوو، قەتاری خۆم ڕاکێشا هاتووم واوە»
قەر دەڵێ: «ئەگەر نەمرم، بژیم، بمێنم
دەبێ بێ سوعبەتێکی بە حەمەدی پاشاغان بنوێنم
وڵاتی بەغدایەی پێوە بشێوێنم».
بەکر دەڵێ: «ئەتوو لەوەی مەکە فکرێ
پیاوی شوانەوێڵە و بێکەس دەگەڵ عێلی چی پێ ناکرێ»
قەر دەڵێ: «ئەتوو بزانە قسەی ئەو تاجرەی هەموو خۆڕاییە
لەتوو وابوو هەموو شتێک چەرچیگەری بازاڕییە
گەزگەزەی چیتی دەفرۆشێ لەتوو وایە هەموو شتێک چەرچیگەری بازاڕییە
ئەگەر نەمرم، بژیم، بمێنم
دەبێ بە مەملەکەت ئیسفەهانێ ڕابگەیێنم
تۆپ و تۆپخانە و لەشکری بۆسەر بەغدایە دێنم
ڕێی کوێستانێ دەبەستم گەرمێنێ دەشێوێنم».
بەکری شێخان دەڵێ: «بەخوڵای! بەشوانان پێک نایەن ئەو کارانە
حەمەدی پاشاغان پیاوێکی ماقووڵە، شاری بەغدایە شارێکی گەورە و گرانە»
بەکری شێخان دەڵێ: «جارێ لەو قسانە گەڕێ خوڵا بکا خاتوون گوڵەزەر چاک ببێ لەو دەردەی، خلاس بێ ئەو بەستەزمانە».

قەر دەڵی: «بەکر ئەتوو بەکری شێخانی».
قسەی چاکت بەزاریدا نایە
ڕەببی زەلیل بی لە چاوان، نەکەویە بەر ئالای حەزرەتی ڕەسووڵوڵلایە
خاتوون گوڵەزەر ئینشـــاڵلا لەو دەردەی ڕزگار دەبێ، چونکە دەگەڵ ئەمنی خواردووە کەلامولڵلایە
ئەوە دەچمەوە سندووسی بۆی دروس دەکەم تیپ و سپا و ئالایە
ڕەببی هەر دوو چاوت کوێر بێ، ئەتوو بۆچی قسەی چاکت بەزاریدا نایە؟
بەکر دەڵێ: «ئەمن چ بکەم، ڕێبوارم، تاجری هەر چوار دەوڵەتانم
ئەوی دیومە هەر وای دەزانم
ئەمنیش سوێندخۆری خاتوون گوڵەزەرێم بۆیە وا سەرەوێرانم
موداخـــڵ لـــە بەغدایە دەکەم خۆم بـــە نۆکەری فەرەجوڵلا خانی حاکمی سندووســـی دەزانم».
قەر دەڵێ: «بەکرا دڵت خۆش کردووم بەو قسانە
خەڵقی گووی خوارد لە گووی بابیان دەیانگوت: شێتە بەکری شێخانە
وەرە دە مەیدانی خەوف و ڕەجایەدا بەئەمانەت بچۆ حەواڵێکم بۆ لە حەمەدی پاشاغان بزانە
بۆ خاتری خولا و پێغەمبەران! بەکر بۆم بکە ئەوێ سوباتێ
بچـــۆ کن حەمەدی پاشـــاغان، بڵێ: قەری کوڕی فەرەجوڵلا خانـــی دەیگوت خاتوون گوڵەزەرێم بداتێ
مەڵێ: قەر شێت و ئاگا لەخۆ نییە
ئەمن ساڵە وەختێکە دەستم لە حوکماتێ هەڵگرتووە شاە عەباسی ئیسفەهانێ دەگەڵ فەرجوڵلا خانی لەبەر ئەوهە ئەمنیان بە نەحلەت کردییە
دەزانم خاتوون گوڵەزەر دەگەڵ تۆش سوێندخۆرە، بەڵا ژن دینی نییە
ئەتوو ئەمینی هەر چوار دەوڵەتانی ئەو کارەش بۆ توو عەیبی نییە
بچۆ بۆم لێ بزانە قسێکی بەسەحییە
وەڵلا یا ئیسفەهانێ بە قڕ دەدەم، یا ڕێی کوێسانێی لێ قەدەغە دەکەم یەکجارییە
بەیەکجارێکی بچۆ، کارم بکە تەواوە
شەرمت پێ نەبێ سەری قەتارێ بگێڕەوە بە دواوە

یانە سندووسی بەقڕ دەدەم، یانە بەغدایە دەستێنم تەواوە».
بەکری شێخان لە شەرمی قەری گەڕاوە
هەتا وەکێ لەنێو خێڵێ حەمەدی پاشاغان تەمبەڵێتیی خۆی بە عەرزێ داداوە
چوو لە حەمەدی پاشاغانی کرد سەلام و سەڵاوە
حەمەدی پاشاغان دەڵێ: «وەعەلێک ئەسلام، خێرە،شوکورا وا قەتارت گەڕاوە».
گوتی: «نازانم چت عەرز بکەم، قاسیدم هیچ گلەییم لەسەر نییە
بەڕێی ڕاستی خۆم دەڕۆیم یەکێک لە ڕازی بەردی بانگی منی کردییە
گەلێکم قسە دەگەڵ کرد هەتا دوێنێ نەمزانی کێیە و کوێندەرییە
سەری قەتارێم ڕاگرت گەلێکمان پێکەو قسە کردییە
گوتی: «ئەمن قەرم کوڕی فەرجوڵلا خانی ئێستا لە ئیسفەهانێ شا عەباس دەگەڵ بابم لێم دەکا گلەییە
ئەگەر خاتوون گوڵەزەرم نەداتێ بەغدایەی لێ دەکەم وێرانە».
ئەگەر حەمەدی پاشاغان ئەو قسەی بیست تەواوە
دەیگوت: «سەبرێ بگرە بەکر، هەتا قسێکی لە ماڵێ دەزانم تەواوە».
ناردیە کن خاتوون گوڵەزەرێ: «ئەو خەبەرە چییە، دەڵێن زبانت دە گرێو ناوە
دەگەڵ شوانێکی خوێرپلە؟» دەڵێ: «بابە ئەمن عێلێکی سەر ئاواڵەم، بێ خودانە
ئەتووش مەزنێکی گەورەی ساحبی هەموو عێلانە
ڕدێن سپی دوڵەتانی، چاکت دەناسی سوڵتانە
ئەمن ساحب دەوڵەتم، دەبێ بدوێنم هەموو شوان و گاوانە
ئەگەر ئەمن هەموو کەسێکی نەدوێنم نامبێتەوە گوزەرانە
بابە تەسخیری من چییە خەڵق دەکا ئەو قسانە؟»
حەمەدی پاشاغان دەڵێ: «ناردوویەتە کن ئەمن بۆ خوازبێنییە
ئەو کوڕی فەرجوڵلا خانی حاکمی سندووسییە».
گوتی: «بابە دەگەڵ ئەمن مەکە گفتوگۆیە
ئەگەر بە سەگێکم بدەی ئیختیاری من هەر بە تۆیە».
حەمەدی پاشاغان بانگی کردەوە بەکری شێخانە:
«ئەمن خاتوون گوڵەزەرم دواندووە ئەتوش بۆخۆت بچۆ قسێکی لێ بزانە».
بەکری شێخان وای گوتییە:

«قوربان! بەڕیشی سپییەوە ڕەمن ناکەوێ دەلاڵییە
دەبێ ژنان بنێری بزانی قسەی چییە».
حەمەدی پاشاغان گوتی: «جا ئەو تەگبیرە بەمن نییە
بەکری شێخان عەرزت بکەم قسێکی دییە
ڕاوەستە خێڵ بگەڕێتەوە ساڵێکی دییە
لەوێ دەتدەمێ بەیەکجارەکییە
بچۆ پێی بڵێ جا بزانە جوابی چییە».
ئەگەر بەکری شێخان جوابی بۆ قەری هێناوە
ئەگەر عەرزی کرد هەموو قسەی بۆ گێڕاوە
گوتی: «یا خولا بەخێرییەوە زەحمەتت بۆ من کێشاوە».
قەر لە ڕاستەوە، گەڕاوە بەدواوە
گەییبە جێ هەواری بانگێکی خۆشی لێ داوە
گیر نەبوو، هەتا هات، گەییبە سندووسی، جێنشینی کرد تەواوە
عەرزی بابی کرد لە ئیسفەهانێ، گێڕاوە
ئەگەر فەرجوڵلا وا دەزانێ
دەچوو دەبوو بەعەرزچی لە کوڕی خۆی لە شای ئیسفەهانێ
شا فەرمووی: «ئەو لە گەرمێنێ ئەمە لە کوێستانێ؟
ئەوە کارێکی زۆر گەورەیە مەگەر سوڵتانی ئەستەمبووڵێ پێ بزانێ».
شا فەرمووی بە فەرجوڵلا خانییە:
«ئەوە کارێکی زۆر بە قابلەت نییە
لەکنم ڕۆم کچێ نادا بەعەجەمییە
ئەڵبەتتە کوڕی تۆ عەوامە چ ئاگای لە خۆی نییە
دەنا مەملەکەتی من کچی وەک کچی حەمەدی پاشاغانی تێدا نییە؟»
شاعەباس گوتی: «فەرجوڵلا خان! قاقەزێکی بنووسە لە قەری:
«نێوی ئەو کچەی چییە؟ قاقەزی بۆ قەری نارد. قەر گوتی: لە ڕووم هەڵنایە قاقەزی بۆ شا عەباسی بنووسمەوە»، لەشکری برد و چوو بۆ سەر حەمەدی پاشاغان خەبەری دا بە حەمەدی پاشاغان:
«ئەمنم کوڕی فەرجوڵلا خانی




چەندم خزمەتی بەرخ و مەڕی وی کرد بە شوانی
ئەمن خۆم کردە نۆکەرێکی کەمترین، ئەوانم دانا لە جێی فەرجوڵڵا خانی
خۆیَ لەمن نەناس کرد قەدری منی نەزانی
ئیدی نەڵێ لە ڕووی هەڵنایە
یا دەبێ خاتوونێم داتێ، یا دەبێ دەگەڵم بکا دەعوایە
ئەو نەیزانی ئەگەر ئەو حەمەدی پاشاغانە
بابی منیش فەرجوڵڵاخانە
بەکر ئەگەر فکرێ بکا، سەد تاجر و توججاڕی وەکو وی لە مەملەکەتی پادشایدایە
قاسدێکی بنێرە کن خاتوون گوڵەزەرێ، بزانن بۆ بەکری لە من دەکا حاشایە
ئەگەر جوابی منی دا دەگەڕێمەوە بەدوایە
ئەگەر بۆ بەکری شێخان بێ بۆی دروس دەکەم سەیر و سوحبەت و سەفایە.
ئەو خەبەر بە بەکری درایە
گوتی: نەمزانی کوڕی فەرجوڵڵا خانییە، کوێراییم دایە
ئەگــەر خاتــوون گوڵەزەرێ بدەن بە قــەری هەرچەند خــەرج و موخاریجی بێ خۆم دەیکێشم لە دنیایە
بۆ خاتری قەری خاتوون گوڵەزەرم بە خوشک قبووڵ کرد، بۆ خۆم دەبم بە برایە
دەشقمی مەقسوودیان حاسڵ بێ، لێکتری ببیننەوە کام و سەفایە.
ئەگەر خەبەری لە حەمەدی پاشاغان دەکرد یەقینە
دەیگوت: بە خولاّی! کچی من لایقی کوڕی فەرجوڵڵاخانی نینە
لێم قبووڵ ناکا سوڵتانی ئەمنیە
« ئەگەر بێتو بیدەمێ دەبێ عەرزچی بکەم بە دڵ و یەقینە».
ئەگەر ئەو قسانە دەگەڕاوە بۆ قەرییە
گوتی: «لەوێ وایە هەر ئەودەمە، کە دەگەڵم دەکردەوە شوانییە
ئەو مەعنایانە هەموو چییە؟
ئەو کارانە وا پێک نایە
تازە نەهاتوومە تکایە
یان بمداتێ یا وەخۆ کەوێ بۆ دەعوایە
دەعوایە دەکەم بەدڵ و بەجانە

هەتتا کەنگێ دەگرێ ئەو بیانووانە؟
« لەشکری ئیسفەهانێ دێنم بە جارێکی، بەغدایە دەکەم وێرانە».
سوارێکی نارد بەچەپەر و بەروانە:
« تەشریفی بەکری شێخان بێتە ئێرەکانە».
کەخەبەر بە بەکری شێخان گەراوە
بە پەلەپەل هات لەولاوە
لە قەری کردەوە سەڵاوە
دەڵێ: «براڵە! چ داوێکە بۆ منت ڕۆناوە».
دەڵێ: لەتۆ ، هەر ئەو قەری شوان ماوە
گوفتارە لە بۆ تۆم ڕۆناوە
بەغدایە دەکەم بڵاوە
ئاخر زۆرم لە توو گێڕاوە،»
دەڵێ: ئەمنیش خزمەتم پێ کراوە
خەبەرم لە خاتوونێ گێڕاوە
بە خوشکم قبووڵ کراوە
بۆ توو چاکە ئەو نەولاوە.
بەکر چوو بە قاسیدییە
بە حەمەد پاشاغان دەڵێ بە یەکجارەکییە:
« ئەتوو بۆ ئەو پیاوە جوابت چییە؟
ئەویش پیاوێکی کەم نییە
بۆ تووش عەیب و شوورەیییە
دەست هەڵگرتنی لە بۆ نییە
مەگەر دەوڵەت لێک درێن یەکجارەکییە
هیچ سەفای لە بۆ توو نییە
بە غەیرەز کوێرەوەرییە
گوتی: بەکر، ئەتوو بۆ چ لە من دەکەی حوکمی؟
کچی خۆم نادەم بە عەجەمی
سبحەینێ بێتە دەعوایە




خەبەری لە بۆ قەری برد

قەر سبحەینێ خۆی دروس کرد

سبحەینێ فەسڵی چێشتاوە

خەبەر بە قەری دراوە:

« ئەو لەشکر هات لەولاوە

دارو بەردی دەپۆشاوە

هەڵێ و بگەڕێوە دواوە».

قەر دەڵێ: «نەمرم، بمێنم

بەغدایە پاک دەشێوێنم

یا سەری خۆم دەدۆڕێنم

یا نە گوڵەزەرێ دەستێنم»

بەکری شێخان وای گوتییە:

«بۆ توو عەیب و شوورەییە

ئەو شەڕەم هیچ پێ چا نییە

حەمەدی پاشاغان کوێستانی نییە

لێی گەرێ تا ساڵێکی دییە

بڵا گەرمێنی لەسەر نەبییە

دەورەی بگرە یەکجارەکییە

لێی دەستێنی چارەی نییە

وێستا هەقت دەگەڵ بەغدایە چییە؟»

قەر دەڵێ: «بەکر کار تەواوە

تازە ناچمەوە بەدواوە

لەشکر و قۆشەنم هێناوە

سندووسم لێ بەجێ ماوە».

بۆتە شەڕ لە زەمانی

جوابی ئەو قسەی درا بە سوڵتانی

دنیا دەمێنێ بە وێرانی

لەبەر کوڕی فەرجوڵلاخانی

سوڵتان دەڵێ: «ڕامەمێنن
ئیسفەهانێ تێ بکەیەنن
ئەگەر قسەم نەسەلمێنن
قەت نابێ عەجەمێک بمێنن
هەرچی شیعەیە بیبەتڵێنن».
ئەو خەبەرە هات، گەڕاوە
بە میری بەغدایە دراوە
ئەگەر میر وادەزانێ
شەقڵن کەوتە دیوانێ
دەڵێ: «بێننە دەرێ جبەخانێ
سەربازم بۆ بدەن لە سانێ».
سەرباز لە سان ڕاوەستاوە
کارێکی گەورە قەوماوە
ئاڵای حەقێیان هەڵداوە
دەس بە دەعوایە کراوە
تا نیوەڕۆ لێکیان داوە
لەشکری بەغدایە شکاوە
سەری بەیداغان بەردراوە
هەرکەسە بۆ خۆی گەڕاوە
قەر ڕۆستەمە ڕاوەستاوە
شاش و پەڕ پاڵیان وێک داوە
پاڵیان وێک دا لە زەمانی
هەروەکو بەوری بەیانی
کە عێلات هەموو پێی زانی
دەیانگوت: «هەتا دوێنێ دەیکرد شوانی
ئەوڕۆکە بەوری بەیانی».
دنیا بەو شەڕەی دەزانی
بەکری شێخان هات، لەولاوە




قاقەزی خاتوون گوڵەزەری هێناوە
ماچی کرد، لەسەر چاوی داناوە
بەکری شێخان گوتی: «قوربان، چ نووسراوە؟»
گوتی: «دوعا و سەڵاوی داناوە
فەرموویە: بۆ لە ڕووی بابم وەرگەڕاوە؟
زۆر خراپم لێ قەوماوە
ئەوا خەتای من گیراوە
پێی بڵێ بگەڕێتەوە
قەرارە دەگەڵم ڕۆناوە
قەرارمان تا بەهارێ
هەتا بەخێر خێڵ دێتەوە خوارێ
جا بۆخۆم دەگەڵی دەکەم گوفتارێ
چا نییە چی دی بگرێ بنارێ
قەر گوتی: «پێی بڵێ پێی ناکەم متمانێ
هەتا بۆم نەخوا قورعانێ
بۆم دانێ قەول و قەرارێ
هەتا وەکو خێڵ دێتە خوارێ».
بەکری شێخان هات، گەڕاوە
قسەی بۆ گوڵەزەر هێناوە
قورعانی بۆ خوارد تەواوە:
«کە هاتم نایەم بە دواوە،
چی دیم ئابڕوو نەکا بڵاوە».
قەر لە بۆ شەوێ گەڕاوە
لەشکری خۆی کرد بڵاوە
سوڵتان بە شا عەباسی تێ گەیاندییە:
«ئەگەر دەڵێ تاراجی بکەم بەیەکجارەکییە
ئەو شەڕ و مەعرەکە چییە؟
شا عەباس وای گوتییە:




«ئەگەر دەفەرمووێ دەری کەم خوێڕییە
دە سوڵتانێ زیاتر کەسم نییە»
سوڵتان وای دا جوابی وییە:
ئیختیاری وی بە من نییە»
فەرجوڵڵاخان قاقەزی نووسییە:
حاشا و مادوڵڵا کوڕی من نییە
لە سندووسی دەکەم خوێڕییە»
قەر گوتی: «دەستەڵات بە من نییە
دەستەڵات بە من نەماوە
حاشا، مادوڵڵا لەو کارانە
دەزانم دەمگرێ قورعانە
ناتوانم لەبەر فەرجوڵڵاخانە
لێم حەرام بوو ڕووی نانی
جا خاتوون گوڵەزەر خۆی زانی».

***



## بەیتی زەمبیل فرۆش

زەمبیل فرۆش پادشابوو. ڕۆژێکی سوار بوو، چووە ڕاوێ. لەسە قەبران غەڵەبەیەک بوو، پرسی: «ئەوە چییە؟» گوتیان: «پیاوێک مردووە» پادشا گوتی: «دەبێ ئەمن بچم، بزانم، قەبر چلۆنە». هەڵستا هاتە سەر قەبران. پیاوێکیان هێنا دە قەبریان نا، بەردیان پێ ڕایەڵ کرد، قوڕیان دادا، گڵیان پێدا کرد. پادشا گوتی: «ئەو ڕەعیەتە مەلا، جێی ئەمنیش هەروا دەبێ؟» مەلا گوتی: «ئەوە ڕەعیەتە، خەرجێ دەدا، بێگارێ دەکا، جێی وی لە جێی توو خۆشترە، بەشکەم ئەتوو فرێ دەن، نەیەڵن لێرە بمێنی. گوتی: «ئاخر ئەمنیش دەمرم؟» مەلا گوتی: «ئەتوو دایکت ماوە، بابت ماوە؟ ئاخر ئەتووش هەر دەمری». گوتی «مەلا ئەگەر ئەمن مردم، لێفێک، دۆشەکێکم بۆ ڕاناخەن؟» گوتی: «نەوەڵڵا هیچت بۆ ڕاناخەن». گوتی:«بڵا بڕۆینەوە، جاڕی ڕاکێشن، ئەمن ئیدی پادشایەتی ناکەم». هاتنەوە ماڵێ، دابەزی، گوتی: «بابە، کەس پێم نەڵێ پادشا». ژنی خۆی بانگ کردە دەرێ، گوتی: «ئەمن ئەو پادشایەتیم ناوێ، مردنی لە دووە، ئەتۆش کەیفی خۆتە ئەمن خولڵا حافیزە».

ژنەکە گوتی: «بابم لە بابت ماقووڵتر نییە ئەتوو دەس لە پادشایەتی هەڵبگری، ئەمن دەس لە خانمەتی هەڵناگرم؟ هەر جێیەکی ئەتوو بڕۆی ئەمنیش دێم».

لە شاری وەدەرکەوت؛ ژنەکەشی وەدووی کەوت. بە پێیان ڕۆین گەینە گاوانی. گاوان لە نێو گاڕانێ بوو. پادشا گوتی: «گاوان بە قوربانت بم وەرە جلان بگۆڕینەوە». سەر

و بەرگیان پێکەوە گۆڕییەوە. ڕۆیی؛ خانم ڕەدووی کەوت. تەماشـــایان کرد. ژنێکی کوێری فەقیر بە ڕێیەدا دەڕۆیی خانم گوتی: «وەرە ســـەر و بەرگان پێکەوە بگۆڕینەوە». جلیان گۆڕییەوە. هەردوو ڕووت و ڕەجاڵ ڕۆین. هەتا گەیشـــتنە شارێکی. چوونە ماڵێکی؛ ساحب ماڵ گوتی: «بابم جووتی دەزانی؟» گوتی: «بەڵێ دەزانم». گرتیان بە نۆکەر. سبحەینێ زوو جووتێکیـــان گا دایـــە، گوتیان: «بڕۆ جووتی بکـــە». گوتی: بە خوڵای جووتیم کەم کـــردووە، بـــۆم لێ بخوڕن تا فێـــر دەبم». بڕێکی جووت کرد هاتەوە، دەســـتی دا بێڵ و ســـەوەتەی خەریکی پەین ڕشتنی بوو، سبحەینێ چووە جووتی کرد هەتا ئێوارێ. هاتەوە بە ساحب ماڵی گوت: «خوڵا هەڵناگرێ ناتوانم بە کەیفی ساحبی بکەم» ئەویشی بە جێ هێشت و چووە شارێکی دی. دەستی بە زەمبیلکردنێ کرد.

ڕۆژێ دەچوو کولۆشـــی خڕ دەکردەوە؛ دەیهێنا دەیکرد بەزمبیلە لە بازاڕی دەیفرۆت. تەماشای کرد ئەو کولۆشە گاڕان و مەڕ لە پەرێزان دەیخۆن؛ گوتی: «خوڵا هەڵناگرێ ئەمن ڕۆزێی ئەو بەستەزمانانە ببڕم». ئەو کارەشی نەکرد، چۆ شارێکی دی لەو شاری شەوێ دە خەوێی دەهات. سبحەینێ هەڵستا چووە سەر دەریایە دەنێوەڕاست ئەو دەریایەی جزیرێک بوو. مێشەیەکی لێ بوو گوتی: «خوڵایە! ئەوە کەس نەیچەقاندووە؛ چ بکەم لەبەر دەریایە ڕێـــم نییـــە بچم بڕێکی بێنم بۆ خۆم بیکەمە زەمبیل». ئەوێ ڕۆژێ زۆر بە ئاجزی هاتەوە. شەوێ دە خەوێدا پێیان گوت: «سبحەینێ بڕۆ لەو مێشەیدا بۆ خۆت کارێ بکە».

زوو هەڵســـتا چووە سەر دەریایە. بێ پایە لە دەریایەی دا، هیچ پێی تەڕ نەبوو. هاتە شاری دەستی بە زەمبیلی خۆی کرد.

خاتوونی پادشای شەوێ زەمبیل فرۆش دەخەوێ دی ئاشق لە وی بوو.

حەق! دڵ وەرە جارێک بە جۆش

جامێ جە ئەشقە مەی بنۆش

کین قەزیەتی زەمبیل فرۆش

فەسیح بکەم حیکایەتێ

دەست لە کورسی سەناعەتێ

دەست لە کورسی و فەرمانێ حەق بوو

ئاشق بەلیقا و شەوق بوو

سەنعەتی زەمبیل لەکن بوو

ئەو پێ بدرێ کیفایەتێ

ئەو لاوێکی تازە ڕواڵ
تەرکی کرد شاهی و گەنج ماڵ
لە ترسی مەوت، ماڵ کرد بەتاڵ
خۆی مەشغووڵ کرد بە تاعەتێ
ئەو لاوێکی ئی سادە بوو
هەردەم لەسەر ڕێی جادە بوو
بەئەسڵ پادشازادە بوو
دایم لە زیکر و تاعەتێ
کوا یاقووبی ساحب کەماڵ؟
عیبادەت کرد هەشتێ و دوو ساڵ
لە ترسی مەوت، ماڵ کرد بەتاڵ
خۆی مەشغووڵ کرد بە تاعەتێ
ساڵێ دەری دوازدەی مودام
سەنعەتێ ویم وی خاس و عام
ڕۆژێ دەکرد زەمبیل تەمام
دەیبرد شار بۆ قیمەتێ
چی ڕۆژێکی لاو زەمبیل دەبەست
دەیبردە بازێڕی بەقەست
نیعمەتی شەوی پێ کەوتە دەست
لاو قانیعە بەقیسمەتێ
چی ڕۆژێکی لاوا زەمبیلان دێنێ
خاتوون لە بورجان ڕادەمێنێ
بەدڵ و بەجان دەیحەبێنی
لاو کەوتە پێ موحەبەتێ
ئەو جارییەی خەوفی خودێنە
دێن بەحیلە بەلاو دەڵێنە:
«لاوا میر لە تۆی زەمبیل دەوێنە،
ئەو بە چاکییەت بانگ کەتێ».




لاو بەو قسەی بوو خۆشحاڵە

ڕووی کردە ماڵ، چۆتە حاڵە

هەڵی گرت زەمبیل چی بوو

ڕووی کردە دیوانی میران

یەک لەدوای وی هات بەخواردا:

«لاو! میر لە تۆی مەتڵەب دیداردا

بۆ خۆت وەرە، بکە قیمەتێ».

لاو، بەوێ فێڵەی نەزانی

بێ ترس و خۆف چوو بۆ خانی

دەربەی دا چەنگ دەرکەوانی

قایم کرا لای دە حشەتێ

لاو نۆڕەی دەربە نەماوە

لێی تەغیر بوو ڕەنگ و باوە:

«تا بمداتێ زەحمەتێ»

لاو بانگ دەکا: «میری کوبارە!

ئەتوو بەمنت هەیە چ کارە؟

تا پێک بیەنم حاجەتێ».

خاتوون دەڵێ: «لاوی فەقیرە،

پیر و ئاقل و هۆش و ژیرە!

حازر نین لێرە چ میرە

بۆت هات بازی دەوڵەتێ».

لاو دەڵێ: «خاتوونێ مومتازە!

لێرە تا شام و حیجازە

نامەوێ دەوڵەت و بازە

من نیم لە گوێن خەیانەتێ

خاتوون دەڵێ: «لاوی شلێوە!

وەرە نێو ڕیحان و سێوە

شەکەر بملێسە بەلێوە




تا ڕۆژی سبحەینێ».
خاتوون دەڵێ: «لاوی ڕواڵە!
وەرە نێو دۆشەک و پاڵە
تێک وەردە ئەو زولف و خاڵە
دوورە ڕۆژی ئاخرەتێ»
لاو دەڵێ: «خاتوونێ! زولف و خاڵی تووم حەریری
قابیل بە خۆت بەبەژنی میری
حەد نییە ڕەنگ من فەقیری
ئەو ناکرێ دەستیان داتێ».
خاتوون دەڵێ: «پەستە و چۆغەڵەت دەبەر دەکەم
بۆ زێڕی سوورت ڕۆ دەکەم
پاک گیانت کەسک و سوور دەکەم
دەتکەم بەچەرخی داوەتێ».
لاو دەڵێ خاتوونێ: «پەستە و چۆغەڵەی خۆم چاترن
لەش گوناهباری پێ وەشرن
لەبۆ ڕۆژی مەسڵەحەتێ».
خاتوون دەڵێ: «دەنا لاو وەها نابی
ئەگەر فیل بی، ئەبرەهە بی
لە چەنگانم خەلاس نابی
نایەی سەر پێی مەسڵەحەتێ».
خاتوون دەڵێ: «لاو مەکە چ قسە و چ دەنگان
بچیە نێو حەوت بەحری نەهەنگان
خەلاس نابی بە چ ڕەنگان
نایەیێی سەرپێی مەسڵەحەتێ».
لاو دەڵێ: «خاتوونێ بە ئەرکان و تۆرە
مەسڵحەت ناکرێ بەزۆرە
ئێوارە دابێ ئەنگۆرە
تێی دەبینین مەسڵەحەتێ».

خاتوون بەو قسەی دڵ بوو غەنی
خۆش هەڵستا، زوو پێ کەنی
دەڵێ: «لاو! وات دێنمە سەر هیدایەتێ».
لاو وای کرد خلاس لە داوێ
ئەنجەتی کرد بە پێشاوێ
بچێ لە باڵەخانان خۆی باوێ
بەشقەم خلاس بێ لە داوێ
خاتوون خوڕیە جاریەی بەنادری:
«مەسینەی ئاوێ هەڵگری
بیبە بۆ جێی لاو تێوە دێ».
لاو هاوار دەکا شێخ و مەلێ:
مووسا لە نێو بەحری عەمیق
بۆ ویت کردە دوازدە تەریق
فیرعۆنی تێدا کرد غەریق
ئەو بۆ جەزای شیرکەتێ
پەنهام بە توو شاهی کەبیر
یووسف توفلێک بوو شێت و ژیر
بران بردیان ئاویتیانە بیر
بردت لە میسرێت کردە میر
نێزیکت کرد لە ڕەحمەتێ
بزانە چیان کرد قەومی کوفار
مەنجەنیقیان ئاویتە خوار
ئیبراهیمیان نابوو دە نار
بێ بەش نەبوو لە ڕەحمەتێ
هوودی لە نێو بەحری دەلان
چل ساڵیشت ئەو دەخەلاند
فەتاحی بابی ڕەحمەتێ
ئادەم گەنمی خوارد، کردی گوناە

تۆبەت قبووڵ کرد، ڕەبەنا
هەر تۆی بابی سەڵتەنەتێ
زەکەریایان بە موشاران بڕی
ئەیووب لەسەر کرمان دڕی
کوانێ عیسای ڕۆشەن چەراخ؟
خوێندنی ئینجیلی خۆش دەماخ
کێ بوو لەکن خوڵای گوستاخ؟
مووسا بنی عیمران نەمان
کوا ئەبوبەکری سدیقی موستەمان؟
کوا عوسمانی بنی عەفان؟
ئەو جامیعەی دەس بە قورعان؟
پەنهام بەتوو شاهی جەبار
زەمبیل فرۆش نەیما ئیختیار»
دەستی گرت خۆی فڕێ دا خوار
جوبرایلی چوست و تەیار
خۆش لە ئاسمانێ هاتەخوار
زەمبیل فرۆشی گرت بەزار
دەڵێ: «عومرم! نەکێشێ زەحمەتێ
پەنهام بەتوو ساحب سجوود
ئەلحەمدوللا یا وەدوود
دەرچووم لەوێ زەلالەتێ
پەنهام بەتوو لایەزانی
واسیتەی گیاندار و بێ گیانی
پێم هیچ نییە دنیای فانی
بێبەش نەبووم لە ڕەحمەتێ
پەنهام بەتوو نادری
هەم کەریمی هەم قادری
چی توو نەیکوژی نامری

بەشم کەوتۆتە فرسەتێ

شوکرم بەتوو، پادشای جەبار

خەلاس دەکەی عەبدی هەژار

هیچ کەس ناتبینێ پەروەردگار

دنیا بۆ کەس نییە باقی دار

چۆن کەوتمە باری فرسەتێ».

خاتوونی میری گوتی: «لاو بۆ نەهاتە خوار؟» چۆ سەربانی تەماشای کرد زەمبیل فرۆش دەگەڵ قەرەواشێ نییە. پرسی: «چی لێ هات؟» گوتی: «خاتوون! لەسەرڕا خۆی هاویشتە کووچەی». خاتوون گوتی: «جا من چ بکەم؟» غەمی وەمە جارێکی دی چاوم پێ ناکەوێ». ڕوانی بە کووچەیدا هەڵدەهات. ئەگەر تەماشای کرد زەمبیل فرۆش چوو دە خانووێکەوە، خاتوونی میری نیشانەی کرد. ژنی زەمبیل فرۆش گوتی: «ها عومرەکەم بۆ چی وا بزرکاوی؟ ئەدی نانت بۆ نەهێناوە؟» گوتی: «ئەمڕۆ زەمبیلەم بردنە ماڵی میری. بردیانە ژوورێ، حەقیان بۆ نەهێنام؛ ئەمنیش هاتمەوە. ژنەکەی گوتی: «دەنا زۆرم برسییە». زەمبیل فرۆش گوتی: «بە خولای چی توو نەتدیبێ ئەمنیش نەمخواردووە». بە ژنەکەی گوت: «ئەتوو بچۆ بۆ حەقی زەمبیلان ئەگەر دایانیەی بێنیە. ئەگەر نەیاندایەی وەرەوە شوکری خولای دەکەین».

ژنی زەمبیل فرۆشی چوو گوتی: «کوێخا دەرک! عەرزی خاتوونی بکە حەقی زەمبیلەکانم بداتێ چمان نییە بخۆین». کوێخا دەرک چوو عەرزی خاتوونێی کرد. خاتوون: «بیهێنە ژوورێ حەقی بدەمێ». دەرکەوان هێنایە ژوورێ. خاتوون کە چاوی پێ کەوت لە پلەکانان بە پیریەوە هات، ماچی کرد گوتی: «بەشقی خولای وەرە! نەقلی خۆت و زەمبیل فرۆشی بکە». گوتی: «خاتوون نێوی خولات هێنا جەرگت بریم. جارێ حەقی زەمبیلانم بدەیە، زەوادمان نەخواردووە؛ جا لە دووم بنێرەوە نەقڵت بۆ دەگێڕمەوە». دەستی ژنی زەمبیل فرۆشی گرت؛ بردیە گەنجخانەی چارشێوی ڕاخست بۆی پڕ کرد. هەرچی کردی چارشێوەکەی بۆ هەڵنەگیرا. کۆشی پێ گرتەوە، بۆی پڕکرد هەتا پێی هەڵگیرا. ڕۆیی چووە ماڵێ. زەمبیل فرۆش پێی پێ کەنی: گوتی: «بۆ عەمرم! ئەمن ناتوانم ئەوانە لە دم چۆمان بێنم؟ ژن بۆیە ناچیزەن، ئەتوو ئەو پووڵەت بۆچ هێنا؟ ڕۆی کە عەرزی. بزانم»، ئەگەر ڕۆی کرد پاکی بوو بەمار و دووپشک و کیسەڵ، بە نێو ماڵێدا بڵاوبوون؛ حەقی زەمبیلان نیم پەنابات کەوتە عەرزی. گوتی: «عەمرم! ئەوانە دەتوانی بەریەوە، هەتا ئەتوو




دێیەوە ئەمنیش دەچم نانی دەکڕم، دێمەوە».

ژنەکە گوتی: «دەترسـێم پێمەوە دەن». گوتی: «نا! مەترسە زەرەریان نابێ بۆت». هەڵی گرت پێیدا ناردەوە. بۆخۆشی هەڵستا چووە بازاڕی نانی کڕی؛ پەنیری کڕی. زۆری برسـی بوو، تەمای بوو نانی بخوا، گوتی: خولا لێم هەڵناگرێ ئەو ژنە چاو لە دەسـتی منە».

هاتەوە ماڵێ.

ژنـی زەمبیل فرۆشـی زێڕەکانی بـردەوە. خاتوون گوتی: «ئەوە کـەم بوو، بۆیەت هێنـاوە؟» گوتی: «قوربان! بۆچـی مێردی من ناتوانێ لە بیابان ئەوانە بێنێتەوە؟» ڕۆژ هاتبـووە ئاوابوونێ. خاتوون گوتی: وەرە نەقڵی خۆتمان بۆ بگێڕەوە، با من ئەمشـەو لە جیاتـی توو بچمە پـاڵ زەمبیل فرۆش». ژنی زەمبیل فرۆش هەموو ڕێوشـوێنی زەمبیل فرۆشـی پێ گـوت. خاتوون خۆی ڕووت کردەوە. جلی خـۆی دا بە ژنی زەمبیل فرۆش. ژنـی زەمبیل فرۆش جلی وی دەبەر نەکرد. خاتـوون جلی وی دەبەر کرد. چوو بۆ ماڵێ زەمبیـل فرۆش. ئەگەر وەژوور کەوت زەمبیل فرۆش گوتـی: عەمرەکەم بۆچی وا درەنگ هاتیەوە؟ گوتی: «خاتوون ڕای گرتبووم. نەیدەیەشت بێمەوە». گوتی وەرە نانی بخۆین. خاتوون لە خۆشییان نانی پێ نەدەخورا گوتی: «زوو جێم بۆ چاک بکە دەنووم». پێکەوە چوون دەجێوە. ئەگەر هاتن ڕاکشـان خاتوون باسـکێکی بۆ کردە سەرین ئەوی دیکەیش دەئەسـتۆی کرد خاتوون. زەمبیل، فرۆشـی ماچ کرد. زەمبیل فرۆشی گوتی: «داخولا لە کەنگێوە کەیفی لێیە بۆیە ئەمڕۆ ئەو نسـیبەتم بەسەر هات». زەمبیل فرۆش لاقی هەڵێنا خاتوون لە فکری نەبوو.

خڕخاڵـی زێڕ لە پێی دەردێنێ؛ دەسـتی وێ کەوت گوتـی: «خانەم خراپ ئەوە ژنی منیان سـوێن داوە خۆی لێ گۆڕیوم». لاقی دانا و و هەڵسـتا وەدەرکەوت. خاتوون چوو بیگرێ؛ هەڵات. خاتوون ڕێی کەوت دەیگوت: «ئینشـاڵلا لە کووچەی دەیگرم». زەمبیل فرۆش دەیگوت: «ئینشاڵلا ئەمنیش لەو کووچەی لێی ون دەبم». هەتا بەیانی ڕێی کەوت بۆی نەگیرا. زەمبیل فرۆش ئاوڕی داوە، هەر لە دووی بوو. ملی لە چۆڵی نا. شاری بەجێ یەشـت لە چەنگانی هەراسان بوو. دەعەرزی ڕاخوڕی، عەرز قەڵشاوە چۆ تێوە. خاتوونی میری گەییە لەسەر عەرزی غوڵامانەی توند گرت. هەرچەند هاواری کرد بەری نەدا گوتی: «وەڵلاە نەیە دەرێ، قسانم دەگەڵ نەکەی، بەرت نادەم». زەمبیل فرۆش دەڵێ:

«خاتوون گیانە!

ئەگەر قایل بوو هەوێ سارانە
دەچم ئەویش دێنمە ئێرەکانە»
کێ بوو لە زەمبیل فرۆشی گوڵبارە
ئەگەر چوو نەگەڕاوە بەدواوە
لەو شارەش چوو بەولاوە
خاتوون لەوێ بەجێ ماوە
ڕۆژ بۆ نیوەڕۆی وەرگەڕاوە
خاتوون گوتی: «چم لێ قەوماوە
بۆ چ قاسیدێک نەهات واوە؟
خوڵایە لە خۆم سەر بەتاڵێ!
ئینجا چلۆن بگەمەوە ماڵێ؟»
کێ بوو لە زەمبیل فرۆشی خورد
ڕووی لە شارێکی دیکە کرد
حەوت ساڵی دی کاسبیی کرد
خوا وای کرد ژنەکەی مرد
حەوت ساڵان تازیەی داگرت
ڕووی دە شارێکی دیکە کرد
سێ ساڵی زەمبیل فرۆشیی کرد
خاتوون قەڵای دروس کرد
سوورەتی هەرسێکانی دروس کرد
خاتوونی زۆر خامۆشی
سوورەتێکی خۆی دروس کرد، یەکی ژنی یەکی زەمبیل فرۆشی
ئەگەر ئەو سوورەتەی دروس کرد
ئەمیندار جێبەجێ زەمبیل فرۆشی گرت
مزگێنییان بۆ خاتوونی دەبرد
خاتوون چراغانی دەکرد:
«وەڵڵاە لە دڵم هەڵگیرا غەم!
جا خەبەرێ بەپادشای بدەم




ئەو جارە کە مێردی دەکەم».

قاقەزێکی لە برای نووســی؛ گوتی: «قایل بــی مێردی دەکەم. ناقایل بێ مێردی هەر دەکەم». پادشــا قاقەزەکەی ماچ کرد. خوێندیەوە، گوتی: «لە من دەوڵەت بەشــارەتە ئەگەر مێردی بکا». پادشا گوتی: «حەز دەکەم ئەوەی ئەو مێردی پێ دەکا بزانم کێیە؟» خاتوون گوتی: «ئەگەر دەفەرمووێ دەینێرمە خزمەتی». خاتوون گوتی: «هەســتە بچۆ ســەڵاوێ بکە تەعزیمێ مەکە». کە زەمبیل فرۆش هەڵســتا چوو سەڵاوی لە دیوانێ کرد. پادشــا گوتی: «ئەو فەقیرە کێیە، شــتێکی بدەنێ بڕوا». گوتیــان : «قوربان! ئەوەی خوشکی تۆی دەوێ، ئەوەیە». گوتی: «بابم خوشکی من مێردی بە توو دەکا؟» گوتی: «بەڵێ ئەگەر خولا بدا». پادشــا ڕقی هەڵســتا. ئەوی لە دیوانێ بوون کەس قسەی پێ نەکرا؛ پادشــا گوتی: «خوشــکی بکوژم یا ئەوەی بکوژم؟» گوتیان: «قوربان! هیچیان مەکوژە. دەرکی خۆت بە خوێن مەکە. ئەو ســاڵ دوازدە ســاڵە، ئەو باغە هەژدیهاییێکی تێدایە؛ هەرچی بچێتە ئەو باغەی هەژدیها دەیخوا. ئەوی بنێرە بخورێ». پیاوێکیان دەگەڵ نارد، هەژدیهــا بیخوا. کابرا گوتی: «چونکە خاتوونی پادشــای ئەتووی دەوێ، ئەتووی ناردووە هەژدیها بتخوا. ئەمن ناوێرم بێم». گوتی: «بابم ئەتوو ڕاوەستە». زەمبیل فرۆش ڕۆیــی. ئــەو هەژدیهایە بوو بە پیاوە و بەپیر زەمبیل فــرۆش هات. گوتی: «یا ڕەبی زۆر شــوکرا! ئەوە خۆت و باغی خۆت ئەوە ڕۆیم». کابراکە مزگێنی بردەوە بۆ پادشای گوتی: «ئەوانە موســڵمانن». پادشا هەڵستا بۆخۆی ڕۆیی. خەڵقی ئەو شارەی پێیان موسڵمان بوون. قۆڵی زەمبیل فرۆشــی گــرت بردیە دیوانێ. قاقەزێکی بۆ خوشــکی نارد. گوتی: «لەمنــی کەوێ بۆ مێــردی بۆ خۆی دیتۆتەوە. ئێزن بدا مارەی بکەم. گوتی: «حاشــا! مێردی پێ ناکەم». زەمبیل فرۆش گوتی: «قوربان! وێستا کە مێردیم پێ ناکا ئەتوو ئەو باغــەت بەمن کەرەم فەرمووە فەعلەم بدەیە بۆ خۆم دەچم خانووێکی لێ دروس دەکەم». دەنگی فەعلانیان بۆ دا هەر کەس بەخێری خۆی چوو. ئەوێ ڕۆژێ قەڵایان بۆ دروس کرد چوو تێوێ ســەری بردە سەر ســەجدەی گوتی: «یا ڕەبی ئەمن و خاتوونێ بێنیەوە سەر حەدی چاردە ساڵەی». جێبەجێ هاتنەوە سەر حددی چاردە ساڵە. خاتوون ئەوجار خۆی لێ مارە کرد پێکەوە دانیشتن.

دەستێک گوڵ بەنادری
ساحبی ئاڵمانی نەمری
ئەوە فەرمایشی ڕەحمان بەکری



## بەیتی باپیر ئاغای مەنگوڕ بابی هەمزاغا



گوێ ڕادێرنێ دوانە

گوێو لە من بێ دیوانە

سێ شەو و سێ ڕۆژانە

بۆو بکەم مەدحی شێرانە

دۆلابی موکریانە

قاقەز چوو بۆ عێلانە

بێ ڕەشەی ڕەسوڵ ئاغانە

دەگەڵ حەمدی شینانە

ڕابەریان ئەورەحمانە

چۆڵیان کرد، باگردانە

بە عیزەتی سوبحانی

سبحەی دەگەڵ بەیانی

لەشکری باپیر خانی

ڕەنگ وەزیری ڕۆمیانی

سواربوو لە باگردانی

مەنگوڕی دە مێ وەجاغێ

پیاو بوون لە سابڵاغێ

تەدارەک بۆ مەراغێ

بۆ مەراغەی ڕەوانە

سێشەم سەری هەمووانە

بە سێشەمۆی پڕ هونەر

باپیر ئاغای پڕ جگەر

بداخانی بوو دەستەبەر

لە سابڵاغێ چوو بۆ دەر

دەڵێ: «هیچ پەرچت نایەتەبەر»

خالەق ساحب سەفایە

پەرچی دەوێ دنیایە

بە ئومێدی ئەو خوڵایە

لێیان دا دەهوڵ و زورنایە

ئەسپیان هاتە سەمایە

زۆر خۆشن بۆ دەعوایە

هومید ڕەسووڵلایە

« ئەو کارە وا پێک نایە!»

هات گەییە فەخرەقایە

لێیان دا دەهۆڵ و زوڕنایە

حەوسەد کەسی ڕاگیرایە

زەوقی باپیر ئاغایە

لێ دەن لە تەپڵی شایە

شوکر وەبەر خوڵایە

مەکوژن سەید و مەلایە




قورعانیان ده سینگیدایه

هات، گەییيه خاتوون باغێ

باپیر ئاغای قۆچاغێ

دەگەڵ خانی سابڵاغێ

سەیری کەیف و دەماغێ

چوو لە عەجەمی یاغێ

باپیر ئاغای خاڵ لە ڕوو

بەڕۆژی سیشەمۆ چوو

عامی خەڵقی چوو لە دوو

چاویان لێ کرد بە فەندی

هات، گەییيه وەکیل کەندی

حەوسەد سواری لە ڕەندی

سبحەینێ چێشتەنگاوە

قاسیدیان دەگێڕاوە

چی ماوە دەنگیان داوە

قۆشەن نەبووە تەواوە

تەگبیریان لێ ڕۆناوە

سبحەی بەیانی داوە

هەر بزووت و نووسراوە

دوو عەشیرەتی ماوە

ئەغڵەب ڕمب نەزەرییە

یەک لەسەتی کەم نییە

بزانن مەسڵحەت چییە

بێ تیپی مەرنەکەنان؟

بۆیەی عالەم ڕاچەنان

بە عەقڵم ڕاچەنان

مەقسوودیان گۆرانە
سولەیمان بە خۆ و بەبرانە
ڕایان کردە جلیتانە
مەسڵەحەتی هەموانە:
«بچین بۆ سەر عەجەمانە
ڕابەرن بۆ سەر عەجەمانە
ڕابەرن بداخانە
مەراغەی بکەین وێرانە
بێن ڕۆنیشین لێرانە
مودەبیر کاک سولەیمانە
چونکە گەورەی عێلانە
چ دەفەرمووی گیانە؟
ئێرە دەبێ وێرانە؟
مارەیان بکەین ژنانە؟
ئێدی، چڵۆنە سەوزیخانە؟»
« هۆی سولەیمانی خەزاڵی
نەوەی ڕۆستەمی زاڵی
حەوت قوبەی لە مەتاڵی
پێم نەڵێن ئەتوو منداڵی
لە جلیێ نەکرد خاڵێ
وەک هەوران بە گەواڵی
دەکوژم ماڵ و تفاڵی،
درەنگە ڕێی مەکەن خاڵی».
گەییە ئەڵڵاهو ئەکبەری
لینگی دا پێش خانی بە موشتەری
دەڵێم: «خانە ئەتوو کوێندەری

نۆسەد سواری بەدەفتەری:.
دەڵێم: «خانە! لە ڕوحێم بوویە موشتەری
لە بۆ مەراغێن بەری»
بۆ مەراغەی بردە خوار
یا بینای پەروەردگار
بەزارخۆشە نۆسەد سوار
ئیزرایل بوو جلۆدار
بۆ مەراغەی بردە خوار
بۆ مەراغەی ڕاکشان
ورشە ورشێ کەمبەران
بێنی میشک و عەنبەران
فەندی پەیاغ بەسەران
قەتن نابێ گوزەران
قەت نانبێ گوزەرانە
عەجەم زۆر بێ ئیمانە
لێن تیک دەدەن مەکانە
سەرن دەبڕن لێرانە
خدر ئاغای نەوجووانە
چووە سەر خانی بەڕمبانە
«بابە لێ دەم ئەمانە»
باپیر دەڵێتن: «کاکە!
کەس ئەوێ مەسڵەحەتێ ناکا
بەداغم دەگەڵ پاکە
هیچ دەهۆیەن لێ ناکا
تەگبیران بکەین چاکە
جێگاکەن زۆر غەمناکە

عەجەم یەکجار هیلاکە»

عەجەم هیلاک و زۆرزانە

چووە سەر جانی بەڕمبانە،

دەڵێ: «بابە لێ دەم ئامانە»

بانگم وەبەر پادشای لە ژوور!

خانی ناردنی دوور بە دوور

بڵباس هاتن بە جەمبوور

ڕانک ڕەشی چەکمە سوور

خان ناردنی بەحوجەتە

بڵباسان تالحە و بەختە

بەسی ڕەختی دە زەردا

کاکە ڕەشی نامەردا

هاتە خوارێ لەسەردا

ئیمانی پێ بوو هەردا

مەنگوڕی دە ڕەمن جۆلانە

چاویان کەوت بەزێڕانە

وەژوور کەوتن یەکانە

چەند شیوی پڕ دەرمانە

چەندی شیشە و شەڕابە

عەجەم بوون بە جەللابە

موکری بوون بە قەسابە

هیچ کەس وا لێ دەرنابا

چلۆن دەبێ ئەو حیسابە

هەمووی مەستی شەرابە

وای لێ دەرنابا کەسە

خالەق! تۆی فەریادرەسە




مەرگ بە هەروەزە
بداخان لێی بوو قەزا
ڕێکی دەدان بەخەزا
تایفەی خان باپیری
ڕێکی دەدان بە شیری
بوو بە خانەبگیری
ئیسلام قڕبوو بە شیری
بە شیری قڕبوو ئیسلام
تێیان دابوو قەتڵ و عام
قەتڵ و عامیان تێدا بوو
سولەیمان بە خۆ و بەبران بوو
سولەیمان بە خۆ بەبرانە
دەردەچوو لە دەربانە
ئەگەر لە دەربان دەرچوو
چوار پێنجی کەوتە دوو
خەلاسبوونی بۆ نەبوو
بۆی نەبوو خەلاسبوونە
لەو کافری دە مەلعوونە
بەو ڕمبی دەسێ سوونە
بە داسی کەرەنتوونە
هەروەک گەنمیان دەدروونە
هەروەک گەنم و سواڵە
دە خوێنیدا شەلاڵە
بڵباس حاڵت بێ حاڵە
لەولای بێ شێرە خڕە
تۆپیان لێ دا بەگوڕە

حەوتی لێ بوون بەوڕە
دەنگی لە عەرزێ بڕا
ئافەریم وەستای خەڕات
دەست بەخەنجەرێ دەدات
حەوت ماڵی کردن بەرباد
وەستا عوزێری هەندوو
خەنجەری شام و تەشوو
لەبەر گەڕەکی داچوو
یەکی لێ خەلاس نەبوو
هۆیە وەستا عوزێری
حەوت ماڵ بەوەجاغکوێری
هەر یەکێکیان دەبوێری
ئاویتی جەزاییێریی،
دابووی لە تەپڵی سەری
ئەویشی کرد بێ بەری
کوا مەرزینگ؟ کوا ئۆمەریل؟
شۆڕە لاوی شل و مل و
لە کۆڵانان بوونە جل
بوونە جل لە کۆڵانان
لەشی دەوان نەوجوونان
کەوتبوون لە کۆڵانان
لە کۆڵان و کەناران
لەشی دە شۆڕەسواران
وەک بژانگی دە داران
سەریان گەیییە حەساران
لە حەساری دەوا گرد




له بڵباسی دەوا خورت

لەش و کەلەش بوونە پرد

عەجەم بەسەردا ڕابرد

هەرکس میوانی خۆی کوشت. به دەهۆڵ و زوڕنا هاتنه سەر باپیر ئاغای جا باپیر ئاغا له بداخانی پرسی:

«لەباپیر ئاغای جندییه

له بداخانی پرسییه

خان، ئەو قووله چییه؟»

دەڵێ: «باپیری شۆگاییيه!

ئەوه دەهۆڵ و زوڕنا و شاییيه

ئەوه پیشەی ترکییه

زەوقه له بۆ خەلقییه»

ڕۆژێکی له ڕۆژئاوایه

خان باپیر لەسەرایه

ئاوری تۆپخانەیان دایه

زەلیل باپیر ئاغایه

لێرەی هیچ بۆ پێک نایه

خدری شۆڕیان هەڵێناوه

لەپێش بابی ڕاگیراوه

حەمەسوور بەچەلەنگی

هەڵیان ئەشکاوته سینگی

کوڕ لەسەر سینگی بابی

لێیان دا به جەللابی

توو قەت موسڵمان نابی

سبحەینێ ئەلەسەحەر

کوێت و بۆز و سەقەر




لە خاویان هێنادەر
لێی کەن زینی موحتەبەر، توندی بکێشن تەنگەوبەر
پێی نا لە ڕکێف کەوتە سەر
سوار ببێ پەپاغ بەسەر!
پەپاغ بەسەوا سوار بێ
خێڵی فەقیر هەژار بێ
موکری هەروا داغدار بێ
هەر هاوار و لێدان بێ
هەر هاوار و لێدانە
بێ سەردار و خێزانە
دەڵێی: مەڕی بێ شوانە
پەخشبوون لە زەویانە
دۆلابی بەگزادانە
سەرکردەی موکریانە
خرابوون ئەو کارانە
بەقڕی دان موسڵمانە
یەکیان نەمان ئەوانە
هومێد بوداغ سوڵتانە
قبووڵ نەکا لەوانە
بۆچ بێ دینی غەیانە؟
وای کرد بۆ عەجەمانە
پێیان نەکا موتمانە
غەلیزن ئەو سەگانە
نەمرە ئەو بداخانە
ناترسێ لە گۆڕخانە
چییان کرد بوو بەستەزمانە؟




ماڵی خۆی کرد وێرانە،
کەسی نەهێشت لە عێلانە
ڕەبی سەدجار شوکرانە
چونکە پێشکار شەیتانە
دەست هەڵگرێ لەو کارانە
هات و گەییە کارێزێ
منداڵی پڕ بە ئامێزێ
ئێخسیر چوونە تەورێزێ
هات و گەییە دریازێ
مەحبووبیان بژارد لە ڕێزێ
هاتە خوار لە لاچینی
لەت بێ لەنێوی زینی
لە بڵباس، بەقینی
برایم ئاغابێ لەسەردا
تاقە سوارەی بێ گەردە
خێزانێ دێکدی وەردا
دێکدی وەردا خێزانە
حەسەنی بەکر ئاغایە
مێردە ڕۆژی تەنگانە
بەری هەڵنەدا گۆرانە
مەلا ڕەسووڵ بێ فەرە
دەپێش بداغی گەڕا:
« خانە! بەسی بێ ئەو شەڕە!
ئیسلام هەمووی وەرگەڕا»
ئیسلام پاک وەرگەڕا
هەتا سێلمێی هەڵناوە

تا سێلم و بەیتاسی
ئێخسیر بەسێ عەباسی
بەسی عەباسی ئێخسیر
زینی ڕۆمیان و بارگیر
لەسەری بوو ڕەمب و شیر
بداخانی جیهانگیر
بداخان بوو لە دوایی
هەزار مەڕی شۆگایی
هەر هەرزانە، خۆڕایی
دەیاندا مەڕ و شایی
بزنێک بێنێ دوو کارە
لە مووی بکرێ دەوارە
بەهای بزنێم دوو پارە
هەزار گای بێ جووت بەندە
قیمەتی گای خوڵابەندە
بڵباسان کاریان گەندە
لە بڵباسی گرد و مرد
خزمەتی خانیان نەکرد
بۆیە بەدیان بۆ ڕابرد
خان عەرزی شای لەوان کرد
بۆیەیان تەگبیر لێ کرد
خان گوتی: «خزمەت بەگەرمێنیان کرد».
بۆیە پاکی برد قڕی کرد
قڕی کرد لە زەمانی
بنۆڕنە تەگبیری خانی
وا گوزەران دەزانی




ئەمینی دەوڵەتانی

بلباس زۆر بەستەزمانی

خزمەتوو نەکرد بەخانی

بۆخۆو پەیدا کرد غەیانی

تایفەی بوداغ سوڵتانی

لەکن پادشای ڕەوانی

مەنگوڕ زۆر بەستەزمانی

بەستەزمانی بێ شومار

نەیاندا خەرج و بێگار

خانیان لێ بوو دەعواکار

هاتینە پێش پیادە و سوار:

«ماڵیاتی نادەین چ جار».

وای گوت باپیری نازدار:

«بۆخۆم دەبمە حاکمی شار

خانی دەردەکەم یەقین

بۆ خۆم دەبمە جێنشین

دەڵێم بەگزادە چ نین».

ئەگەر ئەو قسە هات، ڕابرد

خان ڕۆنیشت تەگبیری کرد

قسەی خۆیان پاک یەک کرد

عەرزی پادشایان دەکرد

پادشا لەوانی قبووڵ کرد

بداخانی گرد و خورد

مانگێکی دی سەبری کرد

پاک مەنگوڕی وەخر کرد

سەرتاپای خەڵات دەکرد




بداخان گوتی: «بمێنم

باپیر ئەمنت دەزیێنم

سابڵاغێت بۆ دەستێنم

باپیر مەبە ئینتیزار

دەبێ ببیە حاکمی شار

لەبەرم هەیە یەک کار

کارم هەیە لەوێندەرێ

جارێ دەنێرم چەپەرێ

چەپەرێکی بەڕەوان

بۆ کن پادشای بەدل و جان

مەراغەی بکەم وێران

پادشای دەکەم بێ خودان

بۆ خۆت ببە ئاگای هەمووان».

لە مەنگوڕی گرد و مرد

قسەی خانیان قبووڵ کرد

بە حەوتووێکی پاکی وەخڕ کرد

بە سابڵاغێ تەگبیر کرد

گوێو لەمن بێ گەلی جەماعەتێ

کەس بە بەگزادان هەڵنەخەڵەتێ

***





# بەیتی عەبدولڕەحمان پاشای بەبە

خالەق! هەر ئەتووی قادر

ڕەبی! هەر ئەتووی قادر

چەند باقی و چەند نادر

تۆی عەرز و ئاسمان ڕاگر

هەشتێ هەزار عالەمە، بێشکە وەڵلاە زیاتر

ئەمنیش یەکم لەوان عالەمان، خۆ دەگرم لە هەمووان کەمتر

سەجدەی شوکرێم لەسەر بوو، نەتخووڵقاندم بەکافر

(لا اله الا الله) سەد هەزار جار شوکر

تۆی ئەووەڵ و تۆی ئاخر

تۆی باتین و تۆی زاهیر

چەند باران و چەند بەفر

چەند ڕووبار و چەند بەحر

چەند ئاسمان و چەند هەور

چەند بەهەشت و چەند ئاور

چەند قۆشەن و چەند لەشکر




چی توو پێت ببێ ئەمر
نەشبێتین دەیکەی حازر
حازر دەکەی بەڕەوانی
ڕەبی هەر تۆی تەن سوبحانی
خالقی کوللی شەیئانی
مالکی بەحر و بەڕیانی
عالم و خەبیری هەموانی
تەوفیقدەری، موستەعانی
ئەزم (عەلی بەردەشانی)
دە بەندێم نەکەی زبانی
بەیتێ دەڵێم بە دیوانی
مەدحی پاشای کورستانی
مەدحی پاشای کامیان باشە
شایەد ڕۆم و قزڵباشە
هەرجارێ شیری دەکێشا
هەمووی دەهاتنە تەماشا
عالەم ئالآیە چاوەشە
مەردە عەبدوڕەحمان پاشا
پاشای بەبان جیهانگیری
وەک ڕۆستەمی زاڵی پیری
تەحا بە ڕا و تەگبیری
ڕاناوێرێ بەڕەزیلی:
«ناکەم خزمەتی وەزیری
نانی دەستێنم بەشیری
بەشیری نەبێ پێک نایە».
دەوڵەوت نایەتە ڕەدایە
ناچمە سەفەری لەحسایە
یاغی دەبم لە بەغدایە

یاغی دەبم ئینشائەڵڵاهـ
خزمەتی ناکەم وەڵلاهـ
ئافەرِیم بارەکەڵلاهـ
تەوەکەل تەعالەڵلاهـ
هەر کوڕە بەبەینە هەللاهـ
بەبە هاتن بەلێمشت[1]
لە غیرەتێیان بەست پشت
دەستی لە بەغدایە شوشت
حەمەد پاشای کوێی کوشت
کوشتنی بە چ قەرار بوو؟
پاشای بەبان سەردا بوو
سەد وەک وی خزمەتکار بوو
دە حاڵی خۆیدا شۆفار بوو
خزمەتی پاشای پێ عار بوو
بێ تالعی لە ملان بار بوو
تالعی پاشی دیار بوو
پاشا کردیە گوفتوگۆیی،
لەگەڵ تۆ محەمەد کۆیی:
«حەزم کرد هاتی و نەڕۆیی
زۆرم حەز کرد میری سۆران
دووزمانی وەکو گۆران
بە ئەقڵ هاتوویە تۆران
بێکەسی دوژمنی زۆران
ئەوجار لێی دەن بە ساتۆران»
ساتۆر دەبان ڕەنگ شمشێری
دەست و باهوو حەملەی شێری

---

١ ـ لێشاو، لافاو.

وای گوتوە شیعری شایێری
یاڵلاهـ پاشا گوێم بدێرێ
کە فرسەت هات، قەت نەیبوێرێ
مەرد هەر بە ئەڵلاهـ دەسپێرێ
هەر ئەڵلایە و ساحیب سوڕە
وەدەست کەوت بەبێ قرە
پشتیان شکان، زگی درا
لەسایەی توو ڕیشی برا
لێک سوار بوون کوڕە کوڕە
لەرسوو[1] ئوردووان بوو بە چڕە
بوو بە چڕە و سەڵاوات
قووەقووە، هاتەهات
هەر خێوەتن بێ قەڵات
هەی دەستی بێ دەستەڵات
کوێی گیران کێ هەڵات؟
لەوان کۆیی دە بەدبەخت
خەلاس ناکەن ڕووحی سەخت
کەلەپوور و ماڵی نەغد
ئەسپ و ئێستر ڕێشمە و ڕەخت
وەرگیرا نەغد بەنەغد
وەرگیرا بە قەتارەوە
بە ئاڵتوون و دینارەوە
بە ئاغاو و خزمەتکارەوە
پاشای بەخشین بە بارەوە
چی پێ بەخشین پێی بوون غەنی
پاشا سوار بوو بۆ مەوتەنی

---

١ ـ لە هەردوو

مەتاڵ لە گوێی کەرگەدەنی
هات، گەیییە قەرەحەسەنی
ئەسەح یاغییە پێدەکەنی
لە پێکەنینی سەرداری
چرەچری کۆچ و باری
هەڵگیرا ڕێیە ڕێبواری
لە جحێڵ تا هەرزەکاری
هەر لە پیر تا ئیختیاری
هەرچی دەستی بگرێ داری
دونیا دەبوو شەوی تاری
خوێن لە سامی سۆران باری
خوێن باری سامی سۆر
هەر لە نیزیک هەر تا دوور
پاشای بەبان قران قڕان
بوو بەسەری سەر ئەسکەران
سوێندی خوارد بە پێغەمبەران :
«لەبۆ شای دەنێرم سەران
سەری ئەوغان و قەجەران».
سرکە سرک بوو لە مووندەران[1]
قاسید هاتەوە بە موتلەق
قسەی کردن دەقاودەق:
وەزیرە وەک بەردی ڕەق
ئەو خەیانی موستەحەق
ڕەجایە ناگرم بەحەق
لەسەر زینم نەکەن شەق
بەغدایەم پێ نەکەن لەق».

---

١ لە هەموو هەندەران، لە هەموو جێیان.

شای کە ئەو قسەی پێ دەزانی
هەڵدەستا بۆ سەر چۆکانی
هەردووک دەستی دان لە ڕانی:
«پاشای دەگەڵ سەلیم خانی
دەنێرمەوە کوردستانی
لە کوردستانی باخێوی
لەبەغدایە سەر ببزێوێ
ئێران و تووران بشێوێ
هەرچی لێو دابنێ لەسەر لێوێ
نەرمی دەکەم وەکوو مێوێ
دەری داوێم لەوێ نێوێ
دەری داوێم بەعەجەمان
بە هەوشار و موغەدەمان» .
پەیدابوو سەدای زەمزەمان
لەبەر دەنگی زیل و بەمان
شێر هەڵاتن لە گوێ چەمان
نەهەنگ دە بەحراندا نەمان
شا خۆش بێ نەکێشێ غەمان
ڕاهی بێ، چ قسە نەمان
ڕاهی بێ دەگەڵ ئالایە
لێرە بڕوا تا بەغدایە.

***





# بەیتی عەلی عاشق

مەجلیسی ئاشقان گیراوە

ساقی لەنێو ڕاوەستاوە

پیاڵەی عیشق نۆش کراوە

«بەخێر هاتی پەریزادە

بەخێر هاتی

بەسەر چاوی دەمن هاتی

بەچیم زانی کە تۆ هاتی؟

بەدەنگی تۆق و خرخاڵان»

«عەلی عاشق! ئەگەر عیشقت زوبانی بێ

سەد جار عەمرت زوو فانی بێ»

حەیفە ئیخلاس پەنهانی بێ

مەلازادە بەخێر هاتی

موتریب! لێ دەبینای سازت

بەختت سووتێ لە بۆ نازت

جووتێ ساقی سەر بەزێڕن

مەی لە مەیخانان دەگێڕن
ئاشقان لە دین وەردەگێڕن
قوربانت بم ئەی بای وادە
تارا لەسەر لەیلم لادە
بەدەستووری حاکم زادە
مەجنوون بۆ یەکێ دەردەدار بوو
بەتیری ئیشق گرفتار بوو
چونکە لەیلێ وەفادار بوو
عەزیزی من بەخێر هاتی
مەجنوونەکەی لە کێوانم
دایم دڵ پڕ لە هیجرانم
بۆ خاڵی لەیل پەریشانم
خۆزگەم بەفەرهادی چینی
خەریکەلە سەنگ تاشینی
ئەویش بۆ ئیشقی شیرینی
قوربانت بم شەماڵ وەرە
ئەو کاغەزەم لە بۆ بەرە
بیدە بەدەستی دلبەرە
ساقیم دەوێ شەراب بێنێ
عەکسی خۆی تێدا بنوێنێ
ئنالیلای لێ بخوێنێ
بەو چاوە گیانم دەستێنێ

***



## وردە مەقام



١

فەسڵێک دەخوێنن یاسینم
لەیلام بێتە ژوور سەرینم:
«کوێت دێشی، دیدەی شیرینم؟»

٢

توو خوڵا! لەیلا، وەرە کنم
بەدڵ ئازا بکە گەردنم
نیزیکە ڕۆژی مردنم

٣

یا خولا هەروا گەرد و تۆز بێ
دەسۆکەی لە ملان ئالۆز بێ
لەیلا جێژنت لێ پیرۆز بێ

٤

قوربانت بم ئەی بای شەوێ
کە جارجار وە ڕووت دەکەوێ
پێی خۆش دەبێ ماچی شەوێ

٥

دیسان شەو هات بۆ حاڵی من
لەو دڵەی پڕ خەیاڵی من
ئالەم سووتا بە ناڵەی من

٦

قوربانت بم ئەی بولبولە
دەم لەسەر خونچان هەڵگرە
سیست کردن ماڵە کاولە

٧

ئەتوو وا دەڕۆی بە ناڕەزای دڵ
خوڵات دەگەڵ بێ مەنزڵ، بە مەنزڵ

٨

ئەگەر بەبێ توو سەر وەسەرین کەم
دوو ڕۆژ پێ نەچێ دەس بە ناڵین کەم

٩

دەترسم بمرم دنیای زۆر مابێ
بەدکاری بێ پیر بە لەیلام شا بێ

١٠

باڵا بەو بەرزی قەد بەو باریکی
ئەستێرەی سوهەیل کەوتە تاریکی

١١

موژەت نیزام و سەر عەسکەر
لەسەر چاوان بەستیان لەنگەر
لنگیان دامێ دەستە و خەنجەر

١٢

چاوت ئەستێرەکەی ڕۆژێ
هەڵدێ دەگەڵ گەلاوێژێ
قەستە بە نازان بمکوژێ

١٣

چاوت ئه‌ستێره‌ی هۆبه‌توو
نه دره‌نگ هه‌ڵدێ گیانه نه زوو
له‌یلێ ڕۆیی مه‌جنوون له دوو

١٤

چاوت ئه‌ستێره‌ی سه‌حه‌ری
هه‌ڵدێ له بێژینگ به‌سه‌ری
کوشتمی قه‌تاره‌که‌ی سه‌ری

١٥

چاوت ڕه‌شه، ده‌گه‌ڵ برۆت
به‌و خاڵه‌ی که‌م، ده‌وره‌ی لێموت
دایکت ماچ که‌م، یا نه بۆ خۆت

***



# مەم و زین



کاکــە مەم نۆکەری میری ڕەواندز بوو. خاتوو زین خوشــکی میری ڕەواندز بوو. کاکە مەم دڵی لێ چوو؛ ئاشــق بوو لە خاتوو زین. میر مەم ئاغای نەخۆش کەوت؛ پێنج ســاڵ تەواو. کاکە مەم ئاغای بە کۆڵ گێڕا. لە دوای ئەم پێنج ســاڵە شــەرتی کرد کە خوشکی خۆی بداتێ. پیاو ماقووڵان جەم بوون قبووڵیان نەکرد. ئاقیبەت زین و مەم ئاشــق بوون بە یەکتر. خاتوو زین کاســەی ئاوی دا بە کاکە مەم. میر پێی زانی. زســتان بوو حوکمی کرد: «ئەســپێکم بۆ بێنن، کاکە مەمی سوارکەن، وەگوزەی ئاوی پیا بکەن با بیبەستێ. دەری کەن با بڕوا بۆ خۆی؛ دەریان کرد. بەوشــەوە ڕۆیی بە نێو بەفر و ســەرما تا نیزیک بەیانی داغل بە شــاری کۆیە بوو. ئەسپەکەی بەڵەد بوو، لەبەر دەروازەی میری ڕاوەستا؛ حیلاندی. میر بەخەبەر بوو. بانگی کردە غوڵامان دەروازەی بکەنەوە بزانن ئەوە کێیە؟ کە چوون دەروازەیان کردەوە دایانبەزاند، هاوردیانە[1] ژوورەوە. میر کە تەماشــای کرد هەموو گیانی بەستووگیە[2].

لێی پرســی گوتی: «چی کردووە بەم شــەوە ســاردە توویان دەرکردووە؟» عەرزی کــرد: «لە بری چاکەی کە لەگەڵ برای تووم کرد. ئەمە جەزای بوو». میری کۆیە گوتی: «ســبەیانێ سەد ســوار دەنێرم خاتووزینت بە زۆر بۆ بێننە ئێرە». زۆر حەمدی خودای کرد.

---

١ ـ وشەی هاوردیان بە شێوەی ئەردەڵانییە

٢ ـ وشەی بەستووگیە بە شێوەی ئەردەڵانییە

## بەیت

جوابێ بنێرن بۆ شەمزینان
سوارین لە ئەسپ و زینان
بۆ شەوقی مەم و زینان
جانان! بکەین تەگبیر و ڕایە
جوابێ بنێرن بۆ زازایە
سوارین لە بۆ ئەم سەفایە
دڵم دەڵێی بەحری وانە
لەنگەریان تێ بەردان گەمیەوانە
جوابێ بنێرن بۆ باڵەکان
سوارین لە کوێت و هەڵەشان
لە بۆ سەفای کیژ چاو ڕەشان
کوێستان لە من داغان داغان
سوورگوڵ پشکوت لە چوارباغان
کاکە زین و براڵە زین و کیژە ڕێحانە
ئاورێکم بەربۆتەوە لە دەروونێ
نە بە بایە دەکوژێتەوە نە بە بارانێ
نە بە پاچ و پێمەڕان نەبە گڵ وەسەردانێ
نەبە شێخە سووری کریوە، نەبە چاکەسواری تاژیانێ
نەبە سەید ئەحمەدی ساوانێ
نەبە تیپی سوارانی کاولە حەریرێ
نەبە گوڵنگە و قویتاسەی کاری مووسڵێ

***

# ئا

ئارەخ چن: ئارەق چن، کڵاو

ئازووخە: ئازووقە، تفاق

ئازیزە: ناوی مەقامێکی کوردییە

ئاسوودەیی: ڕەحەتی

ئاسەوار: شوێنەوار

ئاڵدووز :نەخشێندراو

ئافتاوە: مەسینە

ئانیشک وێدان: خۆ هاوێشتنەسەر ئانیشک

ئاور: ئاگر

ئاوردوو: سووتەمەنی، ئاردوو

ئاورگ: ئاگردان، وەجاخ، کوانوو

ئاوریشم دۆز: بە ئاوریشم دووراو

ئاو لە ئاوەڕۆ دەرکردن: لەحەد بەدەر خراپە کردن

ئاویتیانە: هاویشتیانە

ئایسان: هەڵگیرسان

ئامێز: باوەش

ئۆخژن: ئۆخەی، هەست بە خۆشی کردن

ئەبلە: گەمژە، گێل، بێ ئەقڵ

ئەرجوو: نیاز

ئەزمان: زمان

ئەستەم: زەحمەت، دژوار




ئەستۆخوار: ئەستۆکەچ، ملکەچ

ئەسرۆ: قۆچ

ئەشرەفییەند: لیرەبەند

ئەمەگ: وەفا

ئەنجەت: بیانوو، بەهانە

ئەندەروون: حەرەم، ژوورەوە

ئەنقاب: پایە و ناونیشان

ئەنعام: چاکە

ئەنگوان: لێدران، پێکران

ئەنگۆ: ئێوە

ئەنگۆرە: سەرەتای تاریکایی شەو

ئیختیبار: لە جیاتی (اعتبار) هاتووە

ئیرات: هەڕات، هیرات

ئیرەوان: یەریڤان، ڕەوان

ئیکلام: تەمەنناکێشان

ئیلاقە: لاقە

ئیشک: وشک

ئینکەبەری: نەسەلماندن، ئینکاری، کەبەری

ئینگۆ: ئێوە

ئێخ: یەخە، ئەستۆ

ئێشک ئاغاسی: گەورەی ئێشکچییان

ئێل: عێل

ئێڵچی: باڵیۆز

ئێڵچیگەری: قاسدی

***

ب

باب نۆکەر: گەورە نۆکەر

باخێوی: باژوێ، لێ خوڕی

باراندێز: دێیەکە نیزیک ورمێ (رەزاییە)

باڕێزە: ئەو بارانەی کە بە با ببارێ

بازن و باج: سەرانە

باشووک: باشق ( باڵندەیەکە)

بالیمز: جۆرە تۆپێکە

بانگ یەڵە: بانگ بکە

بایاقوب: شەخسێکە لە موکریان

براز سروشت: بەراز خوو

برک: لاکەلەکە، خاڵگە

برینهێنان: بریندار بوون، زامدار بوون

بڕ: بڕێ، هەندێ، کەمێ

بڕۆ: تالان ( تالان و بڕۆ)

بزگوڕ: شتومەک، شمەک، کەلوپەل

بزورگینە: گەورەکان

بژوێن: جێگایەکی بە گیا و گوڵ

بسک: زلف

بلوێرئەنگێو: بلوێرژەن، بلوێرلێدەر

بلەوەز: هەوەسباز

بلا: با




بناو و مەراغە: دوو شارن لە ئازربایجانی ڕۆژهەڵات

بنبڕی: لەبنەوە ئیشکردن، بە نهێنی کاری خراپکردن

بنپشک: ئەو کچەی کە بۆ ژن بە ژنێ دادەندرێ

بن پانک: بن ڕەشماڵ

بورجی بەڵەک: کۆشکی مەم

بوزلق: سەهۆڵخانە

بۆران: کرێوە

بوودڕ: لەغەم

بوورە: ئەو زەوییەی دەست لە کێڵانی هەڵگیراوە

بەئاس و پەڵاسدا چوو: خۆی ڕنیوە و جلوبەرگی خۆی دڕی بۆ پاکانەی خۆی

بەبەختچوون: لەسەر بەختی یەکێک بەرەو کارێک چوون

بەتڵ: بەتڵێک لە شەو – ماوەیەک لەشەو

بەتڵاندن: بەتەڵاقدان

بەرخەڵ: بەرخەکان

بەرخەل چێشتاودان: بەرخ تێبەردان بۆ شیر مژین

بەرخ فرچکدان: یەکەم ژەک بەبەرخدان ، ژەکیش ئەو شـــیرە خەســـتەیە کە لە گوانی ئاژەڵی ئاوسدا لەسەروبەری زایندا پەیدا دەبێ و لە جیاتی ماست دەبێتە فرۆ.

بەرماو: پاشماوەی خواردن و خواردنەوە

بەرۆک: یەخەی سەرسینگ، پێسیر

بەرکۆژ: دوگمە و قەیتان

بەرِیە: دەشت، سەحرا

بەقاکردن: باوەڕکردن

بەگلەر: بەگەکان

بەلەک: نێوان گوێزینگ و ڕەفیسک

بەعی: بایەخ

بەشقی: بەعەشقی

بەشکەم: بەڵکو

بەهاربەند: حەسارێکی ئاخوڕی تێدا بێ بۆ وڵاغی بەرزە

به‌یار: ئه‌رزی نه‌كێڵدراو

به‌یانی به‌ردان: ڕووناكی په‌یدابوون دوای شه‌به‌ق

به‌نده‌شیر: ئه‌و به‌نده‌ی شیری پێ هه‌ڵده‌واسرێ، یا له مل ده‌كرێ

بیابان: ده‌شتی بێ ئاو و گیا

بیروونكردن: ده‌ركردن

بیلن: ئاگادار( توركییه)

بیوردار: بریندار، ده‌رده‌دار

بینای چاوان: كینایه‌یه له خوا

بێ ئه‌نوا: هه‌ژار، لێقه‌وماو، بێ په‌نا

بێ خودان: بێ ساحێب

بێ سامان: ترسناك

بێ سه‌ڵا: لێقه‌وماو

بێشوه: گوندی بێژوه‌ی نێزیك سه‌ده‌شت

بێنه‌بێنه: هه‌ڕمێن، قه‌ڵه‌باڵغی

بێ نێوبڕ: بێ پشوو، بێ وچان، سه‌ره‌مڕ، سه‌رومڕ

***

# پ

پاردە: وارش، شووورە

پاکار: بەردەستی کوێخا

پاکەت: زەرفی کاغەز

پلیکان: پەیژە

پاشبەند: بەندی پاشەوە

پانکە: گۆڕاییی لە قەدی چیا

پانێر، پارێن: گوێلکە نێری ساڵەوەختە

پانیە: پاژنە

پای حساب: ژێر حیساب

پایە: پەڵپ، بەهانە، بیانوو

پشت ڕەق: لە کار وەڕەزبوون

پندر: کرز، نزیک بەوشکبوون

پەیاغ: کڵاوی ترکان

پەتووڕ: شڕ، دڕاو

پەرچ: لەمپەر، کۆسپ

پەزەوان: مەڕەوان، شوان

پەستە: پەستەک

پەسیوو: پەنا

پەنها: پەنا، پشتیوان، نوا

پیاوە: پیادە

پێ دزیلکە: خۆ دزینەوە

پێده‌شت: ده‌شتایی، داوێنی کێو

پێشبه‌ند: به‌ندی پێشه‌وه

پێشکار: ڕابه‌ر

پێکۆڵ: سمکۆڵ

پێمه‌رد: عیزرائیل

پێناودار: ئۆباڵ له‌ ئه‌ستۆ

پۆست: پۆسته‌، چه‌په‌ر

* * *

## ت

تابیان نەهێنا: هێزیان لێ بڕا

تاتا: داوداو

تاتە شوار: بەردێ کە مردووی لەسەر دەشۆرێ

تاراج: تالان

تاژیی چێ: تاژیی خێرا و شارەزای ڕاو

تاعلقە: تەعللوق (تعلق)

تان: توانج

تانووت: هاندان، دنەدان

ترۆپک: پۆپە، دوند

ترەختان: بەپەلە

ترۆ: خوێڕی

توێژ: توێژاڵ

توور: توورەکە

تووک: نفرین، نزا

تەپڵی باز: ئەو تەپڵەی کە بۆ بەڕێکەوتنی لەشکر لێ دەدرێ

تەرخان: ڕێ پێدراو، مەرەخەس

تەڕلان: بازی تەڕلان، واتە بازی پەسند

تەڕدەس: خێرا

تەرک: ئەو جێگەی وڵاغی کە پاشکۆ و هەگبەی بەسەردا شۆڕ دەکرێتەوە

تەسیخ کێشان: ئەرک کێشان

تەکەڵتوور: ئەو لبادەی بە ڕووی ئێرەوەی زیندا دەدروێ




تەماڵ: ئەو کەروێشکەیە لە لانیدا کەوتووە و ڕاوکەر دیاردیی لێ دەکا

تەنەخی: کار وەداخستن، ئیش پشتگوێ خستن

تەوار: جسنە بازێکە

تەیار: ساز و ئامادە، پەرداخ

تیپ: دەستە، پۆل

تیتۆڵ: پەڕۆ، شرە

تێگیراوی: ئیحتیاج

تێلتاوس: پەڕی تاوس

تۆڕ: شەبەکەی ڕاوە ماسی و ڕاوە مەل

تولەی فینۆ: جۆرە توولەیەک

***

ج

جاڵەبوونەوە: بەرەو خواربوونەوە، گلۆربوونەوە

جانماز: بەرماڵ

جلیت: تەقڵە، جریدبازی

جندی: ئازا، بەشەرەف، بەئەسڵ، ڕەسەن

جەللاب: جەلاد (عەرەبییە)

جەم: ژەم، نۆرەی خواردن

جەمجا: جەم مەقام

جەمماش: دەندووک قولابی

جیفڕک: هەڵتیزان، جووتە هاویشتن

جووت ددان: دووشیلە

جیهەت: سەبەب

***

## چ

چاپەز: ئەو نۆکەرەیە کە سەروبەری چا لێنان و چا تێکردن دەکا لە دیوەخانان

چاوبەنگی: چاومەست

چاولێکردن: بە چاو ئیشارەتکردن

چڕژ: قەڵشت

چغور: چرووپڕ و نغورد

چفە: ڕگە، چقە، جوققە، سەرتانج

چل کەوان: شاخێکە لە کێوی دمدم

چلوان: چل ڕۆژەی منداڵ

چلوو: چلە

چۆم: زێ

چەپەر: پۆستەچی

چەل: جار، چەندچەلان: چەند جاران

چەلەنگ: جوان

چەرخی داوەت: داوەتگێڕ

چەلاندن: چەراندن، چێراندن، لەوەڕاندن

چەمبەرە: شینی ژنان بەدەورە

چێشتاودان: ئاوەدانی بەرخ و مەڕ لە وەختی چێشتەنگاودا

چێشتە: چۆیلەکە، چەک

چێودار: ئەو کەسەی زیندەماڵ دەکڕێ و دەفرۆشێ

چوو: جگ. کلک لەسەر چووان: واتە کلک لەسەر جگی قاچی

چوار کۆلاغە: چوارپێچکە

ح

حاشا و مادوڵلا: ئینکارکردن

حەجمین: ئۆقرەگرتن، هەدادان

حەمایەتکردن: کەویکردن

حەوێزە: ئاوێزە، ئاوێزان، هەڵواسراو

حەیش: خۆشگوزەرانی و عیش

حەمرێکم: عەمرەکەم

حودوود: حەداڵ، ئەسپ و ماینی ڕەسەن

***

## خ

خاپوور: وێران

خاترجەمی: دڵنیایی

خاسەڕەنگ: دەرمانێکی سوورە

خاوپیس: ئەو قوماشەی بە خاوی ڕسترابێ

خانەبگیری: تاڵان

خاو: دابەستنی وڵاغی یەکسم

خڕی بالین: ناوی جێگەیەکە

خەرج و بێگار:

- خەرج: سەرانە (پارە)

- بێگار: بەزۆر کارپێکردن

خەرا: خراپ

خەرتەل: داڵی گەورە، گەپنەک داڵ

خەزایی: غازی

خەسیدە: خەساو

خەفەخان: وەڵاغی زۆر دابەستراو

خەواس: شارەزا

خواجەبێدار: ئاڵقەی دەرگە لێدان

خوانی زین: ئەوەندی لەزین کەسوار لەسەری دادەنیشێ

خوڵا: خودا

خونکار: سوڵتان

خۆبگنخێنین: تەمبەڵی بکەین، خۆمان بوەخرێنین

خۆبواردن: خۆپەنادان لەکار

خۆشخوان: دەنگخۆش

خێو: خوای ئەفسانەیی

***

د

دابین: تەئمین

داژواوە: دەئاژواوە، لێیان دەخوڕێ

داغان: بڵاوکردنەوە

دانزغ: دانزغی، ناوی چەکە

دانگەملکێک: شەشیەک

دانوو: دانوولە

داورین: خۆگرتنەوە، گیرسانەوە

داوەت: شایی

درووغ: درۆ

دڕدۆنگی: گومان لێکردن

دڕوو: دڕک

دژوێن: چڵکن

دگدگ: جۆرێکە لە پۆشاکی شەڕ

دم: دەم

دمکۆ: شائعە

دوند: ترۆپک، پۆپ

دۆشەک و پاڵە: دۆشەک و بالیف

دەبدەب: هاتوبات

دەبڵا: دەبا

دەبۆتخانە: دەبۆی چەک

دەبە: زۆرگەورە

دەبەرڕاکردن: بەقەدڕاکردن

دەربار: بارەگای شایان

دەرمانداو: دەرمانخوارد

دەرۆست: دەرەقەت

دەزبێن: ئەو پەتەی کە شوان کاتێ دەنوێ لەدەستی خۆی و ملی مەڕی دەکا، مەبەست (پشتیوان)ە

دەستندە: کەم کەمە پارەدان بەخەڵک

دەستەوسان: دەسپاچە

دەستەونەزەر: دەست لەسەر سینگ

دەسترۆک: پارچە قوماشێکی تەنکی ناسکە لە فێس و کڵاو دەئاڵێ

دەست لێساندن: بەسەردا زاڵبوون

دەسەرەوە نەچوون: لێ خۆش نەبوون

دەشتی مەحمەشە: دەشتێکە لە سندووسی موکریان

دەشقەم: بەڵکی

دەگرۆم: دەری دێنم

دەلاقە: ڕۆشنە

دەغەملێنێ: دەخەملێنێ

دەمەرقۆپان: پانتۆڵی شەڕ

دەوڵەت زیاد خواستن: ماڵئاواییکردن

دیدارئاخرەتی: لەو دنیا یەکتر دیتنەوە

دێروژوان: بەدرەنگی هاتن

دیواندڕ: ئەو کەسەی دڕ بەدیوانان بدا واتە بڵاویان بکاتەوە

***

ڕ

ڕابەزە: هەستە بڕۆ

ڕکێف: ئاوەزەنگی، زەنگوو

ڕستە: گوریسی ڕەشماڵ

ڕمێن: ڕەواج، برەو

ڕوانگە: ئەو جێگای لەوێڕا ڕاوکەر سەیری ڕاوگە دەکا

ڕۆقنایی چاو: ڕووناکیی چاو

ڕۆم (ڕۆمی): عوسمانلی

ڕۆهێشتن: شۆڕکردنەوە

ڕووبەند: پێچە، پەچە

ڕواڵ: کوڕ، ڕۆڵە

ڕۆژهەڵکشان: ڕۆژ بەرزبوونەوە

ڕۆنان: دانان

ڕۆنیاساوی: بنی گیایەکە کە بەنی پی ڕەنگ دەکەن و ڕەنگێکی سووری بەردەوامی هەیە

ڕەپێشکەوتن: پێشکەوتن

ڕەخت: خشڵێکە لە سینگ و نێوچاوانی وڵاغی سواری دەدرێ

ڕەشەڕاو: ڕاوی ئەو ڕۆژانەی کە بەفری تێدا نابارێ (عارد ڕەشانگە)

ڕەشیشە: باڵندەیەکی ڕەشی چکولۆکەیە لە دەم ئاوان دەژی

ڕەشەگوێری: نەخۆشییەکی ڕەشە وڵاغە

ڕەڵم: ڕەمڵ




ڕەفیسکە: قوڵکەی ئەودیوی ئەژنۆ

ڕەگەڵ: لەگەڵ کەوتن

ڕەمانە: جێگەی گەیشتنەوەیەکی سمت و ران

ڕەند: جوان

ڕموونن: جندۆکە، ونی، بەتێکڕایی مەخلووقاتی سەیر

ڕووساردی: شەرمەزاری

رنەک: قاشاویش، شانەی وڵاغ

ڕیشتە: بەندی مەتاڵ

ڕێی گوزەران: ڕێی ژیان

ڕێژنە: ئاوی باران

ڕێسمە: گرێژەنەی دەرکە

ڕێسمە ماچکردن: دەخاڵەت پێکردن

ڕێشمە: ڕەشمە

ڕێنووس: ئیملا

***

ز

زارجوو: ئەوەندە بنێشتەی جارێک لە زار دەهاوێژرێ

زارک: دەرک، کون

زاف: دیق

زاوابەندی: ئەو زاوایەیە کە لەگەڵ ماڵی باوکی بووکدا دەژی (زاوا پڕێوی)

زندۆڵ: قەڵش

زویروزگار: تۆراو، زیز

زۆرهان: پیری پەککەوتە

زەرزا: عەشیرەتێکی کوردە

زەرگ: جۆرێکە لە چەک

زەماوەند: بەزم و شایی

زەمەند: گیای بەرز و پڕ

زەنوێر: سازگار، بەدەرامەت

زێڕکفت: بەزێڕ نەخشاو

زێڕوەشان: زێڕ شاباشکردن

زێڕ و زەمبەر: خشڵ، زێوەر

زێو: زیو

***

ژ

ژێرلا: لە خوارەوەڕا

ژنانیشو: ژنانیشتان

ژوان: جێ بەڵێنی یەکتر دیتنی حەز لەیەککردووان

***

## س

ساچاخ: ڕیشوو

ساتۆڕ: قیمەکێش

سالووس: دووڕوو

ساڵدات: عەسکەر، سەربازی ڕووس

سامی ڕێ نیشت: ترسا، سام گرتی

سان: ڕاگرتنی لەشکر لە حاڵی ئامادەییدا

سانی: سانایی، ئاسانی

ستیزەکار: شەڕانی

سوبات: کاری گەورە

سوحبەت: گاڵتەوگەپ، خۆش ڕابواردن

سولق: ساردراو

سۆدرە: فیتنە، گۆبەند

سووریاش: قزڵباش

سوێسن: گیایەکی گوڵدارە بەزۆر لە کوێستانان دەڕوێ گوڵی فرەڕەنگی هەیە

سەبوون: گڕە، بای گەرمی هاوینان

سەرترینجانێ: شەترنج

سەرڕەو: بەغار

سەر دە سۆی نان: سەر لە ئاسۆ نان، چاوەڕوانکردن

سەرفراز: سەربەرز، ئازاد

سەرەوێران: سەرشێواو

سەرینچاوە: سەرچاوە

سەفی: سەر کوێر

سەقر: باڵندەیەکی دڕە

سەلکە ڕێشمە: سەرکەلەی کە بە سەری وڵاغەوە دەکرێ و پەتی ڕێشمەی تێ دەخرێ

سەلالەت: سەڵاوات

سەڵماس: شارێکە لە ئازەربایجان

سەودا: مامڵەت

سەوقات: دیاری

سەی: سەگ

سی: مەلێکی ئاوییە وەک قاز

سیپارە: نامیلکە

سیرمە: چەرمی باریک

سیوانکاری: مشتومالکردنی چەکی شەڕ

سێسۆ: سێ سووچ

سێواز: شارێکی تورکیایە

***

## ش

شاتر: تەتەر، پیادەی خۆشڕۆی بیندرێژ

شتاق: چ تاک، هیچ تاک

شالوور: بلبل

شام، شێو، خواردنی شەو

شلکی: نەرمی

شمقاڕ: تەیری ڕاوە

شۆفار: دووزمان

شۆگایی: جسنە مەڕێکە

شەقژن: شەقەی باڵان

شەقی: وێڵ

شەوڕاشکان: بۆڕیی مۆسیقا

شەشەکان: شەشەڵان، مانگی پاش ڕەمەزان

شیرمەشک: ئەو مەشکەی شیری تێ دەکرێ

شیری ئاگربار: شیرێکی تیژی جەوهەردار

شیلان: خوان

شینکی قەزوانی: وەڵاغی بۆرەی مەیلەو شین

شیو و کوڵ: خۆ شووشتن و جلوبەرگ شووشتن، کۆڵکانی

شوولوغ: شلۆق

***




## ع

عالەم ئارای عەباســـی: کتێبێکی مێژووە کە ئەسکەندەر بەگی تورکمان بۆ شا عەباسی سەفەویی داناوە

عەباسی: جۆرە پارەیەک بووە

عەقەی دە زینی: حەقەزین، ئەو تەمەنەی کە وڵاغە بەرزەی تێدا زین دەکرێ

عەمبەڵی: خوتخوتەدار

عوزرشۆر: بالیفەر، ڕەسیو

***

## غ

غازی: خەزاکەر

غوررزەم: گوررزە، گوڕەم، پڕ بەباوەش

غوڵامانە: کاکۆڵ

غولغولە: هەراوهۆریا

غولوو: غەڵبەغەڵب

غەبات: خەبات

* * *




# ف

فرسەق: فرسەخ، مەودایەکی دیاریکراو لە ڕێوبانان

فڕاوێتن: شەڕەجنێو بەشیعر

فیسقە: فندە گولە، مەلێکی زۆر بچووکە

***

## ق

قاپێلک: قەپێلک

قاتوقڕ: نەبوونی و گرانی و نەهاتی

قاجار: زنجیرە پادشایەکی ئێران

قافلانتو: شوێنێکە نیزیک بەسەقز

قاقم: گیانلەبەرێکە کە کەوڵی بۆ پاڵتۆ دەبێ

قاقەزی مەرجانی: قاقەزی تەنک

قالوبەلا: قیامەت

قاڵنی: جۆرە عارەبانەیەکە

قامک: پەنجە، ئەنگوست

قاوەڵتوون: نانی پێشنیوەڕۆ

قڕان: قڕکردن

قڕان: پارەیەکی کەم نرخە

قزڵباش: عەسکەری سەفەوییەکان

قوتار: ڕزگار

قولینچک: سووچ، چمک، گۆشە

قورینگ: باڵندەیەکی ئاوییە وەک قاز

قوڵەبارگین: بارگینی کلک کورت

قوڵە بژە: یاڵ کورت

قۆرچی: پاسەوان

قۆشە: قرۆش

قۆشەن: لەشکر




قۆڵچاخ: لوولە ئاسنێکە شەڕکەر لە قۆڵ و باسکی دەکرد لە شەڕدا

قۆڵ کێشان: تەسدیقکردن

قەدارە: قەمەیەکی کورت، جۆرێکە لە تیخ

قەرار و مەدار: بڕیار

قەرەواش: خزمەتکاری ژن

قەللاش: فێڵباز

قەلەندەر: هەژار

قەلێدە: قەڕیتەی ملی تاژی

قەڵپووز: بەشی پێشەوەی زین

قەڵتاغ: خانەی زین، داری زین

قەوغا: پڕ و قەڵەباڵغ

قەننەدار: خزمەتکارێک بوو لە قەننەی بۆ ئاغای تێ دەکرد

***

ک

کارامە: کار لە دەست هاتوو، شارەزا

کامڕەوا: بەئاوات گەیشتوو

کاو: ژان، ئێش

کاو: مراد، کاو و مراد: نیاز، ئارەزوو

کشمیرد: کشمیر

کلتوور: کلدان

کلوور: نیو ملیۆن

کڵ: پایە، پایگەی پرد

کوشتەری: ئامرازێکی دارتاشییە

کۆبەکۆ: کووچە بە کووچە، کۆڵان بە کۆڵان

کۆنگرە: قوتکەی شوورەی قەڵا

کۆتان: گەوەڕێکی سەرئاواڵە کە بەقامیش یا شووڵ دروست کرابێ

کۆڵاو: جوان، شۆخوشەنگ

کۆم: کۆمەڵ

کووچە: کۆڵان

کوێخا دەرک: دەرکەوان

کەپۆ: لووت

کەرەنتوو: دەسکە داسی درێژ

کەرێزکەن: کارێز هەڵکەن

کەرک: کەپەنەک

کەزی: پەلک، ئۆرک، پرچی هۆنراوە




کەسک: سەوز

کەسیرە: لە سەرمان سڕبوون

کەڵەوەکێشی: سەرکێشی

کەمایەسی: کەمایەتی

کەوڵ بەشان: پیاوی بەڕێز و خاوەن ڕوتبە

کەوی چوو: بەزیو

کەیخودا: قسەڕۆییو، ڕدێن سپی

کێهە: کام

کین: کە این (فارسی)، کە ئەم

کێردۆک: کێردی بچووک

کێل گەردن: گەردن بەرز

***

## گ

گاڕان: گاگەلی دێ، گایەل

گازرکار: ئەو کەسەیە جلکان ڕەنگ دەکا، جلک شۆر

گاگەش باوێمەر: کوێستانێکە و دوو گوندیش بەو نێوە هەن

گاڵتە خەنجەر: شەڕە خەنجەری توند

گاوانی: کۆتاییی ڕیزی شایی کە دژی سەرچۆپییە

گراوی: یار

گرێو: گرەو

گرۆڵ: گاوەڕ

گورچوو: ئەو جێیەی گورچیلەی تێدایە، خاڵێکە

گوریس گەیشتە هێچکان: (گوریس گەیشتە ڕەفیسکان) بەواتای تەنگەوتاوبوون

گولە: ڕیوەڵە، کورتە باڵا

گولە: کەند، چکۆلە

گوڵباو: گوڵڕوو، وەک گوڵ

گوڵی دەمێوان: مێو شەمێی هەنگوین

گوڵەباتوون: کولابتوون (فەرهەنگی مەردۆخ)

گوڵەبارگین: بارگیری خراپ، یابوو

گوستاخ: ڕووهەڵماڵدراو، بێ پەروا

گومبەز: گومەز، گومبەت

گوێ ڕادێران: گوێ هەڵخستن

گۆپاڵ باران: بارانی زۆر توند

گۆپەڕک: بەشێکی تیری شەڕ پێکردنە




گۆرین: ناوبراو، تاین

گۆڕ: تەخت

گۆڕایی: پانایی، تەختایی

گۆل: گۆم

گۆڵمەز: هەرا

گۆنگ: گونجە، ئەوەیە کە وەک لوولە سوور دەکرێتەوە، ئاوی پێدا دەڕوا، پێچ

ئێسکی: قاپەڕەقە

گوێنی: گیایەکی دڕکاوی کوێستانییە کەتیرەی لێ دەگیرێ

گووراو: ڕزکاو

گەپ: یاری و گاڵتە

گەرگەرۆ: گوندێکە لە لاجانی

گەرم کۆڵاوە: باش پوختە بووە

گەلۆ: یارۆ، فڵانی

گەف: هەڕەشە

گەڵ: کەڵا

گەمی: کەشتی

گەنجخانە: خەزێنە

گەوزلێدان: غلۆرکردنەوە

گیانباز: گیانفیدا

* * *

## ل

لاپرەسەن: بە کەسێکی دەڵێن کە لە خۆرا بێ هیچ دەسەڵاتێک خۆ لە قسان یا کاران هەڵبقوتێنی

لات و لووت: هەژار

لایەزان: (لایەزال) عەرەبییە

لانکەژێنی: بێشکە راژاندن

لووزەو: غوردەم، (تیار) شرک

لۆتی و ڕەقاس: چاوەش و سەماکەر

لۆزەندەر: زەلام و ناقۆڵا

لە چاوی منت کەوێ: قەزات لە چاوی من کەوێ

لە ڕووی هەڵنەهات: شەرمی کرد

لە گوێن: ئەم شتە لە گوێنە واتە ئەم شتە ڕێی تێ دەچێ

لەلە: خزمەتکاری منداڵان

لیلوپەڕ: جۆرە گوڵێکە

لینگدان: غاردان

لێ ڕاسان: لێ ڕاپەڕین بە هەڕەشە

لێ ڕەبادان: هەڵقورینجاندن، نقورچگرتن

لێ ڕزین: تجاوزکردن

لیک وەبەشین: بەسەردا دابەشکردن

***

## م

ماهووت: قوماشێكی بەنرخە

محەلەقی داوە: بازی داوە

ماڵێو: ماڵی ئێوە

متەق: دەنگ، ورتە

مستەخەسار: دەس بەخەسار، خەسارەتمەند

مل بەكوێن: پەڵاسی ڕەشماڵان، مل بەكوێن واتە تازیەدار

موخاریج: خەرج و مەسرەف

مەدەبیری: ڕاوێژكەر

مورەسوع: جەوهەربەند

مواجب: ڕەسەت، مووچە، بەرات

موخاریج: خەرجی، مەسرەف

مورسەت: ڕازاوە (مرصع)

مۆری: مووروو

موستەمان: (مستمند) فارسی، هەژار

موغابن: مخابن

موغبەرە: قەبرستان

مولاعەزە: مولاحەزە

مۆمن: پیاوچاك

مەتەرێز: سەنگەر

مەجوعمە: سینی

مەجوزات (معجزات) عەرەبییە

مەجێز: کەیف، زەوق ق شەوق

مەزڵ: مەنزڵ

مەواجب: موچە و بەرات

مەحمەڵ: مەخمەڵ

مەزنایەتی: گەورایەتی

مەلێ: مەلا

میرغەزەب: جەللاد

میرئاخوڕ: گەورەی مەیتەران

میسری: شیری میسری

میعراج: میحراب

مندار: مردار

***

## ن

ناتەبایی: ناڕێكی

نادری: نایابی

ناچیزە: هیچوپووچ

ناحەجمێم: ئۆقرە ناگرم

ناسۆر: كۆنە برین

نانبەدە:ناندەر

نانبێ: نامان بێ

نرخ ڕۆنان: نرخاندن

نزار: نسرم، نسار، جێگای ڕووەو كوێستان

نفرین: دزێو، پیس

نسحەت: نەسیحەت

نمەك پەروەردە: پەروەردەكراو

نوابەفر: جارێك لە بەفر بارین

نوغرۆ: وێران

نەبەدی: پەنهان

نەجیم: نەجیب

نەرم كێشی: لێ سەلماندن و لێبووردن

نەقارخانە و نەقارە: مۆسیقاخانە

نەهار: نانی نیوەڕۆ، فراوین

نیگاداشتن: ئاگاداریكردن

نیگاهداشتی: ئاگاداری

نیهاد: دەروون

نێرتک: نێرک

نێرگز دەبان: دەبانی جەوهەردار

نێرەوەز: نێرینە

نێڵە: لەفە

نێوک: ناوک

نواڵە: جێگایەک کە گیای زۆر و لەوەڕگەی باشی هەبێ لە کوێستان

***

## و

وردا: لە چاوگی (وردان) وەرگیراوە بە واتای دامەزران و هێوران

وەتاغ: ژوور

وەزاڵەهاتن: وەگیان هاتن، جاڕسبوون

وەکاز: داردەست

وەکوژاندن: کوژاندنەوە

وەشرین: شاردنەوە

وەشرم: وەشێرم، بشارمەوە

وەیکوژێ: بیکوژێنێتەوە

وێڕای: دەگەڵ سەڕا

وێڕزان: تێڕزان، لێڕزان، تەجاوزکردن

***

## هـ

هانا: یارمەتی، فریاکەوتن

هاوێر هاوێر: لێکتر جوداکردنەوەی دایک و بێچوو

هونەرێکو: هونەرێکتان

هۆبەهۆ: بانگەبانگ

هۆک: پەڵپ، مان

هەژیان: هەژان، لەرزین

هەستە: ضریبە

هەشتەرخان: شارێکە لە سۆڤییێت

هەڵاڵە: گیایەکی کوێستانییە و گوڵێکی زەردی بۆنخۆش دەگرێ

هەڵبرین: ڕزگاربوون، تێپەڕین

هەڵداشتن: فرێدان

هەلوێشکی: لەو وەختەوە

هەڵبڕان: جیابوونەوە

هەڵدێران: لە جێگای بەرزەوە کەوتنە خوار

هەڵکورمان: هەڵتروشکان

هەودا: داو، تاڵ

هەوشار: ناوچەیەکە لە کوردستانی ئێران

هەوێسار: ژنێک هەوێی هەبێ

هیزار: پارچە قوماشێکی جوان و تەنکە و ژن بەمل و سینگی خۆی دادەدات

***





ی

یەختەخان: تەویلەی یەختە

یاڵ و دوو: یاڵ و بژ

یەکبەز: سەرلەبەر

یەکنوا: ئەو هێندە بەفرەی کە لە یەکجاردا دەبارێ

یەنگی چەری: جۆرێکە لە عەسکەری عوسمانلی




پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانەسەر ڕێنووسی کوردی
**هێمن موکریانی**